

کتێبی
جَواهِرُ البُخاري
بەکوردی
دانراوی
مصطفی محمد عمارة
وەرگێرانی بۆ کوردی
انور قادر شێخانی
هەولێر
چاپی یەکەم
محوی

# کتێبی

# جَواهِرُ البُخاري

## بەکوردی

دانراوی

مصطفی محمد عمارة

وەرگێرانی بۆ کوردی

انور قادر شێخانی


هەولێر

چاپی یەکەم

١٤٣٣ك ٢٠١٢ز

## ناسنامەی کتێب


| | | |
|---|---|---|
| نـاوی پـەرتووك | : | جواهر البخاری |
| دانراوی | : | مصطفی محمد عمارة |
| وەرگێرانی بۆ کوردی | : | ئەنوەر قادر شێخانی |
| دیـزاینی ناوەرۆك | : | نوسینگەی هیوا |
| دیزاینی بەرگ | : | نوسینگەی هیوا |
| نۆرەی چـاپ | : | چاپی یەکەم ٢٠١٢ |

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان

ژمارەی سپاردنی (٦٤١) ساڵی (٢٠١٢)ی دراوەتێ

## پێشكەش بێت بە :

- گیانی پاكی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وە هەموو هاوەڵان و شوێن كەوتوانی و زانایان و ئەولیاو خزمەت گوزارانی دینی خوا.
- پێشكەش بێت بە دایك و باوكم و هاوسەرم ، وە هەموو ئەو مامۆستاو هاورێیانەی یارمەتیان دام رێگایان بۆ ئاسان كردم بۆ سەرخستنی ئەم پرۆژە گەورەیە بەتایبەتی كتێبخانەی مەحوی خودا پایەداریان بكات
- بە هەموو مرۆڤەكان كە بەراستی شوێن رێبازی بەختەوەری دا دەگەڕێن و تا دەستیان كەوێ و لە سزای ناو گۆڕو دۆزەخ ڕزگاریان بێت

# پێشەکی :

الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على سيدنا محمد سيد خير الله وعلى اله وصحبه والتابعين باحسان الى يوم الدين .

براو خوشكانى بەڕێزم :

ئەم كتيبەى بەردەستتان بريتى يە لە وەرگێڕانى كتێبى (جواهر البخارى) كە زياتر لە (٨٠٠) فەرمودەى تيايە وەرمگێڕايە سەر زمانى كوردى ، لە ئامادە كردنى مامۆستا (مصطفى محمد عمارة) خوا بيپارێزێ و ڕوحمى پێبكات وە منيش لە دواى ماندو بونێكى زۆرەوە هەڵسام بە ڕاڤە كردنى فەرمودەكان بۆ سەر زمانى شيرينى كوردى و بۆ ئەوەى خوێنەرانى كورد زمانم سودى لێ ببينن و پەرتوكخانەى كوردى پێ دەوڵەمەند بكەين .

وە هيچم نيە بەس ڕاوەستانم لە بەرامبەر خالقى گەورەم بە مل كەچى و داماوى و بە دڵێكى ڕاچڵەكاوو تۆبە كارو اعتراف بە گوناهو تاوانم دەكەم و دان بە هەڵەو ناڕاستى خۆم دادەنێم و دەڵێم ئەى خودايە لێت دەپاڕێمەوە بە ناوە جوانەكانى خۆت ئەم نوسينەم لێ وەرگرى و لەبەر خاترى تۆ بێت دوور بێت لە ڕياو ڕيابازى وە شەرمەزارى بازاڕى قيامەت نەبين وە ئەگەر لەم نوسينەم پێكابم و ڕاستم كردبێ ئەوا لە فەزڵ و گەورەيى خۆتە (جلّە جلالە) وە ئەگەر هەڵەو كرچ و كاڵيش بێت ئەوا لەلاى خۆمەوەيە هەڵبەتە بەندەش بێ گوناه نيە ، يارەبى خوايە خەم و خەفەتم لە دڵ دەركەى و سەرفرازى هەردووك دونيا بين و بە گەورەيى خۆت ئيستيقامەت و هيدايەتم پێ ببەخشى امين واخر دعوانا أن الحمدلله رب العالمين وصلى الله وسلم على سيدنا وامامنا وقدوتنا محمد صلى الله عليه وسلم تسليما كثيرا الى يوم الدين .

**وەرگێڕانى : انور قادر شێخانى**

**هەولێر / گەڕەكى گولان ١/ ربيع الثانى ١٤٣٣ ك بەرامبەر ٢٠١٢/٢/٢٣ز**

# بسم الله الرحمن الرحيم

**کورتەیەك لە ژیانی ئیمامی بخاری (رضی الله عنه) .**

ناوی موحەمەدی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمی موغیرەی کوڕی بیردزبەی کوڕی بەزبەی جوعفی یە , نازناوی باوکی عبدالله یە پێشەوای موسوڵمانان و سەرقافڵەی کۆمەڵی یەکتاپەرستان و گەورەی فەرمودە ناسەکان لە ساڵی (١٩٤)ی کۆچی لە شاری بوخارا لەدایك بووە هەر لە مندالّیەوە قورئانی پیرۆزی لەبەر کردوە وە لەبەر ئەوەی ئەوەندە زیرەکی و لێهاتویی و شارەزایی لە زمانی عەرەبی هەبوە هەر لە منالّیەوە پێیەوە دیار بوە وە لە ساڵی (٢٠٥)ی کۆچی دەستی داوەتە فەرموودە نوسین و لەسەر دەستی مامۆستای خۆی ·ابو احمد محمد بن یوسف البیکندی).

وە لە ساڵی (٢١٠)ی کۆچی لەگەڵ دایکی و برا گەورەی خۆی سەفەری پڕخێری حەجیان کردوە وە خۆی لە مەککەی پیرۆز مایەوە بۆ وەرگرتن و کۆکردنەوەی فەرمووده وە زۆر شوێن گەڕاوە لەوانە خۆراسانو جەبەل و عێراق و حیجازو میسرو شام، وە هەر لە منالّیەوە چاوی کوێر دەبێت وە بێ باوك گەورە دەبێت وە باوکی سامانێکی زۆری بۆ بەجێ دێڵێت دایکی دەیکا بە خێرو سەرپەرشتی کوڕەکەی.

لە بەسەرهاتێکدا دەگێڕنەوە کە حەزرەتی ئیبراهیم دەچێتە خەونی دایکی و پێی دەفەرموێت بە بەرەکەتی دوعای زۆری تۆ خودا چاوی کوڕەکەتی چاك کردەوە .

ئیمامی بوخاری زۆر سەخی بوەو زاهیدو لەخواترس و بێ هەواو کەم خۆرو کەم خەوو حەلاڵ خۆر بوە , وە دەفەرموێ شك نابەم لە ماڵەکەم یەك درهەمی حەرام هەبێت وە لە خەوا دەبینێ باوەشینێکی پێیەو مێشولە لە پێغەمبەر پاس دەکات ئەو خەونەش بە دانانی کتێبی (صحیح البخاری) لێکدرایەوە وە دەیفەرموو چل ساڵ نانم بی پێخۆر خواردوە لەبەر ئەوەی زۆر لاواز بوە وە هەموو سێ رۆژان

خەتمەکی قورئانی کردوە هەروەها لە کتێبی (فتح الباری) هاتوە لە هەر تەنگاوی و بەلاو موسیبەتێکدا هاتبێتە پێشەوە ئەگەر خەتمی صەحیحی بوخاری کرابا خودای گەورە دەروی خێری کردۆتەوە وە ئەو پاپۆڕەش کە صەحیحی بوخاری تێدا بوو بێت قەت نەبووە غەرق بوبێت ، وە ئیمامی بوخاری بە (١٦) ساڵ صەحیحی بوخاری داناوە لە (٦٠٠) هەزار فەرموودە دەری هێناوە وە لە ساڵی (٢٥٦)ی کۆچی لە تەمەنی (٦٢) ساڵیدا لە شاری سەمەرقەند کۆچی دوایی کردوە وە خۆی دەگێڕێتەوە کە هەر فەرمودەیەکی کە داناوە دەست نوێژێك و غوسلێکی سوننەتی کردوەو دوو ڕکاعەت نوێژی سوننەتی کردوە .

صەحیحی بوخاری لە پاش قورئانی پیرۆز دێت بە یەکەم سەرچاوە

لە دوا داواکارم لە ئیمامی بوخاری خۆش بێت

لەمنیش وەرگرێت ئەم نوسینە

## بابُ بَدْءِ الوَحْيِ لِرَسُولِ اللهِ(ﷺ)

١. عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا أَنَّ الْحَارِثَ بْنَ هِشَامٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ يَأْتِيكَ الْوَحْيُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((أَحْيَانًا يَأْتِينِي مِثْلَ صَلْصَلَةِ الْجَرَسِ، وَهُوَ أَشَدُّهُ عَلَيَّ، فَيُفْصَمُ عَنِّي وَقَدْ وَعَيْتُ عَنْهُ مَا قَالَ، وَأَحْيَانًا يَتَمَثَّلُ لِي الْمَلَكُ رَجُلًا فَيُكَلِّمُنِي فَأَعِي مَا يَقُولُ)).

قَالَتْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: وَلَقَدْ رَأَيْتُهُ يَنْزِلُ عَلَيْهِ الْوَحْيُ فِي الْيَوْمِ الشَّدِيدِ الْبَرْدِ فَيَفْصِمُ عَنْهُ وَإِنَّ جَبِينَهُ لَيَتَفَصَّدُ عَرَقًا.

## بەشی دەستپێكردنی وەحی بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ)

لە خاتوو عائیشە دایكی ئیمانداران (رضي الله عنها) دەگێڕێتەوە كە حاریثی كوڕی هیشام (رضي الله عنه) پرسیاری لە پێغەمبەری خوا كرد (ﷺ) فەرمووی ئەی پێغەمبەری خوا چۆن وەحیت (سروش)ت بۆ دێت؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: هەندێك جار وەحیم بۆ دێت وەكو زرینگەی زەنگ، ئەم جۆرەیان سەختترین شێوەیە لەلای خۆم جا كە فریشتەكە بەرم دەدات لەشم سووك دەبێت و ئەوەی پێم رادەگەیەنێ گشتی دێتەبەرم و، لێی تێدەگەم هەندێك جاریش فریشتەكە لە شێوەی ئادەمی دێتە لام وگفتوگۆم لەگەڵ دەكات و تێی دەگەم كە چیم پێ دەڵێت.

عائیشە خان (رضي الله عنها) فەرمووی دیومە وەحی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دابەزیووە لە رۆژێكی زۆر سارد و سەرما و سۆڵەدا نێوچاوانی پیرۆزی ئارەقی لێ دەتكا.

٢. وَعنْها أيضاً رَضيَ اللهُ عَنها أَنَّهَا قَالَتْ: أَوَّلُ مَا بُدِئَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مِنْ الْوَحْيِ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ فِي النَّوْمِ، فَكَانَ لَا يَرَى رُؤْيَا إِلَّا جَاءَتْ مِثْلَ فَلَقِ الصُّبْحِ ثُمَّ حُبِّبَ إِلَيْهِ الْخَلَاءُ وَكَانَ يَخْلُو بِغَارِ حِرَاءٍ فَيَتَحَنَّثُ فِيهِ، وَهُوَ التَّعَبُّدُ اللَّيَالِيَ ذَوَاتِ الْعَدَدِ قَبْلَ أَنْ يَنْزِعَ إِلَى أَهْلِهِ وَيَتَزَوَّدُ لِذَلِكَ، ثُمَّ يَرْجِعُ إِلَى خَدِيجَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها فَيَتَزَوَّدُ لِمِثْلِهَا حَتَّى جَاءَهُ الْحَقُّ وَهُوَ فِي غَارِ حِرَاءٍ، فَجَاءَهُ الْمَلَكُ فَقَالَ: ((اقْرَأْ، قَالَ: مَا أَنَا بِقَارِئٍ؟ قَالَ: فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الْجَهْدَ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي، فَقَالَ: اقْرَأْ، قُلْتُ: مَا أَنَا بِقَارِئٍ، فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي الثَّانِيَةَ حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الْجَهْدَ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقَالَ: اقْرَأْ، فَقُلْتُ: مَا أَنَا بِقَارِئٍ؟ فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي الثَّالِثَةَ ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقَالَ: ﴿ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ۝١ خَلَقَ ٱلْإِنسَـٰنَ مِنْ عَلَقٍ ۝٢ ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلْأَكْرَمُ﴾ فَرَجَعَ بِهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ يَرْجُفُ فُؤَادُهُ، فَدَخَلَ عَلَى خَدِيجَةَ بِنْتِ خُوَيْلِدٍ –أم المؤنين رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا– فَقَالَ: زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي فَزَمَّلُوهُ حَتَّى ذَهَبَ عَنْهُ الرَّوْعُ، فَقَالَ لِخَدِيجَةَ وَأَخْبَرَهَا الْخَبَرَ: لَقَدْ خَشِيتُ عَلَى نَفْسِي، فَقَالَتْ لَهُ صَلى اللهُ عَلَيهِ وَآلِهِ وَسلم خَدِيجَةَ: كَلَّا وَاللَّهِ مَا يُخْزِيكَ اللَّهُ أَبَدًا، إِنَّكَ لَتَصِلُ الرَّحِمَ، وَتَحْمِلُ الْكَلَّ، وَتَكْسِبُ الْمَعْدُومَ، وَتَقْرِي الضَّيْفَ، وَتُعِينُ عَلَى نَوَائِبِ الْحَقِّ.

فَانْطَلَقَتْ بِهِ خَدِيجَةُ حَتَّى أَتَتْ بِهِ وَرَقَةَ بْنَ نَوْفَلِ بْنِ أَسَدِ بْنِ عَبْدِ الْعُزَّى ابْنَ عَمِّ خَدِيجَةَ، وَكَانَ امْرَأً قَدْ تَنَصَّرَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، وَكَانَ يَكْتُبُ الْكِتَابَ الْعِبْرَانِيَّ، فَيَكْتُبُ مِنْ الْإِنْجِيلِ بِالْعِبْرَانِيَّةِ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَكْتُبَ وَكَانَ شَيْخًا كَبِيرًا قَدْ عَمِيَ، فَقَالَتْ لَهُ خَدِيجَةُ: يَا ابْنَ عَمِّ، اسْمَعْ مِنْ ابْنِ أَخِيكَ، فَقَالَ لَهُ وَرَقَةُ: يَا ابْنَ أَخِي مَاذَا تَرَى؟ فَأَخْبَرَهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) خَبَرَ مَا رَأَى، فَقَالَ لَهُ وَرَقَةُ: هَذَا النَّامُوسُ الَّذِي نَزَّلَ اللَّهُ عَلَى مُوسَى، يَا لَيْتَنِي فِيهَا جَذَعًا، لَيْتَنِي أَكُونُ حَيًّا إِذْ يُخْرِجُكَ

قَوْمُكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أوَمُخْرِجِيَّ هُمْ؟ قَالَ: نَعَمْ، لَمْ يَأْتِ رَجُلٌ قَطُّ بِمِثْلِ مَا جِئْتَ بِهِ إِلَّا عُودِيَ، وَإِنْ يُدْرِكْنِي يَوْمُكَ أَنْصُرْكَ نَصْرًا مُؤَزَّرًا، ثُمَّ لَمْ يَنْشَبْ وَرَقَةُ أَنْ تُوُفِّيَ، وَفَتَرَ الْوَحْيُ.

خاتوو عائیشه (رضي الله عنها) دەفەرمووێ لەسەرەتاوە وەحی بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە خەونی باش دەستی پێ کرد، وە هەر خەونێکی بیدیبایە وەکو رووناکی بەیانی دەهاتەدی، لە پاشان حەزی لە تەنیایی بوو وە بە تەنیا دەچووە ئەشکەوتی حیراء لەوێ شەوان دەمایەوە بە خواپەرستی شەوی بەسەر دەبرد، وە چەند شەوێ لە سەریەك لەوێ دەمایەوە وە تۆشیو و خۆراکی لەگەڵ خۆی دەبرد و لە پاشان دەگەڕایەوە لای خەدیجەی خێزانی و ئەویش خۆراکی بۆ دەپێچایەوە، هەتا ئەو رۆژەی کە وەحی بۆ هات لە ئەشکەوتی حیرا ءبوو کە فریشتەیەك هاتەلای و فەرمووی (إقرأ) واتە بخوێنە فەرمووی من خوێندەوار نیم، ئینجا دەفەرمووێ توند گوشیمی دوای بەری دام و فەرمووی (إقرأ) منیش ووتم خوێندەوار نیم، دیسان بۆ جاری سێیەم توندتر لە جاری پێشووتر گوشیمی بەخۆیەوە تا هێزی لێ بڕیم و لەپاشان بەری دام، ووتی: ﴿ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ﴿١﴾ خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِنْ عَلَقٍ ﴿٢﴾ ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلْأَكْرَمُ ﴿٣﴾ ٱلَّذِى عَلَّمَ بِٱلْقَلَمِ ﴿٤﴾ عَلَّمَ ٱلْإِنسَٰنَ مَا لَمْ يَعْلَمْ﴾ (العلق: ١ – ٥).

واتە: ئەی موحەمەد (ﷺ) بخوێنە بە ناوی ئەوپەروەردگارە ئەوە کە هەموو شتێکی دروست کردووە، ئادەمیزادی لە چەند خوێنپارەیەکی هەڵواسراو (لەناو منداڵداندا) دروست کردوە، بخوێنە لە کاتێکدا هەر

پەروەردگاری تۆ بەخشندەیە، ئەو زاتەیە کە بەهۆی قەڵەمەوە زانستی و زانیاری فێرکردووە، ئادەمیزادی فێری ئەو شتانە کردووە کە نەیزانیوە.

لەپاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە دەمەلەرزەوە گەڕایەوە لای خەدیجەی خێزانی (رضي الله عنها) و فەرمووی دام پۆشن، دام پۆشن ئەوانیش دایانپۆشی تاکو ترس و سامەکەی دەنیشێتەوە ئەمجا باسەکە بۆ خەدیجەی خێزانی دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێ ترسام لەسەر گیانی خۆم، خەدیجە خاتوون (رضي الله عنها) دەفەرمووێ نەبەخوا خوای گەورە سەرشۆڕت ناکات و چونکە تۆ سەردانی خزمان دەکەی و یاریدەی داماوان دەدەیت و نان دەریت و رێز لە میوان دەگری وە یارمەتی لێقەوماوان و بێ نەوایان دەدەیت.

ئینجا خەدیجە بردی بۆ لای وەرەقەی کوڕی نەوفەلی کوڕی ئەسەدی کوڕی عەبدول عوزای، کوڕی مامی خەدیجە، وە ئەم پیاوە لە سەردەمی نەفامی بووبووە گاور و ئینجیلی بە زمانی (عیبری) دەنوسییەوە وە پیاوێکی زۆر پیر و بە ساڵاچوو بوو.

وەرەقەی کوڕی نەوفەل ووتی بە (موحەمەد) ئەی کوڕی برام چ باس و خواسێك هەیە بۆم باس بکە، وە پێغەمبەری خواش(ﷺ) باس و خواسی خۆی بۆ باس کرد وە لەو کاتەدا وەرەقە ووتی ئەمە هەمان فریشتەیە کە وەحی بۆ موسا و عیسای پێغەمبەری خوا ناردووە، وە خۆزگە لەو کاتەی کە گەلەکەت دەرت دەکەن من گەنج بوومایە و یارمەتی تۆم بدابایە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ئایا گەلەکەم دەریەدەرم دەکەن؟!

وەرەقەش ووتی بەڵێ هەر پیاوێ هاتبێ و وەکو تۆ ئەوەی تۆ داوا دەکەی داوای کردبێ دەریان کردووە وە ئەگەر ئەو رۆژە بمێنم سەرت دەخەم، لە

پاشان وەرەقە هەندەی پێ نەچوو کۆچی دوایی کرد، ئیتر لە ماوەی ئەم جارەدا وەحی وەستا و تاوەکو ماوەیەك وەحی بۆ نەهات.

## باب التقوى والهدى وأركان الإسلام وأمور الدين

٣. قَالَ ابْنُ عُمَرَ: لا يَبْلُغُ الْعَبْدُ حَقِيقَةَ التَّقْوَى حَتَّى يَدَعَ مَا حَاكَ فِي الصَّدْرِ.

## بەشی تەقوا و هیدایەت و روکنەکانی ئیسلام و کاری ئاینی

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنه) دەفەرمووێ: (بەندە ناگات بە پلەی لە خواترسانی راستەقینە تاکو ئەوەی لە ناو دڵیەتی وازی لێ نەیەنێ بۆ خوا).

٤. عَن حَنْظَلَةُ بْنُ أَبِي سُفْيَانَ عَنْ عِكْرِمَةَ بْنِ خَالِدٍ عَنْ ابْنِ عُمَرَ بن الخَطاب رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((بُنِيَ الْإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ: شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَإِقَامِ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ وَالْحَجِّ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ)).

قَالَ اللهُ تَعالَى: ﴿ لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّۦنَ وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَٰهَدُوا۟ ۖ وَٱلصَّٰبِرِينَ فِى ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلْبَأْسِ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴾... الآية.

له حەنزەڵەی کوڕی ئەبی سوفیان له عەکرەمەی کوڕی خالید له عەبدوڵلای کوڕی عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنهما) دەفەرمووێ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (ئاینی ئیسلام لەسەر پێنج پایە بنیات نراوە کە ئەوانیش، شایەتی دان کە خوای گەورە تاك و ئەنیلە و هاوەڵی نیە و موحەمەدیش پێغەمبەری خوایە، و نوێژ ئەنجام دات و زەکات بدات و کردنی حەجی فەرزی ماڵی خوا وە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان.

وە خوای گەورەش دەفەرمووی: ﴿لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّۦنَ وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَٰهَدُوا۟ ۖ وَٱلصَّٰبِرِينَ فِى ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلْبَأْسِ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ﴾

واتە: کرداری چاك و کاری باش تەنها بریتی نییە له ڕووکردنتان بەرەو ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، بەڵکو کرداری چاك و کاری باش بریتییە لەوەی کە ئادەمیزاد باوەڕی هێنابێت بە خوا و بە ڕۆژی دوایی و بە فریشتەکان و بە کتێبەکان و بەپێغەمبەران، هەروەها ماڵ و سامانی بەخشی بێت لەگەڵ خۆشەویستیدا-بۆی- بە خزمان و هەتیوان و هەژاران و ڕێبواران و داواکاران و له پێناوی ئازادکردنی بەندەکاندا هەروەها نوێژی بە چاکی ئەنجام دابێت و زەکاتیشی له ماڵ و سامانی دەرکردبێت وە ئەوانەی وەفادار بن بە پەیمانەکانیان، کاتێك پەیمانیان دابێت ئەوانەش کە له کاتی

نەداری و هەژاری و نەخۆشی و ناخۆشی و کاتی جەنگی و شەڕ و شۆڕدا ئارام گرن، ئا ئەوانە کەسانێکن راستییان کردووە–هەر ئەوانەش پارێزگار و خواناس و دیندارن (تەفسیری ئاسان، ل٢٧).

وە دەفەرمووێ ﴿ قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴾ (المؤمنون:١ ) واتە: بەڕاستی ئیمانداران سەرکەوتوو و سەرفرازن.

٥. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((الْإِيمَانُ بِضْعٌ وَسِتُّونَ شُعْبَةً، وَالْحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنْ الْإِيمَانِ)).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئیمان و بڕوابوون شەست و ئەوەندە بەشە، وە شەرم و حەیاش بەشێکە لەئیمان).

## باب المسلم الكامل، والحُبُّ والبغضُ في الله من الإيمان

٦. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ وَالْمُهَاجِرُ مَنْ هَجَرَ مَا نَهَى اللَّهُ عَنْهُ)).

## (بەشی موسڵمانی تەواو، خۆشەویستی و رق لێبوونەوە لە پێناوی خوا لە ئیمانەوەیە)

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (رضي الله عنهما) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (موسڵمان ئەوەیە کە موسڵمانان لە دەست و زمانی سەلامەت بن، وە کۆچکەریش ئەو کەسەیە کە کۆچ بکات لەو شتانەی خوا نەهی و قەدەغەی کردووە).

## باب من الإسلام إطعام الطعام
## وَأَجِبْ لأخيكَ من الإيمان

٧. وَعَنْهُ أيضاً رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أنَّ رَجُلًا سَأَلَ النَّبِيّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: أَيُّ الْإِسْلَامِ خَيْرٌ؟ قَالَ: تُطْعِمُ الطَّعَامَ، وَتَقْرَأُ السَّلَامَ عَلَى مَنْ عَرَفْتَ وَمَنْ لَمْ تَعْرِفْ.

## (بەشی لە ئیسلامەتییە نان دان و، خۆشەویستی بۆ براکەت لە ئیمانەوەیە)

عەبدوڵلای کوڕی عەمر (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە پیاوێ هاتە لای پێغەمبەری خواو (ﷺ) پرسیاری لێ کرد و چ شتێك لە ئاینی ئیسلام زۆر چاکە فەرمووی: (نان بدە و سڵاویش لە هەموو کەسێ بکە کە بی ناسی و نەیناسی).

٨. عَنْ أنَس بن مالك رَضيَ اللهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ ﷺ قَال: ((لَا يُؤْمِنُ أحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لِأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ)).

لە ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (کەستان بە تەواوی ئیمان و بڕوای تەواو نابێت تا ئەو کاتەی ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ براکەی پێی خۆش نەبێ).

## باب حب رَسول (ﷺ) من الإيمان.

٩. وعَنْه أيضاً رَضيَ اللهُ عَنهُ أنّه قَال: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآله سَلَّمَ: ((لَا يُؤْمِنُ أحَدُكُمْ حَتَّى أكُونَ أحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَالِدِهِ وَوَلَدِهِ وَالنَّاسِ أجْمَعِينَ)).

## بەشی خۆشەویستی
## پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ئیمانەوەیە)

ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەو کەسە ئیمان و بڕوای تەواو نابێت تاکو منی خۆشترنەوێ لە دایك و باوکی و منداڵەکانی و وە لە تێکڕای خەڵکی).

## باب حلاوة الإيمان

١٠. عنْ أَنَسٍ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((ثَلَاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ حَلَاوَةَ الْإِيمَانِ: أَنْ يَكُونَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا، وَأَنْ يُحِبَّ الْمَرْءَ لَا يُحِبُّهُ إِلَّا لِلَّهِ وَأَنْ يَكْرَهَ أَنْ يَعُودَ فِي الْكُفْرِ كَمَا يَكْرَهُ أَنْ يُقْذَفَ فِي النَّارِ)).

## (بەشی شرینی ئیمان و بڕوا بوون)

لەئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (سێ شت هەن هەرکەسێ ئەم سێ شتەی تیادا بێ ئەوا شرینی ئیمانی چەشتووە، خوا و پێغەمبەرەکەی لە هەموو کەس زیاتر خۆشبووێ وە کەسێکت خۆش دەوێ لەبەر رازی بوونی خوا خۆشت بووێ وە ئەوەندە پێت ناخۆش بێ کە جارێکی تر بگەڕێیتەوە سەر کوفر و بێبڕوا بوون هەروەکو پێت ناخۆش بێ فڕێ بدرێتە ناو ئاگر.

## باب مُبايعة (ﷺ) لأصحابه

١١. عَن عُبَادَةَ بْنَ الصَّامت رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ –وَكَانَ شَهِدَ بَدْرًا، وَهُوَ أَحَدُ النُّقَبَاء لَيْلَةَ الْعَقَبَةِ– أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ وَحَوْلَهُ عِصَابَةٌ مِنْ أَصْحَابِهِ: ((بَايِعُونِي عَلَى أَنْ لَا تُشْرِكُوا بِاللَّهِ شَيْئًا، وَلَا تَسْرِقُوا، وَلَا تَزْنُوا، وَلَا تَقْتُلُوا أَوْلَادَكُمْ، وَلَا تَأْتُوا بِبُهْتَانٍ تَفْتَرُونَهُ بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَأَرْجُلِكُمْ، وَلَا تَعْصُوا فِي مَعْرُوفٍ، فَمَنْ وَفَى مِنْكُمْ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ، وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا فَعُوقِبَ فِي الدُّنْيَا فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَهُ، وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا ثُمَّ سَتَرَهُ اللَّهُ فَهُوَ إِلَى اللَّهِ إِنْ شَاءَ عَفَا عَنْهُ وَإِنْ شَاءَ عَاقَبَهُ فَبَايَعْنَاهُ عَلَى ذَلِك.

## (بەشی پەیمان و بەیعەت وەرگرتنی پێغەمبەر (ﷺ) لە هاوەڵانی)

عوبادەی کوڕی صامیت (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە ئامادەی جەنگی بەدر و یەکێکە لە نەقیبەکان ئامادەی پەیمانی عەقەبەی یەکەم و دووەم بووە و کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو کاتەی کۆمەڵێ لە هاوەڵان لە دەوری بوون فەرمووی: (پەیمانم لەگەڵ دا بکەن لەسەر ئەوە: کە هاویەش (شەریك) بۆ خوادانەنێن و دزی و داوێن پیسی نەکەن و مناڵی خۆتان لەبەر نەبوونی نەکوژن بوختان بەکەس هەڵنەبەستن وە لەکردنی چاکەو خێردا سەرپێچی نەکەن و جا هەر کەسێ ئەم پەیمانەی بردە سەر ئەوا پاداشتی چاکی پێ دەدرێتەوە وە ئەوەی نەیباتەسەر ئەوا تۆڵەی لێ دەسەنرێ لەم جیهانەدا و بۆی دەبێتە کەفارەت وە ئەوەی تووشی شتێ بوو لەم جیهانەدا و خوای گەورە بۆی پۆشی ئەوە کاری دەکەوێتە دەست خوا، جا خودا ئەگەر حەز بکا لێی دەبوورێ وە ئەگەرنا تۆڵەی لێ دەکاتەوە).جا عوبادە فەرمووی ئێمەش لەسەر ئەوە پەیمانمان پێ دا.

## باب إفشاء السلام من الإسلام

١٢. عَنْ عَمار بن ياسر قَالَ: ثَلَاثٌ مَنْ جَمَعَهُنَّ فَقَدْ جَمَعَ الْإِيمَانَ: الْإِنْصَافُ مِنْ نَفْسِكَ، وَبَذْلُ السَّلَامِ لِلْعَالَمِ، وَالْإِنْفَاقُ مِنْ الْإِقْتَارِ.

### (بەشی/ بڵاوكردنەوەی سەلام لە ئیسلامەتییەوە)

لە عەمماری كوڕی یاسر (رضي الله عنـه) دەفـەرمووێ سـێ شـت هـەن كەسـێ لێـی هاتـەدی ئـەوا ئیمـانو بـڕوای كۆكردۆتـەوە ئـەوانیش: خۆدوورخستنەوە لە گونـاه وە دادپـەروەری كـردن لـە نەفـسی خـۆت وە سەلام كردن و ئاشتی نواندن بۆ خەڵكی و لە كاتی هەژاری و دەستكورتی ماڵ و سامان بۆ خوا ببەخشی.

## باب المعاصي من أمر الجاهلية، ولا يكفر مرتكبها إلا بالشرك.

١٣. قالَ أبو ذَر رضي الله عنه: إِنِّي سَابَبْتُ رَجُلًا فَعَيَّرْتُهُ بِأُمِّهِ فَقَالَ لِي رسول الله (ﷺ): ((يَا أَبَا ذَرّ أَعَيَّرْتَهُ بِأُمِّهِ؟ إِنَّكَ امْرُؤٌ فِيكَ جَاهِلِيَّةٌ، إِخْوَانُكُمْ خَوَلُكُمْ، جَعَلَهُمْ اللَّهُ تَحْتَ أَيْدِيكُمْ، فَمَنْ كَانَ أَخُوهُ تَحْتَ يَدِهِ فَلْيُطْعِمْهُ مِمَّا يَأْكُلُ، وَلْيُلْبِسْهُ مِمَّا يَلْبَسُ، وَلَا تُكَلِّفُوهُمْ مَا يَغْلِبُهُمْ، فَإِنْ كَلَّفْتُمُوهُمْ فَأَعِينُوهُمْ)).

### (بەشی گوناه لە ڕەوشتی نەفامییەوە، وە بەتاوان كردن كافر نابێ و تەنها بە هاوەڵ دان كافر دەبی)

ئەبو زەڕ (رضي الله عنه) دەفەرمووێ: (لەگەڵ پیاوێ دەمەقاڵێمان بوو جنێومان بەیەكتردا، من تانە و توانجم بە دایكی گرت پێم ووت ئەی كوڕی

ژنە قوڵەڕەشەکە، ئەویش چووە لای پێغەمبەری خوا و (ﷺ) بۆی گێڕایەوە و پێغەمبەری خواش فەرمووی ئەی ئەبو زەڕ ئایا بە دایکی عەیبدارت کردووە؟ تۆ پیاوێکی هێشتا رەوشتی نەفامیت تێدا ماوە ئەم بەندە و نۆکەرانەتان برای ئێوەن خودا کردوونی بە ژێر دەستی ئێوە خزمەتتان دەکەن کەواتە لە خواردن و جل بەرگدا لە خۆتان جیایان مەکەنەوە وە ئیش و کاری قورسیان پێ مەکەن تاکە لە هێز و توانایاندا نەبێ وە ئەگەر داوای شتێکیان لێ کردن یارمەتییان بدەن.

## باب حسن إسلام المَرْءِ

١٤. عَن أبي سَعيد الْخُدْرِيَّ رَضيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((إِذَا أَسْلَمَ الْعَبْدُ فَحَسُنَ إِسْلَامُهُ يُكَفِّرُ اللَّهُ عَنْهُ كُلَّ سَيِّئَةٍ كَانَ زَلَفَهَا، وَكَانَ بَعْدَ ذَلِكَ الْقِصَاصُ الْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا إِلَى سَبْعِمِائَةِ ضِعْفٍ، وَالسَّيِّئَةُ بِمِثْلِهَا، إِلَّا أَنْ يَتَجَاوَزَ اللَّهُ عَنْهَا)).

## (بەشی بە جوانی موسڵمان بوونی مرۆڤ)

لە ئەبی سەعیدی خودری دەگێڕێتەوە (رضي الله عنه) کەوا گوێی لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) کە دەفەرمووێ: (کاتێ بەندەیێ موسڵمان بوو لەسەر شێوەیەکی جوان ئیتر هەرچی گوناهێ لەکاتی بێ باوەڕی کردوویەتی خوای گەورە لێی دەبوورێ وە لەپاشدا هەر کردەوەیەك بکات خوا تۆڵەی بۆ دەکاتەوە چاکەیەك بە دە تا یەك بە حەوت سەد بۆی دەنوسرێ و خراپەش یەك بەیەك یان چاوپۆشی لێ دەکات و لەسەری نانوسرێ.

## باب خوف المؤمن أن يحبط عمله وهو لايشعر

١٥. عَن عَبْد اللَّه أنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ وَقِتَالُهُ كُفْرٌ)).

## (بەشی ترسی بڕوادار لەوەی کردەوەی مایە پوچ بێتو خۆی هەستی پێ نەکات)

لە عەبدوڵلاوە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (جوێن دان بە موسڵمانان بۆ دینییەوە شەڕکردنیش لەگەڵیا کوفرە و لەڕێ دەرچوونە.

## باب سؤال جبريل النبي(ﷺ) عن الإيمان والإسلام والإحسان

١٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَال: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَعلى آله وَسَلَّمَ بَارِزًا يَوْمًا لِلنَّاسِ فَأَتَاهُ رَجُلٌ فَقَال: مَا الْإِيمَانُ؟ قَالَ: الْإِيمَانُ أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَبِلِقَائِهِ وَرُسُلِهِ وَتُؤْمِنَ بِالْبَعْثِ. قَالَ: مَا الْإِسْلَامُ؟ قَالَ: الْإِسْلَامُ أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ وَلَا تُشْرِكَ بِهِ، وَتُقِيمَ الصَّلَاةَ، وَتُؤَدِّيَ الزَّكَاةَ الْمَفْرُوضَةَ، وَتَصُومَ رَمَضَانَ. قَالَ: مَا الْإِحْسَانُ؟ قَالَ: أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ -سبحانه وتعالى- فَإِنَّهُ يَرَاكَ. قَالَ: مَتَى السَّاعَةُ؟ قَالَ: مَا الْمَسْئُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ مِنْ السَّائِلِ، وَسَأُخْبِرُكَ عَنْ أَشْرَاطِهَا: إِذَا وَلَدَتْ الْأَمَةُ رَبَّهَا، وَإِذَا تَطَاوَلَ رُعَاةُ الْإِبِلِ الْبُهْمُ فِي الْبُنْيَانِ فِي خَمْسٍ لَا يَعْلَمُهُنَّ إِلَّا اللَّهُ، ثُمَّ تَلَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ

عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ ﴾الآية، ثُمَّ أَدْبَرَ، فَقَالَ رَسول اللهُ (ﷺ): ((رُدُّوهُ فَلَمْ يَرَوْا شَيْئًا))، فَقَالَ (ﷺ): ((هَذَا جِبْرِيلُ جَاءَ يُعَلِّمُ النَّاسَ دِينَهُمْ)).

قَالَ أَبُو عَبْد اللَّهِ: جَعَلَ ذَلِك كُلَّهُ مِنْ الْإِيمَانِ.

## (بەشی پرسیار کردنی جوبرائیل (علیه السلام) لە پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی ئیمان و ئیسلام و چاکە)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ رۆژێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە شوێنێکی بەرچاو لەناوماندا دانیشتبوو لەو کاتەدا پیاوێ هاتە خزمەتی و پرسیاری لێ کرد دەربارەی ئیمان و بڕوابوون چییە؟ ئەویش فەرمووی ئیمان و بڕوابوون بریتییە لەبڕوابوون بە خوا و فریشتانی خوا و بە گەیشتن بە دیداری خوا و پێغەمبەران و بڕوابوون بە رۆژی زیندووبوونەوە).

لە پاشان پیاوەکە فەرمووی ئەی ئیسلامەتی چییە، پێغەمبەر(ﷺ) لە وەڵامدا فەرمووی: (ئیسلام بریتییە لەوەی خوا بپەرستی و هاوبەشی بۆ بڕیارنەدەی و، نوێژ ئەنجام بدەی و زەکاتی لە ماڵ و سامانت دەرکەی رۆژووی مانگی رەمەزان و لە پاشان پیاوەکە ووتی فەرمووی ئەی چاکە چییە؟

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی چاکەبریتییە لەوەی خواپەرستی بکەی وەکو ئەوەی خوات بە چاوی سەردیبێ، وە ئەگەر تۆش ئەو نەبینی ئەو تۆ دەبینی.

لە پاشان پیاوەکە فەرمووی رۆژی قیامەت کەی دێ ئەویش فەرمووی ئەوەی پرسیاری لێ دەکرێ لەوەی پرسیاری کردووە باشتر نازانێ.

واتە: لە تۆی باشتر لێ نازانم، بەڵام وا نیشانەکانیت پێ دەڵێم کە مناڵ بە چاوی تۆکەر و خزمەتکار تەماشای دایك و باوکی بکات، وە پیاوی پێ

خاوس و رەش و ڕووت و شوانی ئاژەڵان، کۆشك و تەلاری بەرز بکەنەوە و فیز و دەعیەی پێ بکەن.

وە هاتنی کاتی قیامەت لە پێنج شتە پەنهانەکانە و کە بەس خوا خۆی دەزانێ کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِ ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌۢ بِأَىِّ أَرْضٍ تَمُوتُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌۢ ﴾ (لقمان-٣٤).

واتە: بەراستی هەر خوا خۆی زانیاری بەرپابوونی ڕۆژی قیامەت دەزانێت، بارانیش هەر ئەو دەیبارێنێت، دەزانێت چی لە سکی دایکاندا هەیە، هیچ کەس نازانێ سبەی چی بەسەر دێت وچی دەست دەکەوێت (لەبەرهەمی مادی و دنیایی یان لە زەخیرە وتوشیووی قیامەت) هیچ کەسیش نازانێ لەسەر چ زەوییەك دەمرێ و کۆتایی بە ژیانی دێت هەروەها کاتی مردن و چۆنیەتیەکەیشی شاراوایە، بەراستی خوا بەهەموو شتێك زانا و ئاگادارە (تەفسیری ئاسان، ل٤١٤).

جا لە پاشاندا پیاوەکە هاتە دەرەوە و ڕۆیی، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی (بڕۆن بانگی ئەو پیاوە بکەنەوە، کە چوونە دەرەوە پیاوەکە نەدیتراوە، ئەوجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ئەوە جوبرائیل بوو هاتبوو کە خەڵك فێری یاساکانی شەریعەت بکات.

ئەبو عەبدوڵڵا (ئیمامی بوخاری) دەفەرمووێ ئەمانە هەمووی لەئیمانەوەیە.

## باب فضل من إستبرأ لدينه

١٧. عَنْ عَامِرٍ قَالَ سَمِعْتُ النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((الْحَلَالُ بَيِّنٌ وَالْحَرَامُ بَيِّنٌ وَبَيْنَهُمَا مُشَبَّهَاتٌ لَا يَعْلَمُهَا كَثِيرٌ مِنْ النَّاسِ، فَمَنْ اتَّقَى الْمُشَبَّهَاتِ اسْتَبْرَأَ لِدِينِهِ وَعِرْضِهِ وَمَنْ وَقَعَ فِي الشُّبُهَاتِ كَرَاعٍ يَرْعَى حَوْلَ الْحِمَى يُوشِكُ أَنْ يُوَاقِعَهُ أَلَا وَإِنَّ لِكُلِّ مَلِكٍ حِمًى، أَلَا وإِنَّ حِمَى اللَّهِ فِي أَرْضِهِ مَحَارِمُهُ، أَلَا وَإِنَّ فِي الْجَسَدِ مُضْغَةً إِذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ وَإِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّهُ أَلَا وَهِيَ الْقَلْبُ)).

## (بەشی فەزلی کەسێك گەردەن پاکی بۆ دینەکەی بێ)

عامیر دەفەرمووێ گوێم لە نوعمانی کوڕی بەشیر بوو (رضي الله عنه) دەیفەرموو گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو(ﷺ) دەیفەرموو: (شتی حەلاڵ ئاشکراو دیارە وە شتی حەرامیش ئاشکرایە و دیارە، وە لەنێوانیاندا شتانێ هەن کە جێگای شك و گومانی تێدایە و خەڵکی سەری لێ دەرناکەن و لێی بە گومانن، وە کەسێ خۆی پاراست لەم شتانە کە جێگای شك و گومانن ئەوا ناموس و دینی خۆی لە نەنگە و عەیبە پاراستووە وە کەسێ تووشی گوماناوی بوو ئەوا تووشی بە شتی حەرامەوە دەبێ وەك چۆن شوانی مەڕ و ماڵات ئەگەر ڕانەکەی لە دەور و بەری پاوانێ بلەوەڕێنی ئەوە بەرە بەرە ڕانەکە لە پاوانەکە نزیك دەبنەوە و لەوانەیە بکەونە ناو پاوانەکە و لێی بخۆن باش ئاگادارین کە هەموو پادشایێ پاوانێکی تایبەتی خۆی هەیە بزانن کە بەست و پاوانی خواش شتە حەرام کراوەکانە وە بزانن لە جەستەی مرۆڤدا پارچە گۆشتێك هەیە، ئەگەر ئەو پارچە گۆشتە ساز و پاك بوو ئەوا هەموو جەستەی پاك و سەلامەت دەبێ وە ئەگەر ئەو پارچە گۆشتەش خراپ بوو ئەوا هەموو لەشی خراپ دەبێ ئەویش دڵی مرۆڤە).

## باب الدين النصيحة

١٨. وقول النَّبي (ﷺ): ((الدِّينُ النَّصِيحَةُ لِلَّهِ وَلِرَسُولِهِ وَلِأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ، قالَ اللهُ تَعَالَى: ﴿إِذَا نَصَحُواْ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ ﴾.

### (بەشی/دین ئامۆژگارییە)

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: (دین ئامۆژگارییە بۆ خواو، پێغەمبەرەکەی، و سەرداری ئیمانداران، وە بۆ تەواوی خەڵکی).

خوای گەورە (جل جلاله) دەفەرمووێ﴿إِذَا نَصَحُواْ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ ﴾ (لە کاتێ دڵسۆز بن بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی) تەفسیری ئاسان، ل٢٠١

١٩. عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: بَايَعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) عَلَى إِقَامِ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَالنُّصْحِ لِكُلِّ مُسْلِمٍ.

جەریری کوڕی عەبدوڵلا دەفەرمووێ: پەیمانم دا بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەر کردنی نوێژ و زەکاتدان و ئامۆژگاری کردنم بۆ هەموو موسڵمانێ.

## باب من سُئِلَ علماً وهو مشتغل في حديثه

٢٠. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: بَيْنَمَا النَّبِيُّ (ﷺ) فِي مَجْلِسٍ يُحَدِّثُ الْقَوْمَ جَاءَهُ أَعْرَابِيٌّ فَقَالَ: مَتَى السَّاعَةُ؟ فَمَضَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يُحَدِّثُ، فَقَالَ بَعْضُ الْقَوْمِ: سَمِعَ مَا قَالَ فَكَرِهَ مَا قَالَ وَقَالَ بَعْضُهُمْ: بَلْ لَمْ يَسْمَعْ، حَتَّى إِذَا قَضَى رَسُول اللهُ (ﷺ) حَدِيثَهُ قَالَ: ((أَيْنَ أُرَاهُ السَّائِلُ عَنْ السَّاعَةِ))؟ قَالَ: هَا أَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ (ﷺ): فَإِذَا ضُيِّعَتْ الْأَمَانَةُ فَانْتَظِرْ السَّاعَةَ، قَالَ: كَيْفَ إِضَاعَتُهَا؟ قَالَ عَلَيهِ الصَّلاة والسَّلام: إِذَا وُسِّدَ الْأَمْرُ إِلَى غَيْرِ أَهْلِهِ فَانْتَظِرْ السَّاعَةَ.

## (بەشی/ کەسێ پرسیاری زانستی لێ بکرێ و ئەویش خەریکی ووتەی خۆی بێ)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەناو کۆڕێکا قسەی بۆ هاوەڵان دەکرد، پیاوێکی دەشتەکی هات و گوتی، کەی قیامەت دادێ؟ پێغەمبەریش (ﷺ) لەسەر فەرموودەی خۆی بەردەوام بوو قسەی نەبڕی لەو کاتەدا خەڵکەکە ووتیان پێغەمبەر گوێی لە قسەی کابرا بوو بەڵام بە دڵی نەبوو بۆیە وەڵامی نەدایەوە وە هەندێکیان ووتیا، لەوانەیە گوێی لێ نەبووبێ، هەتا پێغەمبەر (ﷺ) قسەی خۆی تەواو کرد و لە پاشان فەرمووی کوانێ ئەوەی پرسیاری قیامەتی کرد و کابراش ووتیان ئەوە من بووم فەرمووی: هەرکاتێ سپاردە و ئەمانەت بەزایەدرا ئیتر چاوەڕوانی هاتنی قیامەت بکە.

کابرا ووتی ئەی پێغەمبەری خوا چۆن ئەمانە بەزایە دەچێت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: هەر کاتێ کاروباری میللەت و فەرمانڕەوایی موسڵمانان سپێردرا بە کەسانی ناکەسبەچە ئیتر چاوەڕوانی قیامەت بن.

## باب من رفع صوته بالعلم

٢١. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: تَخَلَّفَ عَنَّا النَّبِيُّ فِي سَفْرَةٍ سَافَرْنَاهَا فَأَدْرَكَنَا (ﷺ) وَقَدْ أَرْهَقَتْنَا الصَّلَاةُ وَنَحْنُ نَتَوَضَّأُ، فَجَعَلْنَا نَمْسَحُ عَلَى أَرْجُلِنَا، فَنَادَى بِأَعْلَى صَوْتِهِ: ((وَيْلٌ لِلْأَعْقَابِ مِنْ النَّارِ -مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلَاثًا)).

## (بەشی/ دەنگ بەرزکردنەوە بۆ زانست و زانیاری)

عەبدوڵلای کوڕی عەمر (رضي الله عنه) دەفەرمووێ لە سەفەرێکا بووین لەگەڵ پێغەمبەری خوادا و لێمان دواکەوت و لە پاشان پێ گەیشتینەوە گەرمەی نوێژ بو، ئێمە ش سەرگەرمی دەستنوێژ شۆردن بووین، بەڵام دەستمان بە پێیەکانمان دا دێنا لە دەستنوێژدا، ئەویش کە بەم جۆرەی دیتین بە دەنگی بەرز بانگی کردین و فەرمووی وا لە دەستی ئاگری دۆزەخ بۆ ئەو کەسەی کە بەباشی پاژنەی پێیەکانی ناشۆرێ، دووجار یان سێ جار دووبارەی کردوە.

## باب من جاء في العِلْم

## وَقَوْلِ اللَّهِ تعالى ﴿وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا﴾

٢٢. عَنْ شَرِيكِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي نَمِرٍ أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ يَقُولُ: بَيْنَمَا نَحْنُ جُلُوسٌ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعلى آلِهِ وَسَلَّمَ فِي الْمَسْجِدِ دَخَلَ رَجُلٌ عَلَى جَمَلٍ فَأَنَاخَهُ فِي الْمَسْجِدِ ثُمَّ عَقَلَهُ ثُمَّ قَالَ لَهُمْ: أَيُّكُمْ مُحَمَّدٌ؟ -وَالنَّبِيُّ (ﷺ) مُتَّكِئٌ بَيْنَ ظَهْرَانَيْهِمْ- فَقُلْنَا: هَذَا الرَّجُلُ الْأَبْيَضُ الْمُتَّكِئُ، فَقَالَ لَهُ الرَّجُلُ: يَا ابْنَ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ؟ فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعلى آلِهِ وَسَلَّمَ: ((قَدْ أَجَبْتُكَ))، فَقَالَ الرَّجُلُ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ

وَعلى آلِهِ وَسَلَّمَ: إِنِّي سَائِلُكَ فَمُشَدِّدٌ عَلَيْكَ فِي الْمَسْأَلَةِ، فَلَا تَجِدْ عَلَيَّ فِي نَفْسِكَ، فَقَالَ: ((سَلْ عَمَّا بَدَا لَكَ)) فَقَالَ: أَسْأَلُكَ بِرَبِّكَ وَرَبِّ مَنْ قَبْلَكَ آللهُ أَرْسَلَكَ إِلَى النَّاسِ كُلِّهِمْ؟ فَقَالَ: ((اللَّهُمَّ نَعَمْ))، قَالَ: أَنْشُدُكَ بِاللهِ آللهُ أَمَرَكَ أَنْ نُصَلِّيَ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسَ فِي الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ؟ قَالَ صلى اللهُ عَلَيهِ وَعلى آلهِ وَسلَّم: ((اللَّهُمَّ نَعَمْ))، قَالَ: أَنْشُدُكَ بِاللهِ آللهُ أَمَرَكَ أَنْ نَصُومَ هَذَا الشَّهْرَ مِنْ السَّنَةِ؟ قَالَ عَلَيهِ الصَّلاة والسَّلام: ((اللَّهُمَّ نَعَمْ))، قَالَ: أَنْشُدُكَ بِاللَّهِ آللَّهُ أَمَرَكَ أَنْ تَأْخُذَ هَذِهِ الصَّدَقَةَ مِنْ أَغْنِيَائِنَا فَتَقْسِمَهَا عَلَى فُقَرَائِنَا؟ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((اللَّهُمَّ نَعَمْ))، فَقَالَ الرَّجُلُ: آمَنْتُ بِمَا جِئْتَ بِهِ، وَأَنَا رَسُولُ مَنْ وَرَائِي مِنْ قَوْمِي، وَأَنَا ضِمَامُ بْنُ ثَعْلَبَةَ أَخُو بَنِي سَعْدِ بْنِ بَكْرٍ.

## بەشی دەربارەی عیلم وزانیاریدا

## وە خوای گەورە دەفەرموێ ﴿وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا﴾

شەریکی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی نمر دەگێڕێتەوە کە گوێ لە ئەنەسی کوڕی مالیك(رضي الله عنه) بوو کە دەیفەرموو ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوا بووین (ﷺ) لە مزگەوت دانیشتبووین پیاوێ بە سواری ووشترێك هات و چووە مزگەوت و ووشترەکەی بەستەوە پرسیاری پێغەمبەری کرد و ووتی ئێوە کامتان موحەمەد وە پێغەمبەریش لەناوماندا پاڵ کەوتبوو، ئێمەش ووتمان ئەو پیاوە سپیەی پاڵ کەوتووە موحەمەدە گوتی ئەی کوڕی عەبدولموتەلیب، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی بەڵێ وەڵامت دەدەمەوە، پیاوەکە ووتی من چەند پرسیارێکت لێ دەکەم و پرسیارەکانم توند و رەقن، پێت ناخۆش نەبێ، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی پرسیارەکەت چییە بیکە.

گوتی: تۆ ئەو خوایەی، کە خوای تۆ و ئەوانەی لە پێش تۆ هاتوون ئایا خوا تۆی ناردووە بۆ خەڵکان بەگشیت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەی خوایە بەشاهید بە کە بەڵێ ئەم قسەیە راستە.

لە پاشان ووتی تۆ ئەوو خوایە، خوای گەورە فەرمانی پێ کردوویت بە پێنج نوێژە فەرزەکان لە شەو و رۆژێکدا؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی ئەی خوایە بە راستی بەڵێ، ئینجا گوتی تۆ ئەو خوایەی خوای گەورە فەرمانی پێ کردوویت ئەم مانگی رەمەزانە لە ساڵدا بەرۆژوو ببن؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەی خوایە بەشاهێد بە ئەم قسەیە راستە و بەڵێ.

پیاوەکە گووتی تۆ ئەو خوایە خوای گەورە فەرمانی پێ کردوویت ئەم زەکاتە لە دەوڵەمەندان وەرگری دابەشی بکەی بەسەر هەژاراندا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی خوایە بە شاهیدبە ئەم قسەیە راستە و بە لێ پیاوەکە ووتی من باوەڕم هێناوە بەوەی کە بۆت ناردراوە وە من نوێنەری هۆزەکەم کە لەلای خۆمان چاوەنواڕی من دەکەن تا هەواڵی تۆیان بۆ ببەم وەمن زمماهی کوڕی سەعلەبەم برای بەنی سەعدی کوڕی بەکر.

٢٣. عَنْ عَبْد الله بْنَ عَبَّاس –رَضيَ اللهُ عَنهما– أخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللّه (ﷺ) بَعَثَ بِكِتَابِهِ رَجُلًا وَأَمَرَهُ أَنْ يَدْفَعَهُ إِلَى عَظِيمِ الْبَحْرَيْنِ، فَدَفَعَهُ عَظِيمُ الْبَحْرَيْنِ إِلَى كِسْرَى، فَلَمَّا قَرَأَهُ مَزَّقَهُ، فَحَسِبْتُ أَنَّ ابْنَ الْمُسَيَّبِ قَالَ: فَدَعَا عَلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَنْ يُمَزَّقُوا كُلَّ مُمَزَّقٍ.

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) نامەیەکی بەناوی خۆیەوە نووسی بە پیاوێکا ناردی بۆ سەر گەورەی وولاتی بەحرەین هەتا ئەو بیگەیەنێ بە کیسرای شای ئێرانی، ئەو کاتە، جا کاتێ کیسرا نووسراوەکەی پێغەمبەری دەخوێنێتەوە پارچە پارچەی دەکات و پێغەمبەریش (ﷺ) نزای لێ کردن و کە خوای گەورە پارچە پارچەیان بکات.

## باب العِلْم قَبْل القَوْل والعَمَل

٢٤. قالَ الإمام البُخاري رَضيَ اللهُ عَنْهُ لِقَوْلِ الله تَعَالَى: ﴿ فَٱعْلَمْ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ ﴾ فَبَدَأَ بِالْعِلْمِ، وَأَنَّ الْعُلَمَاءَ هُمْ وَرَثَةُ الْأَنْبِيَاءِ، وَرَّثُوا الْعِلْمَ، مَنْ أَخَذَهُ أَخَذَ بِحَظٍّ وَافِرٍ، وَمَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَطْلُبُ بِهِ عِلْمًا سَهَّلَ اللَّهُ لَهُ طَرِيقًا إِلَى الْجَنَّةِ. وَقَالَ جَلَّ ذِكْرُهُ: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُاْ ﴾، وَقَالَ تَعالى: ﴿وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَٰلِمُونَ ﴾، وَقال:﴿ وَقَالُواْ لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِىٓ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴾ ﴿هَلْ يَسْتَوِى ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ وَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): ((مَنْ يُرِدْ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ وَإِنَّمَا الْعِلْمُ بِالتَّعَلُّمِ)).

## (بەشی/ عیلم و زانست پێش ووته و کردار)

ئیمامی بوخاری (رضي الله عنه) دەفەرمووێ خوای گەورە دەفەرمووێ ﴿ فَٱعْلَمْ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ ﴾ واتە: (بزانن کە خوا خوایە و هاوەڵ و شەریکی نیە لەمەوە بەدەرکەوت کە خوای گەورە عیلم و زانستی بە پێش خستووە وە زانایان میراتگری پێغەمبەرانن، وە میراتی عیلم و زانیاری پێ بەخشراوە، وە کەسێ زانیاری پێ درا ئەوە بە شتێکی زۆری لە خێر و چاکە دەست کەوتووە وەکەسێ رێگا بگرێ بۆ فێربوونی عیلم و زانیاریدا، خوای گەورە رێگای چوونە بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُاْ ﴾ واتەکەی: (بەڕاستی ئەوانەی زانان لە خوا دەترسێن)، وە هەروەها دەفەرمووێ: ﴿وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَٰلِمُونَ ﴾ تەنها ئەوانەی زانایانن ژیر و تێگەیشتوون وە هەروەها دەفەرمووێ:﴿وَقَالُواْ لَوْ كُنَّا

﴿ نَسۡمَعُ أَوۡ نَعۡقِلُ مَا كُنَّا فِيٓ أَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴾ واتە: بێ بڕوایان لە دۆزەخدا دەڵێن ئەگەر گوێ و عەقڵ و ژیریمان هەبا ئێستا لە هاوەڵانی دۆزەخ نابووین، وە هەروەها دەفەرمووێ: ﴿ هَلۡ يَسۡتَوِي ٱلَّذِينَ يَعۡلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَۗ ﴾ واتە: ئایا ئەوانەی زانست و زانیارییان پێ بەخشراوە وەکو ئەوانەن کە نەزان و نەفامن؟ حەتمەن ئەم دەستەواژەیە وانیە.

وە پێغەمبەری خوا دەفەرمووێ (ﷺ) کەسێ خوا ویستی وا بوو خێر و چاکەی پێ ببەخشرێ ئەوا شارەزای دەکات لە دین و عیلم و زانیاریدا، و عیلم و زانستیش بە فێربوون و خۆماندوکردنە.

٢٥. وَقَالَ أَبُو ذَرّ: لَوْ وَضَعْتُمْ الصَّمْصَامَةَ عَلَى هَذِهِ -وَأَشَارَ إِلَى قَفَاهُ- ثُمَّ ظَنَنْتُ أَنِّي أُنفِذُ كَلِمَةً سَمِعْتُهَا مِنْ رَسُول اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَبْلَ أَنْ تُجِيزُوا عَلَيَّ لَأَنْفَذْتُهَا.

ئەبو زەر دەفەرمووێ (رضي الله عنه) ئەگەر شمشێر بخەنە سەر گەردەنم و بیانەوێ لە گەردنم بدەن و وا گومان ببەم کە فەرموودەیەکم لە پێغەمبەرەوە بیستووە و نەم گەیاندووە ئەوا پێش ئەوەی لە گەردەنم بدەن دەیە گەیەنم.

٢٦. وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ تعالى عَنْهُما: كُونُوا رَبَّانِيِّينَ، حُلَمَاءَ، فُقَهَاءَ.

وَيُقَالُ: الرَّبَّانِيُّ الَّذِي يُرَبِّي النَّاسَ بِصِغَارِ الْعِلْمِ قَبْلَ كِبَارِهِ.

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (رضي الله عنه) دەفەرمووێ وەکو پەروەردەکاران بە نەرم و نیانی و تێگەیشتووی خەڵك پەروەردە بکەن. وە پەروەردەکاری بەو کەسانە دەگوترێت کە فێری زانیاری بچوك دەکەن پێش شتی گەورە.

## باب يتعهد (ﷺ) أصْحابَهُ بِالمَوْعِظة والعِلم كَي لاينفروا

٢٧. عَنْ عَبد الله بْنِ مَسْعُودٍ رَضيَ اللهُ عَنْهُ قَال: كَانَ رَسُول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ يَتَخَوَّلُنَا بِالْمَوْعِظَةِ فِي الْأَيَّامِ كَرَاهَةَ السَّآمَةِ عَلَيْنَا.

## (بەشی/ پێغەمبەری خوا خەڵكی وا رادەهێنا بۆ ئامۆژگاری كردن ناوە بەناو تاكو نەفرە و بێزار نەبن)

عەبدوڵلای كوری مەسعود (رضي الله عنه) دەفەرمووێ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناو بەناو ئامۆژگاری دەكردین نەبادا جارس و وەرەزبین.

٢٨. قالَ أمير المُؤمنِين عُمَر بن الخَطَّاب رَضيَ اللهُ عَنْهُ: تَفَقَّهُوا قَبْلَ أنْ تُسَوَّدُوا.

ئەمیری ئیمانداران عومەری خەتتاب (رضي الله عنه) دەفەرمووێ (عیلم و زانیاری فێر ببن پێش ئەوەی ببن بە سەرداری خەڵكان و گەورە ببن، بەهۆی خۆبەزل زانینەوە نەتوانن فێری ببن.

## باب فَضل من عَلِمَ وعَلَّمَ

٢٩. عَنْ أَبِي مُوسَى عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ تَعالى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَال: ((مَثَلُ مَا بَعَثَنِي اللَّهُ بِهِ مِنْ الْهُدَى وَالْعِلْمِ كَمَثَلِ الْغَيْثِ الْكَثِيرِ، أَصَابَ أَرْضًا فَكَانَ مِنْهَا نَقِيَّةٌ قَبِلَتْ الْمَاءَ فَأَنْبَتَتْ الْكَلَأَ وَالْعُشْبَ الْكَثِيرَ، وكَانَتْ مِنْهَا أَجَادِبُ أَمْسَكَتْ الْمَاءَ فَنَفَعَ اللَّهُ بِهَا النَّاسَ فَشَرِبُوا وَسَقَوْا وَزَرَعُوا، وَأَصَابَتْ مِنْهَا طَائِفَةً أُخْرَى إِنَّمَا هِيَ قِيعَانٌ لَا تُمْسِكُ مَاءً وَلَا تُنْبِتُ كَلَأً فَذَلِكَ مَثَلُ مَنْ فَقُهَ فِي دِينِ اللَّهِ،

وَنَفَعَهُ مَا بَعَثَنِي اللَّهُ بِهِ فَعَلِمَ وَعَلَّمَ وَمَثَلُ مَنْ لَمْ يَرْفَعْ بِذَلِكَ رَأْسًا، وَمَن لَمْ يَقْبَلْ هُدَى اللَّهِ الَّذِي أُرْسِلْتُ بِهِ)).

## (بەشی فەزڵی کەسێ فێری زانیاری ببێ و خەڵکیش فێر بکات)

ئەبو موسا (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی نموونەی ئەوەی کە عیلم و هیدایەت و رێ نیشاندەری کە خوا بە منی ناردووە بۆ هیدایەتی خەڵکی وەکو بارانێکی زۆری بەفەڕ وایە کە بباریێ لە خاکێ، بەشێکی خاکێکی پاك و بەپێز بێت و بارانەکە بگرێتە خۆی و لەوەڕگایەکی زۆری پێ سەوز بێ، وە بەشێکی تری زەوییەکی رەقە، وەگلی بداتەوە و بەشێکی ببێ بە گۆم و کانیا و مەرمووم بۆ خۆیان سودی لێ وەرگرن، بەم رەنگە هەم خۆیان لێی بخۆنەوە و ئاژەڵیش سوودی لێ ببینێت، وە بەشێکی تریش دەشتانی و شۆڕەکات بێ و نە ئاو گلّ بداتەوە و نە لەوەڕیش برووێنێ، جا ئەم خاك و بارانە نمونە و وێنەیە بۆ ئەو کەسە خودا پێداوانە کە لە ئاینی خودا شارەزا دەبن و خەڵکیش فێری شارەزا بوون دەکەن و هەروەك نمونە و وێنەشن بۆ ئەو کەسانەی کە سەریان پێ بەرزنابێ و ئەو هیدایەت و دینە راستەی کە خودا پێ ناردون ئەوان نایانەوێ و وەری ناگرن.

## باب رفْع العِلم وظُهُور الجهْل

٣٠. عَنْ أنس بن مالِك رَضيَ اللهُ عَنْهُ قال: قال رسول الله (ﷺ): ((إِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ يُرْفَعَ الْعِلْمُ وَيَثْبُتَ الْجَهْلُ، وَتُشْرَبَ الْخَمْرُ وَيَظْهَرَ الزِّنَى، وَ تَكثُرَ النِّساء وَيَقِلَّ الرِّجَالُ حَتَّى يَكُونَ لِخَمْسِينَ امْرَأَةً القَيِّمُ الوَاحِدُ)).

## (بەشی/ بەرزبوونەوە و نەمانی عیلم و زانیاری و پەیدابوونی نەزانی و بێ ئاگایی)

ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لە نیشانەکانی ڕۆژی دواییەکە عیلم و زانیاری نامێنێ و نەزانی باڵ بە سەر خەڵکی دادەکێشێ و مەی خواردنەوە پەیدا دەبێ و زینا و داوێن پیسی بە ئاشکرا دەکرێ و ئافرەتان زۆر دەبن پیاوانیش (بەهۆی شەڕ و کوشتارەوە) کەم دەبنەوە و تا وای لێ دێت بە پەنجا ئافرەت یەك سەرداریان دەبێت.

## باب من أعاد الحديث ثلاثاً

٣١. عَنْ أَنَس بن مالك رَضيَ اللهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ كَانَ إِذَا تَكَلَّمَ بِكَلِمَةٍ أَعَادَهَا ثَلَاثًا حَتَّى تُفْهَمَ عَنْهُ، وَإِذَا أَتَى عَلَى قَوْمٍ فَسَلَّمَ عَلَيْهِم ُ{سَلَّمَ} ثَلَاثًا.

## (بەشی/ کەسێ قسەی بکات و سێ جار دووبارەی بکاتەوە)

لە ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە کە ئەگەر قسەی بکردبایە سێ جار دووبارەی دەکردەوە تاکو لێ تێ بگەن وە ئەگەر بەلای هۆزێکا تێپەری بکردبا سێ جار سەلاوی لێ دەکردن.

## باب من أجاب الفتيا

٣٢. عَنْ أَسْمَاءَ بنت أبي بكر رَضيَ اللهُ عَنْها قَالَتْ: أَتَيْتُ عَائِشَةَ رضيَ اللهُ عنها وَهِيَ تُصَلِّي فَإِذا النّاس قِيامٌ، فَقُلْتُ مَا شَأْنُ النَّاسِ؟ فَأَشَارَتْ إِلَى السَّمَاءِ فَقَالَتْ: سُبْحَانَ اللَّه، قُلْتُ: آيَةٌ فَأَشَارَتْ بِرَأْسِهَا أَيْ نَعَمْ فَقُمْتُ حَتَّى علاني الْغَشْيُ فَجَعَلْتُ أَصُبُّ عَلَى رَأْسِي الْمَاءَ فَحَمِدَ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآله وَسَلَّمَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ ثُمَّ قَالَ مَا مِنْ شَيْءٍ لَمْ أَكُنْ أُرِيتُهُ إِلَّا رَأَيْتُهُ فِي مَقَامِي حَتَّى الْجَنَّةُ وَالنَّارُ، فَأُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّكُمْ تُفْتَنُونَ فِي قُبُورِكُمْ مِثْلَ – أَوْ قَرِيبًا، لَا أَدْرِي أَيَّ ذَلِكَ قَالَتْ أَسْمَاءُ – مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، يُقَالُ: مَا عِلْمُكَ بِهَذَا الرَّجُلِ؟ فَأَمَّا الْمُؤْمِنُ – أَوْ الْمُوقِنُ، لَا أَدْرِي بِأَيِّهِمَا قَالَتْ أَسْمَاءُ – فَيَقُولُ: هُوَ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ، جَاءَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَى، فَأَجَبْنَا وَاتَّبَعْنَا، هُوَ مُحَمَّدٌ ثَلَاثًا، فَيُقَالُ: نَمْ صَالِحًا، قَدْ عَلِمْنَا إِنْ كُنْتَ لَمُوقِنًا بِهِ، وَأَمَّا الْمُنَافِقُ – أَوْ الْمُرْتَابُ، لَا أَدْرِي أَيَّ ذَلِكَ قَالَتْ أَسْمَاءُ – فَيَقُولُ: لَا أَدْرِي، سَمِعْتُ النَّاسَ يَقُولُونَ شَيْئًا فَقُلْتُهُ.

### (بەشی/ کەسێ وەڵامی پرسیاری شەرعی خەڵکی بداتەوە)

ئەسمای کچی ئەبو بەکر (رضي الله عنه) فەرمووی چووم بۆ لای عائیشەی خوشکم نوێژی دەکرد منیش گوتم ئەم خەڵکە چیانە بۆچی شلەژاون (نوێژی خۆرگیران بوو) عائیشەش ئاماژەی کرد بۆ ئاسمان کە خۆرگیراوەکانیش سەیرم کرد کەوا خەڵکەکە لە پشت پێغەمبەرەوە نوێژیان دەکرد، عائیشە (رضي الله عنهما) گوتی (سبحان الله) منیش ووتم ئەم خۆرگیرانە ئایەت و نیشانەیە بۆ بەندەکان هەتا ووریا ببنەوە پێی، ئەویش بەسەری ئاماژەی کرد کە بەڵێ، ئیتر منیش لەگەڵیا نوێژم کرد و نوێژەکەی پێغەمبەر درێژەی کێشا رۆژەکەش گەرم بوو منیش بورامەوەو لە هۆش خۆم چووم ئینجا دوای

هەندێك ئاوم هێنا و پەرژاندم بەسەر دەم و چاوم لە پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتارێکی داو لە سەرەتاوە، سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کرد فەرمووی ئەو شتەی کە نەم دیبو لەم شوێنەدا بینیم هەتا بەهەشت و دۆزەخیش وە وەحیم بۆ هات کە ئێوە لە گۆڕەکانتان تاقی دەکرێنەوە و وەکو ئەو تاقیکردنەوەی هاتنی (دەجال جا راوییەکە دەفەرمووێ نازانم ئەسما دەفەرمووێ وەکو ئەو تاقیکردنەوە و یان نزیکی ئەو) ئینجا فەرمووی (ﷺ) لە گۆڕدا پرسیار دەکرێ ئێوە چ دەربارەی ئەو پیاوە دەزانن ئەوجا ئەگەر ئیماندار بێ یان بڕواداری متمانە پێ کراو بێ دەڵێ ئەمە موحەممەدە پێغەمبەری خوایە و بەڵگەی ئاشکرا و هیدایەتی بۆ هێناوین و وەڵاممان دایەوە و شوێنکەوتەی بووین، و ئەوە موحەمەدە سێ جار ئەم ووتەیە دووبارە دەکەمەوە ئینجا پێی دەڵێن بخەوە لە گۆڕەکەت بە خۆشی و ئێمە دەمانزانی کە تۆ بڕواداری متمانە پێ کراو بوویت بەڵام پیاوی (مونافیق و گوماندار) ئەمە گومانی راویەکە کە ئەویش لێی دەپرسن نازانێ وەڵام بداتەوە و دەڵێن ئەوەی خەڵك دەیڵێت منیش وا دەڵێم (کەواتە لەمەوە بۆمان بەڵگە دەسەلمێت کە پرسیاری گۆڕ راست و حەقە نابێت کەس نکوڵی لێ بکات).

## باب تحريض النبي عليه الصلاة والسلام وفد عبد القيس على أن يحفظوا الإيمان والعلم، ويخبروا من وراءهُمْ

٣٢. قالَ مالك بن الحويرث: قالَ لَنا النَّبي صلى الله عليه وآله وسلم: ارجعُوا إلى أهْلِيكُم فعَلِّمُوهُم.

وَقَد أتى وَفدُ عَبدِ القَيسِ إلى رسول الله (ﷺ) فقَالَ: (مَرْحَبًا بِالْقَوْمِ – أَوْ بِالْوَفْدِ – غَيْرَ خَزَايَا وَلَا نَدَامَى)، قَالُوا إِنَّا نَأْتِيكَ مِنْ شُقَّةٍ بَعِيدَةٍ، بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ هَذَا الْحَيُّ مِنْ كُفَّارِ مُضَرَ وَلَا نَسْتَطِيعُ أَنْ نَأْتِيَكَ الآن إِلَّا فِي شَهْرٍ حَرَامٍ، فَمُرْ بِأَمْرٍ نُخْبِرُ بِهِ مَنْ وَرَاءَنَا نَدْخُلُ بِهِ الْجَنَّةَ، فَأَمَرَهُمْ بِأَرْبَعٍ وَنَهَاهُمْ عَنْ أَرْبَعٍ: أَمَرَهُمْ بِالْإِيمَانِ بِاللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ وَحْدَهُ، قَالَ: ((هَلْ تَدْرُونَ مَا الْإِيمَانُ بِاللَّهِ وَحْدَهُ))؟ قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: شَهَادَةُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَإِقَامُ الصَّلَاةِ وَإِيتَاءُ الزَّكَاةِ، وَصَوْمُ رَمَضَانَ، وَتُعْطُوا الْخُمُسَ مِنْ الْمَغْنَمِ. وَنَهَاهُمْ عَنْ الدُّبَّاءِ وَالْحَنْتَمِ وَالْمُزَفَّتِ).

قَالَ شُعْبَةُ: رُبَّمَا قَالَ النَّقِيرِ وَرُبَّمَا قَالَ الْمُقَيَّرِ.

قَالَ: احْفَظُوهُ وَأَخْبِرُوهُ مَنْ وَرَاءَكُمْ.

## (بەشی/هاندانی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ نوێنەری هۆزی عەبدولقەیس، لەسەر ئەوەی پارێزگاری عیلم و بڕوا بکەن و بگەیەنن بۆ ئەوانەی دوای خۆیان)

مالیکی کوڕی حوەیرس (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموین بڕۆنەوە ناو خزم و دۆستتان ئەوەی لێرە فێری بوون فێری ئەوانیش بکەن.

وە نوێنەری عەبدولقەیس هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموون بەخێر بێن ئەی خزمان، ئێوە کارێکی واتا نەکردوە کە تەریق ببنەوە یان شەرمەزار بن، ئەوانیش وتیان ئێمە لە رێگایەکی ناخۆش و دوورەوە دێن و لە نێوانی ئێمە و تۆدا بەنێو هۆزی کافرەکانی موزەڕدا دێین ئەگەر لە مانگەکانی حەرام نەبێت ناتوانین بێین بۆ لات، وە فەرمانێکمان پێ بکە کە بگەیەنین بەوانەی لە دوای ئێمەوە دێن و پێی بچینە بەهەشت، ئەویش فەرمانی پێ کردن لە چوار شت و قەدەغەی لێ کردین لە چوارشت، فەرمانی پێ کردین بە باوەڕهێنان بەخوای تاق و تەنیا وە فەرمووی (ﷺ) ئایا دەزانن بڕواهێنان بە خودا چییە و چۆنە ئەوانیش گوتیان خواو پێغەمبەرەکەی دەزانن.

فەرمووی: (شایەتی بدەن کە خوایەکە و تاق و تەنیا و موحەمەدیش فروستادەی خوایە بۆ خەڵکی، وە نوێژکردن و زەکات دان وە بەرۆژوو بوونی مانگی رەمەزان و فەرمانی پێ کردین لە دەستکەوتی تالانی جەنگ پێنج یەك بدەن وە قەدەغەی لێ کردوین لە چوار شت بەکاری نەهێنین بۆ دروستکردنی خۆشا و سرکە و دۆشا و چونکە شتی ناویان زۆر زوو دەترشێ و دەبێ بە ئارەق وەکو کۆپەڵە و کووڵەکە و بە شێوەی زفت درا و کۆتکەی بنکی دارخورما.

وە فەرموویشی/ ئەم فەرمایشتە کە لەمنتان وەرگرتووە بیگەیننە بەوانەی لە پاش ئێوەش دێن.

## باب إثم من كذَبَ على النبي(ﷺ)

٣٤. عَنْ سَلَمَةَ بن الأكوع رَضيَ اللهُ عَنْهُ قَال: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلهِ وَسَلَّمَ يَقُول: ((مَنْ يَقُلْ عَلَيَّ مَا لَمْ أَقُلْ فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنْ النَّارِ)).

### (بەشی/تاوانی کەسێ
### بە دەم پێغەمبەرەوە درۆ هەڵبەستێ)

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع (رضي الله عنه) دەفەرمووێ گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەیفەرموو: (کەسێ ووتەیی بەدەم منەوە هەڵبەستێ کە نەم ووتبێ با شوێنی خۆی دیاری بکات لە دۆزەخدا).

٣٥. عَنْ علي بن أبي طالب رَضيَ اللهُ عَنْهُ قَال: قالَ رَسُول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وآلهِ وسَلَّمَ: ((لَا تَكْذِبُوا عَلَيَّ فَإِنَّهُ مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ فَلْيَلِجْ النَّارَ)).

عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێ: (درۆ بە زارم هەڵنەبەستن، چونکە کەسێ درۆی بەزارم هەڵبەستێ با بچێتە ناو ئاگری دۆزەخ).

## باب من خصّ بالعِلم قوماً دون قومٍ كراهية ان لايفهموا

٣٦. قَالَ عَلِيٌّ كرم الله وجهه: حَدِّثُوا النَّاسَ بِمَا يَعْرِفُونَ، أَتُحِبُّونَ أَنْ يُكَذَّبَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ؟

## (بەشی/ کەسێ جۆرە زانستێك تایبەت بكات بە كۆمەڵێ و جگە لەخەڵكی تر نەبادا لێی تێ نەگەن)

عەلی (رضي الله عنه) دەفەرمووێ(ئەوەند قسە لەگەڵ خەڵكی بكە بەقەد لێزانی و تێگەیشتووی خەڵكی، ئایا پێیان خۆشە خوا و پێغەمبەرەكەی بە درۆ بخەنەوە).

## باب الحياء في تعلم العِلم وتَعليمِه

٣٧. قَالَ مُجَاهِد بن جبير التابعي رَضيَ اللهُ عَنهُ: لَا يَتَعَلَّمُ الْعِلْمَ مُسْتَحْيٍ وَلَا مُسْتَكْبِرٌ.

وَقَالَتْ عَائِشَةُ رضيَ اللهُ تَعالى عنها: نِعْمَ النِّسَاءُ نِسَاءُ الْأَنْصَارِ لَمْ يَمْنَعْهُنَّ الْحَيَاءُ أَنْ يَتَفَقَّهْنَ فِي الدِّينِ.

## (بەشی/ شەرم كردن لە فێربوونی عیلم و زانیاریدا)

موجاهیدی كوڕی جوبەیری تابیعی (رضي الله عنه) دەفەرموێ ئەو كەسەی شەرمن و لووت بەرز بێت، فێری عیلم و زانیاری نابێت.

وە عائیشە خان (رضي الله عنها) دەفەرموێ: (چاكترین ئافرەتانی ئەنصارییەكانە شەرم قەدەغەی نەكردن لە فێربوونی ئاینیدا).

٣٨. عنْ أُمِّ سَلَمَةَ قالَتْ: جَاءَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآله وسَلَّمَ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ اللَّهَ لَا يَسْتَحِي مِنْ الْحَقِّ، فَهَلْ عَلَى الْمَرْأَةِ غُسْلٌ إِذَا احْتَلَمَتْ؟ فَقَالَ النَّبِي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآله وسَلَّمَ: ((إِذَا رَأَتِ الْمَاءَ، فَغَطَّت أُم سلمة —يعني وجهها)) — وقالَت: يا رسول الله، وَتَحْتَلِمُ المرأة؟ قال: ((نَعَمْ تَرِبَتْ يَمِينُكِ، فِيمَ يَشْبِهُهَا)).

ئوم سەلەمە دەفەرموێ: (ئوم سولەیم هاتە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) پرسیاری کرد و ووتی ئەی پێغەمبەری خوا، خوای گەورە شەرم لە حەق ناکات ئایا ئافرەت غوسل و خۆشۆردنی لەسەرە ئەگەر شەیتانی بوون؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ئەگەر ئاوی دیت ئینجا، ئوم سەلەمە دەم و چاوی خۆی داپۆشی لە شەرمی ئەم ووتەیەدا. وە فەرموی ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ئافرەت شەیتانی دەبێت؟!

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی بەڵێ دەستت لە خۆڵ دابێ ئەی چۆن منداڵ شێوەی دایکی لێ دەرچێ.

## باب لاتقبل الصلاة بغير طهور

٣٩. عَنْ أَبي هُرَيرَةَ رَضيَ اللهُ عَنْهُ قَال: قالَ رَسُولُ اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَآله وسَلّمَ: ((لَا تُقْبَلُ صَلَاةُ مَنْ أَحْدَثَ حَتَّى يَتَوَضَّأَ)) فقَالَ رَجُلٌ مِنْ حَضْرَمَوْتَ: مَا الْحَدَثُ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ؟ قَالَ فُسَاءٌ أَوْ ضُرَاطٌ.

## (بەشی/نوێژ دروست نییە بێ دەستنوێژ گرتن)

ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (کەسێ دەستنوێژی نەبوو نوێژی دروست نییە تا دەستنوێژ تازە دەکاتەوە، ئینجا پیاوێ لە حەزرەمەوتەوە وتی بێ دەستنوێژی چییە ئەی ئەبو هورەیرە، ئەویش ووتی بای بەدەنگ و بێ دەنگ).

## باب فضل الوضوء، والغرَّ المُحَجَلُونَ من آثار الوضوء

٤٠. عَنْ نُعَيْمٍ الْمُجْمِرِ قَالَ: رَقِيتُ مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله تعالى عنه عَلَى ظَهْرِ الْمَسْجِدِ فَتَوَضَّأَ فَقَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: ((إِنَّ أُمَّتِي يُدْعَوْنَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ غُرًّا مُحَجَّلِينَ مِنْ آثَارِ الْوُضُوءِ، فَمَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ يُطِيلَ غُرَّتَهُ فَلْيَفْعَلْ)).

## (بەشی فەزڵی دستنویژ و سپی بوونی دەم چاو لە شوێنەواری دەستنویژ)

نوعەیمی کوڕی موجمر دەفەرمووێ لەگەڵ ئەبو هورەیرە لە سەربانی مزگەوت نووستین ئینجا ئەو هەڵسا و دەستنوێژی شۆرد و فەرمووی گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) فەرمووی: (بەراستی ئۆممەتی من بانگ دەکرێن لە ڕۆژی قیامەت چوار پەل و دەم و چاویان سپی و گەشەدارە بەهۆی شوێنەواری دەستنوێژەوە وە کەسێ پێی خۆشە دەم و چاو و چوار پەلی سپی بێت لە ڕۆژی قیامەت با زۆر دەستنوێژ بشوات).

## باب لايتوضأ من الشك حتى يستقين

٤١. عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ عَنْ عَمِّهِ عبدالله بن زيد أَنَّهُ شَكَى إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وآله وسَلَّمَ الرَّجُلُ الَّذِي يُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهُ يَجِدُ الشَّيْءَ فِي الصَّلَاةِ، فَقَالَ (ﷺ): ((لَا يَنْفَتِلْ - أَوْ لَا يَنْصَرِفُ - حَتَّى يَسْمَعَ صَوْتًا أَوْ يَجِدَ رِيحًا)).

## (بەشی/ ئەو كەسەی دەستنوێژی نەشكاوە كە گومانی كرد تاكو باش بۆی ڕۆن نەبێتەوە)

عوبادەی كوڕی تەمیم لە مامی عەبدوڵلای كوڕی زەید كە باسی پیاوێكی كرد لای پێغەمبەری خوا كە گومانی وایە كە دەستنوێژی شكا لەناو نوێژا ئایا ئەگەر وا ڕووی دا چی بكات نوێژەكە بەتاڵ بكات یان بەردەوام بێت، پێغەمبەری خواش (ﷺ) : (فەرمووی با نوێژەكەی بەتاڵ نەكات تاكو گوێی لە دەنگ دەبێ یان بۆنی دێت).

## باب لايستقبل القبلة ببولٍ ولا غائطٍ إلا عند البناء، جدار أو نحوه

٤٢. عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِذَا أَتَى أَحَدُكُمْ الْغَائِطَ فَلَا يَسْتَقْبِلِ الْقِبْلَةَ وَلَا يُوَلِّهَا ظَهْرَهُ، شَرِّقُوا أَوْ غَرِّبُوا)).

## (بەشی/ نابێت لە كاتی تارەت كردندا بەرامبەر ڕووگە بێت تەنها ئەگەر لەناو چوار دیواردا بێت)

ئەبی ئەیوبی ئەنصاری (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (ئەگەر كەسێ چوو بۆ تارەت كردن نە ڕوو لە قیبلە بێت و نە پشتی تێ بكات بەڵكو بەلای ڕۆژهەڵات یان ڕۆژ ئاوا بێ).

## باب النهي عن الإستنجاء باليَمين

٤٣. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ قَتَادَةَ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ: (ﷺ) ((إِذَا شَرِبَ أَحَدُكُمْ فَلَا يَتَنَفَّسْ فِي الْإِنَاءِ، وَإِذَا أَتَى الْخَلَاءَ فَلَا يَمَسَّ ذَكَرَهُ بِيَمِينِهِ)).

## بەشی نەهی کردن لەتارەت کردن بەدەستی راستە

عەبدوڵڵای کوڕی قەتادە لە باوکی دەگێڕێتەوە کە دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێ: (کەسێ کە ئاوی خوارد با هەناسەی تیدا نەخواتەوە، وە ئەگەر چوو بۆ ئاودەست با بەدەستی راستی چۆکی خۆی نەگرێت).

## باب الوُضوء ثلاثاً ثلاثاً

٤٤. عَن عَطَاءَ بْنَ يَزِيدَ أَخْبَرَهُ أَنَّ حُمْرَانَ مَوْلَى عُثْمَانَ بن عفان رَضيَ اللهُ تَعالى عَنْهُ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ رَأَى عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ دَعَا بِإِنَاءٍ فَأَفْرَغَ عَلَى كَفَّيْهِ ثَلَاثَ مِرَارٍ فَغَسَلَهُمَا ثُمَّ أَدْخَلَ يَمِينَهُ فِي الْإِنَاءِ فَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ ثَلَاثًا، وَيَدَيْهِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ ثَلَاثَ مِرَارٍ، ثُمَّ مَسَحَ بِرَأْسِهِ ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ ثَلَاثَ مِرَارٍ إِلَى الْكَعْبَيْنِ، ثُمَّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَنْ تَوَضَّأَ نَحْوَ وُضُوئِي هَذَا ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ لَا يُحَدِّثُ فِيهِمَا نَفْسَهُ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ)).

## (بەشی دەستنوێژ شۆردن سێ جار سێ جار)

لە عەتای کوڕی یەزید دەگێڕنەوە کە حیمرانی نۆکەری عوسمانی کوڕی عەففان (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە عوسمان (رضي الله عنه) داوای ئاوی دەستنوێژی کردوە لەسەر ئەم شێوەیە دەستنوێژی شۆرد، لە پێشا ئاوی کرد بە هەردوو دەستی خۆیدا، لە پاشان هەردوو دەستی تا هەردوو مەچەکی سێ جار شۆرد، ئینجا دەستی راستی کرد بە ناو دەفرەکەدا و سێ جار ئاوی لە دەم و لووتی رادا، ئینجا سێ جار بەو چەشنە دەستی راستی تا ئانیشکی شۆرد، ئینجا بەو چەشنە دەستی چەپی سێ جار شۆرد، ئینجا

دەستی تەڕ کرد و بەسەر سەریدا هێنا (مەسح) ئینجا قاچی ڕاستی تاکو قوڵەپی (گۆزینگ) سێ جار شۆرد و بە هەمان شێوەش قاچی چەپی لە پاشان عوسمان فەرمووی: پێغەمبەر (ﷺ) هەرکەسێ دەستنوێژ بگرێ لەم چەشنە و ئینجا هەڵسێ دوو ڕەکات نوێژی بکات دوور لە خەیاڵی دنیادا ئەوا خوای گەورە لە گوناهەکانی لەوە وپێشی خۆش دەبێ.

## باب الإستنثار في الوُضوء

٤٥. عَن أبي هُرَيْرَةَ رَضيَ اللهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَال: ((مَنْ تَوَضَّأَ فَلْيَسْتَنْثِرْ، وَمَنْ اسْتَجْمَرَ فَلْيُوتِرْ)).

## (بەشی/ ئاو بەلوت پرژاندن لە دەستنوێژدا)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (کەسێ دەستنوێژی گرت با ئاو لە لوتی رابدا و وە کەسێ تارەتی کرد و ئاوی دەست نەکەوت با بە چەند بەردێکی تاك خۆی پاك بکاتەوە).

## باب التَيَمن في الوُضوء والغسل

٤٦. عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ قَالَتْ: قَالَ رَسُول الله (ﷺ) لَهُنَّ فِي غَسْلِ ابْنَتِهِ: ((ابْدَأْنَ بِمَيَامِنِهَا وَمَوَاضِعِ الْوُضُوءِ مِنْهَا)).

## (بەشی/ بەلای ڕاست دەست پێکردن لە دەستنوێژ و غوسلدا)

ئوم عەتیە دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە کاتی شۆردنی تەرمی زەینەبی کچی دا، پێی فەرموو لەلای ڕاستەوە دەست بکەن بە شۆردنی وە لە ئەندامەکانی دەست نوێژ دەستی پێ بکەن.

## باب شرب الكَلْب مِن الإناء

٤٧. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَال: إِنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَال: ((إِذَا شَرِبَ الْكَلْبُ فِي إِنَاءِ أَحَدِكُمْ فَلْيَغْسِلْهُ سَبْعًا)).

## (بەشی /خواردنەوەی سەگ لە قاپ و ئامان)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر سەگ دەمی لەقاپ و قاچاغی ئێوە ناو شتی تیا خواردەوە ئەوە قاپەکە بشۆن حەوت جار) (شەش جار بە ئاو جارێك بە خۆڵ) بۆ ئەوەی ئاوە گڵ بکرێت).

## باب فضل الإقامة بالمسجد

٤٨. وَعَنْهُ أيضاً رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَال: قالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وآلِهِ وَسَلَّمَ: ((لَا يَزَالُ الْعَبْدُ فِي صلَاةٍ مَا كَانَ فِي الْمَسْجِدِ يَنْتَظِرُ الصَّلَاةَ، مَا لَمْ يُحْدِثْ)).

## (بەشی /فەزلی مانەوە لەناو مزگەوتدا)

ئەبو هورەیرە دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (بەندە هەتا چاوەڕوانی نوێژ بکات بەنوێژ بۆی حیسابە بەمەرجێ دەستنوێژی نەشکێ).

## باب الوُضوء من الإناء

٤٩. عَنْ أَنَسِ بن مالك رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) دَعَا بِإِنَاءٍ مِنْ مَاءٍ فَأُتِيَ بِقَدَحٍ رَحْرَاحٍ فِيهِ شَيْءٌ مِنْ مَاءٍ، فَوَضَعَ أَصَابِعَهُ فِيهِ. قَالَ أَنَسٌ: فَجَعَلْتُ أَنْظُرُ إِلَى الْمَاءِ يَنْبُعُ مِنْ بَيْنِ أَصَابِعِهِ (ﷺ). قَالَ أَنَسٌ فَحَزَرْتُ مَنْ تَوَضَّأَ مَا بَيْنَ السَّبْعِينَ إِلَى الثَّمَانِينَ.

## (بەشی/ دەستنوێژ شۆردن لەناو قاپی ئاودا)

ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوای قاپێك ئاوی کرد، ئینجا بۆیان هێنا و ئینجا پەنجەکانی خستە ناو قاپەکە، ئەنەس دەفەرموێ: منیش تەماشای ئاوم دەکرد لەنێوان پەنجەکانی پیرۆزیدا وەکو کانی هەڵدەقولا و، ئەنەس دەفەرموێ ژمارەی ئەو کەسانەی کە دەستنوێژییان شۆرد لە نێوان حەفتا تاکو هەشتا کەس دەبوون.

## باب الإستجمار وتراً

٥٠. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللّهِ (ﷺ) قَالَ: ((إِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ فَلْيَجْعَلْ فِي أَنْفِهِ ثُمَّ لِيَنْثُرْ، وَمَنْ اسْتَجْمَرَ فَلْيُوتِرْ، وَإِذَا اسْتَيْقَظَ أَحَدُكُمْ مِنْ نَوْمِهِ فَلْيَغْسِلْ يَدَهُ قَبْلَ أَنْ يُدْخِلَهَا فِي وَضُوئِهِ، فَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَا يَدْرِي أَيْنَ بَاتَتْ يَدُهُ)).

## (بەش/ تارەت کردن بە بەردی تاك)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (کەسێ دەستنوێژی شۆرد با ئاوی لە لوتی و دەمی رابدا و لوتی بجولێ لەگەڵ ئاوەکەدا، وە کەسێ تارەتی کرد بە بەرد با بەبەردی تاکەوە تارەتی بکات، وە کە لەخەو هەڵسا با پێش ئەوەی دەستی لەناو قاپی دەستنوێژ دا بنێ با لە دەرەوەی قاپەکە دەستی بشوات، چونکە نازانی ئەم شەوە دەستی چی پیاکەوتووە).

## باب الوضوء من النوم

٥١. عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((إِذَا نَعَسَ أَحَدُكُمْ وَهُوَ يُصَلِّي فَلْيَرْقُدْ حَتَّى يَذْهَبَ عَنْهُ النَّوْمُ فَإِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا صَلَّى وَهُوَ نَاعِسٌ لَا يَدْرِي لَعَلَّهُ يَسْتَغْفِرُ فَيَسُبُّ نَفْسَهُ)).

## (بەشی/ دەستنوێژ شۆردن لە دوای لەخەو هەڵسان)

لە عائیشەوە (رضي الله عنها) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی کەسێ خەو زۆری بۆ هێنا و خەریکی نوێژ بوو با بنوێ هەتا خەوەکەی لەسەر دەڕەوێتەوە دوایی با نوێژەکە بکات {ئەگەر نوێژەکە بەسەر نەچێت} چونکە نازانێ کابرای خەواڵوو چ دەڵێ لەناو نوێژا لەبەر زۆری خەوەکە لەوانەیە لە بری دوعاکردن جوێن بە خۆی بدات.

## باب الكبائر أن لايستتر المرء من بَولِه

٥٢. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما أَنَّهُ قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ بِحَائِطٍ مِنْ حِيطَانِ الْمَدِينَةِ أَوْ مَكَّةَ فَسَمِعَ صَوْتَ إِنْسَانَيْنِ يُعَذَّبَانِ فِي قُبُورِهِمَا، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): ((يُعَذَّبَانِ، وَمَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ)) ثُمَّ قَالَ: ((بَلَى، كَانَ أَحَدُهُمَا لَا يَسْتَتِرُ مِنْ بَوْلِهِ، وَكَانَ الْآخَرُ يَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ، ثُمَّ دَعَا بِجَرِيدَةٍ فَكَسَرَهَا كِسْرَتَيْنِ فَوَضَعَ عَلَى كُلِّ قَبْرٍ مِنْهُمَا كِسْرَةً))، فَقِيلَ لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لِمَ فَعَلْتَ هَذَا؟ قَالَ (ﷺ): ((لَعَلَّهُ أَنْ يُخَفَّفَ عَنْهُمَا مَا لَمْ تَيْبَسَا)).

## (بەشی/ لە گوناهە گەورەکانە
## کەسێ خۆی دانەپۆشی لە کاتی میزکردندا)

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەلای باخێکدا رەت بوو لە باخەکانی مەدینەدا یان مەککەدا لەو کاتەدا گوێی لە دەنگی دوو مرۆڤ بوو لە ناو گۆڕدا ئازار دەدران، فەرمووی ئەوانە ئازار دەدرێن فەرمووی: ئەوانە ئازار دەدرێن لەسەر شتێ ئازار دەدرێن کە خۆیان بە گەورەیەیان دانەناوە و بە بچوکییان سەیر کردوە بەڵام لەلای خوا گەورەن، یەکێکیان لە کاتی میزکردندا بە بەرچاوی خەڵك ئەنجامی دەدا و خۆی لە پەنادا نەدا و ئەویتریشیان قسەی لە نێوان خەڵکی دەکرد بۆ ئاژاوەنانەوە لەپاشاندا فەرمانی کرد بە لقە دارخورمایەك کردنی بە دوو کەرتەوە و هەرپارچەی لەسەر گۆڕێکدا ناشت و هاوەڵان ووتیان بۆ وات کرد ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی بەشکوم بێتە هۆی سووك بوونی ئازار لەسەریان هەتاکو ئەم دارە ووشك دەبێت یادی خوا دەکات وە بەهۆیەوە ئازار لەسەر گۆڕەکە سوك دەبێت.

٥٣. عَنْ مَيْمُونَةَ أُم المؤنين رَضيَ اللهُ عَنْها أنَّ رَسُولَ اللّهِ (ﷺ) سُئِلَ عَنْ فَأْرَةٍ سَقَطَتْ فِي سَمْنٍ فَقَالَ: ((أَلْقُوهَا، وَمَا حَوْلَهَا فَاطْرَحُوهُ، وَكُلُوا سَمْنَكُمْ)).

لە مەیمونەی دایکی ئیمانداران (رضي الله عنها) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پرسیاری لێ کرا دەربارەی مشکێك کە دەکەوێتە ناو رۆنەوە چی بکەین لە رۆنەکە ئەویش فەرمووی مشکەکەو ئەو رۆنەی پیایا کەوتووە فرێی بدەن وە رۆنەکەی تر بخۆن خاوێنە (بەمەرجێك رۆنەکە بەستو بێت) بەڵام ئەگەر وەکو ئاو شکە بێت ئەوا ناخورێت وە دەبێ فرێ بدرێت.

## باب السِّواك

٥٤. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: بِتُّ عِنْدَ النَّبِيِّ (ﷺ) فَاسْتَنَّ.

## (بەشی سیواك كردن)

عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس (رضي الله عنه) دەفەرمووێ لەلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) نووستم و بینیم سیواك دەكات.

٥٥. عَنْ أَبِي بُرْدَةَ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) فَوَجَدْتُهُ يَسْتَنُّ بِسِوَاكٍ بِيَدِهِ يَقُولُ أُعْ أُعْ وَالسِّوَاكُ فِي فِيهِ كَأَنَّه يَتَهَوَّعُ.

ئەبو بەردە لە باوكی دەگێڕێتەوە كە دەفەرموێ چووم بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) دیتم سیواكی لە دەمی دەنا و دەیوت ئوع و ئوع وەك بڵێ هەڵێنجی دەهات پێی.

٥٦. عَنْ حُذَيْفَةَ قَال: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) إِذَا قَامَ مِنْ اللَّيْلِ يَشُوصُ فَاهُ بِالسِّوَاكِ.

حوزەیفەی كوڕی یەمان دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) كە لە خەو هەڵدەستا لە شەوا سیواكی دەكرد لە دەمی دا و لە نێوان دانەكانی وەردەدا.

٥٧. عَنْ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَال: ((أَرَانِي أَتَسَوَّكُ بِسِوَاكٍ فَجَاءَنِي رَجُلَانِ أَحَدُهُمَا أَكْبَرُ مِنْ الْآخَرِ، فَنَاوَلْتُ السِّوَاكَ الْأَصْغَرَ مِنْهُمَا، فَقِيلَ لِي كَبِّرْ، فَدَفَعْتُهُ إِلَى الْأَكْبَرِ مِنْهُمَا)).

عەبدوڵڵای كوڕی عومەر دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ لە خەوما بینیم سیواكم دەكرد و دوو پیاو هاتن یەكێكیان گەورەتر بوو لە ئەوی تریان منیش ووتم دار سیواكەكە بدەم بە ئەوەی بچوكەكە كەچی پێم ووترا گەورەكەیان بە پێش خەمنیش دام بە گەورەكەیان.

## باب فضل من بات على الوضوء

٥٨. عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَال: قَالَ النَّبِيُّ عَلَيهِ الصَّلَاةُ والسَّلام: ((إِذَا أَتَيْتَ مَضْجَعَكَ فَتَوَضَّأْ وُضُوءَكَ لِلصَّلَاةِ، ثُمَّ اضْطَجِعْ عَلَى شِقِّكَ الْأَيْمَنِ، ثُمَّ قُلْ: اللَّهُمَّ أَسْلَمْتُ وَجْهِي إِلَيْكَ، وَفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ، وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ رَغْبَةً وَرَهْبَةً إِلَيْكَ، لَا مَنجا وَلَا مَنْجَى مِنْكَ إِلَّا إِلَيْكَ، اللَّهُمَّ آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِي أَنْزَلْتَ، وَبِنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ. فَإِنْ مُتَّ مِنْ لَيْلَتِكَ فَأَنْتَ عَلَى الْفِطْرَةِ، وَاجْعَلْهُنَّ آخِرَ مَا تَتَكَلَّمُ بِهِ)).

### (بەشی/ فەزلی کەسێ دەستنوێژی شۆرد و دوایی بخەوێ)

بەڕائی کوڕی عازیب (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر چویتە سەر جێگای نووستن لە پێشدا دەست نوێژێك بشۆرە و وەکو دەستنوێژی نوێژکردن، لە پاشان لەسەر لای راستە راکشێ و بڵێ (اللّهُمَّ أسلَمتُ وجهي إليك وفَوّضْتُ أمري إليك ألجأت وظهري إليكَ رَغبَةً وَرَهبةً إليكَ، لا مَلْجأ ولا منْجى إلا إليك اللّهُمّ آمنتُ بِكتابِكَ الذّي أنزلت و بِنَبيِكَ الذّي أرسلَت).

وە راڤەی دوعایەکە بەم جۆرەیە: (خودایە خۆم سپارد بە تۆ و پشتم بەستوە بە تۆ هەروەك مەترسیم هەیە لە قاڕ و نزای تۆ، وە ئومێدیشم بەهێزی تۆ هەیە هیچ پاساوێك نیە لە عەزاب و سزای تۆ مەگەر هەر لای خۆت پەنا هەر پەنای تۆیە و بەس باوەڕم هەیە بەو نامە پیرۆزەی کە خۆت ناردووتە خوارەوە کە قورئانی گەورەیە وە باوەڕیشم هەیە بە پێغەمبەرەکەت کە خۆت رەوانەت کردوە). وەئەگەر لەم شەوەدا کۆچی کرد ئەوە لەسەر ئیسلامەتی دەمری، وەبا ئەوە دواین قسەو گوفتارت بێ.

# كتاب الغسل

## باب الوُضوء قبل الغسل

٥٩. عَنْ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وآله وَسَلَّمَ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وآلِهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا اغْتَسَلَ مِنْ الْجَنَابَةِ بَدَأَ فَغَسَلَ يَدَيْهِ ثُمَّ يَتَوَضَّأُ كَمَا يَتَوَضَّأُ لِلصَّلَاةِ، ثُمَّ يُدْخِلُ أَصَابِعَهُ فِي الْمَاءِ فَيُخَلِّلُ بِهَا أُصُولَ شَعَرِهِ، ثُمَّ يَصُبُّ عَلَى رَأْسِهِ ثَلَاثَ غُرَفٍ بِيَدَيْهِ ثُمَّ يُفِيضُ الْمَاءَ عَلَى جِلْدِهِ كُلِّهِ.

## (نامەی خۆشۆردن (الغسل)

## (بەشی/ دەستنوێژ پێش خۆشۆردن)

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی پێغەمبەری خوا کە بۆ لەش گرانی خۆی دەشۆرد لەسەرەتاوە دەستی دەشۆرد و دوایی دەستنوێژێکی دەشۆرد لە پاشان ئاوی هەڵدەگرت و پەنجەی دەخستە سەر بن موەکانی سەری تا دەیزانی تەواو تەڕ بوون، ئەوجا سێ مشت ئاوی هەڵدەگرت بە سەرسەری خۆی دادەکرد لە پاشان هەموو لەشی خۆی دەشۆرد.

٦٠. عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها قَالَتْ: كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَالنَّبِيُّ (ﷺ) مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ مِنْ قَدَحٍ يُقَالُ لَهُ الْفَرَقُ.

عائیشە (رضي الله عنها) دەفەرموێ جاران من و پێغەمبەر (ﷺ) بەیەکەوە لەیەك قاپدا خۆمان دەشۆرد قاپەکەی پێی دەوترا (فەرەق).

٦١. عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِذَا اغْتَسَلَ مِنْ الْجَنَابَةِ غَسَلَ يَدَهُ..

عائیشە (رضي الله عنها) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) عادەتی وابوو گەر بۆ لەش پیسی خۆی دەشۆرد هەردوو دەستی دەشۆرد.

٦٢. عَنْ جُبَيْرُ بْنُ مُطْعِمٍ قَال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((أَمَّا أَنَا فَأُفِيضُ عَلَى رَأْسِي ثَلَاثًا –وَأَشَارَ بِيَدَيْهِ كِلْتَيْهِمَا)).

جوبەیری کوڕی موطعیم (رضي الله عنه) فەرمووی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی:من سێ مشت ئاو دەکەم بەسەرما، جوبەیر فەرمووی پێغەمبەر (ص) بەهەردوو دەستی نیشانیدا لەمشت پڕ هەردوو دەستە.

٦٣. عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ قَال: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعلى آلِه وَسَلَّمَ يَدُورُ عَلَى نِسَائِهِ فِي السَّاعَةِ الْوَاحِدَةِ مِنْ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ، وَهُنَّ إِحْدَى عَشْرَةَ، قَالَ: ((قُلْتُ لِأَنَسٍ: أَوكَانَ يُطِيقُهُ))؟ قَالَ: كُنَّا نَتَحَدَّثُ أَنَّهُ أُعْطِيَ قُوَّةَ ثَلَاثِينَ. وَقَالَ سَعِيدٌ عَنْ قَتَادَةَ: إِنَّ أَنَسًا حَدَّثَهُمْ: تِسْعُ نِسْوَةٍ.

ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) فەرموی پێغەمبەر ﷺ جاری وابوو لە یەك کاتدا بە شەو یا بەڕۆژ دەڕۆیشتە لای هەر هەموو خێزانەکانی یەکە یەکە لە گەڵیان دروست دەبوو کە ئەو کاتە یازدە ئافرەتی هەبوو، (راویەکە دەڵێ ووتم بە ئەنەس) ئایا توانای ئەوەندەی هەبوو؟ ئەنەس دەفەرموێ ئێمە قسەی ئەوەمان دەکرد کە ئەو لەم لایەنە توانای سی پیاوی پێ درابوو وە سەعید لەقەتادە ریوایەت دەکات کە ئەنەس دەگێڕێتەوە کە نۆ خێزانی هەبووە..

٦٤. عَنْ عَلِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَال: كُنْتُ رَجُلًا مَذَّاءً، فَأَمَرْتُ رَجُلًا أَنْ يَسْأَلَ رَسُول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ –لِمَكَانِ ابْنَتِهِ– فَسَأَلَهُ فَقَالَ لَهُ: ((تَوَضَّأْ وَاغْسِلْ ذَكَرَكَ)).

عەلی کوڕی ئەبو تالیب (رضي الله عنه) دەفەرمووێ من پیاوێکم (مەزیم) زۆر بوو شەرمم کرد پرسیاری دەربارەی لە پێغەمبەر بکەم لەبەر ئەوەی کچی ئەوم لەلابوو (زاوای ئەو بووم)، پیاوێکم راسپارد کە ئەو پرسیارە لە

پێغەمبەری خوا بکات ئەویش پرسیاری لێ کرد پێغەمبەر لە وەڵامدا فەرمووی با چۆکی خۆی بشوات و دەستنوێژ بشوات، {چوك: واتە: زەکەر}.

٦٥. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَتْ مَيْمُونَةُ وَضَعْتُ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ غُسْلًا فَسَتَرْتُهُ بِثَوْبٍ، وَصَبَّ عَلَى يَدَيْهِ فَغَسَلَهُمَا ثُمَّ صَبَّ بِيَمِينِهِ عَلَى شِمَالِهِ فَغَسَلَ فَرْجَهُ فَضَرَبَ بِيَدِهِ الْأَرْضَ فَمَسَحَهَا ثُمَّ غَسَلَهَا، فَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ وَغَسَلَ وَجْهَهُ وَذِرَاعَيْهِ، ثُمَّ صَبَّ عَلَى رَأْسِهِ وَأَفَاضَ عَلَى جَسَدِهِ، ثُمَّ تَنَحَّى فَغَسَلَ قَدَمَيْهِ فَنَاوَلْتُهُ ثَوْبًا فَلَمْ يَأْخُذْهُ، فَانْطَلَقَ وَهُوَ يَنْفُضُ يَدَيْهِ.

عەبدوڵلای کوڕی عەبباس دەفەرموێ مەیمونەی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ ئاوم ئامادە کرد بۆ پێغەمبەری خوا بۆ خۆشۆردن وە بە پۆشاکی پەنام لێ کرد وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاوی بە دەستی خۆی داکرد هەردوو دەستی شۆرد و ئینجا بە دەستی ڕاست ئاوی دەکرد بە دەستی چەپدا، ئینجا ناوگەڵی خاوێن کردەوە و شۆردی ئینجا دەستی لە زەوی خشاند و سڕییەوە و شۆردی وە ئاوی لە دەم و لووتی ڕادا و دەم و چاوی شۆرد و قۆڵەکانی شۆرد و لە پاشان ئاوی بەسەر سەری خۆیدا کرد و بە هەموو لەشدا گرتوە لە پاشان کشایەوە و هەردوو پێیەکانی شۆرد و ئینجا پەڕۆیەکم بۆ برد و بۆ خۆ ووشك کردنەوە بەڵام وەری نەگرت ئاوەکەی بە دەستی لە لەشی دەتەکاند.

٦٦. عَنْ عائشة قَالَتْ: كُنَّا إذا أصَابَ إِحْدَانَا جَنَابَةٌ أَخَذَتْ بِيَدِيها ثَلاثًا فَوقَ رَأسِهَا ثُمَّ تَأْخُذُ بِيَدها على شِقِّهَا الأيمَنِ وَبِيَدِهَا الأُخرى على شِقهَا الأيْسَرِ.

عائیشە دەفەرموێ (رضي الله عنها) ئێمە لە کاتی تووشی بێ نوێژی هاتباین بۆ خۆ شۆردن هەر یەکێکمان بە هەردو دەستی ئاوی دێنا و بەلای ڕاستەی خۆی دادەکرد و لە پاشان بە هەردوو دەستی ڕاستی بە لای چەپی خۆی دادەکرد و غوسلی پێ دەکرد.

## باب من إغتسلَ عرياناً

٦٧. عَنْ أبِي هُرَيْرَةَ رَضيَ اللهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَال: ((بَيْنَا أيُّوبُ يَغْتَسِلُ عُرْيَانًا فَخَرَّ عَلَيْهِ جرَادٌ مِنْ ذَهَبٍ، فَجَعَلَ أيُّوبُ يَحْتَثِي فِي ثَوْبِهِ، فَنَادَاهُ رَبُّهُ يَا أيُّوبُ ألَمْ أكُنْ أغْنَيْتُكَ عَمَّا تَرَى؟ قَالَ: بَلَى وَعِزَّتِكَ، وَلَكِنْ لَا غِنَى لِي عَنْ بَرَكَتِكَ)).

### (بەشی/ کەسێ بە رووتی خۆی شۆرد)

ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی (جارێ ئەیوب پێغەمبەر (علیه السلام) بە تەنیا لە شوێنی چۆڵا بە رووتی خۆی دەشۆرد لەو کاتەدا کوللەی زێڕینی بەسەردا باری جا ئەیوب بە مشتی خۆی زێڕەکەی دەکردە ناو جلەکانیەوە لەو کاتەدا خوای گەورە بانگی کرد: ئەی ئەیوب ئەدی من بێ نیازم نەکردووی لە شتی وادا ئیتر ئەم خۆماندووکردنەی بۆ چییە ئەیوب فەرمووی: بەڵێ سوێند بە گەورەیی تۆ و بەڵام هەرگیز لە پیت و بەرەکەتی تۆ بێ نیازم نابم.

## باب الجنب يتوضأ وينام

٦٨. عَنْ عَائِشَةَ رَضيَ اللهُ عَنْها قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) إذَا أرَادَ أنْ يَنَامَ وَهُوَ جُنُبٌ غَسَلَ فَرْجَهُ وَتَوَضَّأَ لِلصَّلَاةِ.

### (بەشی/ لەش گران دەستنوێژ دەگرێ ئینجا دەخەوێ)

عائیشە (رضي الله عنها) دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر لەشی گران بوایە و بیویستا بخەوتبایە ناوگەلی خۆی دەشۆرد و دەستنوێژی دەشۆرد و ئینجا دەنوستەوە.

٦٩. قَالَ عَطَاءٌ: يَحْتَجِمُ الْجُنُبُ وَيُقَلِّمُ أظْفَارَهُ وَيَحْلِقُ رَأْسَهُ، وَإنْ لَمْ يَتَوَضَّأْ.

عەتا دەفەرمووێ: ئەوەی لەش گران بێ دەتوانێ کەلەخاشاخ بگرێ وە نینۆکی بقرتێنێ و سەری خۆی بتاشێ وە ئەگەر دەستنوێژیش نەشوات.

٧٠. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ أَنَّهُ قَالَ: ذَكَرَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) أَنَّهُ تُصِيبُهُ الْجَنَابَةُ مِنْ اللَّيْلِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((تَوَضَّأْ وَاغْسِلْ ذَكَرَكَ ثُمَّ نَمْ)).

**عەبدوڵلای کوری عومەر (ﷺ) دەفەرمووێ عومەری کوڕی خەتتاب پرسیاری لە پێغەمبەری خوا کرد کە کەسێ لەش گران بێت و لە شەوا ) پێغەمبەری خواش فەرمووی با دەستنوێژ بگرێ وە چۆکی خۆی بشوات و بخەوێ.**

## باب إذا إلتقى الختان

٧١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعلى آلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((إِذَا جَلَسَ بَيْنَ شُعَبِهَا الْأَرْبَعِ ثُمَّ جَهَدَهَا فَقَدْ وَجَبَ الْغُسْلُ)).

## (بەشی/ کاتێ هەردوو ئامرازی بڕاوەی نێر و مێ گەیشت بەیەکدا)

**ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی ئەگەر پیاو دانیشت لە نێوان چوار پەلی ئافرەتدا لە پاشان خۆی ماندو کرد و لە گەڵیا جووت بوو ئەوا خۆشۆردن لەسەر هەردوو لا پێویست دەبێ (با ئاویش نەیەتەوە).**

## كتاب الحيض

قالَ اللهُ تَعالى: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ ۖ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ ۖ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ ۖ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ ﴾.

## (نامەی بێ نوێژی ئافرەتان)

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ ۖ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ ۖ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ ۖ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ ﴾. البقرة.

واتە: ئەی پێغەمبەر پرسیارت لی دەکەن دەربارەی عادەی مانگانەی ئافرەت پێیان بڵێ ئەوە ئازار و زەرەرەکەوابوو خۆتان بە دوور بگرن لە هاوسەرەکانتان کە لەو حاڵە دابوون وە نزیکیان مەکەون تا پاك دەبنەوە، جا کاتێك پاك و خاوێن بوونەوە و خۆیان شۆرد بچنە لایان، بەو شێوەی کە خوا فەرمانی داوە، بەراستی خوا تەوبەکاران و پاکانی خۆشدەوێ (تەفسیری ئاسان، ل٣٥).

٧٢. عَنْ عائشة رَضيَ اللهُ عَنْها قَالَتْ: خَرَجْنَا لَا نَرَى إِلَّا الْحَجَّ فَلَمَّا كُنَّا بِسَرِفَ حِضْتُ، فَدَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَأَنَا أَبْكِي، قَالَ: ((مَا لَكِ، أَنُفِسْتِ))؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: ((هَذَا أَمْرٌ كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَى بَنَاتِ آدَمَ فَاقْضِي مَا يَقْضِي الْحَاجُّ غَيْرَ أَنْ لَا تَطُوفِي بِالبَيْتِ)) قَالَتْ: وَضَحَّى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَنْ نِسَائِهِ بِالْبَقَرِ.

عائیشە (رضي الله عنها) دەفەرمووێ لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بووین دەرچووین بۆ حەج تاکو گەیشتین بۆ سەرەف (شوێنێکە نزیك مەککە) من کەوتمە بێ نوێژی وە دەستم کرد بە گریان، وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتەلام فەرمووی بۆ دەگری رەنگە بێ نوێژ بوویت؟ ووتم بەڵێ، فەرمووی ئەمە شتێکە خوای گەورە دایناوە لەسەر کچانی نەوەی ئادەم خەتای تۆی نییە، جا هەرچی (حاجی) دەیکا تۆش بیکە، تەنها نابێت تەوافی ماڵی خوا

بکەیت، وە عائیشەخان دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە پاشان قوربانی سەربڕی و مانگایەکی لە جیاتی خێزانەکانی سەربڕی.

## باب غَسل الحائض رأس زوجِها وترجيلهِ

٧٣. عَنْ عائشة رَضيَ اللهُ عَنْها قالَتْ: كُنْتُ أُرَجِّلُ رَأسَ رسول الله (ﷺ)وأنا حَائِضٌ.

## (بەشی/ شۆردن و شانەکردنی سەری مێرد لەلایەن ئافرەتی بێ نوێژەوە)

عائیشەخان (رضي الله عنها) دەفەرموێ من سەری پێغەمبەری خوا (ﷺ)م شانە دەکرد لەو کاتەدا بێ نوێژ بووم.

## باب قراءَة الرجل في حجر الحائض

٧٤. عَنْ عائِشةَ رَضيَ اللهُ عَنْها أنَّ النَّبيَّ (ﷺ) كَانَ يَتَّكئُ في حَجْرِي وَأنَا حَائِضٌ ثُمَّ يَقْرَأُ القُرآن.

## (بەشی/خوێندنی قورئان لەلایەن پیاوەوە لەو کاتەی سەری لەسەر کۆشی ئافرەتی خۆی دابنێت کە بێ نوێژە)

عائیشە خان (رضي الله عنها) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەری لەسەر کۆشم دادەنا لەو کاتەدا من بێ نوێژ بووم و قورئانی دەخوێند.

## باب ترك الحائض الصوم

٧٥. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضيَ اللهُ عَنْهُ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ فِي أَضْحَى أَوْ فِطْرٍ إِلَى الْمُصَلَّى فَمَرَّ عَلَى النِّسَاءِ فَقَالَ: ((يَا

مَعْشَرَ النِّسَاءِ تَصَدَّقْنَ، فَإِنِّي أُرِيتُكُنَّ أَكْثَرَ أَهْلِ النَّارِ))، فَقُلْنَ وَبِمَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: ((تُكْثِرْنَ اللَّعْنَ، وَتَكْفُرْنَ الْعَشِيرَ، مَا رَأَيْتُ مِنْ نَاقِصَاتِ عَقْلٍ وَدِينٍ أَذْهَبَ لِلُبِّ الرَّجُلِ الْحَازِمِ مِنْ إِحْدَاكُنَّ))، قُلْنَ: وَمَا نُقْصَانُ عَقْلِنا وَدِينِنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: ((أَلَيْسَ شَهَادَةُ الْمَرْأَةِ مِثْلَ نِصْفِ شَهَادَةِ الرَّجُلِ))؟ قُلْنَ: بَلَى! قَالَ: ((فَذَلِكِ مِنْ نُقْصَانِ عَقْلِهَا، أَلَيْسَ إِذَا حَاضَتْ لَمْ تُصَلِّ وَلَمْ تَصُمْ))؟ قُلْنَ: بَلَى! قَالَ: ((فَذَلِكِ مِنْ نُقْصَانِ دِينِهَا)).

## (بەشی بەرۆژوو نەبوونی ئافرەتی بێ نوێژ)

ئەبو سەعیدی خودری (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) چوو بۆ نوێژی جەژنی قوربان یان رەمەزان بۆ شوێنی نوێژگا (المصلی)، وە بەلای ئافرەتاندا ڕابورد و فەرمووی کۆمەڵی ئافرەتان خێر و خێرات زۆر بکەن و داوای لێخۆشبوون لە خوا بکەن، چونکە خوا دۆزەخی نیشاندام دیم زۆری هەرەزۆری خەڵکانی ئافرەتان بوون، ئەوانیش وتیان بۆچی؟ فەرمووی چونکە زۆر نەفرەت لە خەڵکی دەکەن و سپڵەیی لەگەڵ مێردەکانیان دەکەن و چاکەی ئەوتان لەپێش چاودا نییە، کەسم نەدیووە وەك ئێوە کەم هۆش و کەم دین بێ کەچی پیاوان بەم هەموو زیرەکییەیان لە خشتەیان دەبەن، وتیان ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەم ئاینی و کەم هۆشیمان کامەیە، فەرمووی کەم هۆشیەکانتان بریتییە لەو شایەتی دوو ژن بە شایەتی تاقە پیاوێ حیسابە وە کەم ئاینیتان بریتییە لەوەی ئافرەتانیش کاتی بێ نوێژی چەند شەوێ دەمێننەوە و نە نوێژ دەکەن و نە بەڕۆژوو دەبن ئەمەش کەم ئاینیەکەتانە.

## باب الطيب للمرأة عند غَسلها من الحيض

٧٦. عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رَضيَ اللهُ تَعالى عَنْها قَالَتْ: كُنَّا نُنْهَى أَنْ نُحِدَّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلَاثٍ إِلَّا عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا، وَلَا نَكْتَحِلَ، وَلَا نَتطيبَ، وَلَا نَلْبَسَ ثَوْبًا مَصْبُوغًا إِلَّا ثَوْبَ عَصْبٍ، وَقَدْ رُخِّصَ لَنَا عِنْدَ الطُّهْرِ إِذَا اغْتَسَلَتْ إِحْدَانَا مِنْ مَحِيضِهَا فِي نُبْذَةٍ مِنْ كُسْتِ أَظْفَارٍ وَكُنَّا نُنْهَى عَنْ اتِّبَاعِ الْجَنَائِزِ.

## (بەشی/ خۆ بۆن خۆش کردنی ئافرەتان لە کاتی خۆشۆردنی بێ نوێژیدا)

ئوم عەطیە (رضي الله عنها) دەفەرموێ ئێمە قەدەغەمان لێ کراوە لە تازیە و پرسەدانان بۆ مردوو لە سێ ڕۆژان زیاتر بۆ خزم بەڵام بۆ مێرد مردوو دەبێ چوار مانگ و دە ڕۆژ تازیە و پرسە بگێڕین وە لەو ماوەیەدا نابێ چاو برێژین یان خۆمان بۆن خۆش بکەین یان جلی ڕەنگا و ڕەنگ لەبەر بکەین مەگەر بەرگێ لە پێشدا ڕەنگ کرابێ وە لە پاشان چنرابێ بەڵام لەکاتی خۆشۆردندا لە بێ نوێژی ڕێگەی ئەوەمان دراوە کە بە قەد پێویست عود و گوڵاو بۆ شوێنی بێ نوێژییەکە بەکار بهێنین، بەقەد نینۆکێك وە نەهیمان لی کراوە بەدوای تەرمی مردوودا بڕۆین بۆ سەر گۆڕستان.

## باب الملك الموكّل بالرحم ودعاؤه

٧٧. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضيَ اللهُ عَنْه عَنْ النَّبيِّ عَلَيهِ الصَّلَاةُ والسَّلام قَالَ: ((إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ وَكَّلَ بِالرَّحِمِ مَلَكًا يَقُولُ: يَا رَبِّ نُطْفَةٌ، يَا رَبِّ عَلَقَةٌ، يَا رَبِّ مُضْغَةٌ، فَإِذَا أَرَادَ اللهُ أَنْ يَقْضِيَ خَلْقَهُ قَالَ أَذَكَرٌ أَمْ أُنْثَى، شَقِيٌّ أَمْ سَعِيدٌ، فَمَا الرِّزْقُ وَالْأَجَلُ فَيُكْتَبُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ)).

## (بەشی/ ئەو فریشتەی فەرمانی پێکراوە بە رەحمی ئافرەتان و داواکانی)

ئەنەسی کوڕی مالیك(رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە دەفەرمویَ خوای گەورە فریشتەیەکی کردۆتە وەکیلی خۆی لەناو رەحمی ئافرەتدا، وە فریشتەکە دەفەرمویَ ئەی خوای گەورەم ئەوا دڵۆپە ئاوێکە، ئەوا پارچە خوێن پارەیەکە، خوایە بۆتە پارچە گۆشتێك لەو کاتەدا ئەگەر خوای گەورە ویستی وابوو بە دروستبوونی منالْ، فریشتەکە دەفەرمووێ ئایا نێر بێ یان مێ؟ وە رزق و رۆژی و بەدبەخت و کامەرانی و ئەجەل و تەمەنی چون و چەند بێت وە لەو کاتەدا لەناو تاریکی سکی دایکیا ئەوانە دەنوسرێ.

## باب فضل إستقبال القبلة

٧٨. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَإِذَا قَالُوهَا وَصَلَّوْا صَلَاتَنَا، وَاسْتَقْبَلُوا قِبْلَتَنَا، وَذَبَحُوا ذَبِيحَتَنَا، فَقَدْ حَرُمَتْ عَلَيْنَا دِمَاؤُهُمْ وَأَمْوَالُهُمْ إِلَّا بِحَقِّهَا، وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللَّهِ)).

## (بەشی/ فەزلی رووکردنە رووگە (قیبلە))

ئەنەسی کوڕی مالیك دەفەرمویَ (رضي الله عنه) پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویی: (فەرمانم پیَ کراوە جەنگ لەگەڵ خەڵکیدا بکەم تاکو دەڵێن (هیچ خوایە نیە جگە لە الله نەبێت) کە وایان ووت وە نوێژیان وەکو نوێژی ئێمە ئەنجام دا و وەکو ئێمە روویان کردە قیبلەی ئێمە وە وەکو ئێمە لە گۆشتی گیانلەبەریَ بخوا کە ئێمە سەری ببڕین ئەوا ئەو کەسە خوێن و ماڵی لەسەر ئێمە حەرام دەبێت و تەنها بە مافی خۆی نەبێت وەحیساب و لێپرسینەوەی لەسەر خوایە).

## باب تسوية الصفوف

٧٩. عَنْ عائشة رَضيَ اللهُ عَنْها قالَتْ: أُقيمَتْ الصَّلَاةُ فَأَقْبَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللّه (ﷺ) بِوَجْهِهِ فَقَالَ: ((أَقِيمُوا صُفُوفَكُمْ وَتَرَاصُّوا فَإِنِّي أَرَاكُمْ مِنْ وَرَاءِ ظَهْرِي)).

### (بەشی/ ڕێك و ڕاست وەستان لە ڕیزی نوێژدا)

عائیشە (رضي الله عنها) دەفەرموێ قامەتی نوێژ کرا و پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەماشای ئێمە ی کرد و فەرموی: ڕیزەکانتان ڕاست و ڕێك بکەن چونکە من لەپاشەوەی خۆم ئێوە دەبینم.

## باب جعلت لي الأرض مسجداً

٨٠. عَنْ جَابِرِ بْن عَبْدِ اللّهِ قال: قالَ رَسُول الله (ﷺ): ((أُعْطِيتُ خَمْسًا لَمْ يُعْطَهُنَّ أَحَدٌ قَبْلِي: نُصِرْتُ بِالرُّعْبِ مَسِيرَةَ شَهْرٍ، وَجُعِلَتْ لِي الْأَرْضُ مَسْجِدًا وَطَهُورًا، فَأَيُّمَا رَجُلٍ مِنْ أُمَّتِي أَدْرَكَتْهُ الصَّلَاةُ فَلْيُصَلِّ، وَأُحِلَّتْ لِي الْغَنَائِمُ وَلَمْ تَحِلَّ لِأَحَدٍ قَبْلِي وَأُعْطِيتُ الشَّفَاعَةَ))، وَكَانَ النَّبِيُّ يُبْعَثُ إِلَى قَوْمِهِ خَاصَّةً، وَبُعِثْتُ إِلَى النَّاسِ عَامَّةً)).

### (بەشی/ زەویم بۆ کراوە بە مزگەوت)

جابری کوڕی عەبدوڵلا (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی پێنج شتم پێ دراوە لە پێش خۆم نەدراوە بە هیچ ئوممەتی کە ئەوانیش: ترسی من خراوە دڵی دوژمنەکەمەوە بە دووری مانگە ڕێیەك، وە زەویم بۆ کراوە بە مزگەوت و دەست نوێژ وە هەرکەسێ لە ئوممەتی من کاتی نوێژی هات با بیکات، وە تالانی جەنگیم بۆ حەڵاڵ کراوە وە بۆ هیچ ئوممەتی لە پێش خۆم حەڵاڵ نەبووە و، وە تکا و شەفاعەتی ڕۆژی دوایی پێم بەخشراوە، وە گشت پێغەمبەرێ بۆ گەلەکەی نێردراوە، بەڵام من بۆ گشت خەڵکی زەوی نێردراوم.

# (كتاب الصلاة)

٨١. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: حَدَّثَنِي أَبُو سُفْيَانَ فِي حَدِيثِ هِرَقْلَ قَالَ: يَأْمُرُنَا -يَعْنِي النَّبِيَّ عَلَيهِ الصَّلاةُ والسَّلام- بِالصَّلَاةِ، وَالصِّدْقِ، وَالْعَفَافِ.

## (نامەی نوێژ)

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەفەرموێ ئەبو سوفیان بۆی گێڕامەوە لە فەرمودەی (هیرەقل)دا کە دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێکردین بە نوێژ و ڕاستگۆیی و داوێن پاکی.

# باب وجوبْ الصلاة في الثياب وقول الله تعالى

﴿خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ﴾

٨٢. عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ أَنَّ رَسُول الله (ﷺ) قَال: ((يَزُرُّهُ وَلَوْ بِشَوْكَةٍ، وَمَنْ صَلَّى فِي الثَّوْبِ الَّذِي يُجَامِعُ فِيهِ مَا لَمْ يَرَ أَذًى)). وَأَمَرَ النَّبِيُّ عَلَيهِ الصَّلاة والسَّلام أَنْ لَا يَطُوفَ بِالْبَيْتِ عُرْيَانٌ.

## (بەشی پێویست بوونی نوێژ بە جل وبەرگەوە وە خوای گەورە دەفەرموێ ﴿خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ﴾

لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەع دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی (جلەکانتان ببەستن یان بیدرونەوە با بە دڕکێکیش بێت، وە نوێژی ئەو کەسە دروستە بە جل و بەرگ ئەنجامی بدات کە سەرجێی و جیماعی لەگەڵ ئافرەتی خۆی پێ کردوە بە مەرجێك پیس و بێ نوێژ نەبێ. وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی کرد بەوەی کە نابێت تەواف و سوڕانەوەی ماڵی بەیت بە ڕووتی و بێ پۆشاکی بکرێت.

٨٣. قَالَ الْحَسَنُ: كَانَ الْقَوْمُ يَسْجُدُونَ عَلَى الْعِمَامَةِ وَالْقَلَنْسُوَةِ وَيَدَاهُ فِي كُمِّهِ.

حەسەن دەفەرموێ (هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) كرنۆشیان دەبرد لە نوێژا و عەمامە و مەندیلیان لەسەری بووە وە دەستیان لەناو كەلانگوچك دابوو).

٨٤. وَعَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَالِكٍ بْنِ بُحَيْنَةَ أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ إِذَا صَلَّى فَرَّجَ بَيْنَ يَدَيْهِ حَتَّى يَبْدُوَ بَيَاضُ إِبْطَيْهِ.

عەبدوڵڵای كوڕی مالیك كوڕی بوحەینە دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) كە نوێژی دەكرد لە كڕنۆشا هەردوو باڵی بڵاودەكردەوە هەتا سپیتایی بن باخەڵی دیار دەكەوێ.

٨٥. عَنْ أَبِي سَعِيد أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) رَأَى نُخَامَةً فِي جِدَارِ الْمَسْجِدِ فَتَنَاوَلَ حَصَاةً فَحَكَّهَا، فَقَالَ: ((إِذَا تَنَخَّمَ أَحَدُكُمْ فَلَا يَتَنَخَّمَنَّ قِبَلَ وَجْهِهِ، وَلَا عَنْ يَمِينِهِ، وَلْيَبْصُقْ عَنْ يَسَارِهِ أَوْ تَحْتَ قَدَمِهِ الْيُسْرَى)).

ئەبی سەعید (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەلغەمێكی دیت بە دیواری مزگەوتادا نووسا بوو بە بەردێك كڕاندی لێی كردەوە وە فەرمووی كەسێ بەلغەمی فڕێ دا با لەشوێن سوجدەی یان لەلای راستی خۆی فڕیی نەدات وە با لەلای چەپی یان لەلای پێی چەپی فڕێی بدات.

٨٦. عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالك قَالَ: قَالَ رسول الله (ﷺ): ((الْبُزَاقُ فِي الْمَسْجِدِ خَطِيئَةٌ وَكَفَّارَتُهَا دَفْنُهَا)).

ئەنەسی كوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (تف روو كردن لەناو مزگەوت تاوانێكە و كەفارەتی ئەو تاوانەش لادان و شاردنەوەیەتی).

٨٧. عَنْ كَعْبُ بْنُ مَالك قال: كَانَ النَّبِيُّ عَلَيهِ الصَّلاةُ وَالسَّلام إِذَا قَدِمَ مِنْ سَفَرٍ بَدَأَ بِالْمَسْجِدِ فَصَلَّى فِيهِ.

**كەعبی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا کە لە سەفەر بگەڕابوایەوە لە سەرەتادا دەچووە مزگەوت و نوێژی تیا دەکرد.**

## باب الإثم المارُّ بين يدي المصلي

٨٨. عَنْ أبي جَهم قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لَوْ يَعْلَمُ الْمَارُّ بَيْنَ يَدَيْ الْمُصَلِّي مَاذَا عَلَيْهِ لَكَانَ أَنْ يَقِفَ أَرْبَعِينَ خَيْرًا لَهُ مِنْ أَنْ يَمُرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ))، قَالَ أَبُو النَّضْرِ: قالَ لَا أَدْرِي أَقَالَ أَرْبَعِينَ يَوْمًا أَوْ شَهْرًا أَوْ سَنَةً.

## (بەشی/ تاوانی کەسێ بە پێش نوێژی نوێژکەر دابێت)

**ئەبی جەهم دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێ ئەگەر ئەو کەسەی بەپێش نوێژی نوێژکەردا بڕوات بزانێ چەندە گوناهی گەورەیە ئەگەر چل (ئەبو زەڕ دەفەرموێ نازانم راوی فەرموودەکە ووتی چل رۆژ یان چل مانگ یان چل ساڵ) رابوەستێ باشترە لەوەی بە پێش نوێژی نوێژکەردا بڕوات.**

## باب الحدث في المَسْجِد

٨٩. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((الْمَلَائِكَةُ تُصَلِّي عَلَى أَحَدِكُمْ مَا دَامَ فِي مُصَلَّاهُ الَّذِي صَلَّى فِيهِ مَا لَمْ يُحْدِثْ، تَقُولُ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ، اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ)).

## (بەشی بێ دەستنوێژی لەناو مزگەوت)

**ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (فریشتەکانی خوا سەلاوات لەسەر ئەو کەسە لێ دەدەن کە لەناو شوێن نوێژەکەی خۆی بێت مادام لە نوێژی خۆی بێ و دەستنوێژی مابێ، وە فریشتەکان دوعای بۆ دەکەن و پێی دەڵێن خوا رەحم و بەزەیی پێ بکە).**

## باب من قعد حيث ينتهي بهِ المجلس

٩٠. عَنْ أَبِي وَاقِدٍ اللَّيْثِيِّ رَضِيَ اللهُ تَعالَى عَنْهُ قَالَ: بَيْنَمَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فِي الْمَسْجِدِ فَأَقْبَلَ ثَلَاثَةُ نَفَرٍ فَأَقْبَلَ اثْنَانِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وَذَهَبَ وَاحِدٌ، فَأَمَّا أَحَدُهُمَا فَرَأَى فُرْجَةً فَجَلَسَ، وَأَمَّا الْآخَرُ فَجَلَسَ خَلْفَهُ، وَأَمَّا الثالث فَأَدبَرَ ذاهِباً، فَلَمَّا فَرَغَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((أَلَا أُخْبِرُكُمْ عَنْ الثَّلَاثَةِ؟ أَمَّا أَحَدُهُمْ فَأَوَى إِلَى اللَّهِ فَآوَاهُ، وَأَمَّا الثالثُ فَاسْتَحْيَا فَاسْتَحْيَا اللَّهُ مِنْهُ، وَأَمَّا الْآخَرُ فَأَعْرَضَ، فَأَعْرَضَ اللَّهُ عَنْهُ)).

## (بەشی/ دانیشتینی کەسێ لە شوێنێ کە چۆڵ بێ و دوایی دانیشتگاکە بێت)

ئەبی واقیدی لەیسی (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا لەناو مزگەوت دانیشتبوو، سێ کەس هاتن وە لەسەرەتاوە دوانیان هاتنە پێشەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) یەکێکیان ڕۆیشت، وە یەکێکیان شوێنێکی بەتاڵی بینی و لێی دانیشت، وە ئەوەی تریان لە پشتەوەی خەڵکەکە دانیشتەوە، سێیەمایان پشتی کرد و ڕۆیشت و وە پێغەمبەری خوا لە ووتاردان تەواو بوو فەرمووی ئایا ئاگادارتان بکەم دەربارەی ئەم سێ کەسە، یەکێکیان شوێنی خۆی گرت و خواش پەنای دا، وە سێیەمیان نەویست خەڵکەکە تووشی ئەزیەت بکات وە خواش ڕەحمی پێ کرد و وە ئەوەی تریش پشتی کرد و ڕۆیشت خواش پشتی تێ کرد.

## باب تعاون المؤمنين

٩١. عَنْ أَبِي مُوسَى الأشعَرِي رَضيَ اللهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلى آلِهِ وَسَلَّمَ قَال: ((إِنَّ الْمُؤْمِنَ لِلْمُؤْمِنِ كَالْبُنْيَانِ يَشُدُّ بَعْضُهُ بَعْضًا، وَشَبَّكَ أَصَابِعَهُ)).

## (بەشی/ یارمەتیدانی بڕوادارن بۆ یەکتری)

ئەبی موسای ئەشعەری (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (بڕودار بۆ بڕواداران وەکو قەڵا و چینی دیوار وان بۆ یەکتری، یەکتر دەبستنەوە، وە ڕاوی دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) پەنجەکانی لێك ئاڵاند.

## باب يرد المصلي من مرَّ بين يديهِ

٩٢. عَنْ أبي سَعيد قال: سَمِعْتُ رَسُول الله (ﷺ) يَقُولُ: ((إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ إِلَى شَيْءٍ يَسْتُرُهُ مِنْ النَّاسِ فَأَرَادَ أَحَدٌ أَنْ يَجْتَازَ بَيْنَ يَدَيْهِ فَلْيَدْفَعْهُ فَإِنْ أَبَى فَلْيُقَاتِلْهُ فَإِنَّمَا هُوَ شَيْطَانٌ)).

### (بەشی لادانی کەسێ بەدەست بە پێش نوێژەکەردا بڕوات)

ئەبی سەعید دەفەرمووێ گوێم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو دەیفەرموو: (ئەگەر کەسێ نوێژی کرد با شتێ بکاتە سنور لە پێش شوێنی سوجدەی نوێژی خۆی وە ئەگەر کەسێ ویستی بە پێشیدا بچێ با بەدەست قەدەغەی بکات وە ئەگەر هەر نەگەڕاوە با بەهێزی لەگەڵ بکات نەیەڵێ بە پێشی دا بڕوات چونکە ئەمە شەیتانە).

## باب فضل الصلاة لوَقتها

٩٣. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مَسعُود رَضيَ اللهُ عَنْهُ قَال: سَأَلْتُ رَسُول الله (ﷺ) أَيُّ الْعَمَلِ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ؟ قَالَ: ((الصَّلَاةُ عَلَى وَقْتِهَا))، قُلت: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ ((بِرُّ الْوَالِدَيْنِ))، قلت: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: ((الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ)).

### (بەشی/ فەزلی نوێژکردن لە کاتی خۆیدا)

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (رضي الله عنه) دەفەرموێ پرسیارم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد چ کردەوەیەك خۆشەویستە لەلای خوا، فەرمووی: (نوێژ لە کاتی خۆی بکرێت، ووتم لە پاشان چی تر فەرمووی چاکە کردن لەگەڵ دایك و باوکدا، ووتم لە پاشان چی تر فەرمووی جیهاد و تێکۆشان لە پێناو خوا).

## باب الصلوات الخمس كفارة

٩٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: ((أَرَأَيْتُمْ لَوْ أَنَّ نَهَرًا بِبَابِ أَحَدِكُمْ يَغْتَسِلُ فِيهِ كُلَّ يَوْمٍ خَمْسًا، مَا تَقُولُ ذَلِكَ يُبْقِي مِنْ دَرَنِهِ))؟ قَالُوا: لَا يُبْقِي مِنْ دَرَنِهِ شَيْئًا، قَالَ: ((فَذَلِكَ مِثْلُ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسِ، يَمْحُو اللَّهُ بِهِ الْخَطَايَا)).

## (بەشی/ پێنج نوێژە فەرزەکان دەبنە کەفارەت بۆ گوناهەکان)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە گوێی لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو: (ئایا ئەگەر لەبەر دەرگای ماڵی هەر یەکێکتان رووبارێك هەبێ و هەموو رۆژێ پێنج جار خۆتانی لێ بشۆن ئایا هیچ پیس و چڵکنی لەلاشەتان دەمێنێ؟ هاوەڵانی وتیان نەخێر، فەرمووی ئەو پێنج نوێژە فەرزانەش بەهۆیەوە خوای گەورە گوناه و تاوانی دەسڕێتەوە).

## باب إثم من فاتَتْهُ العصر

٩٥. عَنْ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((الَّذِي تَفُوتُهُ صَلَاةُ الْعَصْرِ فَكَأَنَّمَا وُتِرَ أَهْلَهُ وَمَالَهُ)).

## (بەشی/ تاوانی کەسێ نوێژی عەسر بفەوتێنێ)

لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێ: (ئەوەی نوێژی عەسر بفەوتێنێ و نەیکات هەروەکو ماڵ و منداڵی بە فەوتان چووبێت وایە).

٩٦. عَنْ أَبِي الْمَلِيحِ قَال: كُنَّا مَعَ بُرَيْدَةَ فِي غَزْوَةٍ فِي يَوْمٍ ذِي غَيْمٍ، فَقَالَ: بَكِّرُوا بِصَلَاةِ الْعَصْرِ فَإِنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: ((مَنْ تَرَكَ صَلَاةَ الْعَصْرِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُ)).

**ئەبی مولیح دەفەرموێ لەگەڵ بورەیدە بووین لە جەنگی (ذي الغیم) فەرمووی پەلە بکەن بۆ ئەنجامدانی نوێژی عەسر چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی کەسێ نوێژی عەسری نەکرد ئەوا هەموو کردەوەی چاکەی بەتاڵ دەبێتەوە.**

## باب فضل الصلاة العصر

٩٧. عَنْ جَرِيرِ البجلي رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَال: كُنَّا مع النَّبِيِّ (ﷺ) فَنَظَرَ إِلَى الْقَمَرِ لَيْلَةً فَقَال: ((إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ عَزَّ وَجلَّ كَمَا تَرَوْنَ هَذَا الْقَمَرَ، لَا تُضَامُّونَ، فَإِن اسْتَطَعْتُمْ أَلَّا تُغْلَبُوا عَلَى صَلَاةٍ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا فَافْعَلُوا))، ثُمَّ قَرَأَ ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ ٱلْغُرُوبِ﴾.

## (فەزلی نوێژی عەسر)

**جەریری بەجەلی (رضي الله عنه) دەفەرمووێ ئێمە لەخزمەت پێغەمبەری خوا بووین (ﷺ) کە تەماشای مانگی کرد لە شەوی چواردەیە فەرموی ئێوە خوای گەورە دەبینن لە قیامەت هەروەکو ئەم مانگەتان بینیوە بە راستەقینەیی و بێ نارەحەتی، وە ئەگەر تواناتان هەیە ئاگاداری نوێژی بەیانی و نوێژی عەسر بن مەیان فەوتێنن، لە پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە:**

﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ ٱلْغُرُوبِ﴾

واتە: (ئەی پێغەمبەر بۆ بەرگەگرتنی ئەو گیروگرفتەی دێتە رێت ستایشی خوا بکە پێش خۆرهەڵاتن و پێش ئاوابوونی تەسبیحات و سوپاسی خوا بکەن).

## باب الآذان قبل الذهاب الوقت

٩٨. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ قال: سِرْنَا مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) لَيْلَةً فَقَالَ بَعْضُ الْقَوْمِ: لَوْ عَرَّسْتَ بِنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: ((أَخَافُ أَنْ تَنَامُوا عَنْ الصَّلَاةِ))، قَالَ بِلَالٌ: أَنَا أُوقِظُكُمْ، فَاضْطَجَعُوا، وَأَسْنَدَ بِلَالٌ ظَهْرَهُ إِلَى رَاحِلَتِهِ، فَغَلَبَتْهُ عَيْنَاهُ فَنَامَ، فَاسْتَيْقَظَ النَّبِيُّ عَلَيهِ الصَّلَاةُ والسَّلام وَقَدْ طَلَعَ حَاجِبُ الشَّمْسِ فَقَالَ: ((يَا بِلَالُ، أَيْنَ مَا قُلْتَ))؟ قَالَ: مَا أُلْقِيَتْ عَلَيَّ نَوْمَةٌ مِثْلُهَا قَطُّ، قَالَ: ((إِنَّ اللَّهَ قَبَضَ أَرْوَاحَكُمْ حِينَ شَاءَ، وَرَدَّهَا عَلَيْكُمْ حِينَ شَاءَ، يَا بِلَالُ قُمْ فَأَذِّنْ بِالنَّاسِ بِالصَّلَاةِ))، فَتَوَضَّأَ، فَلَمَّا ارْتَفَعَتْ الشَّمْسُ وَابْيَاضَّتْ قَامَ فَصَلَّى.

## (بەشی/ نوێژ لە کاتی خۆی)

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی قەتادە (رضي الله عنه) دەفەرموێ لە سەفەرێکا بووین لەگەڵ پێغەمبەری خوادا شەویوو کەوتینە رێ هەندێك لە هاوەڵان وتیان ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) خۆزگە کەمێك بخەوتینانە!! ئەویش فەرمووی ئەترسم خەوتان لێ بکەوێ و ئاگاتان لە نوێژی بەیانی نەبێتەوە ئینجا بیلال فەرمووی بخەون من خەبەرتان دەکەمەوە، جا ئەوانیش نوستن و بیلالیش ووڵاخەکانی یەخ کرد و پشتی پێوەی دا وخەو زۆری بۆ هێنا چاوی چووە خەو و خەوی لێکەوت، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) خەبەری بۆوە خۆرهەڵات بوو فەرمووی ئەی بیلال تۆ نەتگوت من خەبەرتان دەکەمەوە؟

ئینجا بیلال فەرمووی ئەی پێغەمبەری خوا هەرگیز خەوی وا قورسم لێ نەکەوتووە، فەرمووی ئەمە خواستی خوابوو لەسەر خواستی خوا خەوتان لێکەوتووە تا ئەو کاتەی حەزی کردوە ئینجا بە ئاگای هێناونەوە و گیانی کردن بەبەرتانەوە ئەوجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ئەی بیلال هەڵسە بانگ بدە بە گوێی خەڵکیدا بۆ نوێژ وە خۆی دەستنوێژی گرت و لەو کاتەدا ڕۆژ تەواو بەرز بۆتەوە هەڵسا نوێژی کرد.

## باب وجوب صلاة الجماعة

٩٩. قَالَ الْحَسَنُ: إِنْ مَنَعَتْهُ أُمُّهُ عَنْ الْعِشَاءِ فِي الْجَمَاعَةِ شَفَقَةً عَلَيهِ لَمْ يُطِعْهَا.

## (بەشی/ فەرزبوونی نوێژی بە کۆمەڵ)

حەسەن دەفەرمووێ: ئەگەر دایکێك ڕۆڵەکەی قەدەغە بکات لە چوونە مزگەوت بۆ نوێژی عیشا (خەوتنان) لەبەر سۆز و خۆشەویستی با بەگوێی نەکات و بچێ.

١٠٠. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ بِحَطَبٍ فَيُحْطَبَ، ثُمَّ آمُرَ بِالصَّلَاةِ فَيُؤَذَّنَ لَهَا، ثُمَّ آمُرَ رَجُلًا فَيَؤُمَّ النَّاسَ ثُمَّ أُخَالِفَ إِلَى رِجَالٍ فَأُحَرِّقَ عَلَيْهِمْ بُيُوتَهُمْ)).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە نیازم هەبوو فەرمان بدەم بە کۆمەڵێ دارم بۆ کۆبکەنەوە و فەرمان بە یەکێك بکەم بەرنوێژەکە بۆ خەڵکی بکات و من لەگەڵ کۆمەڵێکا بچم بۆ سەر ئەو کەسانەی کە ئامادەی نوێژی جەماعەت نابن،ماڵەکانیان بەسەردا بسوتێنم).

## باب فضل صلاة الجماعة

١٠١. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: ((صَلَاةُ الْجَمَاعَةِ تَفْضُلُ صَلَاةَ الْفَذِّ بِخَمْسٍ وَعِشْرِينَ دَرَجَةً)).

### (فەزلی/ نوێژی بە کۆمەڵ (جماعە))

ئەبو سەعیدی خودری (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە گوێی لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو دەیفەرموو: (نوێژی بە کۆمەڵ فەزلی زیاترە و خێرترە لە نوێژی بە تەنیا بە بیست و پێنج پلە).

١٠٢. عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشعَرِي قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): ((أَعْظَمُ النَّاسِ أَجْرًا فِي الصَّلَاةِ أَبْعَدُهُمْ فَأَبْعَدُهُمْ مَمْشًى، وَالَّذِي يَنْتَظِرُ الصَّلَاةَ حَتَّى يُصَلِّيَهَا مَعَ الْإِمَامِ أَعْظَمُ أَجْرًا مِنْ الَّذِي يُصَلِّي ثُمَّ يَنَامُ)).

ئەبو موسای ئەشعەری (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ئەو کەسە خێری گەورەترە کە دەچێ بۆ نوێژی بە کۆمەل هەتا رێگەیان دوورتر بێت، ئەو کەسەش کە چاوەڕوانی نوێژ دەکات بە کۆمەڵ بیکات لەگەڵ ئیمامدا پاداشتی گەلێ گەورەترە لەو کەسەی کە نوێژ دەکا و لە پاشان دەخەوێ.

## باب فضل التهجير الى الظهر والمحافظة على العشاء

١٠٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي بِطَرِيقٍ وَجَدَ غُصْنَ شَوْكٍ عَلَى الطَّرِيقِ فَأَخَّرَهُ فَشَكَرَ اللَّهُ لَهُ فَغَفَرَ لَهُ))، ثُمَّ قَالَ: ((الشُّهَدَاءُ خَمْسَةٌ: الْمَطْعُونُ، وَالْمَبْطُونُ، وَالْغَرِيقُ، وَصَاحِبُ الْهَدْمِ، وَالشَّهِيدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ)). وَقَالَ: ((لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ مَا فِي النِّدَاءِ وَالصَّفِّ الْأَوَّلِ، ثُمَّ لَمْ يَجِدُوا إِلَّا أَنْ يَسْتَهِمُوا عَلَيهِ لَاسْتَهَمُوا، وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي التَّهْجِيرِ لَاسْتَبَقُوا إِلَيْهِ، وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي الْعَتَمَةِ وَالصُّبْحِ لَأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا)).

## (بەشی/ زوو چوون بۆ نوێژی نیوەڕۆ و پارێزگاری لە نوێژی عیشا کردن)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: جارێ پیاوێ بە ڕێگایەکا دەڕۆیی لقی دڕکێکی دیت لەسەر ڕێگاکە کەوتبوو دووری خستەوە لە ڕێگەکە، خودا لەسەر ئەوە سوپاسی کرد و لێی خۆش بوو، لە پاشان فەرمووی ئەم پێنج کەسە شەهیدن، کەسێ بە تاعون بمرێ شەهیدە و کەسێ بە دەردی ژانە سك بمری و کەسێ لە ئاودا بخنکێ کەسێ دیوار بروخێ بەسەریا و بمرێ وە کەسێ لە پێناوی خودا بکوژرێ لە جەنگا ئەوانە شەهیدن.

وە فەرمووی وە ئەگەر خەڵکی بزانن لەبانگدان و ڕیزی یەکەمی نوێژی بەکۆمەڵ چەندە خێری هەیە ئەگەر هیچ چارەیان نەبوایە جگە لەتیروپشك کردن بۆی، تیروپشکیان دەکرد وە ئەگەر بزانن کە چەندە خێری هەیە زوو چوون بۆ نوێژی قرچەی گەرما و نیوەڕۆ بە ڕاکردن دەچوون بۆی وە ئەگەر دەیانزانی خێری نوێژی بەکۆمەڵی بەیانی و خەوتنان (عیشا) چەندە گەورەیە ئەوا بۆی دەچوون ئەگەر بە گاگۆلکەیی بوایە دەهاتن بۆی.

## باب فضل المساجد، وسبعة يظلهُم اللهُ في ظلهِ

١٠٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ تَعالى عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمْ اللَّهُ فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لَا ظِلَّ إِلَّا ظِلُّهُ: الْإِمَامُ الْعَادِلُ، وَشَابٌّ نَشَأَ فِي عِبَادَةِ رَبِّهِ، وَرَجُلٌ قَلْبُهُ مُعَلَّقٌ فِي الْمَسَاجِدِ، وَرَجُلَانِ تَحَابَّا فِي اللَّهِ اجْتَمَعَا عَلَيْهِ وَتَفَرَّقَا عَلَيْهِ، وَرَجُلٌ طَلَبَتْهُ امْرَأَةٌ ذَاتُ مَنْصِبٍ وَجَمَالٍ فَقَالَ إِنِّي

أَخَافُ اللَّهَ، وَرَجُلٌ تَصَدَّقَ أَخْفَى حَتَّى لَا تَعْلَمَ شِمَالُهُ مَا تُنْفِقُ يَمِينُهُ، وَرَجُلٌ ذَكَرَ اللَّهَ خَالِيًا فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ)).

## (بەشی/ فەزلی مزگەوت و ئەو حەوت کەسەی خوای گەورە سێبەریان دەکات لە سێبەری خۆی)

**لە ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێرنەوە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە دەفەرموێ: (حەوت چین هەن خوای گەورە سێبەریان دەکات لەو رۆژەی کەوا هیچ سێبەرێ نییە جگە لە سێبەری ئەو، ئەوانیش سەردار و سەرکردەی دادپەروەروە، گەنجێك تەمەنی خۆی لە خواپەرستی بەکارهێنابێ، و وە پیاوێ دڵی پەیوەست بێ بە مزگەوتەوە، وە دوو پیاو لەبەر رەزامەندی خوا یەکتریان خۆش بوێ و کۆبونەوە و لەیەك جیابوونەوەیان بۆ خوا بێت و، وە پیاوێ ئافرەتێکی شۆخ و شەنگ و جوان و بەبنەماڵە داوای کاری ناڕەوای لێ بکات ئەویش و بڵێ لە خوا دەترسم، وە پیاوێ چاکەیەکی کرد کە ئەوەندە بەپەنهانی بیکا هەتا ئەگەر بە دەستی راستی ئەنجامی دا دەستی چەپی بێ ئاگا بێ لێی، وە پیاوێ یادی خوا بکا و فرمێسك بە چاوەکانی بێتەخوار لە ترسی خوا.**

## باب إذا حضر الطعام

**١٠٥. عَنْ هِشَامِ بن عروة قَالَ: سَمِعْتُ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: ((إِذَا وُضِعَ الْعَشَاءُ وَأُقِيمَتِ الصَّلَاةُ فَابْدَءُوا بِالْعَشَاءِ)).**

## (بەشی/ ئەوکاتەی خواردن ئامادەکرا)

هیشامی کوڕی عوروە دەفەرموێ گوێم لە عائیشە بوو (رضي الله عنها)لە پێغەمبەری خوا گێراویەتەوە (ﷺ) کە دەفەرمووێ: (ئەگەر کاتی نوێژ هات و خواردن دانرا ئەوا لە پێشدا خواردن بخۆن دوایی نوێژەکە ئەنجام بدە).

١٠٦.عَنْ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهُ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((إِذَا كَانَ أَحَدُكُمْ عَلَى الطَّعَامِ فَلَا يَعْجَلْ حَتَّى يَقْضِيَ حَاجَتَهُ مِنْهُ وَإِنْ أُقِيمَتْ الصَّلَاةُ)).

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ئەگەر یەکێکتان لەسەر خواردن بوو با پەلە نەکات تاکو خواردنەکە تەواو دەخوا ئەگەر قامەتی نوێژ دەکرا.

## باب إذا دُعيَ الإمام الى الصلاة وبِيَدهِ ما يأكل

١٠٧. عَنْ جَعْفَرُ بْنُ عَمْرِو بْنِ أُمَيَّةَ أَنَّ أَبَاهُ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعلى آلِهِ وَسَلَّمَ يَأْكُلُ ذِرَاعًا يَحْتَزُّ مِنْهَا فَدُعِيَ إِلَى الصَّلَاةِ فَقَامَ فَطَرَحَ السِّكِّينَ فَصَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ.

## (بەشی/ ئەگەر بانگی ئیمام کرا بۆ نوێژ و ئەویش پارویَ خواردنی لەدەستدا بوو)

جەعفەری کوڕی عەمری کوڕی ئومەیە لە باوکی دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێ پێغەمبەری خوام بینی (ﷺ) باڵی مەڕێکی لە دەست دا بوو دەیخوارد و لەو کاتەدا بانگی نوێژ درا هەڵساوە چەقۆکەی فڕی دا و نوێژی کرد و دەستنوێژی نەشۆرد.

## باب من قالَ لِيؤذن في السفر مؤذن واحد

١٠٨. عَنْ مَالِكِ بْنِ الْحُوَيْرِثِ قال: أَتَيْتُ للنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلى آلِهِ وَسَلَّمَ فِي نَفَرٍ مِنْ قَوْمِي، فَأَقَمْنَا عِنْدَهُ عِشْرِينَ لَيْلَة، وَكَانَ رَحِيمًا رَفِيقًا، فَلَمَّا رَأَى شَوْقَنَا إِلَى أَهَالِينَا قَالَ: ((ارْجِعُوا فَكُونُوا فِيهِمْ، وَعَلِّمُوهُمْ وَصَلُّوا، فَإِذَا حَضَرَتْ الصَّلَاةُ فَلْيُؤَذِّنْ لَكُمْ أَحَدُكُمْ، وَلْيَؤُمَّكُمْ أَكْبَرُكُمْ)).

## (بەشی/ کەسێ بانگ بدات لە سەفەردا بە بانگەوێژێك)

مالیکی کوڕی حوەیرس دەفەرمووێ لەگەڵ کۆمەڵێکا لە خزمی خۆم چووین بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) و بیست شەو لەلای ماینەوە وە زۆر بەزەیی و دڵنەرم بوو وە کەزانی زۆر بە پەرۆشین بۆ نیوخانەوادەکەمان فەرمووی بگەڕێنەوە بۆ ناو هاودێهاتی خۆتان فێری نوێژییان بکەن و وە ئەگەر کاتی هات و با یەکێکتان بانگ بدات و کامتان بە تەمەنترە با ببێتە ئیمام بۆتان.

## باب الذهاب إلى الصلاة، وَمنْ رَابَهُ في شئ في صَلَاتِهِ

١٠٩. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ عَلَيهِ الصَّلاةُ والسَّلام قَال: ((إِذَا سَمِعْتُمْ الْإِقَامَةَ فَامْشُوا إِلَى الصَّلَاة، وَعَلَيْكُمْ بِالسَّكِينَةِ وَالْوَقَارِ، وَلَا تُسْرِعُوا، فَمَا أَدْرَكْتُمْ فَصَلُّوا وَمَا فَاتَكُمْ فَأَتِمُّوا)).

## (بەشی چوون بۆ نوێژ و کەسێ شتێکی لێ روودا لە ناو نوێژدا)

لە ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێ: (ئەگەر گوێتان لەبانگ و قامەتی نوێژ بوو بۆی بچن بە

لەسەرخۆیی و بەهێمنی بڕۆن بۆ نوێژ و بە هەڵە داوان نەچن وە ئەوەی پێگەیشتن بیکەن وە ئەوەی پیانەگەیشتن دوایی تەواوی بکەن.

١١٠. قالَ صَلى اللهُ عَلَيهِ وآلِه وَسلَّم: ((مَنْ رَابَهُ شَيْءٌ فِي صَلَاتِه فَلْيُسَبِّحْ)).

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (کەسێ لە نوێژا شتێکی لێ روودا یان سەهوی کرد با بڵێ (سبحان الله)).

## باب المرأة وحدها تكون صفاً

١١١. عَنْ أَنَس بْنِ مَالِكٍ قَال: صَلَّيْتُ أنَا وَيَتِيمٌ فِي بَيْتِنَا خَلْفَ النَّبِيِّ عَلَيهِ الصَّلاةُ وَالسَّلام وَأُمِّي أُمُّ سُلَيْمٍ خَلْفَنَا.

## (بەشی/ ئافرەت لە ریزێکی تر بە تەنیا رادەوەستێ لە نوێژ)

ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەفەرموێ لەگەڵ پێغەمبەری خوا نوێژم دەکرد من و هەتیوێك لەماڵەکەمان لە پشت پێغەمبەری خوا (ﷺ) وە دایکم ئوم سولەیم لە پشت ئێمەوە نوێژی کرد.

## (باب فضل الضعفاء)

١١٢. قالَ رَسُول الله (ﷺ): ((أبغوني في ضعفائكم فإنما ترزقون بضعفائكم)).

## (بەشی/ فەزلی بێ هێزان (الضعفاء))

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (ئاگاتان لە بێ هێزان و بێنەوایان بن چونکە بەهۆی پاڕانەوەی ئەوانەوە رزق و رۆزیتان و سەرکەوتنان بۆ دێت).

## باب من رفعَ رأسهُ قبل الإمام

١١٣. عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ رَضيَ اللهُ عَنْهُ عَنْ النَّبيِّ (ﷺ) قَال: ((أَمَا يَخْشَى أَحَدُكُمْ -أَوْ أَلا يَخْشَى أَحَدُكُمْ- إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ قَبْلَ الْإِمَامِ أَنْ يَجْعَلَ اللَّهُ رَأْسَهُ رَأْسَ حِمَارٍ، أَوْ يَجْعَلَ اللَّهُ صُورَتَهُ صُورَةَ حِمَارٍ)).

**ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە دەفەرمویَ ئایا ئەو کەسەی کە لە سوجدە و روکوعا لە پێش ئیمام سەری بەرز دەکاتەوە ناترسێ خوای گەورە سەری بکات بە سەری گوێدرێژ یان وێنەی بکات بە وێنەی گوێدرێژ.**

## باب إمامة العبد والمولى

١١٤. عَنْ أَنَسٍ رَضيَ اللهُ عَنْهُ عَنْ النَّبيِّ (ﷺ) قَال: ((اسْمَعُوا وَأَطِيعُوا، وَإِنْ اسْتُعْمِلَ (عَلَيكُم) حَبَشِيٌّ كَأَنَّ رَأْسَهُ زَبِيبَةٌ)).

## (بەشی/ پێشنوێژی (ئیمام)ی بەندە و کۆیلە)

**ئەنەس (رضي الله عنه) لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە کە دەفەرمووێ: (گوێ بگرن و گوێڕایەڵی بکەن ئەگەر هاتوو ئەوەی کرا بە سەروەرتان بەندەیەکی حەبەشی بێت وسەری وەکو مێژوو رەش بێت).**

## (باب تخفيف الإمام)

١١٥. عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ رَضيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَال: ((إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلْيُخَفِّفْ، فَإِنَّ فِيهِمْ الضَّعِيفَ وَالسَّقِيمَ وَالْكَبِيرَ وَذا الحاجَة، وَإِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ لِنَفْسِهِ فَلْيُطَوِّلْ مَا شَاءَ)).

## (بەشی سووككردنی پێش نوێژ (تخفيف الامام)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ئەگەر یەکێکتان پێش نوێژی بۆ خەڵکی کرد با بە سوکی بیکات و درێژەی پێ نەدات چونکە پیاوی بێ هێز و نەخۆش و بەساڵاچوو و خاوەن پێویستی تیایە، بەڵام ئەگەر بۆ خۆی نوێژی کرد با چەند حەزی لێیەتی درێژی بکاتەوە.

١١٦.وَقَد أَقْبَلَ رَجُلٌ بِنَاضِحَيْنِ وَقَدْ جَنَحَ اللَّيْلُ، فَوَافَقَ مُعَاذًا يُصَلِّي، فَتَرَكَ نَاضِحَهُ وَأَقْبَلَ إِلَى مُعَاذٍ، فَقَرَأَ بِسُورَةِ الْبَقَرَةِ أَوْ النِّسَاءِ فَانْطَلَقَ الرَّجُلُ وَبَلَغَهُ أَنَّ مُعَاذًا نَالَ مِنْهُ فَأَتَى النَّبِيّ (ﷺ) فَشَكَا إِلَيْهِ مُعَاذًا، فَقَالَ رَسُول الله (ﷺ) (لمُعاذ): ((يَا مُعَاذُ، أَفَتَّانٌ أَنْتَ -أَوْ أَفَاتِنٌ، ثَلَاثَ مِرَارٍ- فَلَوْلَا صَلَّيْتَ بِسَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأعلى وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا، وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى، فَإِنَّهُ يُصَلِّي وَرَاءَكَ الْكَبِيرُ وَالضَّعِيفُ وَذُو الْحَاجَةِ)).

دەگێرنەوە کە دوو پیاو هاتن بە دوو ووشترەوە ئاویان پێ بوو بۆ خواردنەوە وە شەو داهات وە رازی بوون کە موعازی کوڕی جەبەل (رضي الله عنه) پێش نوێژیان بۆ بکات و ووشترەکەیان بەجێ هێلا و نوێژییان دەست پێ کرد وە موعازیش لە پاش فاتیحە سورەتی (البقرة و النساء)ی خوێند پیاوێك نوێژەکەی بڕی و هەڵسابو چوو بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) شکاتی لە موعاز کرد کە نوێژەکەی زۆر درێژکردۆتەوە وە پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرموی ئەی موعاز تۆ دەتەوێ فیتنە و ئاژاوە دروست بکەی (سێ جار) ئەم ووتەی دوبارە کردەوە ئایا نەدەبوو کە سورەتی (سبح إسم ربِكَ الأعلى) وەیان سورەتی (والشمس وضحاها، والليل إذا يغشى) بخوێنی چونکە خەڵکانێك لە دوای تۆ نوێژ دەکەن کە پیر و پەککەوتەن خاوەن پێویستین).

١١٧. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ كَانَ يُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ يَرْجِعُ فَيَؤُمُّ قَوْمَهُ.

جابیر دەگێڕێتەوە لەعەبدوڵلا کە موعازی کوڕی جەبەل لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی دەکرد و دەگەڕایەوە بۆ لای خزمەکانی و نوێژی بە کۆمەڵی بۆ دەکردن.

١١٨. عَنْ أَنَس قال: كانَ رَسُول الله (ﷺ) يوجز الصَّلاة وَيُكَمِّلُها. وَقالَ صَلى اللهُ عَلَيهِ وَآلهِ وَسلَّم: ((ائْتَمُّوا بِي وَلْيَأْتَمَّ بِكُمْ مَنْ بَعْدَكُمْ)).

ئەنەس (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا نوێژی بە تەواوی دەکرد و کورتی و سوکی دەکرد و وە دەفەرموێ پەیڕەوم بکەن.

مەبەستی ریزی یەکەم و و ەریزی دوای ئێوەش با چاو لە ئێوە بکەن.

## باب إعتدال القائمين

١١٩. عَنْ النعمان بن بشير رَضيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّ النَّبيَّ صَلى الله عَلَيهِ وَعَلى آلهِ وَسَلَّم قال: ((لَتُسَوُّنَّ صُفُوفَكُمْ أو لَيُخَالِفَنَّ الله بَينَ وُجُوهِكُمْ)).

## (بەشی/ تەواو وەستان لە پێوە)

نوعمانی کوڕی بەشیر (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی لە ریزی نوێژدا ریزەکانتان رێك و راست کەن وئەگەر ئەوە نەکەن خودا رووتان لێك جیاواز و تاق و لۆق دەکات و پەرتەوازە دەبن.

١٢٠. عَنْ أَنَس قَال: أُقيمَتْ الصَّلَاةُ فَأَقْبَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِوَجْهِهِ فَقَالَ: ((أَقِيمُوا صُفُوفَكُمْ وَتَرَاصُّوا فَإِنِّي أَرَاكُمْ مِنْ وَرَاءِ ظَهْرِي)).

ئەنەس (رضي الله عنه) دەفەرمویٚ قامەتی نویٚژ کرا و پیٚغەمبەری خوا (ﷺ) هات بۆ ناومان و تەماشای ئیٚمەی کرد و فەرموی ریٚزەکانتان ریٚك و راست بکەن چونکە من لە پشتەوە چاوم لیٚتانە دەتانبینم.

١٢١. وَعَنْهُ أيضاً عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَال: ((سَوُّوا صُفُوفَكُمْ فَإِنَّ تَسْوِيَةَ الصُّفُوفِ مِنْ إِقَامَةِ الصَّلَاةِ)).

دیسان لە ئەنەسەوە ئەویش لە پیٚغەمبەری خوا دەگریٚتەوە کە دەفەرمویٚ ریزەکانتان ریٚك و راست بکەن چونکە راست بوونی ریزەکان لە تەواو و کامیل بوونی نویٚژە.

## باب ما يقول بعد التكبير

١٢٢. عَنْ أبي هُرَيْرَةَ كَانَ النَّبِيّ (ﷺ) يَسْكُتُ بَيْنَ التَّكْبِيرِ وبَيْنَ الْقِرَاءَةِ إِسْكَاتَةً وَيَقول بَينَ التكبير وقراءَة الفاتحة: ((اللَّهُمَّ بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ، اللَّهُمَّ نَقِّنِي مِنْ الْخَطَايَا كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الْأَبْيَضُ مِنْ الدَّنَسِ، اللَّهُمَّ اغْسِلْ خَطَايَايَ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ)).

## (بەشی/ چ دەڵیٚی پاش دابەستنی نویٚژ (الله أكبر) کردن و پیٚش فاتیحا)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمویٚ پیٚغەمبەری خوا کاتیٚ نویٚژی دەست پیٚ دەکرد کەمیٚك بیٚ دەنگ دەبوو لە نیٚوان (الله أكبر)ی نویٚژ دابەستن و فاتیحا خویٚندندا، دەیووت: (((اللَّهُمَّ بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ، اللَّهُمَّ نَقِّنِي مِنْ الْخَطَايَا كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الْأَبْيَضُ مِنْ الدَّنَسِ، اللَّهُمَّ اغْسِلْ خَطَايَايَ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ))

واتە: خوایە لە گوناھ و تاوان دوورم خەرەوە، وەك دووری نێوان خۆرهەلآت و خۆرئاوا، خوایە لە گوناھ پاکم کەیتەوە هەروەکو چڵن بەرگی سپی لە چڵك پاك دەکەیتەوە وە خودایە گوناهەکانم بە ئاوو بەفر و تەرزە بشۆرەوە.

## باب رفع البصر الى السماءِ

١٢٣.عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ رَضي اللهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُول اللهِ (ﷺ) قال: ((مَا بَالُ أَقْوَامٍ يَرْفَعُونَ أَبْصَارَهُمْ إِلَى السَّمَاءِ فِي صَلَاتِهِمْ؟ لَيَنْتَهُنَّ عَنْ ذَلِكَ أَوْ لَتُخْطَفَنَّ أَبْصَارُهُمْ)).

## (بەشی/ سەربەرزکردنەوە بۆ ئاسمان)

ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (لەبەرچی هەندێ کەس چاو هەڵدەبڕن لەناو نوێژا بۆ ئاسمان بۆ وادەکەن؟! دەبێ وازبهێنن لەم کارە ناشرینە یان بێگومان چاویان کوێر دەبێ).

## باب الإلتفات في الصلاة

١٢٤. عَنْ عَائِشَةَ رَضيَ الله عَنْها قَالَتْ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللّهِ (ﷺ) عَنْ االْتِفَاتِ فِي الصَّلَاةِ، فَقَالَ: ((هُوَ اخْتِلَاسٌ يَخْتَلِسُهُ الشَّيْطَانُ مِنْ صَلَاةِ الْعَبْدِ)).

## (بەشی/ ئاوڕدانەوە لە نوێژدا)

عائیشە خان (رضي الله عنها) دەفەرموێ پرسیارم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد دەربارەی ئاوڕدانەوە لەناو نوێژدا فەرمووی ئەوە لێ دزینەوەیەکە شەیتان لێی دەدزێ لە نوێژی بەندەدا.

## باب جهر الإمام بالتأمين وفضله

١٢٥.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ الله عَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: ((إِذَا أَمَّنَ الْإِمَامُ فَأَمِّنُوا، فَإِنَّهُ مَنْ وَافَقَ تَأْمِينُهُ تَأْمِينَ الْمَلَائِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ)).

وَقَالَ ابْنُ شِهَابٍ: وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((آمِين)).

## (بەشی ئامین كردنی ئیمام لەناونوێژدا و فەزل و گەورەیی)

ئەبو هورەیره (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) كە دەفەرموێ ئەگەر ئیمام ووتی ئامین ئێوەش ئامینی لەگەڵ بكەن چونكە هەر كاتێ ئامین كردنی ئێوە و ئامینی فریشتەكانی خوا گەیشت بە یەكدا خودا لە تاوانی لەوە وپێشتان دەبورێت، ئیبن شەهاب دەفەرموێ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو (ئامین).

## باب فضل السجُود

١٢٦. عَنْ سَعِيدِ بْنُ الْمُسَيَّبِ وَعَطَاءُ بْنُ يَزِيدَ أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَخْبَرَهُمَا أَنَّ النَّاسَ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَلْ نَرَى رَبَّنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ قَالَ: ((هَلْ تُمَارُونَ فِي الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ لَيْسَ دُونَهُ سَحَابٌ))؟ قَالُوا: لَا، يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: ((فَهَلْ تُمَارُونَ فِي الشَّمْسِ لَيْسَ دُونَهَا سَحَابٌ))؟ قَالوا: لَا. قَالَ: ((فَإِنَّكُمْ تَرَوْنَهُ كَذَلِكَ، فَيَقول: مَنْ كَانَ يَعْبُدُ شَيْئًا فَلْيَتَّبِعْ، فَمِنْهُمْ مَنْ يَتَّبِعُ الشَّمْسَ وَمِنْهُمْ مَنْ يَتَّبِعُ الْقَمَرَ، وَمِنْهُمْ مَنْ يَتَّبِعُ الطَّوَاغِيتَ، وَتَبْقَى هَذِهِ الْأُمَّةُ فِيهَا مُنَافِقُوهَا فَيَأْتِيهِمْ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فَيَقُولُ: أَنَا رَبُّكُمْ. فَيَقُولُونَ: هَذَا مَكَانُنَا حَتَّى يَأْتِيَنَا رَبُّنَا، فَإِذَا جَاءَ رَبُّنَا عَرَفْنَاهُ، فَيَأْتِيهِمْ اللَّهُ فَيَقُولُ أَنَا رَبُّكُمْ، فَيَقُولُونَ: أَنْتَ رَبُّنَا، فَيَدْعُوهُمْ فَيُضْرَبُ الصِّرَاطُ بَيْنَ ظَهْرَانَيْ جَهَنَّمَ فَأَكُونُ أَوَّلَ مَنْ يَجُوزُ مِنْ الرُّسُلِ بِأُمَّتِهِ، وَلَا يَتَكَلَّمُ يَوْمَئِذٍ أَحَدٌ إِلَّا الرُّسُلُ، وَكَلَامُ

الرُّسُلِ يَوْمَئِذٍ: اللَّهُمَّ سَلِّمْ سَلِّمْ. وَفِي جَهَنَّمَ كَلَالِيبُ مِثْلُ شَوْكِ السَّعْدَانِ، هَلْ رَأَيْتُمْ شَوْكَ السَّعْدَانِ؟ قَالُوا: نَعَمْ. قَالَ: فَإِنَّهَا مِثْلُ شَوْكِ السَّعْدَانِ، غَيْرَ أَنَّهُ لَا يَعْلَمُ قَدْرَ عِظَمِهَا إِلَّا اللَّهُ، تَخْطَفُ النَّاسَ بِأَعْمَالِهِمْ فَمِنْهُمْ مَنْ يُوبَقُ بِعَمَلِهِ وَمِنْهُمْ مَنْ يُخَرْدَلُ ثُمَّ يَنْجُو، حَتَّى إِذَا أَرَادَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ رَحْمَةَ مَنْ أَرَادَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، أَمَرَ اللَّهُ الْمَلَائِكَةَ أَنْ يُخْرِجُوا مَنْ كَانَ يَعْبُدُ اللَّهَ فَيُخْرِجُونَهُمْ وَيَعْرِفُونَهُمْ بِآثَارِ السُّجُودِ، وَحَرَّمَ اللَّهُ عَلَى النَّارِ أَنْ تَأْكُلَ أَثَرَ السُّجُودِ فَيَخْرُجُونَ مِنَ النَّارِ، فَكُلُّ ابْنِ آدَمَ تَأْكُلُهُ النَّارُ إِلَّا أَثَرَ السُّجُودِ، فَيَخْرُجُونَ مِنَ النَّارِ قَدْ امْتَحَشُوا فَيُصَبُّ عَلَيْهِمْ مَاءُ الْحَيَاةِ، فَيَنْبُتُونَ كَمَا تَنْبُتُ الْحِبَّةُ فِي حَمِيلِ السَّيْلِ ثُمَّ يَفْرُغُ اللَّهُ مِنَ الْقَضَاءِ بَيْنَ الْعِبَادِ وَيَبْقَى رَجُلٌ بَيْنَ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ، وَهُوَ آخِرُ أَهْلِ النَّارِ دُخُولًا الْجَنَّةَ مُقْبِلٌ بِوَجْهِهِ قِبَلَ النَّارِ، فَيَقُولُ يَا رَبِّ اصْرِفْ وَجْهِي عَنْ النَّارِ قَدْ قَشَبَنِي رِيحُهَا وَأَحْرَقَنِي ذَكَاؤُهَا، فَيَقُولُ: هَلْ عَسَيْتَ إِنْ فُعِلَ ذَلِكَ بِكَ أَنْ تَسْأَلَ غَيْرَ ذَلِكَ؟ فَيَقُولُ: لَا وَعِزَّتِكَ فَيُعْطِي اللَّهَ مَا يَشَاءُ مِنْ عَهْدٍ وَمِيثَاقٍ فَيَصْرِفُ اللَّهُ وَجْهَهُ عَنْ النَّارِ، فَإِذَا أَقْبَلَ بِوَجْهِهِ عَلَى الْجَنَّةِ وَرَأَى بَهْجَتَهَا سَكَتَ مَا شَاءَ اللَّهُ لَهُ أَنْ يَسْكُتَ ثُمَّ قَالَ: يَا رَبِّ قَدِّمْنِي عِنْدَ بَابِ الْجَنَّةِ، فَيَقُولُ اللَّهُ لَهُ: أَلَيْسَ قَدْ أَعْطَيْتَ الْعَهْدَ وَالْمِيثَاقَ أَلَا تَسْأَلَ غَيْرَ الَّذِي كُنْتَ سَأَلْتَ؟ فَيَقُولُ: يَا رَبِّ لَا أَكُونُ أَشْقَى خَلْقِكَ، فَيَقُولُ: فَمَا عَسَيْتَ إِنْ أُعْطِيتَ مِثْلَ ذَلِكَ أَلَا تَسْأَلَ غَيْرَهُ؟ فَيَقُولُ: لَا وَعِزَّتِكَ، لَا أَسْأَلُ غَيْرَ ذَلِكَ، فَيُعْطِي رَبَّهُ مَا شَاءَ مِنْ عَهْدٍ وَمِيثَاقٍ، فَيُقَدِّمُهُ إِلَى بَابِ الْجَنَّةِ، فَإِذَا بَلَغَ بَابَهَا فَرَأَى زَهْرَتَهَا وَمَا فِيهَا مِنَ النَّضْرَةِ وَالسُّرُورِ فَيَسْكُتُ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَسْكُتَ فَيَقُولُ: يَا رَبِّ أَدْخِلْنِي الْجَنَّةَ، فَيَقُولُ اللَّهُ: وَيْحَكَ يَا ابْنَ آدَمَ مَا أَغْدَرَكَ أَلَيْسَ قَدْ أَعْطَيْتَ الْعَهْدَ وَالْمِيثَاقَ أَلَا تَسْأَلَ غَيْرَ الَّذِي أُعْطِيتَ؟ فَيَقُولُ: يَا رَبِّ لَا تَجْعَلْنِي أَشْقَى خَلْقِكَ، فَيَضْحَكُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ مِنْهُ، ثُمَّ يَأْذَنُ

لَهُ فِي دُخُولِ الْجَنَّةِ فَيَقُولُ لَهُ: تَمَنَّ، فَيَتَمَنَّى حَتَّى إِذَا انْقَطَعَ أُمْنِيَّتهُ قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: زِد مِنْ كَذَا وَكَذَا، أَقْبَلَ يُذَكِّرُهُ رَبُّهُ عَزَّ وَجَلَّ حَتَّى إِذَا انْتَهَتْ بِهِ الْأَمَانِيُّ قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: لَكَ ذَلِكَ وَمِثْلُهُ مَعَهُ)).

## (بەشی/ فەزلی كڕنۆش بردن (السجود))

له سەعیدی كوڕی موسەیب وە عەطای كوڕی یەزید دەگێڕێتەوە كە ئەبوهورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە كە خەڵكان ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایا ئێمە لەرۆژی قیامەت خوای دەبینین؟ فەرموی شەوی چواردە كە ئاسمان ساف بێت و هەوری لەبەر نەبێ هیچ گومانتان دەبێت له دیتنی مانگدا؟ ووتیان نەخێر، فەرموی ئایا بەرۆژی نیوەڕۆ كە هەور بەری ئاسمانی نەگرتبێ گومانتان هەیە له دیتنی خۆر ووتیان نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا فەرموی دە ئاوا بێ شك و گومان خودای خۆتان دەبینن، وەبەفەرمانی خوا بانگەواز دەكرێ دەڵێت هەركەس چی پەرستووە با بەدوای ئەو بكەوێ، ئیتر هەیانە خۆرپەرست بووە، وە هەیانە مانگ پەرست بووە وە هەندێك بەدوای گومراكەرە سەركەشەكان دەكەون وە هەندێك لەو ئۆممەتە دەمێنن لەناویان دایە هەندێك له مونافیق و دووڕوو، چاوەڕوانی پەروەردگاری خۆیان دەكەن، جا خوای گەورە لەسەر شێوەیێ دێ بۆ لایان و دەفەرموێ من پەروەرگاری ئێوەم ئەوانیش دەڵێن ئێرە جێگای ئێمەیەو ناجولێین هەتا خودا دێ بۆ لامان بەسەر ئەو شێوەكە روون و ئاشكرای، ئینجا خوای گەورە دەفەرموێ (جل جلاله) من پەروەردگاری ئێوەم ئەوانیش دەڵێن تۆ پەروەردگاری ئێمەی، ئەوجا خودا بانگەوازییان لێ دەكات و لەپاشان پردی سیراط لەسەر پشتی دۆزەخ دادەنرێ و منیش یەكەم كەسم كە پێیدا دەپەڕمەوە له پێغەمبەران كە ئۆممەتم لەو پردە دەپەڕێنەوە وە لەو رۆژەدا

هیچ کەس قسە ناکات تەنها پێغەمبەران نەبن وە ووتەی پێغەمبەران لەو ڕۆژەدا ئەوەیە خوایە سەلامەتیان بفەرموو وە لە لێواری دۆزەخ چەند قولاپێ هەیە وەك دڕکی (سەعدان) وایە ئایا دڕکی سەعدانیتان بینیوە؟ ووتیان بەڵێ فەرمووی بەڵێ وەکو دڕکی سەعدان وایە بەڵام گەورەیەکەی بەس خوا دەزانێ جا کاتێ خەڵکەکە دەیانەوێ لەسەر پردەکە بپەڕنەوە ئەم قولاپانە پەلاماریان دەدەن لەولا و ئەولادا جا هەیدانە بەهۆی گوناهەکانیانەوە پەلامار دەدرێن و دەکەوننە خوارەوە هەیانە بریندار دەبن و ڕزگاریان دەبێ وەهەشیانە قولابییەکان ئەنجنیان دەکەن و لە پاشان ڕزگارییان دەبێ هەتا کاتێ خوای گەورەوەهەشیانە خوای گەورە ئەوەی بیەوێ ڕەحمیان پێ دەکات لە دۆزەخ دەریان دێنێت، فەرمان دەکات بەفریشتەکانی کەوا ئەوکەسەی دەریێنن کە خوای پەرستووە ئینجا فریشتەکان دەریان دێنن وە دەیان ناسنەوە بە شوێنەواری کڕنۆش بردنیان وەخوای گەورە شوێنەواری کڕنۆش بردنی حەرامی کردووە لەسەر ئاگر، وە دێنە دەرەوە لەناو ئاگر لاشەیان ڕەش بووە وەکو خەڵوز و سوتاون ئینجا ئاوی ژیانەوەیان پێدا دەکەن و ئیتر چۆن دلنەوێڵە لەناو ئاو سەوز دەبێت ئاوا سەوز دەبنەوە دەبنە مرۆڤێکی ئاسایی ئەوجا خودا لەدادگای بەندەکان دەبێتەوە، پیاوێك دەمێنێ لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدایە وە دواین کەسە لە ئاگری دۆزەخ دێتە دەرەوە بۆ بەهەشت رووی لەلای دۆزەخە دەڵێ ئەی پەروەدگار دەم و چاوم وەرگێرە لە ئاگری دۆزەخ کە بڵێسەکەی سەوتاندمی خوای گەورەش پێی دەفەرموێ ڕەنگە ئەگەر ئەم کارەت بۆ بکرێ داوای شتی تر بکەی؟ دەڵێ نا بە گەورەیی تۆ دلوای شتی تر ناکەم ئینجا چەندی کە خوا مەیلی لێ بێت عەهد و پەیمان دەدات کە داوای شتی تر نەکات وە خوای گەورە رووی لە ئاگرەکە سورر

دەخاتەوە، کە تەماشای بەهەشت و ناز و نیعمەتی بەهەشت دەکات ئەوەندی خوا حەز بکات بێ دەنگ دەبێت لە پاشان دەڵێ ئەی پەروەردگارم نزیکم بکەرەوە لە دەرگای بەهەشت، وە خوای گەورە پێی دەفەرموێ ئایا تۆ عەهد و پەیمانت نەدا کە چی تر داوای شتی تر نەکەی؟ ئەویش دەڵێ ئومێد دەکەم نەبم بە بەدبەختترین کەس لەلای تۆ ئینجا پێی دەفەرموێ ئایا رەنگە ئەگەر ئەم کارەت بۆ بکرێ داوای شتی تر بکەی ئەویش دەڵێ بە گەورەیی تۆ سوێندم داوای چی تر لە تۆ ناکەم ئینجا خوا چەندە حەزی لێ بێت عەهد و پەیمانی لێ وەردەگرێ و ئینجا دەیبەن بۆ بەردەم دەرگای بەهەشت وە کە چاوی بە ناز و نیعمەت و خۆشی و شادییەکانی بەهەشت دەکەوێ سەرسام دەبێ و ئەوەندەی خوا حەزی لێ بێت بێ دەنگ دەبێت.

ئەوجا دەڵێ ئەی خوایە بمبەرە ناو بەهەشتەوە!

خوای گەورە دەفەرموێ ئەی هاوار لەدەست بێ پەیمانی تۆ ئەی ئادەمیزاد چەندە بێ پەیمانیت خو لەلای خۆت ئەوەندە عەهد و پەیمانت دا کە چیی تر داوا نەکەی، ئەویش دەڵێت خوایە نەمکەی بە بەدبەختترین کەس لە دروستکراوانت ئینجا خوای گەورە کاری ئەم بەندەی خۆی پێ دەکەنێ لە پاشان مۆڵەتی چوونە بەهەشتی پێ دەدات و پێی دەڵێت داوا بکە هەتا پێتی بدەم و ئاواتت بهێنمەدی ئەویش خۆزگەیەکی زۆر دەخوازێ و داوای هاتنەدی گەلێ ئاوات دەکات هەتا هەرچی دەوێ داوای دەکات ئەوسا خودا شتی بیر دەخاتەوە و دەفەرموێ لە شتی تریش داوا بکە ئەوانەی کە خۆی لە بیری نەمابوو خودا بیری دەخاتەوە تا کۆتایی خۆزگە و ئاواتی ئەوجا خودا پێی دەفەرموێ ئەمە و ئەوەندەی تریش لەگەڵی بۆ تۆ.

## باب التسبيحْ والدُعاء في السُجود

١٢٧.عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللّهُ عَنْهَا قالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ عَلَيهِ الصَّلاةُ وَالسَّلام يُكْثِرُ أَنْ يَقُولَ فِي رُكُوعِهِ وَسُجُودِهِ: ((سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي، يَتَأَوَّلُ الْقُرْآنَ)).

## (بەشی تەسبیحات و دوعا لە سوجدەدا)

عائیشە خان (رضي الله عنها) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر دوعای لە کرنۆش (سجدة)و روکوعدا دەکرد و دەیفەرموو: ((سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي))

واتە: تۆ خودایەکی پاك و بێ گەردی ئەی پەروەردگارم لە سایەی خۆتەوەیە کە من تەسبیح و سوپاسی تۆ دەکەم ئەی خوایە لێم خۆش بە (يتأول القران) واتە کە خوا لەم ئایەتە داوای لێ دەکات کە تەسبیحاتی خوا بکات (فَسَبِحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وإسْتَغْفِرهُ إنَهُ كانَ توابأ).

١٢٨.وَعَنْها أيضاً أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَدْعُو فِي الصَّلَاةِ اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَفِتْنَةِ الْمَمَاتِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ الْمَأْثَمِ وَالْمَغْرَمِ، فَقَالَ لَهُ قَائِلٌ: مَا أَكْثَرَ مَا تَسْتَعِيذُ مِنْ الْمَغْرَمِ! فَقَالَ: إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا غَرِمَ حَدَّثَ فَكَذَبَ، وَوَعَدَ فَأَخْلَفَ)).

عائیشە خان (رضي الله عنها) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە پاش تەحیات و پێش سەلامدانەوە لەناو نوێژدا ئەم دوعایەی دەکرد: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَفِتْنَةِ الْمَمَاتِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ الْمَأْثَمِ وَالْمَغْرَمِ)

واتە: (خوایە پەنانت پەنات دەگرم لە سزای ناوگۆڕ، وە پەنا دەگرم بەتۆ لە ئاژاوەی دەججال وە پەنات پێ دەگرم لە ئاژاوە و فیتنەی مردن و ژیان وە پەنا دەگرم خوایە بە تۆ لە تاوانباری و کەڵەکەبوونی قەرز و قۆڵە لەسەرم، وە یەکێ عەرزی کرد ئەی پێغەمبەری خوا بۆ ئەوەندە باسی قەرز و قۆڵە دەکەی، فەرمووی: پیاو ئەگەر کەوتە ژێر باڵی قەرزەوە تووشی درۆ و دەلەسە دەبێت و بەڵێن دەدات نایباتە سەر.

١٢٩.عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّهُ قَالَ لِلنَّبِي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: عَلِّمْنِي دُعَاءً أَدْعُو بِهِ فِي صَلَاتِي، قَالَ: ((قُلْ اللَّهُمَّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْمًا كَثِيرًا، وَلَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ فَاغْفِرْ لِي مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدِكَ، وَارْحَمْنِي إِنَّك أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ)).

لە ئەبو بەکری راستگۆ (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە دەفەرموێ بە پێغەمبەری فەرموو دوعا و نزایەکم فێر بکە لەناو نوێژدا بیکەم، ئەویش فەرمووی بڵێ: (قُلْ اللَّهُمَّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْمًا كَثِيرًا، وَلَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ فَاغْفِرْ لِي مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدِكَ، وَارْحَمْنِي إِنَّك أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ).

خوایە من ستەمم لە نەفسی خۆم کرد بە ستەمێکی زۆر وە جگە لە تۆ کەسی تر رادەی ئەوە نیە کە لە گوناه و تاوانم خۆشبێ و میهرەبانیت. بەلوتفو کەرەمی خۆت لێم خۆشبە میهرەبانیم لەگەڵ بنوێنە بەڕاستی تۆ تاوان بەخشو میهرەبانیت.

## باب الذكر بعدَ الصّلاة

١٣٠. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَال: جَاءَ الْفُقَرَاءُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ فَقَالُوا ذَهَبَ أَهْلُ الدُّثُورِ مِنْ الْأَمْوَالِ بِالدَّرَجَاتِ الْعُلَا وَالنَّعِيمِ

الْمُقِيمِ، يُصَلُّونَ كَمَا نُصَلِّي، وَيَصُومُونَ كَمَا نَصُومُ، وَلَهُمْ فَضْلٌ مِنْ أَمْوَالٍ يَحُجُّونَ بِهَا وَيَعْتَمِرُونَ وَيُجَاهِدُونَ وَيَتَصَدَّقُونَ. قَالَ: ((أَلَا أُحَدِّثُكُمْ إِنْ أَخَذْتُمْ أَدْرَكْتُمْ مَنْ سَبَقَكُمْ وَلَمْ يُدْرِكْكُمْ أَحَدٌ بَعْدَكُمْ، وَكُنْتُمْ خَيْرَ مَنْ أَنْتُمْ بَيْنَ ظَهْرَانَيْهِ، إِلَّا مَنْ عَمِلَ مِثْلَهُ، تُسَبِّحُونَ وَتَحْمَدُونَ وَتُكَبِّرُونَ خَلْفَ كُلِّ صَلَاةٍ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ فَاخْتَلَفْنَا بَيْنَنَا فَقَالَ بَعْضُنَا: نُسَبِّحُ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ وَنَحْمَدُ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ وَنُكَبِّرُ أَرْبَعًا وَثَلَاثِينَ، فَرَجَعْتُ إِلَيْهِ فَقَالَ: تَقُولُ سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَاللَّهُ أَكْبَرُ حَتَّى يَكُونَ مِنْهُنَّ كُلِّهِنَّ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ.

## (بەشی/ یادی خواکردن پاش نوێژان)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە هەژاران هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) ووتیان هەرچی پایەی بەرز و ناز و نیعمەت هەیە دراوە بە دەوڵەمەندەکان و دەیبەن بۆ خۆیان وەکوئێمە نوێژ دەکەن و وەکو ئێمە بە رۆژوو دەبن و ئەوان وە ماڵ و سامانیان هەیە و حەج و عومرە و جیهاد و تێ کۆشان و خێر و خێراتی پێ دەکەن بەڵام ئێمە ماڵ و سامانمان نیە ئەم جۆرە خێرەی پێ بکەین، پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمووی دەی با کارێکتان پێ بڵێم ئەگەر جێبەجێ بکەن دەگەنە ئەوان کە پێشتان کەوتوون وەکەسیش لە پاش ئێوە بەو پلەیە ناگات وە ئێوە دەبن بە باشترین چینی دەورووبەری خۆتان ئەگەر کەسێ وەك ئێوە ئەو کارە بکات ئەویش ئەوەیە کە لە پاش هەموو نوێژان سی و سێ جار بڵێن (سبحان الله) و سی و سێ جار بڵێن (الحمد لله) وە سی وسێ جار بڵێن (الله أكبر) ڕاوی فەرموودەکە دەڵێت جیا و الایمان لێ پەیدا بووە دەربارەی یان سی وسێ جار بڵێ سبحان الله سی و سێ جار الحمد لله وسی چوار جار (الله أكبر) دەفەرموێ گەڕامەوە بۆ

خزمەتی لێم پرسی فەرموی سی و سێ جار سبحان الله والحمد لله والله أكبر.

واتە: هەر یەکێکیان سی‌و سێ جار

١٣١. عَنْ وَرَّادٍ كَاتِبِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ قَالَ: أَمْلَى عَلَيَّ الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ فِي كِتَابٍ إِلَى مُعَاوِيَةَ أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ يَقُولُ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلَاةٍ مَكْتُوبَةٍ: ((لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، اللَّهُمَّ لَا مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلَا مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلَا يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ)).

لە وەڕادی نووسەری موغیرە کوڕی شوعبە دەفەرموێ موغیرەی کوڕی شوعبە نامەی پێ نوسیم بۆ موعاویەی فەرمانڕەوای موسڵمانان کە پێغەمبەر (ﷺ) لەپاش هەموو نوێژە فەرزەکان وە دەیفەرموو: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، اللَّهُمَّ لَا مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلَا مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلَا يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ)

خوایە تۆ تاك و تەنیای هیچ شەریك و هاوەڵێکت نیە و موڵك و سامان وسوپاس و دەستەڵات شایانی تۆیە و توانای هەموو شتێکت هەیە وە خوایە ئەوەی تۆ بیدەی بەکەس نابڕێ وە ئەوەی تۆ نەیدەی بەکەس نادرێ وە دارای و دەستەڵاتداری لەلای تۆ هیچ دادێکیان پێ ناگات.

## كتاب الجمعة

## باب إستعمال الدهن للجمعة

١٣٢.عَنْ سَلْمَانَ الْفَارِسِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسول الله (ﷺ): ((لَا يَغْتَسِلُ رَجُلٌ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَيَتَطَهَّرُ مَا اسْتَطَاعَ مِنْ طُهْرٍ وَيَدَّهِنُ مِنْ دُهْنِهِ أَوْ يَمَسُّ مِنْ طِيبِ بَيْتِهِ، ثُمَّ يَخْرُجُ فَلَا يُفَرِّقُ بَيْنَ اثْنَيْنِ ثُمَّ يُصَلِّي مَا كُتِبَ لَهُ ثُمَّ يُنْصِتُ إِذَا تَكَلَّمَ الْإِمَامُ إِلَّا غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ الْأُخْرَى)).

## (نامەی هەینی (جمعە))

## (بەشی/ بەكارهێنان رۆن بۆ سەر شانە كردن لە هەینیدا)

سەلمانی فارسی(رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئەو پیاوەی لە رۆژی هەینیدا خۆی بشۆرێ و تا بۆی بكرێ خۆی پاك و خاوێن راگرێ و سەر و ریشی خۆی شانە بكات و رۆنی لە قژی بدات یان لەو بۆنە خۆشەی كە هەیەتی خۆی بۆنخۆش بكات، ئینجا لەماڵ دەرچێ بەسەر شانی كەس باز نەدات لە هەر شوێنێ بۆی كرا نوێژی سوننەتی كرد و لە پاشان گوێ لە ووتار بگرێ ئەوا خوای گەورە لە گوناه و تاوانی نێوان ئەو هەینی و هەینی داهاتووی دەبورێت.

## باب السِّواك يوم الجُمعة، وحَديث كلُكُمْ راع

١٣٣.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: ((لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي –أَوْ عَلَى النَّاسِ– لَأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ مَعَ كُلِّ صَلَاةٍ)).

## (بەشی سیواك كردن لە رۆژی هەینیدا، وە فەرمودەی (كلُكُم راع))

لە ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەگەر لەبەر ئەزیەت و ناخۆشی نەبا لەسەر ئوممەتی من یان لەسەر خەڵكی فەرمانم دەكرد بە سیواك كرن لەگەڵ هەموو نوێژان.

١٣٤. عَنْ عبد الله بن عمر رَضِيَ الله عَنهما يَقول: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) يَقُولُ: ((كُلُّكُمْ رَاعٍ وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ: الْإِمَامُ رَاعٍ وَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَالرَّجُلُ رَاعٍ فِي أَهْلِهِ وَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ وَالْمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ فِي بَيْتِ زَوْجِهَا وَمَسْئُولَةٌ عَنْ رَعِيَّتِهَا، وَالْخَادِمُ رَاعٍ فِي مَالِ سَيِّدِهِ وَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ)).

عەبدوڵڵای كوڕی عومەر (رضي الله عنه) دەفەرموێ گوێم لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو دەیفەرموو ئێوە هەموو وەك شوان وان لەسەر چاودێری و بەرپرسیاریەتی خۆتان بەسەر ژێردەستەكانتان، پێشەوا و سەركردەكان شوانن بەسەر ئەو گەلەی لە ژێر دەستیان دایە و پیاویش شوانە بەسەر ماڵ و مناڵ خۆی و وە ئافرەتیش شوانە بەسەر بەرپرسیاریەتی لە ماڵی مێردی وە هەروەها نۆكەر و بەندەش شوانن بەسەر ئەو ماڵ و سامانەی كە لە ژێر دەستیان دایە لە ماڵ و سامانی گەورەكەیان.

## باب الغسل يوم الجُمْعَةَ

١٣٥. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضيَ اللهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قال: ((لِلَّهِ تَعَالَى عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ حَقٌّ أَنْ يَغْتَسِلَ فِي كُلِّ سَبْعَةِ أَيَّامٍ يَوْمًا)).

## (بەشی خۆشۆردنی رۆژی هەینی)

**ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (مافی خوای گەورەیە لەسەر هەموو موسڵمانی باڵغ لە هەفتەیەکدا جارێك خۆی بشوات).**

## باب السّاعة التي في يوم الجمعة

١٣٦. وَعَنْهُ أيضاً رَضيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ ذَكَرَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَقَالَ: ((فِيهِ سَاعَةٌ لَا يُوَافِقُهَا عَبْدٌ مُسْلِمٌ وَهُوَ قَائِمٌ يُصَلِّي يَسْأَلُ اللَّهَ تَعَالَى شَيْئًا إِلَّا أَعْطَاهُ إِيَّاهُ وَأَشَارَ بِيَدِهِ يُقَلِّلُهَا)).

## (بەشی ئەو کاتەی لە رۆژی هەینیدا هەیە کە نزای تیادا گیرایە)

**ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) باسی رۆژی هەینی کرد و فەرمووی: (لەرۆژی هەینیدا کاتێك هەیە هەر بەندەیێ موسڵمانێ نوێژ بکات و داوای هەر شتێ لە خوا بکات ئەوا بێگومان پێی دەدرێت، وە بە پەنجە ئاماژەی پێ کرد کە کاتەکە زۆر کەمە).**

## باب ما يقرأ في صلاة الفجر يوم الجُمعةً

١٣٧.عَنْ أبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَال: ((كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِه وَسَلَّمَ يَقْرَأُ فِي الْجُمُعَةِ فِي صَلَاةِ الْفَجْرِ ﴿الم تَنْزِيلُ —السَّجْدَةُ﴾، و ﴿هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَـٰنِ﴾.

### (بەشی/ ئەو سورەتەی دەخوێندری لە نوێژی بەیانی ڕۆژی هەینی)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) عادەتی وابوو لە ڕۆژی هەینی نوێژی بەیانی لە پاش سورەتی فاتیحا ئەم دوو سوڕەتەی دەخوێند ﴿الم تَنْزِيلُ —السَّجْدَةُ﴾، و ﴿هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَـٰنِ﴾.

## باب المشي الى الجمْعةً

١٣٨.وَقَوْلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ ﴿فَٱسْعَوْاْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ﴾ ، وَمَنْ قَالَ السَّعْيُ لِلْعَمَل وَالذَّهَابُ لِقَوْلِهِ تَعَالَى:﴿وَسَعَىٰ لَهَا سَعْيَهَا﴾، وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: يَحْرُمُ الْبَيْعُ حِينَئِذٍ، وَقَالَ عَطَاءٌ: تَحْرُمُ الصِّنَاعَاتُ كُلُّهَا.

### (بەشی/ ڕۆیشتن بۆ نوێژی هەینی)

وە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَٱسْعَوْاْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ﴾ واتە بڕۆن بۆ یادی خوا وە دەفەرموێ: ﴿وَسَعَىٰ لَهَا سَعْيَهَا﴾

واتە:کاری بۆ کرد وڕێگای بۆ بڕی.

وه عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس (رضي الله عنه) دەفەرمووێ قەدەغەكراوە لەكاتی بانگی نوێژی هەینیدا كڕین و فرۆشتن بكرێ، وە عەطا فەرموی حەرام و قەدەغەیە ئیش و كار و پیشەسازییەكان لە كاتی بانگی نوێژدا.

١٣٩. عَنْ ابْن عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قال: نَهَى رَسول الله (ﷺ) أنْ يُقِيمَ الرَّجُلُ أخَاهُ مِنْ مَقْعَدِهِ وَيَجْلِسَ فِيهِ.

عەبدوڵڵای كوڕی عومەر (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەهی كردوە لە كەسێ یەكێك لە جێگاكەی هەڵبسێنێ و خۆی لە جێگای ئەو دابنیشێ.

١٤٠. عَنْ أبِي هُرَيْرَةَ رَضِي الله عَنْهُ أنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَال: ((إذَا قُلْتَ لِصَاحِبِكَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ أنْصِتْ، وَالْإمَامُ يَخْطُبُ فَقَدْ لَغَوْتَ)).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێرێتەوە كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی ئەگەر لەكاتی وتاری هەینیدا ووتت بە هاوەڵت بێ دەنگ بە ئەوا قسەی بێ جێت (لغوة) كردوە.

# كتاب العيدين

## باب فضل العملْ أيام العشر

١٤١. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضيَ اللهُ عَنْهُما عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ أنَّهُ قَال: ((مَا الْعَمَلُ فِي أيَّامٍ أفْضَلَ مِنْهَا فِي هَذا العَشر)). قَالُوا: وَلَا الْجِهَادُ؟ قَالَ: ((وَلَا الْجِهَادُ، إلَّا رَجُلٌ خَرَجَ يُخَاطِرُ بِنَفْسِهِ وَمَالِهِ فَلَمْ يَرْجِعْ بِشَيْءٍ)).

## (نامەی دوو جەژنەکان)

## (بەشی/ فەزلی کردەوە لە دە رۆژی یەکەمی مانگی (ذي الحجة) کە ناسراوە بە نۆمینەی حاجیان لەگەڵ یەکەم رۆژی جەژنی قوربان)

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی هیچ کردەوەیەك نیە لەلای وا لە دە ڕۆژەکانی مانگی (ذي الحجة) گەورەتر بێت، هاوەڵان ووتیان لە جیهاد و تێکۆشانیش گەورەترە؟ فەرمووی جیهاد و تێکۆشانیش ناگات بەو، تەنها پیاوێ دەرچێ بە ماڵ و بە گیان بۆ جیهاد لە رێی خودا وە شەهید بێ و نەگەرێتەوە.

## باب التكبير أيام منى، وإذا غدا الى عَرَفَة

١٤٢. وَكَانَ عُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ يُكَبِّرُ فِي قُبَّتِهِ فَيَسْمَعُهُ أَهْلُ الْمَسْجِدِ فَيُكَبِّرُونَ، وَيُكَبِّرُ أَهْلُ الْأَسْوَاقِ حَتَّى تَرْتَجَّ مِنًى تَكْبِيرًا، وَكَانَ عُمَر يُكَبِّرُ بِمِنًى تِلْكَ الْأَيَّامَ وَخَلْفَ الصَّلَوَاتِ وَعَلَى فِرَاشِهِ وَفِي فُسْطَاطِهِ وَمَجْلِسِهِ وَمَمْشَاهُ تِلْكَ الْأَيَّامَ جَمِيعًا. وَكَانَتْ مَيْمُونَةُ تُكَبِّرُ يَوْمَ النَّحْرِ، وَكُنَّ النِّسَاءُ يُكَبِّرْنَ خَلْفَ أَبَانَ بْنِ عُثْمَانَ وَعُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ لَيَالِيَ التَّشْرِيقِ مَعَ الرِّجَالِ فِي الْمَسْجِدِ.

## (بەشی/ تەکبیر لێدان لە رۆژەکانی لە مینا بوون و چوون بۆ کێوی عەرەفە)

عومەری کوڕی خەتتاب (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عادەتی وابوو تەکبیری لێ دەدا لە شوێنی خۆی لەناو گومەزی وە خەڵکی ناو مزگەوت گوێیان لێ دەبوو لەگەڵی تەکبیریان لێ دەدا وە خەڵکی بازاڕیش تەکبیرییان لێ دەدا و بەو شێوەی کە مینا دەلەرزییەوە لەبەر دەنگی تەکبیرەیان دا، وە عومەر هەموو

ئەو ڕۆژانەی لە مینا بوو تەکبیرەی لێ دەدا و چ لە پاش نوێژەکان و چ لەسەر جێگای نووستن و چ لە بازاڕ و چ لە شوێنی دانیشتن و ڕێگادا. هەموو ئەو ڕۆژانە، وە مەیمونە لە ڕۆژی جەژنی قوربان تەکبیرەی لێ دەدا و ئافرەتانیش تەکبیرەیان لێ دەدا و هەتا لەزەمانی ئیبانی کوڕی عوسمان و عومەری کوڕی عەبدولعەزیز هەتا شەوانی جەژنی قوربان لەگەڵ پیاوان لەمزگەوتندا تەکبیرەیان لێ دەدات.

١٤٣. عَنْ مُحَمَّد بْن أَبِي بَكْرٍ الثَّقَفِيُّ قَالَ: سَأَلْتُ أَنَساً وَنَحْنُ غَادِيَانِ مِنْ مِنًى إِلَى عَرَفَاتٍ عَنْ التَّلْبِيَةِ، كَيْفَ كُنْتُمْ تَصْنَعُونَ مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) ؟ قَالَ: كَانَ يُلَبِّي الْمُلَبِّي لَا يُنْكَرُ عَلَيْهِ، وَيُكَبِّرُ الْمُكَبِّرُ فَلَا يُنْكَرُ عَلَيْهِ.

لە موحەمەدی کوڕی ئەبو بەکری سەقەفی دەفەرموێ پرسیارم لە ئەنەس کرد کە ئێمە لەمینا دەگەڕاینەوە بۆ کێوی عەرەفە دەربارەی تەلبیە (لبيك اللهم لبيك) لێدان چۆن لێتان دەدان لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی هەندێ کەس (لبيك اللهم) یان لێ دەدا و پێی ناخۆش نەبوو وە هەندێك تەکبیرەیان لێ دەدا دیسان ئینکاری نەدەکرد.

١٤٤. عَنْ حَفْصَةَ عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ قَالَتْ: كُنَّا نُؤْمَرُ أَنْ نَخْرُجَ يَوْمَ الْعِيدِ حَتَّى نُخْرِجَ الْبِكْرَ مِنْ خِدْرِهَا، وحَتَّى نُخْرِجَ الْحُيَّضَ فَيَكُنَّ خَلْفَ النَّاسِ فَيُكَبِّرْنَ بِتَكْبِيرِهِمْ وَيَدْعُونَ بِدُعَائِهِمْ، يَرْجُونَ بَرَكَةَ ذَلِكَ الْيَوْمِ وَطُهْرَتَهُ.

لە حەفصە لە ئوم عەتیە دەفەرموێ ئێمە فەرمانمان پێ دەکرا لە ڕۆژی جەژن لەماڵ دەرچین بۆ نوێژی جەژن هەتا ئەو کچانەی لە ژێر پەردەشدا بوون دەهاتن وە ئەو ئافرەتانەی لە بێ نوێژی دابوون دەهاتن لە پشت خەڵکان دادەنیشتن وە تەکبیرەیان لێ دەدا و لەگەڵ خەڵکان وە دوعایان

لەگەڵ خەڵکانی تر دەکرد و داوای پیت و بەرەکەت و خاوێن بوونەوە لە گوناه دەکرد لەو ڕۆژەدا.

١٤٥. عَنْ نَافِعٍ عَنْ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ رَسُول الله (ﷺ) كَانَ وتركُزُ الْحَرْبَةُ قُدَّامَهُ يَوْمَ الْفِطْرِ وَيوم النَّحْرِ ثُمَّ يُصَلِّي.

له نافیع له عەبدوڵلای کوڕی عومەر (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) نێزەی خۆی لەپێش خۆی دەچەقاند له کاتی نوێژی جەژنی قوربان و ڕەمەزاندا و نوێژی دەکرد.

١٤٦.عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قالَتْ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ تَعالى عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ (عَلَيَّ) وَعِنْدِي جَارِيَتَانِ تُغَنِّيَانِ بِغِنَاءِ بُعَاثَ فَاضْطَجَعَ عَلَى الْفِرَاشِ وَحَوَّلَ وَجْهَهُ، وَدَخَلَ أَبُو بَكْرٍ فَانْتَهَرَنِي وَقَالَ: مِزْمَارَةُ الشَّيْطَانِ عِنْدَ الرَّسُولِ (ﷺ)؟ فَأَقْبَلَ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وآلِهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: ((دَعْهُمَا))، فَلَمَّا غَفَلَ غَمَزْتُهُمَا فَخَرَجَتَا، وَكَانَ يَوْمُ عِيدٍ يَلْعَبُ السُّودَانُ بِالدَّرَقِ وَالْحِرَابِ، فَإِمَّا سَأَلْتُ النَّبِي عَلَيهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلام وَإِمَّا قَالَ: ((تَشْتَهِينَ تَنْظُرِينَ))؟ فَقُلتْ: نَعَمْ، فَأَقَامَنِي وَرَاءَهُ خَدِّي عَلَى خَدِّهِ، وَهوَ يَقُولُ: دُونَكُمْ يا بَنِي أَرْفِدَةَ حَتَّى إِذَا مَلِلْتُ قَالَ: حَسْبُكِ؟ قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: فَاذْهَبِي.

عائیشە (رضي الله عنها) دەفەرموێ دوو کەنیزەکم لەلا بوون گۆرانیان دەگوت بەسەر شەڕی بوعاسدا لەو کاتەدا پێغەمبەر (ﷺ) هاتە ژوورەوە لەسەر نوێنەکەی پاڵکەوت ڕووی لە ئێمە وەرچەرخان وە لەپاشان ئەبوبەکری باوکیشم هاتە ژوورەوە لە پێشدا لە منی خوڕی و پێم هەڵشاخا ئەوجا فەرمووی باڵۆرەی شەیتان لەلای پێغەمبەری خوا لێدەدرێ؟ پێغەمبەریش (ﷺ) ڕووی کردە ئەبوبەکر وە فەرمووی ئەی ئەبوبەکر وازیان

لێ بهێنه با سرودەکەیان بڵێن چونکه ئەمڕۆ جەژنی موسڵمانانه، عائیشه (رضي الله عنها ) فەرموی جا کاتێ ئەبوبەکر ئاگای له ئێمه نەما منیش به ئاماژه تێم گەیاندن که بڕۆن کەنیزەکانیش ڕۆیشتن، عائیشه دەفەرموێ ڕۆژی جەژن بوو حەبەشییەکان به قەڵغان و نێزه یارییان دەکرد جا فەرمووی یان پرسیارم له پێغەمبەر کرد (ﷺ) یان خۆی فەرموی حەزدەکەی تەماشای بکەی؟ ووتم به ڵێ جا منی له پشتی خۆی وەستان و چەناگەم نایه سەرشانی و ڕوومەتم نا بەڕوومەتیەوه ئەوجا پێغەمبەر فەرموی ئەی نەوەی ئەرفیدە! خەریکی یاری خۆتان بن ئیتر منیش دەستم کرد به تەماشاکردنی تاخۆم تاقەتم نەما، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی بەسه، گوتم بەڵێ فەرمووی دەبڕۆ.

١٤٦م– عَنْ الْبَرَاءِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُول الله (ﷺ) يَخْطُبُ فَقَالَ: إِنَّ أَوَّلَ مَا نَبْدَأُ مِنْ يَوْمِنَا هَذَا أَنْ نُصَلِّيَ ثُمَّ نَرْجِعَ فَنَنْحَرَ، فَمَنْ فَعَلَ فَقَدْ أَصَابَ سُنَّتَنَا.

بەڕا ءدەفەرموێ گوێم له پێغەمبەری خوا بوو ووتاری دەدا و دەیفەرموو یەکەم شتێ لەم ڕۆژەدا که دەستی پێ بکەین ئەوەیه نوێژی جەژن بکەین و له پاشان که گەڕاینەوه ماڵەوه قوربانیمان سەردەبڕی و کەسێ ئاوا بکات ئەوا لەسەر سوننەتی و ڕێگای ئێمەیه.

١٤٧. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَال: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) لَا يَغْدُو يَوْمَ الْفِطْرِ حَتَّى يَأْكُلَ تَمَرَاتٍ.

ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) عادەتی وابوو تاکو چەند دەنکه خورمای نەخواردبا نەدەچوو بۆ نوێژی جەژن.

١٤٨. وَعَنه عَن النَّبي عَلَيهِ الصَّلاةُ والسَّلام: وَيَأْكُلُهُنَّ وِتْرًا.

ئەنەس دەگێڕێتەوه (رضي الله عنه) له پێغەمبەرەوه (ﷺ) که چەند دەنکه خورمای تاکی دەخوارد له پێش نوێژی جەژن.

## باب ما قيلَ في الزلازل

١٤٩. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضيَ اللهُ عَنْهُ قَال: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): ((لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يُقْبَضَ الْعِلْمُ وَتَكْثُرَ الزَّلَازِلُ وَيَتَقَارَبَ الزَّمَانُ وَتَظْهَرَ الْفِتَنُ وَيَكْثُرَ الْهَرْجُ، وَهُوَ الْقَتْلُ، حَتَّى يَكْثُرَ فِيكُمْ الْمَالُ فَيَفِيضَ)).

### (بەشی/ دەربارەی زەمین لەرزەکان (زلازل)

ئەبو هورەیرە رَضيَ اللهُ عَنْهُ دەگێرێتەوە کە دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی (رۆژی قیامەت هەڵناستێ هەتا عیلم و زانیاری نامێنێت و بومەلەرزە زۆر دەبێتو کات و ساتیش نزیك دەبێتەوە وە فیتنە وئاشوب زۆر پەیدا دەبێت کە ئەویش کوشت و کوشتارە، وە ماڵ و سامان زۆر دەبێت لەناوتاندا.

## باب خمس لايعلمهن الآ الله

١٥٠. عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضيَ اللهُ عَنْهُ قَال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((مِفْتَاحُ الْغَيْبِ خَمْسٌ لَا يَعْلَمُهَا إِلَّا اللَّهُ: لَا يَعْلَمُ أَحَدٌ مَا يَكُونُ فِي غَدٍ، وَلَا يَعْلَمُ أَحَدٌ مَا يَكُونُ فِي الْأَرْحَامِ، وَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَاذَا تَكْسِبُ غَدًا، وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ، وَمَا يَدْرِي أَحَدٌ مَتَى يَجِيءُ الْمَطَرُ)).

### (بەشی/ پێنج شت بەس خوا دەیزانێ)

عەبدوڵلای کوڕی عومەر دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی کلیلی شاراوەکان پێنجن کەس نایزانێ مەگەر خوا نەبێت کە ئەوانیش کەس نازانێ بۆ بەیانی چ دەبێ، وە نازانێ لەناو رەحمی مێینە چ هەیە وە نازانێ بەیانی نەفس چ دەکات وە نازانێ مرۆڤ کەی و لەکوێ دەمرێ وە نازانێ کەی باران دەبارێت.

## باب معاملة المرأة وسفرها

١٥١. رأى رَسول الله صَلى اللهُ عَلَيه وَآله وَسلَّم أَكْثَرَ أَهْلِ النَّار النِّسَاءَ. قَالُوا: بِمَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: ((بِكُفْرِهِنَّ)). قِيلَ: يَكْفُرْنَ بِاللَّهِ؟ قَالَ: ((يَكْفُرْنَ الْعَشِيرَ وَيَكْفُرْنَ الْإِحْسَانَ، لَوْ أَحْسَنْتَ إِلَى إِحْدَاهُنَّ الدَّهْرَ كلهُ ثُمَّ رَأَتْ مِنْكَ شَيْئًا قَالَتْ مَا رَأَيْتُ مِنْكَ خَيْرًا قَطُّ)).

## (بەشی/ کڕین و فرۆشتن و سەفەرکردنی ئافرەت)

پێغەمبەری خوا (ﷺ) بینی لە شەوی میعراجا زۆربەی هەرەزۆری خەڵکی دۆزەخ ئافرەت بوون، ووتیان بەهۆی چیەوە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، فەرمووی بەهۆی سپڵەیی ووتیان ئایا سپڵەیی لە خوا دەکەن فەرمووی سپڵەیی لە مێرد و خزمی مێرد دەکەن و چاکەی ئەویان لەپێش چاو نییە، ئەگەر ساڵێکی تەواو چاکەیان لەگەڵ بکەی لەپاشان شتێکی بچووکیان لێ دیتیت دەڵێت قەد خێر و چاکەم لێت نەبینیووە.

١٥٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَال: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلى آلهِ وَسلَّمَ: ((لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ أَنْ تُسَافِرَ مَسِيرَةَ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ لَيْسَ مَعَهَا حُرْمَةٌ)).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویی: (بۆ هیچ ئافرەتێ دروست نیە کە ئیمان و بڕوای بە خواو بە رۆژی قیامەت هێنابێ کە سەفەری شەو و رۆژێك بکات هیچ مەحرەمێکی (خزمێکی نزیکی) لەگەڵ نەبێت).

# كتاب الجنائز

## باب البكاء عند المريض

١٥٣. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: اشْتَكَى سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ شَكْوَى لَهُ فَأَتَاهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ يَعُودُهُ مَعَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ وَسَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ وَعَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ، فَلَمَّا دَخَلَ عَلَيْهِ فَوَجَدَهُ فِي غَاشِيَةِ أَهْلِهِ فَقَالَ صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَآلِهِ وَسَلَّم: ((أَقَدْ قَضَى))؟؟ قَالُوا: لَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَبَكَى النَّبِيُّ (ﷺ)، فَلَمَّا رَأَى الْقَوْمُ بُكَاءَ النَّبِيِّ (ﷺ) بَكَوْا. فَقَالَ: ((أَلَا تَسْمَعُونَ إِنَّ اللَّهَ لَا يُعَذِّبُ بِدَمْعِ الْعَيْنِ وَلَا بِحُزْنِ الْقَلْبِ، وَلَكِنْ يُعَذِّبُ بِهَذَا –وَأَشَارَ إِلَى لِسَانِهِ– أَوْ يَرْحَمُ، وَإِنَّ الْمَيِّتَ يُعَذَّبُ بِبُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ)) وَكَان عُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ يَضْرِبُ فِيهِ بِالْعَصَا، وَيَرْمِي بِالْحِجَارَةِ، وَيَحْثِي بِالتُّرَابِ.

## (نامەی تەرم (الجنائز))

## (بەشی/ گریان لەلای نەخۆش)

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنه) دەفەرموێ سەعدی کوڕی عوبادە نەخۆش بوو، پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆیشت بۆ سەردانی لەگەڵ عەبدورەحمانی کوڕی عەوف و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود، کاتێ چووە ژوورەوە بۆ لای و دیتی بوراوەتەوە جا پێغەمبەر فەرمووی ئایا مردووە یان ماوە ووتیان نەمردوە ئەی پێغەمبەری خوا، ئیتر پێغەمبەر دەستی کرد بە گریان و خەڵکەکەش کە دیتیان پێغەمبەر (ﷺ) بۆی گریا دەستیان کرد بە گریان و فەرمووی گوێتان لێ بێت خودا بە فرمێسکی چاو و پەژارەی دڵ ئازارتان نادات بەڵکو ئازارتان دەدات بەوە، ئاماژەی بۆ زمانی

کرد  فەرمووی یان رەحمتان پێ دەکرێت، وە مردوو ئازار دەدرێ بەگریانی و شین و رۆڕۆ کردن بەسەریدا.

وە عومەر (رضي الله عنه)  بە دار عەصا لەوکەسەی دەدا کە شین و ڕۆڕۆی دەکرد یان بەردی تێ دەگرت یان خۆڵی بەسەردا دەکردن.

## باب الكاسية في الدُنيا وعقد الشّيطان

١٥٤. عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) اسْتَيْقَظَ لَيْلَةً فَقَالَ: ((سُبْحَانَ اللَّهِ، مَاذَا أُنْزِلَ اللَّيْلَةَ مِنْ الْفِتْنَةِ، مَاذَا أُنْزِلَ مِنْ الْخَزَائِنِ، مَنْ يُوقِظُ صَوَاحِبَ الْحُجُرَاتِ، يَا رُبَّ كَاسِيَةٍ فِي الدُّنْيَا عَارِيَةٍ فِي الْآخِرَةِ)).

## (بەشی/ ئەوانەی لە دونیا پۆشتەن، وەگرێیەکانی شەیتان)

لە ئوم سەلەمە (رضي الله عنها) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) شەوێ لەخەو هەڵسا و فەرمووی پاك و خاوێنی بۆ خوا ئەم شەو چەندەها فیتنە دادەبەزێ بۆ سەر زەوی، چەندە لە گەنجینەکانی خوا دابەزیوە سەر زەوی، کەسێ هەبێ ئافرەتانی خۆم لە خەو هەڵسێنێ زۆر کەس هەیە لە دوونیا پۆشتە و بەبەرگە لە ڕۆژی قیامەت ڕووت و بێ بەرگە.

١٥٥. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: ((يَعْقِدُ الشَّيْطَانُ عَلَى قَافِيَةِ رَأْسِ أَحَدِكُمْ إِذَا هُوَ نَامَ ثَلَاثَ عُقَدٍ، يَضْرِبُ كُلَّ عُقْدَةٍ عَلَيْكَ لَيْلٌ طَوِيلٌ فَارْقُدْ، فَإِنْ اسْتَيْقَظَ فَذَكَرَ اللَّهَ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَإِنْ تَوَضَّأَ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَإِنْ صَلَّى انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَأَصْبَحَ نَشِيطًا طَيِّبَ النَّفْسِ، وَإِلَّا أَصْبَحَ خَبِيثَ النَّفْسِ كَسْلَانَ)).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه)  دەگێڕێتەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی شەیتان لە ژێر سەری هەر یەکێکیتان سێ کوێرەگرێ لێ دەدات لەهەر

گرێیەکدا پێی دەڵێت شەو درێژە و بخەوە ئەگەر هەڵسا و یادی خوای کرد ئەوا گرێیەك دەکرێتەوە، ئەگەر دەستنوێژی شۆرد ئەوا گرێیەکی تر دەکرێتەوە، وە ئەگەر نوێژی کرد گرێی سێیەمیش دەکرێتەوە و کە بەیانی کردەوە بە لەش سوکی و نەفس پاکی بەیانی دەکاتەوە بەڵام ئەگەر وای نەکرد لەش گران و نەفس پیس و بەتەمەڵ بەیانی دەکاتەوە.

## باب الدُعاء وَالصّلاة في آخر الليل

١٥٦.وعَنْهُ أيضاً أنَّ رَسُولَ اللّه (ﷺ) قَال: ((يَنْزِلُ رَبُّنَا تَبَارَكَ وَتَعَالَى كُلَّ لَيْلَةٍ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا حِينَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الْآخِرُ يَقُولُ: مَنْ يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ، مَنْ يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ، مَنْ يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ)).

## (بەشی/ نزا و نوێژ لە کۆتایی شەودا)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (لە هەموو شەوێك خوا ی گەورە دێتە ئاسمانی دونیا لە کاتی رۆیشتنی سێیەکی کۆتایی شەودا و دەفەرموێ کەسێ لێم بپارێتەوە بۆ ئەوەی نزای گیرا بکەم وە کەسێ داوام لێ بکات کە بیدەمێ وەکەسێ داوای لێخۆشبوونم بۆ بکات کە لێی خۆشبم).

## باب يكره التشدد في العِبادة

١٥٧.عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَتْ عِنْدِي امْرَأَةٌ مِنْ بَنِي أَسَدٍ فَدَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: ((مَنْ هَذِهِ))؟ قُلْتُ: فُلَانَةُ، لَا تَنَامُ مِنَ اللَّيْلِ فَذُكِرَت مِنْ صَلَاتِهَا. فَقَالَ: ((مَهْ عَلَيْكُمْ مَا تُطِيقُونَ مِنَ الْأَعْمَالِ، فَإِنَّ اللَّهَ لَا يَمَلُّ حَتَّى تَمَلُّوا)).

## (بەشی/ کەراهەتی هەیە توندڕەوی کردن لە خواپەرستیدا)

عائیشە (رضي الله عنها) دەفەرموێ ئافرەتێ لە بەنی ئەسەد لەلام بوو لەوکاتەدا پێغەمبەری خوا هاتەژوورەوە فەرموی ئەمە کێیە؟ ووتم فولانە کەسە کە شەو ناخەوێ لەبەر شەونوێژ کردن فەرمووی ئاگاداریە ئەوەندەی لە تواناتان دایە لە کردەوەی چاك بیکەن خوای گەورە فەزلی خۆی نابڕێ بەسەرتانەوە هەتا خۆتان بێزار ئەبن لە داواکردنی.

١٥٨.عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَال: قَالَ لِي النَّبِيُّ (ﷺ): أَلَمْ أُخْبَرْ أَنَّكَ تَقُومُ اللَّيْلَ وَتَصُومُ النَّهَارَ؟ قُلْتُ: إِنِّي أَفْعَلُ ذَلِكَ. قَالَ: ((فَإِنَّكَ إِذَا فَعَلْتَ ذَلِكَ هَجَمَتْ عَيْنُكَ وَنَفِهَتْ نَفْسُكَ، وَإِنَّ لِنَفْسِكَ حَقًّا وَلِأَهْلِكَ حَقًّا فَصُمْ وَأَفْطِرْ وَقُمْ وَنَمْ)).

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) پێی ووتم ئایا تۆ نیت کە پێیان گوتوم کە شەو شەونوێژ و بە ڕۆژیش بەڕۆژووی، ووتی گوتم ئەم شتانە دەکەم فەرمووی ئەگەر وا بکەی پەلاماری چاوت داوە ونەفسی خۆت ماندوو کردوە، نەفسی خۆت مافی لەسەرت هەیەو ماڵ و خێزانت مافیان لەسەرت هەیە و بەڕۆژووبە هەندێ جاریش بە ڕۆژوو مەبە شەویش هەندێکی بخەوە و هەندێکی شەونوێژی بکە.

## باب الإستخارة في الأمور من غير الفريضة ندباً

١٥٩.عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يُعَلِّمُنَا الاسْتِخَارَةَ فِي الْأُمُورِ كَمَا يُعَلِّمُنَا السُّورَةَ مِنْ الْقُرْآنِ يَقُولُ: ((إِذَا هَمَّ أَحَدُكُمْ بِالْأَمْرِ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ لِيَقُلْ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْتَخِيرُكَ بِعِلْمِكَ وَأَسْتَقْدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ وَأَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ الْعَظِيمِ، فَإِنَّكَ تَقْدِرُ وَلَا أَقْدِرُ وَتَعْلَمُ وَلَا أَعْلَمُ وَأَنْتَ

عَلَّامُ الْغُيُوبِ. اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الْأَمْرَ خَيْرٌ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي فَاقْدُرْهُ لِي وَيَسِّرْهُ لِي ثُمَّ بَارِكْ فِيهِ. وَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الْأَمْرَ شَرٌّ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي فَاصْرِفْهُ عَنِّي وَاصْرِفْنِي عَنْهُ، وَاقْدُرْ لِي الْخَيْرَ حَيْثُ كَانَ ثُمَّ أَرْضِنِي بِهِ)) قَالَ: وَيُسَمِّي حَاجَتَهُ.

## (بەشی/ ئیستیخارە (سەرپشك) لە هەموو كار و كردووەیەكدا خێرەو سوننەتە و جگە لە نوێژی فەرز)

جابیری كوڕی عەبدوڵلا (رضي الله عنهما) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فێری نوێژی ئیستیخارەی دەكردین هەروەكو فێری سورەتێك لە قورئانی بۆ دەكردین و دەیفەرموو ئەگەر یەكێكیان وویستی كارێكی هەبوو نەیزانی ئەگەر بیكا باشە یان خراپە، با لە پێش دا دوو رەكعات نوێژی سوننەت بكات و لە دواییدا ئەم دوعایە بخوێنێ: (: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْتَخِيرُكَ بِعِلْمِكَ ... ثُمَّ أَرْضِنِي بِهِ) لە دەقە عەرەبیەكە هاتووە، واتە: خوایە داوات لێ دەكەم بە عیلم و زانستی خۆت و دەستەڵات و توانای خۆت چاكە وخێرم نیشان بدە و ئەوەی باشە بۆم زاڵم بكە بەسەریدا وە داوای بەش وبارەو بەخششی گەورەیی خۆتت لێ دەكەم چونكە تۆ توانای هەموو شتێكت هەیە و من بێ دەستەڵاتم و توانام نییە وە تۆش هەموو شت دەزانی من نایزانم وە خۆت توانا و زانای بە هەموو نهێنییەكان و ئاشكرایەكان پەروەردگارم تۆ دەزانی ئەگەر ئەم كارە باشە بۆ دینم و ئاینم باشە بۆ ئێستا و دوارۆژم ئەوا لە چارەمی بنوسە و ئاسانی بكە بۆم وە لەپاشان دا پیت و بەرەكەتی تێ بخە وە ئەگەر ئەم كارە خراپە بۆ دین و ئایینم و گوزەرانم و سەرەنجامی كارم، وە ئەگەر خراپە بۆ ئێستا و دوارۆژم ئەوە لێمی لادە و منیش لەو لادە وە هەرچی چاكە بۆم بنوسە وە لەپاشان دا رازیم بكە پێی وە فەرمووێ ناوی شتەكە بێنی لە دوعایەكەدا.

## باب الأمر بإتباع الجنائز

١٦٠.عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنَ مُقَرِّنٍ عَنْ الْبَرَاءِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُم قَال: أمَرَنَا رَسُول الله (ﷺ) بِسَبْعٍ وَنَهَانَا عَنْ سَبْعٍ: أَمَرَنَا بِاتِّبَاعِ الْجَنَائِزِ، وَعِيَادَةِ الْمَرِيضِ، وَإِجَابَةِ الدَّاعِي، وَنَصْرِ الْمَظْلُومِ، وَإِبْرَارِ الْقَسَمِ وَرَدِّ السَّلَامِ، وَتَشْمِيتِ الْعَاطِسِ. وَنَهَانَا عَنْ آنِيَةِ الْفِضَّةِ، وَخَاتَمِ الذَّهَبِ، وَالْحَرِيرِ وَالدِّيبَاجِ وَالْقَسِّيِّ وَالْإِسْتَبْرَقِ وركوبِ المياثِرِ.

### (بەشی/ فەرمان کردن بە دوای مردوودا رۆیشتن بۆ گۆڕستان)

لە موعاویەی کوڕی موقرن لە بەرا ء (رضي الله عنهم) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێکردوین بە حەوت شتان و قەدەغەی کردوین لە حەوت شتان:

فەرمانی پێ کردوین کە بەدوای تەرمی مردوودا بڕۆین بۆ گۆڕستان وە سەردانی نەخۆش بکەین، وە چوونی بۆ سەر دەعوەت و وە یارمەتی دان و پشتگیری کردنی ستەم لێ کراو وە بەجێگەیاندنی سوێندخواردن و وەڵامی سڵاوکردن وە وەڵامی کەسێ پژمی کە ووتی (الحمد لله)، وە قەدەغەی کردوین لە بەرکارهێنانی قاپ و قاچاغی زێر و زیو و لە ئەنگوستیلەی زێڕ و وە ئاڵتون و ئاوریشم و وە لە دیباج و لە قەسی کە جۆرە جل وبەرگێکن لە میسر دروست دەکرا کە قوماشێکە لە تێکەڵ بە ئاوریشم و کتان وە لە ئیستەبرەق و دۆشەکەلەی سەر زینی ئەسپ کە لە ئاوریشم بوو (کە جۆرە پۆشاکێکن).

## باب فضل من تُوفي لَهُ وَلَدٌ

١٦١.عَنْ أَنَسٍ بن مالِك رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَال: قَالَ النَّبِيُّ عَلَيهِ الصَّلاة والسَّلام: ((مَا مِنْ النَّاسِ مِنْ مُسْلِمٍ يُتَوَفَّى لَهُ ثَلَاثٌ لَمْ يَبْلُغُوا الْحِنْثَ إِلَّا أَدْخَلَهُ اللَّهُ الْجَنَّةَ بِفَضْلِ رَحْمَتِهِ إِيَّاهُمْ)).

### (بەشی/ گەورەیی کەسێ منالّی نەبالغی بمرێ)

ئەنەس کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی هەر موسلّمانێ سێ منالّی نەبالّغی بمرن بێگومان خودا لەبەر خاتری ئەو منالّانە دەیخاتە بەهەشتەوە.

## باب تكره النياحة على الميت

١٦٢. عَنْ الْمُغِيرَةِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَال: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُول: ((إِنَّ كَذِبًا عَلَيَّ لَيْسَ كَكَذِبٍ عَلَى أَحَدٍ، مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنْ النَّارِ)). سَمِعْتُ رَسول اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وآلِهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: ((مَنْ نِيحَ عَلَيْهِ يُعَذَّبُ بِمَا نِيحَ عَلَيْهِ)).

### (بەشی/ کەراهەتی شین و ڕۆ ڕۆ کردن بەسەر مردوودا)

موغیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ گوێم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو دەیفەرموو درۆ بە دەم منەوە وەك درۆ بە دەم کەسێ تر نیە هەرکەسێ بە ئارەزووی خۆی درۆ بە دەم منەوە هەڵبەستێ با جێی خۆی لەناو ئاگری دۆزەخ خۆش بکات وە هەروەها گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو دەیفەرموو هەر مردووێ شین و ڕۆ ڕۆی لەسەر بکرێ بەهۆی ئەوەوە سزا دەدرێ.

## باب ليس منا من شق الجيوب

١٦٣. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مَسعُود رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَال: قَالَ رَسول الله (ﷺ): ((لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَطَمَ الْخُدُودَ، وَشَقَّ الْجُيُوبَ، وَدَعَا بِدَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ)).

## (بەشی/ لە ئێمە نییە کەسێ یەخەی خۆی دادڕێ)

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (لە ئێمە نییە ئەوەی لە ڕوومەتی خۆی بدات و ئەوەی یەخەی خۆی دادڕێ وە ئەوەی شین و ڕۆ ڕۆی سەردەمی نەفامی بکات بەسەر مردوودا).

## باب التصدّق بالثلث

١٦٤. عَنْ سَعْدِ بن أبي وَقَّاص رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَال: كانَ النَّبيّ (ﷺ) يَعُودُني عام حَجَّة الوداع مِنْ وَجَعٍ اشْتَدَّ بِي، فَقُلْتُ: إني قَد بَلَغَ بِي منَ الوجع وأَنَا ذُو مَالٍ وَلَا يَرِثُنِي إِلَّا ابْنَةٌ، أفَأَتَصَدَّقُ بِثُلُثَيْ مَالِي. قَالَ: ((لا)). فَقُلْتُ: بِالشَّطْرِ. فَقَالَ: ((لا)). ثُمَّ قالَ: ((الثُّلُثُ وَالثُّلُثُ كَبِيرٌ -أو كَثِيرٌ- إِنَّكَ إِنْ تَذَرِ وَرَثَتَكَ أَغْنِيَاءَ خَيْرٌ مِنْ أَنْ تَذَرَهُمْ عَالَةً يَتَكَفَّفُونَ النَّاسَ، وَإِنَّكَ لَنْ تُنْفِقَ نَفَقَةً تَبْتَغِي بِهَا وَجْهَ اللَّهِ إِلَّا أُجِرْتَ بِهَا حَتَّى مَا تَجْعَلُ فِي فِي امْرَأَتِكَ)).

## (بەشی/ خێرکردن بە سێیەکی ماڵ)

لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص (رضي الله عنه) دەفەرموێ ساڵی حەجی ماڵئاوایی نەخۆش کەوتم لە مەککە و زۆر کەشەنگ بووم پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەردانی کردم و پێم ووت من ماڵێکی زۆرم هەیە و دەمبینی کە نەخۆش کەوتووم و تەنها کچێکم هەیە کە کەلەپور و میراتم لێ بگرێ جا دەمەوێ دووبەش لە سێ بەشی ماڵەکەم بکەم بە خێر لە پاش مردنم

وەسیەت بکەم، پێی فەرمو دروست نییە، منیش گوتم دە نیوەی ماڵەکەم ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی نابێت، منیش ووتم دە سێ یەکی ماڵەکەم دەکەم بەخێر، پێغەمبەری خوا فەرمووی دە سێ یەك دەبێ وە سێ یەکیش زۆرە، میراتگرەکانت ئەگەر بە دەوڵەمەندی بەجێ بهێڵی چاکترە لەوەی کە بە هەژاری بەجێیان بهێڵی لە خەڵکی دەست پان بکەنەوە وە تۆش هەرچی خەرجی دەکەی لەبەر رەزای خودا ئەوا پاداشتی لەسەر وەردەگریت تەنانەت ئەو پاروەی کە دەیدەیت بە دەمی خێزانەت پاداشت وەردەگریّ.

## باب ما يَنهى عَنْ الحلق عند المصيبة

١٦٥.وَجِعَ أَبُو مُوسَى وَجَعًا فَغُشِيَ عَلَيْهِ وَرَأْسُهُ فِي حَجْرِ امْرَأَةٍ مِنْ أَهْلِهِ فَلَمْ يَسْتَطِعْ أَنْ يَرُدَّ عَلَيْهَا شَيْئًا. فَلَمَّا أَفَاقَ قَالَ: أَنَا بَرِيءٌ مِمَّنْ بَرِئَ مِنْهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) بَرِئَ مِنْ الصَّالِقَةِ وَالْحَالِقَةِ وَالشَّاقَّةِ.

## (بەشی/ نەهی کردن لە قژ ڕنینەوە لەکاتی بەڵا و موسیبەتدا)

ئەبو موسا (رضي الله عنه) ئازارێکی زۆری هەبوو لەو نەخۆشییە بورایەوە وە سەری لەسەر کۆشی خێزانەکەی دانابوو، خێزانەکەی دەستی کرد بەگریان و هات و هاواری کرد ئەویش نەیتوانی لەو کاتەدا وەڵامی خێزانەکەی بداتەوە وە لەو کاتەدا کە بە ئاگا هاتەوە ووتی من بێزار و بەریم لەوەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێی بێبەریە، کە پێغەمبەری خوا بەرییە لەو ئافرەتەی کە شین و شەپۆرە و قژی خۆی دەتاشی و یەخەی خۆی دادەدڕێ.

## باب القِيام للجَنازة

١٦٦. عَنْ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَال: ((إِذَا رَأَيْتُمْ الْجَنَازَةَ فَقُومُوا حَتَّى تُخَلِّفَكُمْ)).

## (بەشی/ هەڵسانەوە لەبەر تەرمی مردوودا)

لە عامیری کوڕی ڕەبیعە دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرمووێ ئەگەر تەرمی مردووتان دیت بۆی هەڵسن هەتا تەرمەکە تێدەپەڕێ لە لاتان.

## باب حمل الرجال للجَنازة

١٦٧. عَنْ أبي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَال: ((إِذَا وُضِعَتِ الْجِنَازَةُ وَاحْتَمَلَهَا الرِّجَالُ عَلَى أَعْنَاقِهِمْ فَإِنْ كَانَتْ صَالِحَةً قَالَتْ قَدِّمُونِي، وَإِنْ كَانَتْ غَيْرَ صَالِحَةٍ قَالَتْ يَا وَيْلَهَا أَيْنَ يَذْهَبُونَ بِهَا؟ يَسْمَعُ صَوْتَهَا كُلُّ شَيْءٍ إِلَّا الْإِنْسَان، وَلَوْ سَمِعَهُ صَعِقَ)).

## (بەشی هەڵگرتنی پیاوان بۆ تەرمی مردوو)

لە ئەبی سەعیدی خودری (رضي الله عنه) کە پیغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ کاتێ تەرمی مردوو دادەنرێ لەناو داری تەرما و پیاوان هەڵی دەگرن دەیخەنە سەر شانیان بۆ گۆڕستان، ئەگەر مرۆڤێکی باش و چاکەخواز بووبێت دەڵێ زووکەن بمبەن و ئەگەر مردووەکە مرۆڤێکی باش نەبێت بانگ دەکا و دەڵێت هەی هاوار و ڕۆ ڕۆ بۆ خۆم بۆ کوێم دەبەن، وە هەموو کەسێ ئەم دەنگە دەبیستێ تەنها ئادەمیزاد گوێی لێ نابێت وە ئەگەر گوێی لێ بێت لە ترسان دەتوقێ وزندەقی دەچێ.

## باب فضل من شهد الجنازة

١٦٨. عَن أبي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ تَعالى عَلَيْهِ وآلِهِ وَسَلَّمَ: ((مَنْ شَهِدَ الْجَنَازَةَ حَتَّى يُصَلِّيَ عَلَيها فَلَهُ قِيرَاطٌ وَمَنْ شَهِدَها حَتَّى تُدْفَنَ فَلَهُ قِيرَاطَانِ))، قِيلَ: وَمَا الْقِيرَاطَانِ؟ قَالَ: ((مِثْلُ الْجَبَلَيْنِ الْعَظِيمَيْنِ)).

## (بەشی/ فەزلی کەسێ ئامادەی تەرمی مردوو بێت)

**ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (کەسێ ئامادەی تەرمی مردوو بێت هەتا نوێژی لەسەر دەکرێ.بەقەد یەك قیرات خێری بۆ دەنوسرێ وە کەسێ ئامادەبێ هەتا دەنێژرێ ئەوا خێری دوو قیراتی بۆ دەنوسرێ، یەکێ ووتی دوو قیرات چییە و چەندە؟ فەرمووی بە قەدەر دوو کێوی گەورەن).**

## باب إسلام الصبي

١٦٩. وَعَنْهُ أيضاً أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وآلِهِ وَسَلَّمَ قال: ((مَا مِنْ مَوْلُودٍ إِلَّا يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ أَوْ يُنَصِّرَانِهِ أَوْ يُمَجِّسَانِهِ)).

## (بەشی/ موسڵمانبوونی منداڵ)

**ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی هەر منداڵ کە لە دایك دەبێت بە سروشت لەسەر فترەت و ئیسلامەتی لە دایك دەبێ بەڵام لەوەودوا دایك و باوکی دەیگۆڕن و وەکو خۆیان دەیکەن بە گاور یان بە جولەکە یان بەئاگرپەرست.**

## باب قاتل النفس

١٧٠. عَنْ ثَابِتِ بْنِ الضَّحَّاكِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَال: ((مَنْ حَلَفَ بِمِلَّةٍ غَيْرِ الْإِسْلَامِ كَاذِبًا مُتَعَمِّدًا فَهُوَ كَمَا قَالَ وَمَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِحَدِيدَةٍ عُذِّبَ بِهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ)).

### (بەشی/ کەسێ خۆی بکوژێ)

سابیتی کوڕی (ضحاك) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی کەسێ سوێند بخوا لەسەر دینێك جگە لە دینی ئیسلامەتی بە ئەنقەست و بەدرۆ ئەوە چۆنی گوتووە وا دەبێ (وەکو بڵێ دینم بە دینی جولەکان بێت ئەم ئیشە وایە) وە کەسێ خۆی بکوژێ بە شتێ لەناو ئاگری دۆزەخیش دیسانەوە بەو شتە سزا دەدرێتەوە).

## باب النهي عن سَبِّ الأموات

١٧١. عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها أَنَّ رَسول الله (ﷺ) قال: ((لَا تَسُبُّوا الْأَمْوَاتَ فَإِنَّهُمْ قَدْ أَفْضَوْا إِلَى مَا قَدَّمُوا)).

### (بەشی/ نەهی کردن لە جنێوّدان بە مردوو)

لە عائیشەوە (رضي الله عنها) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی جنێوّ بە مردوو مەدەن چونکە ئەوان گەیشتن بەو کردەوەی کە لە پێش خۆیان بەرێی کرد.

# (كتاب الزكاة)

## باب وجوب الزكاة

١٧٢.عَنْ أَبِي أَيُّوبَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَجُلًا قَالَ لِلنَّبِيِّ (ﷺ): أَخْبِرْنِي بِعَمَلٍ يُدْخِلُنِي الْجَنَّةَ قَالَ: ((مَالَهُ مَالَهُ)) وَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((أَرَبٌ مَالَهُ، تَعْبُدُ اللَّهَ وَلَا تُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا، وَتُؤْتِي الزَّكَاةَ، وَتَصِلُ الرَّحِمَ)).

# (نامەی زەكات)

## (بەشی واجیب بوونی زەكات)

**لە ئەبی ئەیوب دەگێڕێتەوە (رضي الله عنه) كە پیاوێ ووتی بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) كردەوە یەكم پێی بڵێ كە بەهۆیەوە بچم بۆ بەهەشت هاوەڵەكانیش ووتیان بە چی بە چی وە پێغەمبەریش فەرمووی خوا بپەرستە و هاوەڵی بۆ بڕیار مەدە و زەكات بدە و سەردانی خزم و كەس بكە.**

١٧٣.عَنْ أبي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، وَكَفَرَ مَنْ كَفَرَ مِنْ الْعَرَبِ، فَقَالَ عُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: كَيْفَ تُقَاتِلُ النَّاسَ وَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَمَنْ قَالَهَا فَقَدْ عَصَمَ مِنِّي مَالَهُ وَنَفْسَهُ إِلَّا بِحَقِّهِ وَحِسَابُهُ عَلَى اللَّهِ))؟؟ فَقَالَ: ((وَاللَّهِ لَأُقَاتِلَنَّ مَنْ فَرَّقَ بَيْنَ الصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ، فَإِنَّ الزَّكَاةَ حَقُّ الْمَالِ، وَاللَّهِ لَوْ مَنَعُونِي عَنَاقًا)) كَانُوا يُؤَدُّونَهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لَقَاتَلْتُهُمْ عَلَى مَنْعِهَا. قَالَ عُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: فَعَرَفْتُ أَنَّهُ الْحَقُّ.

**ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ، پێغەمبەر (ﷺ) كۆچی دوایی كرد و ئەبوبەكر بوو بە جێنشینی ئەو، لە عەرەبەكان هەندێك هەڵگەڕانەوە لە دیندا ئەبو بەكر ویستی بچێ بە گژیاندا، عومەری كوڕی**

خەتتاب فەرمووی چۆن شەڕیان لەگەڵ دەکەی ئەدی نەتبیستووە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی (فەرمانم پێ کراوە کە شەڕ لەگەڵ خەڵکی بکەم هەتا دەڵێن (لا إله إلا الله) ئیتر ئەوکەسەی ئەمە بڵێ ئەوا سەر و ماڵی لە من حەرام دەبێت مەگەر لەبەر مافێکی ڕەوا کە لە سەری بێ بەپێی شەرعی خودا وە حیساب و لێپرسینەوەی لەسەر خودایە، ئەبو بەکر فەرمووی سوێندم بە خوا جەنگ و شەڕ لەگەڵ ئەو تاقمە دەکەم کە جیاوازی بکات لە نێوان نوێژ و زەکاتدا وە دەڵێن نوێژ فەرزە بەڵام زەکات فەرز نییە ئەوەی ئینکاری بکات وە ئەگەر گیسکێکی دەدات بە پێغەمبەر و ئێستا نەیدەدا شەریان لەگەڵ دەکەم.لەو کاتەدا عومەر فەرمووی بۆم دەرکەوت کە ئەبو بەکر لەسەر حەق و راستییە.

## باب إثم مانع الزكاة

١٧٤.وَعَنْهُ أيضاً قَال: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((مَنْ آتَاهُ اللَّهُ مَالًا فَلَمْ يُؤَدِّ زَكَاتَهُ مُثِّلَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ شُجَاعًا أَقْرَعَ لَهُ زَبِيبَتَانِ، يُطَوَّقُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، ثُمَّ يَأْخُذُ بِلِهْزِمَتَيْهِ –يَعْنِي شِدْقَيْهِ– ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا مَالُكَ، أَنَا كَنْزُكَ، ثُمَّ تَلَا ﴿ وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ ﴾الآية.

## (بەشی/ گوناهی کەسێك زەکات نەدات)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (کەسێ خوا ماڵ و سامانی پێدا و زەکاتی نەدا لە رۆژی قیامەتدا ئەم ماڵ و سامانە دەبێتە ئەژدیهایەکی کەچەڵی شاخداری خاوەن دوو کەڵبەی گەورەی رەش و خۆی لەملی گادەدا و ئەلقە دەخوات دەنوسێ بە

هەردوو لغاوییەوە پێی دەڵێ من ماڵ و سامانەکەتم من ماڵ و سامانەکەتم لە پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ ﴾{سورەتی ال عمران، بگەڕێوە بۆ تەفسیری ئاسان بۆ راڤەکردنی}.

## باب إنفاق المال في حقه

١٧٥.عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَال: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: ((لَا حَسَدَ إِلَّا فِي اثْنَتَيْنِ رَجُلٍ آتَاهُ اللَّهُ مَالًا فَسَلَّطَهُ عَلَى هَلَكَتِهِ فِي الْحَقِّ وَرَجُلٍ آتَاهُ اللَّهُ حِكْمَةً فَهُوَ يَقْضِي بِهَا وَيُعَلِّمُهَا)).

## (بەشی/ سەرف کردنی ماڵ لە رێگای شەرعیدا)

لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێ گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەیفەرموو: (حەسودی بردن لە دوو کات بە گوناه و تاوان نانوسرێ: یەکێکیان پیاوێ خوای گەورە ماڵ و سامانی پێ ببەخشێ و سەرفی بکات لە رێگای شەرعیدا و زەکاتی لێ بدا و ئەوی تریان پیاوێ خوای گەورە دانایی و زانیاری پێ بەخشرابێ و لە نێوان خەڵکی بڵاوی بکاتەوە خەڵکی فێر بکات (واتە حەسودی بردن بەم دوو کەسە دروستە).

## باب الصَدقةَ من كَسبَ طيب

١٧٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَنْ تَصَدَّقَ بِعَدْلِ تَمْرَةٍ مِنْ كَسْبٍ طَيِّبٍ، وَلَا يَقْبَلُ اللَّهُ إِلَّا الطَّيِّبَ، وَإِنَّ اللَّهَ يَتَقَبَّلُهَا بِيَمِينِهِ ثُمَّ يُرَبِّيهَا لِصَاحِبِهِ كَمَا يُرَبِّي أَحَدُكُمْ فَلُوَّهُ حَتَّى تَكُونَ مِثْلَ الْجَبَلِ)).

## (بەشی/ صەدەقە و خێر کردن لە ماڵی پاك و حەڵاڵ)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەوەی خێرێ بکات بە قەد دەنکە خورمایەکی لە کەسابەتی حەڵاڵ چونکە هەرچی حەڵاڵ و پاك نەبێت خوا وەری ناگرێ، وە ئەوەی خێری بکا لە حەڵاڵ، خودا وەری دەگرێ بە دەستی راستی قودرەتی خۆی وەك چۆن یەکێ لە ئێوە جوانووی ماینێ یان پێچووە وشترێ بۆخۆی پەروەردە دەکا، خودایش ئەو خێرە ئاوا پەروەردە دەکا تا تەواو گەورە دەبێ وە بە قەد کێوێکی لێ دێت.

## باب الصَدَقة قبل الرد

١٧٧. عَنْ حَارِثَةَ بْنَ وَهْبٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسول الله (ﷺ) يَقُولُ: ((تَصَدَّقُوا فَإِنَّهُ يَأْتِي عَلَيْكُمْ زَمَانٌ يَمْشِي الرَّجُلُ بِصَدَقَتِهِ فَلَا يَجِدُ مَنْ يَقْبَلُهَا، يَقُولُ الرَّجُلُ: لَوْ جِئْتَ بِهَا بِالْأَمْسِ لَقَبِلْتُهَا، فَأَمَّا الْيَوْمَ فَلَا حَاجَةَ لِي بِهَا)).

## (بەشی/ خێر و صەدەقە کردن پێش ئەوەی لێت وەرنەگیرێ)

حاریسی کوڕی وەهەب دەفەرموێ گوێم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو فەرمویٚ: (تا زووە خێر و صەدەقە بکەن، چونکە کات و زەمانێك بەسەرتان دادێت پیاوێ بە خێر و صەدەقەوە دەڕوات تا بیدات بە کەسێ بەڵام کەسی دەست ناکەوێ کە لێی وەرگرێ ، پیاوێ پێی دەڵێت ئەگەر دوێنێ بۆت هێنابام وەرم دەگرت بەڵام ئەمڕۆ پێویستم پێی نییە).

## باب أي الصَدقة أفضل

١٧٨. عَن أبي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وآلِهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أيُّ الصَّدَقَة أعْظَمُ أجْرًا؟ قَالَ: ((أنْ تَصَدَّقَ وَأنْتَ صَحِيحٌ شَحِيحٌ، تَخْشَى الْفَقْرَ وَتَأْمُلُ الْغِنَى، وَلَا تُمْهِلُ حَتَّى إِذَا بَلَغَتْ الْحُلْقُومَ قُلْتَ لِفُلَانٍ كَذَا وَلِفُلَانٍ كَذَا وَقَدْ كَانَ لِفُلَانٍ))!

### (بەشی/ چ خێر و صەدەقەیەك خێرترە و باشترە)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پیاوێ هاتە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ئەی پێغەمبەری خوا چ خێرێك گەورەترە لە پاداشتدا فەرمووی ئەو خێرەی كە دەیكەی لە شت ساغ بێ و دڵت پێی خۆش بێ و مەترسی هەژار كەوتنت هەبێ و هیوای دەوڵەمەندبوونت هەبێ، نەوەك كەمتەرخەمی بكەی هەتا ئەو كاتەی گیان دەگات بە قورگت و بەڵێ ئەوە بۆ ئەم و ئەمە بۆ ئەو تازە چ سودی دەبێ چونكە ئەم ماڵە دەبێ بە ماڵی میراتگران.

## باب من أمَرَ خادمه بالصَدقة

١٧٩.عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِذَا أنْفَقَتْ الْمَرْأةُ مِنْ طَعَامِ بَيْتِهَا غَيْرَ مُفْسِدَةٍ كَانَ لَهَا أجْرُهَا بِمَا أنْفَقَتْ وَلِزَوْجِهَا أجْرُهُ بِمَا كَسَبَ، وَلِلْخَازِنِ مِثْلُ ذَلِكَ لَا يَنْقُصُ بَعْضُهُمْ أجْرَ بَعْضٍ شَيْئًا)).

### (بەشی/ كەسێ فەرمان بە خزمەتگوزار و نۆكەری بدات بەخێركردن)

عائیشەخان (رضي الله عنها) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (كاتێ ژن بەبێ دەست بڵاوی لەخۆراكی ماڵەوەی ببەخشێ ئەوە پاداشتی

باشی بۆ هەیە لەسەر ئەو بەخشینە هەروەها مێردەکەش پاداشتی باشی بۆ هەیە چونکە ئەو پەیدای کردوە وە کلیل دار و خەزینە داریش بە هەمان شێوە پاداشی هەیە کەسیشیان لە پاداشتی کەسیان کەم ناکەنەوە).

## باب الحَثْ على أداء أموال الناس، وفَضل الغَني علَى الفَقيرْ

١٨٠. قالَ رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وآله وَسَلَّمَ: ((مَنْ أَخَذَ أَمْوَالَ النَّاسِ يُرِيدُ أَدَاءَهَا أَدَّى اللَّهُ عَنْهُ وَمَنْ أَخَذَ يُرِيدُ إِتْلَافَهَا أَتْلَفَهُ اللَّهُ)).

## (بەشی/ هاندان لە سەردانەوەی ماڵی خەڵكی و فەزڵی دەوڵەمەندی بەسەر هەژار)

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (کەسێ ماڵ و سامانی خەڵكی لابێ بە قەرز بیەوێ بیداتەوە ئەوا خوا یارمەتی دەدات بۆ دانەوەی قەرزەکە، بەڵام ئەوەی بیەوێ نەیداتەوە ئەوا خوای گەورە ماڵ و سامانی بەهەدەر دەبات و خێری لێ نابینێت).

١٨١. عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ عَلَيهِ الصَّلاةُ والسَّلام قَال: ((الْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنْ الْيَدِ السُّفْلَى وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ وَخَيْرُ الصَّدَقَةِ عَنْ ظَهْرِ غِنًى وَمَنْ يَسْتَعْفِفْ يُعِفَّهُ اللَّهُ وَمَنْ يَسْتَغْنِ يُغْنِهِ اللَّهُ)).

حەكیمی كوڕی حیزام (رضي الله عنه) لە پێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە كە دەفەرموێ دەستی سەرەوە باشترە لەدەستی ژێرەوە وە ئەو دەستەی كە دەبەخشێ باشترە لەوەی وەردەگرێ، وە دەست پێ بكە بە خزمە نزكەكانت وەكو دایك و باوكت وە چاكترین خێر و صەدەقە لەو خێرەیە كە لەسەر تێری بێ وە هەركەسێكیش خۆی بە دوور بگرێ لە ڕووزەردی و سواڵ

کردن و سواڵ دا خودا لە هەردوو جیهاندا ڕوو سوور و سەربەرزی دەکات وە هەرکەسێ چاوی لە دەستی ئەم و ئەو نەبێ خوای گەورە بێ نیاز و دەوڵەمەندی دەکات.

## باب المنفق والمُمْسِك

١٨٢.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: ((مَا مِنْ يَوْمٍ يُصْبِحُ الْعِبَادُ فِيهِ إِلَّا وَمَلَكَانِ يَنْزِلَانِ فَيَقُولُ أَحَدُهُمَا: اللَّهُمَّ أَعْطِ مُنْفِقًا خَلَفًا. وَيَقُولُ الْآخَرُ: اللَّهُمَّ أَعْطِ مُمْسِكًا تَلَفًا)).

## (بەشی/ ئەمەی خێر دەکات و ئەوەی نایکات)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە دەفەرموێ هەموو ڕۆژێ لەسەر بەندەکان دەبێتەوە دوو فریشتە دادەبەزن بۆ سەر زەوی، یەکێکیان دەفەرموێ: خودایە ئەوەی بەخشندەیە تۆش پێی ببەخشە و تۆڵەی بەزیادەوە بۆ بکە وە ئەوەی تریشیان دەفەرموێ خودا ئەوەی ڕەزیل و نابەخشێ تۆش لێی بگرەوە و سامانی بفەوتێنە.

١٨٣.وعَنهُ أيضاً أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَقول: ((مَثَلُ الْبَخِيلِ وَالْمُنْفِقِ كَمَثَلِ رَجُلَيْنِ عَلَيْهِمَا جُبَّتَانِ مِنْ حَدِيدٍ مِنْ ثُدْيَيْهِمَا إِلَى تَرَاقِيهِمَا، فَأَمَّا الْمُنْفِقُ فَلَا يُنْفِقُ إِلَّاسبَغَتْ أَوْ وَفَرَتْ عَلَى جِلْدِهِ حَتَّى تُخفي بَنَانَهُ وَتَعْفُوَ أَثَرَهُ. وَأَمَّا الْبَخِيلُ فَلَا يُرِيدُ يُنْفِقُ شَيئاً إِلَّا لَزِقَتْ كُلُّ حَلْقَةٍ مَكَانَهَا فَهُوَ يُوسِّعُهَا وَلَا تَتَّسِع)).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بوو دەفەرموێ نمونەی پیاوی ڕەزیل و چرۆك و وە ئەوەی بەخشندەیە و سەخییە وەکو نمونەی دوو پیاو وان کە یەکێ سەر و زرێی ئاسنی تەسکیان لە بەردا

بێ لە ئاستی مەمکیانەوە بێ تا حولەمەی خوار قورگیانەوە جا لە دوای جار ئەوەی ماڵ دەبەخشێ بۆی دەکشێ و فراوان دەبێ و تا دەگاتە بەرپێی، بەڵام پیاوی چروك و رەزیل هەرکاتێ ویستی خێرێك بکات ئەم زرێیەکە تەسك دەبێتەوە دێتەوە یەك و هەردوو دەستی توند و شەتەك دەدرێن بە بەرپێەوە وە پێغەمبەر فەرموی جا رەزیلەکە هەر هەوڵ و تەقەلا دەدات کە بکشێ و بە رینی بکات بەڵام هەر تەسك دەبێتەوە و لەسەری ناتوانێ.

## باب على كل مسلم صدقة

١٨٤.عَنْ أبي موسى الأشعري رضي الله عَنْه عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ صَدَقَةٌ))، فَقَالُوا: يَا نَبِيَّ اللَّهِ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ؟ قَالَ: ((يَعْمَلُ بِيَدِهِ فَيَنْفَعُ نَفْسَهُ وَيَتَصَدَّقُ)). قَالُوا: فَإِنْ لَمْ يَجِدْ؟ قَالَ: ((يُعِينُ ذَا الْحَاجَةِ الْمَلْهُوفَ)). قَالُوا: فَإِنْ لَمْ يَجِدْ؟ قَالَ: ((فَلْيَعْمَلْ بِالْمَعْرُوفِ وَلْيُمْسِكْ عَنْ الشَّرِّ فَإِنَّهَا لَهُ صَدَقَةٌ)).

## (بەشی/ لەسەر هەموو موسڵمانێ صەدەقە هەیە)

ئەبو موسای ئەشعەر (رضي الله عنه) لە پێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێ: (لەسەر هەموو موسڵمانێ صەدەقە و خێر پێویستە، هاوەڵان ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر نەیبوو چۆن، فەرمووی با ئیش بکات هەم خۆی بەخێو بکات هەم خێریش لە دەستکەوتەکەی بکات، گوتیان ئەگەر ئەمەی بۆ نەکرا چۆن فەرموی یاریدەی لێقەوماوێ یان داما و بدات ووتیان ئەی ئەگەر ئەمەشی بۆ نەکرا چی بکات، فەرموی با رەفتاری جوان بێ کاری باش و رێگەی باش بێ، واز لە خراپە بهێنێ ئەمە بۆی دەبێتە گەورەترین خێر و صەدەقە.

## باب الإستعفاف عن المسألة

١٨٥.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَأَنْ يَأْخُذَ أَحَدُكُمْ حَبْلَهُ فَيَحْتَطِبَ عَلَى ظَهْرِهِ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَأْتِيَ رَجُلًا فَيَسْأَلَهُ أَعْطَاهُ أَوْ مَنَعَهُ)).

## (بەشی/ خۆدوورخستنەوە لە سواڵ کردن)

**ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (سوێندم بەو کەسەی کە گیانی منی بەدەستە کەسێ لە ئێوە گوریسێ هەڵبگرێ بە کۆڵ و کۆڵەدارێ بە پشتی هەڵگرێ بیفرۆشێ پێویستی خۆی پێ جێبەجێ بکات گەلێ باشترە لەوەی بچێ بۆ لای خەڵکی و سواڵ و دەرۆزە بکات ئیتر بەشی بدەن یان نایدەن).**

١٨٦. عَنْ حَكِيمَ بْنَ حِزَامٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَأَعْطَانِي ثُمَّ سَأَلْتُهُ فَأَعْطَانِي ثُمَّ سَأَلْتُهُ فَأَعْطَانِي، ثُمَّ قَالَ: ((يَا حَكِيمُ إِنَّ هَذَا الْمَالَ خَضِرَةٌ حُلْوَةٌ فَمَنْ أَخَذَهُ بِسَخَاوَةِ نَفْسٍ بُورِكَ لَهُ فِيهِ، وَمَنْ أَخَذَهُ بِإِشْرَافِ نَفْسٍ لَمْ يُبَارَكْ لَهُ فِيهِ، وكان كَالَّذِي يَأْكُلُ وَلَا يَشْبَعُ الْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنْ الْيَدِ السُّفْلَى)). فقَالَ حَكِيمٌ: فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ لَا أَرْزَأُ أَحَدًا بَعْدَكَ شَيْئًا حَتَّى أُفَارِقَ الدُّنْيَا. فَكَانَ أَبُو بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ يَدْعُو حَكِيمًا إِلَى الْعَطَاءِ فَيَأْبَى أَنْ يَقْبَلَهُ مِنْهُ. ثُمَّ إِنَّ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دَعَاهُ لِيُعْطِيَهُ فَأَبَى أَنْ يَقْبَلَ مِنْهُ شَيْئًا، فَقَالَ: إِنِّي أُشْهِدُكُمْ يَا مَعْشَرَ الْمُسْلِمِينَ عَلَى حَكِيمٍ أَنِّي أَعْرِضُ عَلَيْهِ حَقَّهُ مِنْ هَذَا الْفَيْءِ فَيَأْبَى أَنْ يَأْخُذَهُ، فَلَمْ يَرْزَأْ حَكِيمٌ أَحَدًا مِنْ النَّاسِ بَعْدَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)حَتَّى تُوُفِّيَ.

حەکیمی کوڕی حیزام (رضي الله عنه) دەفەرموێ داوام لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد بەشی دام لە پاشان داوام لێ کردەوە هەمدیسان بەشی دام لە پاشان دیسانەوە داوام لێ کرد هەم دیسان بەشی دام، لە پاشان فەرموی ئەم ماڵ و سامانە میوەی سەوز و شیرینە و خۆشە بەڵام کەسێ بە چاودێری وەریگرێ ئەوە خودا پیت و بەرەکەتێ تێ دەخا بەڵام ئەوەی بە چاوچنۆکی و هەڵپە هەڵپەی بۆ بکات و چاوی تێی ببڕێ و تا دەیدەنێ ئەو ماڵە پیت و بەرەکەتی تێ ناکەوێ وەك ئەو کەسە لی دێت کە هەر دەخوا و تێر نابێت، دیارە دەستی بەرز و بەخشەر چاکترە لە دەستی نزم و وەرگر، حەکیم ووتی گوتم ئەی پێغەمبەری خوا سوێندم بەوکەسەی تۆی کردوە بە پێغەمبەر لە پاش تۆ تا لە دونیادا دەردەچم شت لە کەس داوا ناکەم، وە ئەبوبەکر (رضي الله عنه) بانگی حەکیمی کرد و بۆ پێدانی دەستکەوتی جەنگی بەڵام حەکیم وەری نەگرت وە عومەر (رضي الله عنه) ئەویش بەم شێوەیە بانگی کرد بۆ پێدانی سامانی جەنگی وەری نەگرت وە عومەر فەرموی ئەی خەڵکینە بە شاهێد بن من ئەم ماڵ و سامانە دەدەم بە حەکیمی کوڕی حیزام وەری ناگرێ، راوی دەفەرموێ حەکیمی کوڕی حیزام هەتا کۆچی دوایی کرد لە کەسی تر لە پاش پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەری نەگرت.

## باب مَنْ سأل النّاس تكثُراً

١٨٧. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((مَا يَزَالُ الرَّجُلُ يَسْأَلُ النَّاسَ حَتَّى يَأْتِيَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لَيْسَ فِي وَجْهِهِ مُزْعَةُ لَحْمٍ)).

## (بەشی کەسێ داوای ماڵ و سامان بکات بۆ زۆربوون)

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی پیاوی واتان هەیە هەر خەریکی دەرۆزە و سواڵ کردنە هەتا دەگاتە رۆژی قیامەت بۆ دیوانی خودا یەك پارچە گۆشتی بە روویدا نامێنێ و دەم و چاوی یەك پارچە ئێسقانە و بێ گۆشتە.

١٨٨. كَتَبَ مُعَاوِيَةَ بن أبي سفيان رَضيَ اللهُ عَنْهما إِلَى الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ رَضيَ اللهُ عَنْه أَنْ اكْتُبْ إِلَيَّ بِشَيْءٍ سَمِعْتَهُ مِنْ رَسول الله (ﷺ)، فَكَتَبَ إِلَيْهِ: سَمِعْتُ رَسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: ((إِنَّ اللَّهَ كَرِهَ لَكُمْ ثَلَاثًا: قِيلَ وَقَالَ، وَإِضَاعَةَ الْمَالِ، وَكَثْرَةَ السُّؤَالِ)).

موعاویەی کوڕی ئەبی سوفیان نامەی نووسی بۆ موغیرەی کوڕی شوعبە(رضي الله عنه) کەوا شتێکم بۆ بنوسە کە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ)ت بیستبێ ئەویش بۆی نوسی کە گوێم لە پێغەمبەری خوا بووە دەیفەرموو خوای گەورە رقی لە سێ شتانە، قسە و قسەلۆك کردن فولان ئاوای گوت فولان ئاوای گووت و ماڵ و سامان بە زایەدان، و زۆر پرسیار و سوالکردن.

١٨٩.عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضي اللهُ عَنها قَالَتْ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلِيَ أَجْرٌ أَنْ أُنْفِقَ عَلَى بَنِي أَبِي سَلَمَةَ؟ إِنَّمَا هُمْ بَنِيَّ، فَقَالَ: ((أَنْفِقِي عَلَيْهِمْ، فَلَكِ أَجْرُ مَا أَنْفَقْتِ عَلَيْهِمْ)).

ئوم سەلەمە (رضي الله عنه) دەفەرموێ ووتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چەند منالێکم ماوە لە ئەبو سەلەمەی مێردی پێشووم ئەگەر ماڵ و سامانیان پێ ببەخشم خێرم پێ دەگا؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی ماڵ و سامانیان بدەیێ وە بۆیان سەرف بکە پاداشت وەردەگری لەلایەن خودای گەورە.

١٩٠. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((لَيْسَ الْمِسْكِينُ الَّذِي يَطُوفُ عَلَى النَّاسِ تَرُدُّهُ اللُّقْمَةُ وَاللُّقْمَتَانِ، وَالتَّمْرَةُ وَالتَّمْرَتَانِ، وَلَكِنْ الْمِسْكِينُ الَّذِي لَا يَجِدُ غِنًى يُغْنِيهِ، وَلَا يُفْطَنُ بِهِ فَيُتَصَدَّقُ عَلَيْهِ، وَلَا يَقُومُ فَيَسْأَلُ النَّاسَ)).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (هەژاری ئەوەنییە کە بەسەر خەڵکی دەگەڕێ و ئەم دەرگا و ئەو دەرگا دەکات بۆ سواڵکردن وە لەو ماڵ و پاروێ نان وەردەگرێ وە لەو ماڵ و دوو پارو وەردەگرێ یان دەنکێ خورما و یان دوو دەنك خورما، بەڵکو هەژاری ئەو کەسەیە کە شایستەی خێر پێ کردن نییە و دارایی نیە کە پێی بژی و لەبەر قەدرگرتنی خۆی ناچێ بۆ سواڵ و دەرۆزە لە خەڵکی بکات ئەوە هەژار و فەقیری راستەقینەیە.

١٩١. عَنْ زَيْنَب إمرَأة عبدالله بن مَسعود رضي لله عَنهُما قالَت: انْطَلَقْت إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعلى آلِهِ وَسَلَّمَ فَوَجَدْتُ امْرَأَةً مِنْ الْأَنْصَارِ عَلَى الْبَابِ حَاجَتُهَا مِثْلُ حَاجَتِي، فَمَرَّ عَلَيْنَا بِلَالٌ فَقُلْنَا {له}: سَلِ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ أَيَجْزِي عَنِّي أَنْ أُنْفِقَ عَلَى زَوْجِي وَأَيْتَامٍ لِي فِي حَجْرِي. فَسَأَلَهُ فَقَالَ: ((نَعم، لَهَا أَجْرَانِ، أَجْرُ الْقَرَابَةِ وَأَجْرُ الصَّدَقَةِ)).

زەینەبی خێزانی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (رضي الله عنها) دەفەرموێ چوومە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) دیتم ئافرەتێ لە ئەنصارییان لە دەرگای ماڵی پێغەمبەر وەستابوو پێویستی وەکو پێویستی من بوو و لەو کاتە بیلال هاتو پێمان ووت پرسیار لە پێغەمبەری خوا بکە ئایا دروستە بۆ من کە ماڵ و سامان سەرف بکەم بۆ مێردم کە عەبدوڵڵا کە دەست کورت بووە هەندێك هەتیوو لەلای بوون خۆی بە خێووی دەکردن، پێغەمبەری خوا فەرمووی بەڵێ

دوو پاداشتی بۆ هەیە بە پاداشتی خزمایەتی و پاداشتی خێر و صەدەقە کردن.

١٩٢. وَفِي رواية: قالَتْ يا رسول الله إِنَّكَ أَمَرْتَ بِالصَّدَقَة، وكَانَ عِنْدِي حُلِيٌّ فَأَرَدْتُ أَنْ أَتَصَدَّقَ بِهِ فَزَعَمَ ابْنُ مَسْعُودٍ أَنَّهُ وَوَلَدَهُ أَحَقُّ مَنْ تَصَدَّقْتُ بِهِ عَلَيْهِمْ. فَقَالَ النَّبِيُّ عَلَيهِ الصلاةُ والسَّلام: ((صَدَقَ ابْنُ مَسْعُودٍ زَوْجُكِ وَوَلَدُكِ أَحَقُّ مَنْ تَصَدَّقْتِ بِهِ عَلَيْهِمْ)).

لە ریوایەتێکی تردا هاتووە زەینەب ووتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تۆ فەرمانت بە خێر و صەدەقە کردوە وە من هەندێك خشلّ و ئالّتونم هەیە دەمەوێ خێر و خێراتی پێ بکەم کەچی بە قسەی عەبدوللّای کوڕی مەسعودی مێردم بێ ئەو خشلّ و زێرە بدەم بە عەبدوللّای کوڕی مەسعود و منالّەکانی ئەوە خێرترە، پێغەمبەری خوا فەرمووی عەبدوللّای کوڕی مەسعود راست دەکات و قسەکەی تەواوە مێردەکەت و منالّەکانت لە پێشترە کە ئەم خێرەی پێ بدەیت.

١٩٣. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ إِنَّ نَاسًا مِنْ الْأَنْصَارِ سَأَلُوا رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ فَأَعْطَاهُمْ، ثُمَّ سَأَلُوهُ فَأَعْطَاهُمْ، ثُمَّ سَأَلُوهُ فَأَعْطَاهُمْ، حَتَّى نَفِدَ مَا عِنْدَهُ، فَقَالَ: ((مَا يَكُونُ عِنْدِي مِنْ خَيْرٍ فَلَنْ أَدَّخِرَهُ عَنْكُمْ وَمَنْ يَسْتَعْفِفْ يُعِفَّهُ اللَّهُ وَمَنْ يَسْتَغْنِ يُغْنِهِ اللَّهُ وَمَنْ يَتَصَبَّرْ يُصَبِّرْهُ اللَّهُ، وَمَا أُعْطِيَ أَحَدٌ عَطَاءً خَيْرًا وَأَوْسَعَ مِنْ الصَّبْرِ)).

ئەبو سەعیدی خودری (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە خەڵکانێ لە ئەنصارییەکانی مەدینە داوایان لە پێغەمبەر کرد ئەویش بەشی دان و لە پاشان داوایان کردەوە ئەویش دیسان بەشی دان وە تا هەمووی تەواو بوو، فەرمووی ئەو ماڵ و سامانەی لەلای من لە ئێوەی ناشارمەوە وە ئەوەی لە

دەستم بێ دەیدەم پێتان وە هەر کەسێکیش خۆی بە دوور بگرێ لە رووزەردی سواڵکردن خودا لە هەردوو جیهاندا روو سوور و سەربەرزی دەکات وە هەرکەسێکیش چاوی تێربێ و خۆی بێ نیاز بگرێ چاوی لە دەستی خەڵکی نەبێ خودا دەوڵەمەندی دەکات وە هیچ بەهرە و خەڵاتی فراوانتر نییە لە سەبر و ئارام گرتن.

١٩٤. عَنْ عمر بن الخَطاب رضي الله عَنْه قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يُعْطِينِي الْعَطَاءَ فَأَقُولُ أَعْطِه مَنْ هُوَ أَفْقَرُ إِلَيْهِ مِنِّي، فَيقول: ((خُذْهُ، إِذَا جَاءَكَ مِنْ هَذَا الْمَالِ شَيْءٌ وَأَنْتَ غَيْرُ مُشْرِفٍ وَلَا سَائِلٍ فَخُذْهُ، وَمَا لَا فَلَا تُتْبِعْهُ نَفْسَكَ)).

عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) جاران لە ماڵ و سامان بەشی دەدام و پێم ووت بیدە بە کەسێ کە ئەو لە من زیاتر پێویستی پێ هەیە ئەویش فەرمووی ئەی عومەر کاتێ شتێکت پێ درا وەری گرە بەڵام چاوی تێ مەبڕە وە خۆت داوای نەکەی وە خۆتێ مەگەینە.

١٩٥. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ النَّبِيِّ عَلَيهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلام قَالَ: ((لَأَنْ يَأْخُذَ أَحَدُكُمْ حَبْلَهُ ثُمَّ يَغْدُوَ أَحْسِبُهُ قَالَ إِلَى الْجَبَلِ فَيَحْتَطِبَ فَيَبِيعَ فَيَأْكُلَ وَيَتَصَدَّقَ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَسْأَلَ النَّاسَ)).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێرێتەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی ئەگەر کەسێ بچێ گوریسێ هەڵگرێ بە کۆڵێ دار بێنێ بۆ بازاڕ و بیفرۆشێ وە بە پارەکەی لێی بخوا و خێر و صەدەقەی پێ بکات باشترە لەوەی دانیشێ بە تەمبەڵی و سواڵکردن لە خەڵکی بکات.

١٩٦. عَنْ عَبدالله بن عمر رضي الله عَنهُما عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلى آلِهِ وَسَلَّمَ قَال: ((فِيمَا سَقَتْ السَّمَاءُ وَالْعُيُونُ أَوْ كَانَ عَثَرِيًّا الْعُشْرُ، وَمَا سُقِيَ بِالنَّضْحِ نِصْفُ الْعُشْرِ)).

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنهما) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ ئەو کشتوکاڵەی بە باران و چۆم و چۆگە و کانی و کارێز ئاوبدری یان دێمی بێ ئەوا زەکاتەکەی دەیەکە (واتە: یەك لەسەر دەیە) وە ئەوەیش بە ئاوکێشان بە ووڵاخ واتە بە مەسرەف و پارە ئاوبدرێ زەکاتەکەی نیو دەیەکە، واتە بیست لە یەك (نِصْف عُشْر) واتە ٢/١.

١٩٧.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَال: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعلى آلِهِ وَسَلَّمَ يُؤْتَى بِالتَّمْرِ عِنْدَ جِذاذ النَّخْلِ فَيَجِيءُ هَذَا بِتَمْرِهِ وَهَذَا مِنْ تَمْرِهِ حَتَّى يَصِيرَ عِنْدَهُ كَوْمًا مِنْ تَمْرٍ، فَجَعَلَ الْحَسَنُ وَالْحُسَيْنُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَلْعَبَانِ بِهذا التَّمْرِ، فَأَخَذَ أَحَدُهُمَا تَمْرَةً فَجعلَهَا فِي فِيهِ، فَنَظَرَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَأَخْرَجَهَا مِنْ فِيهِ فَقَالَ: ((أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ آلَ مُحَمَّدٍ لَا يَأْكُلُونَ الصَّدَقَةَ)).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ خورمایان هێنا بۆ پێغەمبەر (ﷺ) هەتا لە خزمەتیدا خەرمانی خورما زۆر کۆکراوە وە حەسەن و حوسێنی کچەزای پێغەمبەر گەمە و گاڵتەیان پێ دەکرد وە یەکێکیان دەنکە خورمایەکی خستە دەمیەوە پێغەمبەری خواش بینی، وەهەوڵی دا دەنکە خورماکە لە دەمی بهێنێتە دەرەوە وە دەری هێنا و فەرمووی ئایا نازانی ئێمەی خانەوادەی موحەمەد زەکات ناخۆین و قەدەغەیە لەسەرمان.

١٩٨.عَنْ أَبِي سَعِيد الخُدري رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قال: قَالَ رسول الله (ﷺ): ((لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَة أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ)).

ئەبو سەعیدی خودری (رضي الله عنه) فەرموی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی لە پێنج ئۆقە زیو کەمتر زەکاتی لێ دەرناکرێ وە حوشتریش لە پێنج حوشتر کەمتر بێ زەکاتی نیە، وە خورما و دانەوێڵە ئەگەر لە پێنج وویسق کەمتر بوون زەکاتیان تێدا نیە (پێنج وویسق دەکاتە ٦٥٣کغم)

## باب صدق الفطر

١٩٩.عَنْ أبن عمر رضي الله عنهما قال: فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) زَكَاةَ الْفِطْرِ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ عَلَى الْعَبْدِ وَالْحُرِّ وَالذَّكَرِ وَالْأُنْثَى وَالصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ مِن الْمُسْلِمِينَ، وَأَمَرَ بِهَا أَنْ تُؤَدَّى قَبْلَ خُرُوجِ النَّاسِ للصَّلَاةِ.

## (بەشەكانی/ زەكاتی سەرفیترە)

عەبدوڵڵای كوڕی عومەر (رضي الله عنهما) پێغەمبەری خوا سەرفیترەی لەسەر پێویست كردین لە رەمەزاندا بە دانی صاعێك خورما یان صاعیك جۆ لەسەر بەندە و ئازاد و نێر و مێ و گەورە و بچووك لەموسڵمانان فەرمانی دا كە دەربكرێ لە ماڵ و سامان پێش چوونی بۆ نوێژی جەژنی رەمەزان.

٢٠٠. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: كُنَّا نُخْرِجُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) يَوْمَ الْفِطْرِ صَاعًا مِنْ طَعَامٍ، وَكَانَ طَعَامَنَا الشَّعِيرُ وَالزَّبِيبُ وَالْأَقِطُ وَالتَّمْرُ.

ئەبو سەعیدی خودری دەفەرموێ ئێمە لە زەمانی پێغەمبەر (ﷺ) زەكاتی سەرفیترەمان دەدا كە صاعیك بوو لە خواردەمەنی یان كەشك یان جۆ یان خورما یان مێژوو.

٢٠١. عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما قَالَ: فَرَضَ النَّبِيُّ عَلَيهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام صَدَقَةَ الْفِطْرِ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ أَوْ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ عَلَى الصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ وَالْحُرِّ وَالْمَمْلُوك.

ئیبن عومەر (رضي الله عنهما) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) زەكاتی سەرفیترەی فەرزكرد لەسەر موسڵمانان صاعیك لە جۆ یان خورما لەسەر گەورە و بچووك و بەندە و ئازادا.

## (كتاب الحج)

## باب آداب الحَج

٢٠٢. وَعنْهُ أيضاً قال: سَمِعْتُ رسول الله (ﷺ) يَقُول: ((مَنْ حَجَّ لِلّهِ فَلَمْ يَرْفُثْ وَلَمْ يَفْسُقْ رَجَعَ كَيَوْمِ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ)).

## (نامەی حەج)

## (بەشی/ ئادابی حەج كردن)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) فەرموی كەسێ حەج بكات و لە كاتی حەج كردنی دا نەچێتە لای خێزانی و سەرپێچی فەرمانی خوای نەكرد كە گەڕایەوە وەك ئەو ڕۆژەی كە تازە لە دایك بوو وایە.

## باب الخُطبة أيام مِنى

٢٠٣. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) خَطَبَ النَّاسَ يَوْمَ النَّحْرِ فَقَالَ: ((يَا أَيُّهَا النَّاسُ، أَيُّ يَوْمٍ هَذَا))؟ قَالُوا: يَوْمٌ حَرَامٌ، قَالَ: ((فَأَيُّ بَلَدٍ))؟ قَالُوا: بَلَدٌ حَرَامٌ، قَالَ: ((فَأَيُّ شَهْرٍ هَذَا))؟ قَالُوا: شَهْرٌ حَرَامٌ، قَالَ: ((فَإِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ وَأَعْرَاضَكُمْ عَلَيْكُمْ حَرَامٌ كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا، فِي بَلَدِكُمْ هَذَا فِي شَهْرِكُمْ هَذَا، فَأَعَادَهَا مِرَارًا))، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَقَالَ: ((اللَّهُمَّ هَلْ بَلَّغْتُ)) قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّهَا لَوَصِيَّتُهُ

إِلَى أُمَّتِهِ ثُمَّ قالَ عَليهِ الصَّلاةُ والسَّلام: ((فَلْيُبْلِغْ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ، فَرُبَّ مُبَلَّغٍ أَوعى مِنْ سَامِعٍ، لَا تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّارًا يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ)).

## (بەشی/ ووتاری رۆژانی مینا)

لەعەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ووتاری دەدا لە رۆژی جەژنی قوربان فەرمووی (ئەی خەڵکینە ئەم رۆژە چ رۆژێکە ووتیان رۆژی حەرام و قەدەغەیە، ئینجا فەرمووی ئەم شارە چ شارێکە ووتیان ئەم شارە شاری حەرام و قەدەغەیە کە مەککەیە فەرمووی ئەدی ئەم مانگە چ مانگێکە ووتیان مانگی حەرامە فەرمووی خوێن و ماڵ و سامانتان و ناموستان لەسەر یەکتری حەرام و قەدەغەیە وەکو حەرامی ئەو رۆژە و لەم مانگەتان و وە لەم شارەتان دا وە چەند جارێك دووبارەی کردەوە لە پاشان سەری بەرزکردەوە و فەرمووی خودایە بە شاهید بە پێم راگەیاندن، وە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس فەرمووی سوێندم بەوەی گیانی منی بەدەستە بەراستی ئەمە راسپاردەیەکە بۆ ئۆممەتەکەی لە پاشان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی با ئەوانەی لێرەن بۆ ئەوانەی لێرەنین بگێرنەوە، وە لەوانەیە ئەوەی پێی رادەگەینن تێگەیشتووتر بێت، وە ئاگادار بن لە پاش من کافر و بێ بڕوا نەبنەوە یەخەی یەکتری بگرن و لە گەردەنی یەکتر بدەن.

٢٠٤. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) أَنَاخَ بِالْبَطْحَاءِ الَّتِي بِذِي الْحُلَيْفَةِ فَصَلَّى بِهَا، وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَفْعَلُ ذَلِكَ.

لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنهما) دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وشترەکەی یەخدا لە بەطحاء لە نزیك (ذو الحليفة) وە لەوێ نوێژی کرد، وە راوی کە دەڵێت عەبدوڵڵای کوڕی عومەر هەموو جاران وای دەکرد.

٢٠٥. وَعَنْه رضي اللهُ عَنْهُ أنَّ تَلْبِيَةَ رَسُولِ اللّهِ (ﷺ) لَبَّيْكَ اللّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لَا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لَا شَرِيكَ لَكَ.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنهما) دەفەرموێ تەلبیەکردنی پێغەمبەر بەم جۆرە بوو (لَبَّيْكَ اللّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لَا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لَا شَرِيكَ لَكَ) واتە: خودایە بە دەم بانگەوازی تۆوە هاتووم وە لە خزمەتت دام وە خوایە لە خزمەتت داوم و هاوەڵ و شریکت بۆ نیە و هەموو سوپاس و ستایش هەر بۆ تۆیە، بەخشش و ناز و نیعمەت هەر لە خۆت دێ و بێ هاوەڵ و شەریکی.

٢٠٦. عَنْ عَبْدِ اللّهِ بْنِ أبِي أوْفَى رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: اعْتَمَرَ رَسُولُ اللّهِ (ﷺ) فَطَافَ بِالْبَيْتِ وَصَلَّى خَلْفَ الْمَقَامِ رَكْعَتَيْنِ وَمَعَهُ مَنْ يَسْتُرُهُ مِنْ النَّاسِ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: أدَخَلَ رَسُولُ اللّهِ (ﷺ) الْكَعْبَةَ؟ قَالَ: ((لا)).

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی ئەوفا دەفەرموێ (رضي الله عنه) پێغەمبەری خوا (ﷺ) عومرەی کرد، تەوافی ماڵی خوای کرد و دوو رەکعات نوێژی سوننەتی لە پشت مەقامی ئیبراهیم کرد وە چەند کەسانێ لەگەڵی بوون بەریان لە خەڵکی گرت نەبادا نوێژەکەی پێ ببڕن و ئازاری بۆ دروست کەن، پیاوێ ووتی ئایا پێغەمبەری خوا (ﷺ) چووە ناو کەعبە؟ فەرمووی نەخێر.

٢٠٧. عَنْ إبن عمر رضي الله عَنهُما أنَّه سأله رجل عَنْ استلام الحجر فقالَ: رأيت رسول الله (ﷺ) يَسْتَلِمُهُ وَيُقَبِّلُهُ.

لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەگێڕێتەوە (رضي الله عنه) کە پیاوێ پرسیاری لێ کرد دەربارەی ماچ کردنی بەردە رەشەکە (الحجر الاسود) فەرمووی خۆم پێغەمبەری خوام (ﷺ) دیت دەستی کردە بەردە رەشەکە و ماچی کرد.

٢٠٨.وعَنْه رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قال: كانَ النَّبيُّ (ﷺ) إذَا طَافَ الطَّوَافَ الْأوَّلَ خَبَّ ثَلَاثاً وَمَشِي أَرْبَعاً، وَكَانَ يَسْعَى بَطْنَ الْمَسِيلِ إِذَا طَافَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە تەوافی یەکەم جاری دەکرد لە دورەی کەعبەدا سێ جار بە نەرمە غاردان دەی کرد و چوارەکەی تر بە ڕۆیشتنی ئاسایی بوو تەوافی دەکرد، وە کە سەعی لە نێوان سەفا و مەڕوەدا لەلای شیوەکەی نێوان سەفا و مەڕوادا نەرمە غاری دەدا (کە ئێستا لە نێوان دوو گڵۆپی سەوزا دایە)ئامادەکار.

٢٠٩.عَنْ أُمِّ الْفَضْلِ رَضيَ اللهُ عَنْها قالَت: شَكَّ النَّاسُ يَوْمَ عَرَفَةَ فِي صَوْمِ النَّبِيِّ (ﷺ)، فَبَعَثْتُ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) بِشَرَابٍ فَشَرِبَهُ.

لە ئوم فەضل (رضي الله عنها) دەفەرموێ: (خەڵکی بە گومان بوون لە ڕۆژی عەرەفە لە بەڕۆژوو بوونی پێغەمبەر(ﷺ)، ئوم فەضل دەفەرموێ جا منیش جامێ شیرم نارد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) (تا بزانین بەڕۆژوو یان نا) پێغەمبەری خوا شیرەکەی خواردەوە ئیتر زانیمان کە بەڕۆژوو نییە)..

٢١٠. عَنْ عَلِيّ كَرَّمَ اللهُ وَجهه قَال: أمَرَنِي رَسُولُ اللّهِ (ﷺ) أنْ أتَصَدَّقَ بِجِلَالِ الْبُدْنِ الَّتِي نَحَرْتُ وَبِجُلُودِهَا.

عەلی (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی پێکردم بەو حوشترەی کە سەرم بڕیوە بۆ قوربانی بە کەل و پەلەکانیش کە لەسەر پشتییەوە بوون وەپیستەکەشی بیکەم بە خێر و صەدەقە.

٢١١. عَنْ أبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَال: ((الْعُمْرَةُ إِلَى الْعُمْرَةِ كَفَّارَةٌ لِمَا بَيْنَهُمَا، وَالْحَجُّ الْمَبْرُورُ لَيْسَ لَهُ جَزَاءٌ إِلَّا الْجَنَّةُ)).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەم عومرەیە تاکو عومرەی تر دەبێتە کەفارەتی گوناه و تاوانی نێوانیان وە حەجی وەرگیراو لەلای خودا پاداشتی تەنها بەهەشتە

٢١٢. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلى آله وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا قَفَلَ مِنْ غَزْوٍ أَوْ حَجٍّ أَوْ عُمْرَةٍ يُكَبِّرُ عَلَى كُلِّ شَرَفٍ مِنْ الْأَرْضِ ثَلَاثَ تَكْبِيرَاتٍ، ثُمَّ يَقُولُ: ((لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، آيِبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ سَاجِدُونَ لِرَبِّنَا حَامِدُونَ، صَدَقَ اللَّهُ وَعْدَهُ وَنَصَرَ عَبْدَهُ وَهَزَمَ الْأَحْزَابَ وَحْدَهُ)).

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنهما)دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا کاتێ لە غەزا یان حەج یان لە عومرە دەگەڕایەوە لە ڕێگادا بەسەر هەر بەرزاییەك و تەپۆلکەیێ سەردەکەوت بە دەنگی بەرز سێ جار دەیووت (الله أكبر) وە لە پاشان ئەم زیکرەی دەکرد: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، آيِبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ سَاجِدُونَ لِرَبِّنَا حَامِدُونَ، صَدَقَ اللَّهُ وَعْدَهُ وَنَصَرَ عَبْدَهُ وَهَزَمَ الْأَحْزَابَ وَحْدَهُ)

واتە: هیچ خوایەك نییە جگە لە الله نەبێت وە هاوەڵ و شەریکی نییە وە موڵك و سامان بۆ خوایە و دەستەڵاتی لەسەر هەموو شتێك هەیە وە گەراینەوە بۆ تۆبەکاری و بەندایەتی، کڕنۆش بردن بۆ پەروەردگارمان و سوپاس گوزارین، وە خوای گەورە بەڵێنەکەی بەراست گەیاند و بەندەی خۆی سەرخست وە هەر خۆی کۆمەڵی بێ بڕوای ژێر خست.

٢١٣. عَنْ جابر رضي الله عَنْه قال: نَهى النَّبي صلى الله عليه وَعلى آله وَسلم أنْ يَطْرُقَ الرَّجُل أهْلَهُ لَيْلاً.

جابر (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگەی نەدەداو نەهی دەکرد پیاو بە شەوا لەناکاو خۆی بکا بە ماڵی خۆی.

٢١٤. عَنْ أَنَس بن مالك قَالَ: كَانَ رسول الله (ﷺ) لَا يَطْرُقُ أَهْلَهُ، كَانَ لَا يَدْخُلُ إِلَّا غُدْوَةً أَوْ عَشِيّاً.

ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) عادەتی وابوو کە لەسەفەر دەگەڕایەوە بەشەو لە ناکاو نەیدەدا بەسەر ماڵ و منالّیدا بەڵکو یان سەر لەبەیانی دەگەڕایەوە یان دەمە و ئێواریٚ.

## باب السفر عذاب

٢١٥. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ تَعالى عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((السَّفَرُ قِطْعَةٌ مِنْ الْعَذَابِ يَمْنَعُ أَحَدَكُمْ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ وَنَوْمَهُ، فَإِذَا قَضَى نَهْمَتَهُ فَلْيُعَجِّلْ إِلَى أَهْلِهِ)).

## (بەشی سەفەر و ئێش و ئازارە)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە دەفەرموێ: (سەفەر بەشێکە لە عەزاب و ئازار، خۆراك و خواردنەوە و نوستنی لێ تێك دەچێ و ئەگەر کارتان لە سەفەر تەواو بوو پەلە بکەن بۆ گەڕانەوە بۆ لای ماڵ و منالّتان.

## باب فضل المدينة المنورة

٢١٦. وَعَنْه أيضاً قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((عَلَى أَنْقَابِ الْمَدِينَةِ مَلَائِكَةٌ لَا يَدْخُلُهَا الطَّاعُونُ وَلَا الدَّجَّالُ)).

## (بەشی/ فەزڵی مەدینەی منەوەڕە)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی لەسەر دەرگاکانی شاری مەدینە فریشتەکانی خوا وەستاون ناهێڵن نە تاعوون وە نە دەججال بێتە نێو شاری مەدینەی پیرۆز.

٢١٧.قالَ عَلَيه الصَّلاة والسَّلام: ((الْمَدِينَةُ كَالْكِيرِ تَنْفِي خَبَثَهَا، وَيَنْصَعُ طَيِّبهَا)).

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (شاری مەدینە وەکو کوورەی ئاسن وایە پیسی و پۆخڵی لادەبات و پاك و خاوێنی و بۆن خۆشی بڵاو دەکاتەوە).

٢١٨.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَال: ((مَا بَيْنَ بَيْتِي وَمِنْبَرِي رَوْضَةٌ مِنْ رِيَاضِ الْجَنَّةِ وَمِنْبَرِي عَلَى حَوْضِي)).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ لە نێوان ماڵ و مینبەری من بریتییە لە مێرگێك لە مێرگەکانی بەهەشت وەمینبەرم لەسەر حەوزی کەوسەرە لەبەهەشتدا.

٢١٩.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((إِنَّ الْإِيمَانَ لَيَأْرِزُ إِلَى الْمَدِينَةِ كَمَا تَأْرِزُ الْحَيَّةُ إِلَى جُحْرِهَا)).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (ئیمان و بڕوا پەنگ دەخواتەوە لە مەدینەدا هەروەك چۆن مار کۆدەبێتەوە و پەپکە دەکات لەسەر کونەکەی خۆیدا).

٢٢٠.عَنْ أنس بن مالك قال: كان النَّبِيُّ عَلَيه الصَّلاة والسَّلام يَقُولُ: ((لَا يَكِيدُ أَهْلَ الْمَدِينَةِ أَحَدٌ إِلَّا انْمَاعَ كَمَا يَنْمَاعُ الْمِلْحُ فِي الْمَاءِ)).

ئەنەسی کوڕی مالیك دەفەرموێ (رضي الله عنه) پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرمو: (کەس ناتوانێ زەرەر و ئازار بە خەڵکی مەدینە بگەیەنێ وە کەسێ

ئاوا بکا ئەوا خوای گەورە دەیتوێنێتەوە وە لەناوی دەبات وەك چۆن خوێ لە ئاودا دەتوێتەوە).

٢٢١. عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ تَعالَى عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وآلهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((اللَّهُمَّ اجْعَلْ بِالْمَدِينَةِ ضِعْفَيْ مَا جَعَلْتَ بِمَكَّةَ مِنْ الْبَرَكَةِ)).

ئەنەس (رضي الله عنه) لە پێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێ خودایە گیان، بگێرە بۆ خەڵکی مەدینە دووقاتی پیت وبەرەکەتی مەککە.

٢٢٢. وَمِنْ دُعائِهِ: ((اللَّهُمَّ حَبِّبْ إِلَيْنَا الْمَدِينَةَ كَحُبِّنَا مَكَّةَ أَوْ أَشَدَّ، اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي صَاعِنَا وَفِي مُدِّنَا وَصَحِّحْهَا لَنَا وَانْقُلْ حُمَّاهَا إِلَى الْجُحْفَةِ)) قَالَتْ عائِشة رَضِيَ اللهُ عَنْها: وَقَدِمْنَا الْمَدِينَةَ وَهِيَ أَوْبَأُ أَرْضِ اللَّهِ، قَالَتْ: فَكَانَ بُطْحَانُ يَجْرِي نَجْلًا –تَعْنِي مَاءً– آجِنًا، وكَانَ أبو بكر إذا أخَذَتْهُ الحُمَّي يقول:

كُلُّ امْرِىءٍ مُصَبَّحٌ في أهلِهِ والمَوتُ أدْنى مِنْ شِراكِ نَعلِهِ

وَكانَ بلالٌ إذا أقلَعَ عَنْهُ الحَمَّى يَرفَعْ عَقِيرَتَهُ وَيَقول:

ألا لَيتَ شِعري هَل أبِيتَنَّ لَيلَةً بِواد وحَوْلِي إذْخِرٌ وَنَخيلُ

وَهَل أرِدَن يَوماً مِياهَ مجِنَّة وَهل يَبْدُونَ لي شامَةٌ وَطَفِيلُ

وە لە نزاکانی پێغەمبەر (ﷺ): (اللَّهُمَّ حَبِّبْ إِلَيْنَا الْمَدِينَةَ كَحُبِّنَا مَكَّةَ أَوْ أَشَدَّ، اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي صَاعِنَا وَفِي مُدِّنَا وَصَحِّحْهَا لَنَا وَانْقُلْ حُمَّاهَا إِلَى الْجُحْفَةِ) واتە: خوایە گیان چۆن شاری مەککەت لا خۆشەویست کردوین ئاوا شاری مەدینەش لامان خۆشەویسترین کەس زیاتر، خوایە پیت و بەرەکەتیش بۆمان بنێرە بۆ صاع و مشت و گەز و پێوانەدا، وە دانەوێڵە و میوەدا وە تەندروستی و لەش ساغی بدە بە دانیشتووانی و بیکە بە شارێکی سازگار بۆمان وە ناساغی بگۆزەوە ببە بۆ (جوعفە)، عائیشە فەرمووی (رضي الله

عنها) چوینه شاری مەدینه بوه خۆشترین و خۆشەویسترین زەوی خوا، وه دەفەرمویّ بوطحان ئاوی تیادا دەڕۆیی–وه ئەبو بەکر کاتێ تای گرتبا دەیفەرموو: (كُلُّ امْرِىءٍ مُصَبَّحٌ فِي أَهْلِهِ وَالمَوتُ أَدْنى مِنْ شِرَاكِ نَعلِهِ) واته هەموو کەسێك ئەمڕۆ بەیانی لەلای خزم و کەس و کاری دایه و وه مردن لێی نزیك تره له ئاوزێنەی کەوشەکانی.

وه بیلال ئەگەر تای بەری دابا دەنگی بەرزدەکردەوه دەیفەرموو:

أَلا لَيتَ شِعرِي هَل أَبِيتَنَّ لَيلَةً بِوادٍ وحَوْلِي إِذْخِرٌ وَنَخيلُ

وَهَل أَرِدَن يَوماً مِياهَ مجنَّةٍ وَهَل يَبْدُونَ لي شامَةٌ وَطَفِيلُ

واته: خۆزگه ئەمزانی ئایا ئەتوانم شەوێك له دۆڵێکدا بمێنمەوه و له دەوروبەرم (إِذْخِرٌ) جۆره گیایەکه و جەلیل هەبێت وه ئایا ئەتوانم رۆژێك بێمه سەر ئاوەکانی (مجنَّة) (شوێنێکه) وه لەوێوه هۆزی شامه و توفەیلم لێ دیار بێت.

# (كتاب الصوم)

## باب فضل الصَّوْمْ

٢٢٣. وَعَنْه أيضاً أنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((الصِّيَامُ جُنَّةٌ، فَلَا يَرْفُثْ وَلَا يَجْهَلْ وَإِنْ امْرُؤٌ قَاتَلَهُ أَوْ شَاتَمَهُ فَلْيَقُلْ إِنِّي صَائِمٌ مَرَّتَيْنِ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ {يقول تَعالى:} يَتْرُكُ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ وَشَهْوَتَهُ مِنْ أَجْلِي الصِّيَامُ لِي وَأَنَا أَجْزِي بِهِ وَالْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا)).

## (نامەی رۆژوو)

## (بەشی/ فەزڵی رۆژوو)

ئەنەس (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (رۆژوو قەڵغانە لە گوناه و تاوان، وە ئەگەر کەسێك بەرۆژوو بوو با قسەی ناشیرین و قسەی سەردەمی نەزانی نەکات بەرامبەر خەڵکی وە ئەگەر کەسێك شەری پێ بفرۆشێت یان جنێوی پێ پێی بڵێ من بەرۆژووم دووجار، سوێندم بەو کەسەی کە گیانی منی بەدەستە بۆنی دەمی رۆژووەوان لەلای خوا لە بۆنی میسك خۆشترە (خوای گەورە دەفەرموێ) لەبەر من واز لە خواردن و خواردنەوە و ئارەزوەکانی دێنێ، رۆژوو بۆ منە و وەمنیش پاداشتی دەدەمەو وە چاکە یەك بە دەیە.

٢٢٤.عَنْ عُمَر بن الخطاب رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قال: مَنْ حَفَظ حَدِيثًا عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) فِي الْفِتْنَةِ؟ قَالَ حُذَيْفَةُ: أَنَا سَمِعْتُهُ (ﷺ) يَقُولُ: ((فِتْنَةُ الرَّجُلِ فِي أَهْلِهِ وَمَالِهِ وَجَارِهِ، تُكَفِّرُهَا الصَّلَاةُ وَالصِّيَامُ وَالصَّدَقَةُ)).

عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) دەفەرموێ: (کامتان فەرمودەیەکی لە پێغەمبەر وەرگرتووە دەربارەی فیتنە و ئاشوب) لەو کاتەدا حوزەیفە ووتی من گوێم لە پێغەمبەر بوو (ﷺ) دەیفەرموو: (فیتنە و ئاژاوەی پیاو لە ماڵ و منالی و دراوسێیەکەی دەبێت و وە بەهۆی رۆژوو و نوێژ و خێر و خێراتەوە دەبێتە کەفارەتی گوناهەکان بۆی).

## باب قول الزور في الصَوْمْ

٢٢٥.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَنْ لَمْ يَدَعْ قَوْلَ الزُّورِ وَالْعَمَلَ بِهِ فَلَيْسَ لِلَّهِ حَاجَةٌ فِي أَنْ يَدَعَ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ)).

## (بەشی/ قسەی نابەجێ لە کاتی بەرۆژووبوندا)

ئەبو هورەیرە دەفەرموێ (رضي الله عنه) پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی کەسێ واز لە قسەی نابەجێ و کردەوەی خراپە نەهێنێ ئەوا خوا پێویستی بەو نییە کە واز لە خواردن و خواردنەوە بهێنێ.

## باب الصوم لمن خاف العزوبة

٢٢٦. عَنْ عَبدالله بن مَسعود رضي الله عَنْه قال: كُنَّا مع النّبي (ﷺ) فَقالَ: ((مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ، فإِنَّهُ أغَضُّ للبَصَرِ وَأحصَنُ للفَرجْ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ)).

## (بەشی/ رۆژوو بۆ کەسێ توانای ژنهێنانی نەبێ)

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (رضي الله عنه) دەفەرموێ ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا بووین (ﷺ) فەرمووی کەسێ توانای ژنهێنانی بوو با ژنبهێنێ چونکە دەبێتە هۆی پاراستنی چاو و دامەنی وە ئەگەر توانای نەبوو با بەرۆژوو بێت چونکە رۆژوو بۆی دەبێت بە دەرمان و ئارەزوو شکێن.

## باب بركة السحور

٢٢٧. عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): ((تَسَحَّرُوا فَإِنَّ فِي السَّحُورِ بَرَكَةً)).

## (بەشی/ بەرەکەت لە پارشێودا)

ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی پارشێوو بکەنەوە چونکە پارشێو پیت و بەرەکەتی تیایە.

## باب السواك للصائم

٢٢٨. عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عَنْها عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وآلِهِ وَسَلَّمَ قال: ((السِّوَاكُ مَطْهَرَةٌ لِلْفَمِ مَرْضَاةٌ لِلرَّبِّ)).

## (بەشی/ سیواك بۆ رۆژووان)

عائیشەخان (رضي الله عنها) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە دەفەرموێ: (سیواك کردن دەبێتەهۆی خاوێنکردنەوەی ناودەم و رازیبوونی خوای گەورەی لەسەرە).

## باب من قامَ رَمَضان وليْلة القدر

٢٢٩. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رسول الله (ﷺ) قَالَ: ((مَنْ صَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ، وَمَنْ قَامَ لَيْلَةَ الْقَدْرِ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ)).

## (بەشی/ کەسێ لە رەمەزان و شەوی قەدەر هەڵسێ بۆ شەونوێژ)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی کە سێ مانگی رەمەزان بەرۆژوو بێت بە ئیمان و بڕوایەوە و داوای پاداشت لە خوا بکات خوا لە گوناهی پێشووی دەبووێت.

٢٣٠. عَنْ عَائِشَةَ وَأُمِّ سَلَمَةَ رضي الله عَنهُما أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ يُدْرِكُهُ الْفَجْرُ وَهُوَ جُنُبٌ مِنْ أَهْلِهِ ثُمَّ يَغْتَسِلُ وَيَصُومُ.

عائیشەخان و ئوم سەلەمە (رضي الله عنهما) دەفەرموون کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگەیشتە بەیانی و لەش گران بوون (لە جەنابەت دابوو) خۆی دەشۆرد و وە بەرۆژووش دەبوو.

٢٣١.وعَنْها رَضِيَ اللّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يُقَبِّلُ وَيُبَاشِرُ وَهُوَ صَائِمٌ، وَكَانَ أَمْلَكَكُمْ لِإِرْبِهِ.

**عائیشەخان (رضي الله عنها) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) عادەتی وابوو یەکێك لە خێزانەکانی خۆی ماچ دەکرد و بەرۆژوو بوو، وە لە هەموو کەس زیاتر توانای خۆگری هەبوو بەسەر نەفس و ئارەزووی خۆیدا.**

٢٣٢. عَنْ جابر بن عبدالله رضي الله عنهما قال: كان رسول الله صلى الله عليه وآلِه وسلم في سفر فرأى زحاماً ورجلاً قد ظُلِّلَ عليه فقال: ((ما هذا))؟ فقالوا صائم، فقال: ((لَيْسَ مِنَ البِرِّ الصِّيَامُ في السَّفَرِ)).

**جابیری کوڕی عەبدوڵلا دەفەرموێ (رضي الله عنه) پێغەمبەر (ﷺ) لە سەفەردا بینی قەرەباڵغێ، وەپیاوێ سێبەری بۆ کرابوو فەرموی ئەوە چییەتی ووتیان بەرۆژووە، فەرمووی لە چاکە دانیە رۆژوو لەسەفەردا.**

٢٣٣. عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ رضي الله عَنْهُ قال: آخَى النَّبِيُّ (ﷺ) بَيْنَ سَلْمَانَ وَأَبِي الدَّرْدَاءِ رَضي اللهُ عَنهُما فَزَارَ سَلْمَانُ أَبَا الدَّرْدَاءِ فَرَأَى أُمَّ الدَّرْدَاءِ مُتَبَذِّلَةً فَقَالَ لَهَا: مَا شَأْنُكِ؟ قَالَتْ: أَخُوكَ أَبُو الدَّرْدَاءِ لَيْسَ لَهُ حَاجَةٌ فِي الدُّنْيَا، فَجَاءَ أَبُو الدَّرْدَاءِ فَصَنَعَ لَهُ طَعَامًا فَقَالَ: كُلْ. قَالَ: فَإِنِّي صَائِمٌ. قَالَ: مَا أَنَا بِآكِلٍ حَتَّى تَأْكُلَ، فَأَكَلَ فَلَمَّا كَانَ اللَّيْلُ ذَهَبَ أَبُو الدَّرْدَاءِ يَقُومُ، قَالَ نَمْ، فَنَامَ ثُمَّ ذَهَبَ يَقُومُ فَقَالَ لَهُ سَلْمانُ نَمْ، فَلَمَّا كَانَ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ قَالَ سَلْمَانُ: قُمْ الْآنَ، فَصَلَّيَا، فَقَالَ لَهُ سَلْمَانُ: إِنَّ لِرَبِّكَ عَلَيْكَ حَقًّا وَلِنَفْسِكَ عَلَيْكَ حَقًّا وَلِأَهْلِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، فَأَعْطِ كُلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ، فَأَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) فَذَكَرَ لَهُ ذَلِكَ فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): ((صَدَقَ سَلْمَانُ)).

**لە ئەبی جەحیفە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) برایەتی خستە نێوان سەلمان و ئەبو دەردا ء (رضي الله عنهما) وە سەلمان**

سەردانی ئەبو دەردای کرد و وە بینی دایکی دەرداء بە پەشۆکاوی و بەرگی ناشیرنی لەبەردابوو فەرمووی ئەوە چیتە دایکی ئەبو دەردا ووتی برات ئەبو دەرداء پێویستی بە دونیا نییە، کاتێ ئەبو دەرداء هاتەوە خواردنی بۆ دروست کرد بە سەلمانی ووت تۆ بخۆ من بەرۆژووم، سەلمان ووتی هەتا تۆ لێی نەخۆین منیش ناخۆم، ئەویش لێی خوارد، کاتێ شەو داهات ئەبو دەرداء چوو بۆ شەونوێژ و سەلمان پێی ووت بخەوە جارێ، ئەویش خەوت پاشان هەڵسایەوە سەلمان پێی ووت بخەوە، هەتا شەو ئەوەندەی نەما، ئینجا سەلمان پێی وت هەڵسە ئینجا هەڵساو بەیەکەوە شەو نوێژیان کرد، سەلمان پێی ووت پەروەردگارت مافی بەسەرتەوە هەیە، نەفسی خۆت مافی بەسەرتەوە هەیە، خێزانت مافی بەسەرتەوە هەیە، جا هەریەك مافی خۆی بدەرێ جا کاتێ بەیانی بۆوە چوو بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و باسەکەی بۆ گێرانەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: سەلمان راستی راستی فەرمووە.

٢٣٤.عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَصُومُ حَتَّى نَقُولَ لَا يُفْطِرُ، وَيُفْطِرُ حَتَّى نَقُولَ لَا يَصُومُ، فَمَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) اسْتَكْمَلَ صِيَامَ شَهْرٍ إِلَّا رَمَضَانَ، وَمَا رَأَيْتُهُ أَكْثَرَ صِيَامًا مِنْهُ فِي شَعْبَانَ.

عائیشەخان (رضي الله عنها) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) عادەتی وابوو کە بەرۆژوو دەبوو دەمان ووت قەت وازی لێ ناهێنێ وە کە بەرۆژوو نابوو دەمان ووت قەت بەرۆژوو نابێت (رۆژووی سوننەت) وەنەمان دیت پێغەمبەر (ﷺ) مانگێك لەسەر یەك بەرۆژوو بێت تەنها مانگی رەمەزان نەبێت وە نەمان دیت هیچ مانگی زیاتر تیادا بەرۆژوو بایە لە مانگی شەعبان زیاتر.

٢٣٥.عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((الْتَمِسُوهَا فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ لَيْلَةَ الْقَدْرِ، فِي تَاسِعَةٍ تَبْقَى، فِي سَابِعَةٍ تَبْقَى، فِي خَامِسَةٍ تَبْقَى)).

**عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (رضي الله عنهما) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (چاوەڕێی شەوی قەدەر بکەن لە دە شەوی کۆتایی مانگی رەمەزان، لە بیست ویەك، لە بیست و سێ وە لە بیست و پێنجی).**

٢٣٦. عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ عَلَيهِ الصَّلاةُ والسَّلام إِذَا دَخَلَ الْعَشْرُ شَدَّ مِئْزَرَهُ وَأَحْيَا لَيْلَهُ وَأَيْقَظَ أَهْلَهُ.

**عائیشەخان (رضي الله عنها) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) عادەتی وابوو کە دە شەوی کوتایی مانگی رەمەزان دەهات پێشینەکەی توند دەکرد و شەونوێژی دەکرد و خاوخێزانی هەڵدەستاند.**

٢٣٧. وَعنها أيضاً أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَعْتَكِفُ الْعَشْرَ الْأَوَاخِرَ مِنْ رَمَضَانَ حَتَّى تَوَفَّاهُ اللَّهُ، ثُمَّ اعْتَكَفَ أَزْوَاجُهُ مِنْ بَعْدِهِ.

**عائیشە خان (رضي الله عنها) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) کە دە شەوی کۆتایی مانگی رەمەزان دەهات ئیعتکافی دەکرد لەمزگەوتدا هەتا کۆچی دوایی کرد وە لە دوای وویش خێزانەکانی وایان دەکرد.**

٢٣٨. وَعنها أيضاً رَضي اللهُ عَنها قالتْ: وَإِنْ كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ لَيُدْخِلُ عَلَيَّ رَأْسَهُ وَهُوَ فِي الْمَسْجِدِ فَأُرَجِّلُهُ، وَكَانَ لَا يَدْخُلُ الْبَيْتَ إِلَّا لِحَاجَةٍ إِذَا كَانَ مُعْتَكِفًا.

**عائیشە خان (رضي الله عنها) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئیعتکافی دەکرد لەناو مزگەوتدا وە لە پەنجەرەی ژووری مزگەوتدا سەری دەهێنایە**

دەرەوە و منیش سەریم شانە دەکرد و نەدەهاتەوە ماڵەوە مەگەر بۆ شتێك بوایە کە ئادەمیزاد پێویستیەتی.

٢٣٩. عَنْ صَفِيَّةَ زَوْجَ الرسول (ﷺ) ورضي عنها أَنَّهَا جَاءَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ تَزُورُهُ فِي اعْتِكَافِهِ فِي الْمَسْجِدِ فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ فَتَحَدَّثَتْ عِنْدَهُ سَاعَةً، ثُمَّ قَامَتْ تَنْقَلِبُ، فَقَامَ النَّبِيُّ عَلَيهِ الصَّلاةُ والسَّلام مَعَهَا يَقْلِبُهَا، حَتَّى إِذَا بَلَغَتْ بَابَ الْمَسْجِدِ عِنْدَ بَابِ أُمِّ سَلَمَةَ، مَرَّ رَجُلَانِ مِنْ الْأَنْصَارِ فَسَلَّمَا عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ لَهُمَا: ((عَلَى رِسْلِكُمَا إِنَّمَا هِيَ صَفِيَّةُ بِنْتُ حُيَيٍّ)) فَقَالَا: سُبْحَانَ اللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَكَبُرَ عَلَيْهِمَا، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((إِنَّ الشَّيْطَانَ يَبْلُغُ مِنْ الْإِنْسَانِ مَبْلَغَ الدَّمِ، وَإِنِّي خَشِيتُ أَنْ يَقْذِفَ فِي قُلُوبِكُمَا شَيْئًا)).

لە صەفیەی خێزانی پێغەمبەر (رضي الله عنها) و (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە سەردانی پێغەمبەری خوای کردوە لەمزگەوتدا لەکاتی ئیعتکافدا بووە لە مزگەوت لە دە شەوی کۆتایی مانگی رەمەزان وە قسەی لەگەڵ کردوە چەند کاتێك لە پاشان هەڵساوە وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵی هەڵساوە وە هەتا گەیشتووە بە دەرگای مزگەوت لە نزیك دەرگای ئوم سەلەمە لەو کاتەدا دوو پیاو بەوێدا تێپەریان کردووە و سڵاویان لە پێغەمبەر کردوو وە ئەویش وەڵامی سڵاوی وانی دایەوە و فەرمووی لەسەرخۆ بن ئەمە صەفیەی کچی حوبەی، ئەوانیش ووتیان (سبحان الله) ئەی پێغەمبەری خوا، وە ئەو ووشەیە لەلایان گەورە بوو وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی (شەیتان لەناو دڵی مرۆڤ دا هاتووچۆ دەکات هەروەکو چۆن خوێن لەناو دەمارەکان هاتووچۆ دەکات وە ترسام کە شتێك بکەوێتە دڵتانەوە).

٢٤٠. عَنْ أَنَس بْن مَالِك رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ رسول الله (ﷺ)قَالَ: ((لَيْسَ مِنْ بَلَدٍ إِلَّا سَيَطَؤُهُ الدَّجَّالُ إِلَّا مَكَّةَ وَالْمَدِينَةَ، لَيْسَ لَهُ مِنْ نِقَابِهَا نَقْبٌ إِلَّا عَلَيْهِ الْمَلَائِكَةُ صَافِّينَ يَحْرُسُونَهَا، ثُمَّ تَرْجُفُ الْمَدِينَةُ بِأَهْلِهَا ثَلَاثَ رَجَفَاتٍ، فَيُخْرِجُ اللَّهُ كُلَّ كَافِرٍ وَمُنَافِقٍ)).

ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه)لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: (هیچ شارێك نییە کە دەججال نەچێتە ناوی جگە لە مەککە و مەدینە نەبێت وە هیچ ڕێرەوێك نامێنێ لەو دوو شارە فریشتەی لێ نەبێ بۆ پاراستن، وە شاری مەدینەش سێ بوومەلەرزەی تێدا ڕوودەدات دەبێتەهۆی دەرچوونی هەرچی کافر و مونافیق و دووڕوویەك هەیە تیایدا).

٢٤١. قَالَ ابْنُ عُمَر بن الخطاب رضي الله عنهما: إِسْبَاغُ الْوُضُوءِ الْإِنْقَاءُ.

عەبدوڵلای کوڕی عومەری کوڕی خەتتاب دەفەرموێ دەستنوێژ شۆردنی بە تێر و تەسەلی واتە بە تەواوی پاك بوونەوە.

## باب تحية المسجد وصلاة الضحى والتَطَوع في البَيْت وَشَهر رَمَضان

٢٤٢.عَنْ أَبي قَتَادَةَ الْأَنْصَارِيَّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَال: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمْ الْمَسْجِدَ فَلَا يَجْلِسْ حَتَّى يُصَلِّيَ رَكْعَتَيْنِ)).

## (بەشی/ نوێژی چوونە ناو مزگەوت (تحيه المسجد) و نوێژی چێشتنگا و نوێژی سوننەت لە ماڵەوە و مانگی رەمەزان)

ئەبی قەتادەی ئەنصاری (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (ئەگەر کەسێکتان چووە مزگەوت با دانەنیشێ تاکو دوو رەکعات سوننەتی چوونە ناو مزگەوت بکات (تحية المسجد).

٢٤٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: أَوْصَانِي خَلِيلِي بِثَلَاثٍ لَا أَدَعُهُنَّ حَتَّى أَمُوتَ: صَوْمِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، وَصَلَاةِ الضُّحَى، وَنَوْمٍ عَلَى وِتْرٍ.

**ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ خۆشەویستم پێغەمبەری خوا (ﷺ) وە صیەت و ئامۆژگاری کردم بە سێ شتان کە وازی لێ ناهێنم تاکو مردن: ڕۆژووی سێ ڕۆژان لە هەر مانگێکدا، وە کردنی نوێژی چێشتنگاو، وە تاکو نوێژی وەتر نەکەم نەخەوم.**

٢٤٤. عَنْ نَافِعٍ عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وآلِهِ وَسَلَّمَ: ((اجْعَلُوا فِي بُيُوتِكُمْ مِنْ صَلَاتِكُمْ، وَلَا تَتَّخِذُوهَا قُبُورًا)).

**لە نافیع لە عەبدوڵلای کوڕی عومەر (رضي الله عنهما) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ): (فەرموی لە ماڵەکانتان بەشی نوێژی سوننەتی تیادا بکەنەوە وە ماڵەکانتان مەکەن بە گۆڕستان).**

٢٤٥. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: ((إِذَا دَخَلَ شَهْرُ رَمَضَانَ فُتِّحَتْ أَبْوَابُ السَّمَاءِ، وَغُلِّقَتْ أَبْوَابُ جَهَنَّمَ، وَسُلْسِلَتْ الشَّيَاطِينُ)).

**ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوەکە پێغەمبەری (ﷺ) فەرمووی ئەگەر مانگی ڕەمەزان هات دەرگاکانی ئاسمان دەکرێتەوە وە دەرگاکانی دۆزەخ دادەخرێت و، شەیتانەکان کۆت و زنجیر دەکرێت.**

## باب الصائم إذا أكَلَ، ومن مات وَعَلَيْهِ صوم

٢٤٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ رسول الله (ﷺ) قَالَ: ((إِذَا نَسِيَ أَحَدُكُمْ فَأَكَلَ وَشَرِبَ فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ فَإِنَّمَا أَطْعَمَهُ اللَّهُ وَسَقَاهُ)).

## (بەشی/ ڕۆژووان ئەگەر خواردنی خوارد وە کەسێ مردوو ڕۆژووی لەسەربوو)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی کەسێ لە بیری چوو بەڕۆژووە خواردن یان خواردنەوەی خوارد با ڕۆژووەکەی تەواو بکات، ئەوە خوا تێر خواردن خواردنەوەی کردوە.

٢٤٧.عَنْ عائشة رضي الله عنها أنَّ رسول الله (ﷺ) قال: ((مَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ صَوْمٌ صَامَ عَنْهُ وَلِيُّهُ)).

عائیشە (رضي الله عنها) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (کەسێ کۆچی کرد و ڕۆژوی ڕەمەزانی لەسەربوو کەس و کاری دەتوانن بۆ بگرنەوە).

٢٤٨.وَقَالَ الْحَسَنُ: إِنْ صَامَ عَنْهُ ثَلَاثُونَ رَجُلًا فِي يَوْمٍ وَاحِدٍ جَازَ.

ئیمامی حەسەن (رضي الله عنه) دەفەرموێ: (ئەگەر لە ڕۆژێکدا سی کەس بۆی بەڕۆژوو بن ئەوا دروستە).

٢٤٩.عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّهُ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أُمِّي مَاتَتْ وَعَلَيْهَا صَوْمُ شَهْرٍ أَفَأَقْضِيهِ عَنْهَا؟ قَالَ: ((نَعَمْ، فَدَيْنُ اللَّهِ أَحَقُّ أَنْ يُقْضَى)).

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (رضي الله عنها) دەفەرموێ پیاوێ هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) ووتی ئەی پێغەمبەری خوا دایکم مردووە و ڕۆژووی مانگێك لە ڕەمەزان قەرزارە و بۆی نەلوا بیگرێت ئایا دروستە بۆی بگرمەوە؟ فەرمووی بەڵێ بۆی بگرەوە چونکە قەرزی خوا نزیکترە کە بۆی بگێڕنەوە.

## باب تعجيل الإفطار، وصوم الجُمْعَةً

٢٥٠.عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (ﷺ) قَالَ: ((لَا يَزَالُ النَّاسُ بِخَيْرٍ مَا عَجَّلُوا الْفِطْرَ)).

## (بەشی/ پەلە کردن لە رۆژوو شکاندن و رۆژووی هەینی)

لە سەهلی کوڕی سەعد (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: خەڵکان بەردەوام دەبن لەسەر خێر و چاکە کردندا. هەتا لە رۆژوو شکاندن دا پەلەی لێ بکەن.

٢٥١. عَنْ أبي هُرَيْرَة رَضيَ اللهُ عَنْهُ أن رسول الله (ﷺ) قال: ((لا يصوم أحدكم يوم الجمعة إلا يوما قبله أو بعده)).

لە ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (با کەستان رۆژی هەینی بەرۆژوو نەبێت بە تەنیا (رۆژووی سوننەت) تەنها ئەگەر رۆژێك لە پێش یان لە پاش لەگەڵیدا.

## باب الوتر، والإستسقاء، وإستماع خطبة الجُمعَة ومن تَعَارَ منَ الليل

٢٥٢.عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((اجْعَلُوا آخِرَ صَلَاتِكُمْ بِاللَّيْلِ وِتْرًا)).

## (بەشی/ نوێژە بارانە و گوێدان بۆ ووتاری ئاینی و وە کەسێ لەشەو خەوێ لێ زڕا)

لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنهما) لە پێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: (نوێژەکانتان بە تاك کۆتایی پێ بهێنن لە شەودا).

٢٥٣.عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ كَانَ إِذَا قَحَطُوا اسْتَسْقَى بِالْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ فَقَالَ: اللَّهُمَّ إِنَّا كُنَّا نَتَوَسَّلُ إِلَيْكَ بِنَبِيِّنَا فَتَسْقِينَا، وَإِنَّا نَتَوَسَّلُ إِلَيْكَ بِعَمِّ نَبِيِّنَا فَاسْقِنَا قَالَ: فَيُسْقَوْنَ.

ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) عادەتی وابوو کە ووشکە ساڵی و بێ بارانی رووی تێ دەکردن داوای باران بارینی لە خوا دەکرد و دەیگوت خوایە بۆ خاتری عەبباس کوڕی عەبدولموتەڵیب بارانمان بۆ ببارێنەوە دەیفەرموو (خوایە گیان ئێمە لە کاتی بێ بارانی و ووشکەساڵی کاتێ کە پێغەمبەر (ﷺ) لە ژیاندا مابوو ئەومان دەکرد بە تکا کار لەلای تۆ وە بارانت بۆ دەباراندین و ئێستاش بیکە بۆ خاتری مامی پێغەمبەر بارانمان بۆ ببارێنە دەفەرموێ ئیتر بارانیان بۆ دەباری.

٢٥٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيُّ (ﷺ) قال: ((إِذَا كَانَ يَوْمُ الْجُمُعَةِ وَقَفَتْ الْمَلَائِكَةُ عَلَى بَابِ الْمَسْجِدِ يَكْتُبُونَ الْأَوَّلَ فَالْأَوَّلَ، وَمَثَلُ الْمُهَجِّرِ كَالَّذِي يُهْدِي بَدَنَةً ثُمَّ يُهْدِي بَقَرَةً ثُمَّ كَبْشًا ثُمَّ دَجَاجَةً ثُمَّ بَيْضَةً، فَإِذَا خَرَجَ الْإِمَامُ طَوَوْا صُحُفَهُمْ وَجَلَسوا وَيَسْتَمِعُونَ الذِّكْرَ)).

ئەبو هورەیرە دەفەرموێ (رضي الله عنه) پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ ئەگەر رۆژی هەینی داهات فریشتەکانی خوا لەلای دەرگاکانی مزگەوتەکان دادەنیشتن وە ئەوانەی کە لە یەکەمەوە دێن بۆ نوێژی هەینی ناویان دەنوسن، وە نموونەی ئەو کەسە کە زووتر دێت بۆ نوێژی هەینی وەکو ووشترێکی کردبێتە قوربانی لە ئەجر و پاداشتدا وایە وە ئەوی لە دوای وی دێت وەکو مانگایەکی کردبێتە قوربانی وایە و ئەوی لەدوای ئەویش دێت وەکو بەرانێکی کردبێتە قوربانی وایە و ئەوی لە دوای ئەویش دێت وەکو

مریشکێکی کردبێته قوربانی وایه و، ئەوەی لە پاش ئەویش دێت وەکو هێلکەیەکی کردبێتە خێر وایە، لەو کاتەی ئیمام دێت بۆ مزگەوت و ووتاردان دا. فریشتەکان پەراوەکە دەپێچنەوە و دێن بۆ ناو مزگەوت و گوێ لە یادی خوا دەگرن.

٢٥٥.عَنْ عُبَادَةَ بْنُ الصَّامِتِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((مَنْ تَعَارَّ مِنْ اللَّيْلِ فَقَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَه، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، الْحَمْدُ لِلَّهِ وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ، ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي، أَوْ دَعَا اسْتُجِيبَ لَهُ، فَإِنْ تَوَضَّأَ (أي وَصَلَّى) قُبِلَتْ صَلَاتُهُ)).

لە عوبادەی کوڕی صامیت (رضي الله عنه) لە پێغەمبەری خوا دەگێڕێتەوە کە (ﷺ) دەفەرموێ: (کەسێ لەشەوا خەوی لێ زڕا با بڵێ (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَه، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، الْحَمْدُ لِلَّهِ وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ، لە پاشان وتی: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي) واتە: ئەم زیکرە بکات و بڵێ خوایە لێم خۆشبە یان هەر دوعایەك بکات ئەوا دوعای گیرا دەبێت وە ئەگەر دەستنوێژی شۆرد و نوێژی کرد نوێژەکەی قەبوڵ دەبێت.

## باب الإسراع بالجَنازةَ

٢٥٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قال: قالَ النَّبِيُّ (ﷺ): ((أَسْرِعُوا بِالْجِنَازَةِ فَإِنْ تَكُ صَالِحَةً فَخَيْرٌ تُقَدِّمُونَهَا إِلَيهِ، وَإِنْ يَكُ سِوَى ذَلِكَ فَشَرٌّ تَضَعُونَهُ عَنْ رِقَابِكُمْ)).

## (بەشی پەلە كردن لە تەرم بەڕێ كردن)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (پەلە بكەن لە بەڕێكردنی تەرمی مردوودا بۆ گۆڕستان، ئەگەر پیاوچاك بێت ئەوا ئێوە بۆ سەر خێر و خۆشی دەیبەن وە ئەگەر پیاوخراپیش بێت ئەوە شەڕێكە وە لەكۆڵ خۆتانی دەكەنەوە).

## باب سماع الميت أصوات المُشَيِّعيه

٢٥٧. عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((الْعَبْدُ –أي المسلم– إِذَا وُضِعَ فِي قَبْرِهِ، وَتُوُلِّيَ وَذَهَبَ أَصْحَابُهُ حَتَّى إِنَّهُ لَيَسْمَعُ قَرْعَ نِعَالِهِمْ أَتَاهُ مَلَكَانِ فَيَقُولَانِ لَهُ مَا كُنْتَ تَقُولُ فِي هَذَا الرَّجُلِ مُحَمَّدٍ (ﷺ)؟ فَيَقُولُ: أَشْهَدُ أَنَّهُ عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ، فَيُقَالُ: انْظُرْ إِلَى مَقْعَدِكَ مِنْ النَّارِ أَبْدَلَكَ اللَّهُ بِهِ مَقْعَدًا مِنْ الْجَنَّةِ)) قَالَ النَّبِيُّ عليه الصَّلاةُ والسَّلام: ((فَيَرَاهُمَا جَمِيعًا. وَأَمَّا الْكَافِرُ أَوْ الْمُنَافِقُ فَيَقُولُ لَا أَدْرِي، كُنْتُ أَقُولُ مَا يَقُولُ النَّاسُ، فَيُقَالُ: لَا دَرَيْتَ وَلَا تَلَيْتَ، ثُمَّ يُضْرَبُ بِمِطْرَقَةٍ مِنْ حَدِيدٍ ضَرْبَةً بَيْنَ أُذُنَيْهِ فَيَصِيحُ صَيْحَةً يَسْمَعُهَا مَنْ يَلِيهِ إِلَّا الثَّقَلَيْنِ)).

## (بەشی/ گوێ لێ بوونی مردوو لە دەنگی ئەوانەی ئامادەی ناشتنی بوون)

ئەنەس (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (كاتێ بەندەی موسڵمان دەمرێ و دەیخەنە ناو گۆڕەوە وە هاوڕێیانی دەگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە هێشتا گوێی لە چرپەی كەوشەكانیانە، لەو كاتە دوو فریشتە دێنە لای كە پێیان دەوترێت (نەكیر و مونكیر) پێی دەڵێن: باوەڕت

چیە دەربارەی ئەو پیاوە، کە (موحەمەدە) جا ئەوەی کە موسڵمان بێ وەڵام دەداتەوە دەڵێ شایەتی دەدەم کە بەندە و پێغەمبەری خوایە ئەوجا پێی دەڵێن ئا ئەوە جێگای تۆ بوو لە ئاگری دۆزەخ سەیر کە خوا بۆی گۆڕیتەوە بەو شوێنە خۆشە کە بەهەشتە وە ئەویش بە چاوی خۆی جێگای خۆی دەبینێ بەڵام بێ بڕوا یان پیاوی دووڕوو (مونافیق) کە پرسیاری لێ دەکەن لە وەڵامدا دەڵێ نازانم، ئەوەندە هەیە خەڵکی چی دەڵێن منیش وا دەڵێم وە فریشتەکان پێی دەڵێن دەك هەر نەزانی ئیتر یەك گورزەی ئاسنینی لێ دەدەن لە نێوان هەردوو گوێیەکانی ئەوسا قیژە و هاوارێك دەکات هەرچی لە دەوریەری هەیە گوێی لێ دەبێت تەنها جنۆکە و ئادەمی نەبێت.

## باب قاتِل نفسهِ في النّار

٢٥٨. عَنْ جُنْدَب رضي الله عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((كَانَ بِرَجُلٍ جِرَاحٌ فَقَتَلَ نَفْسَهُ، فَقَالَ اللَّهُ: بَدَرَنِي عَبْدِي بِنَفْسِهِ حَرَّمْتُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ)).

## (بەشی/ کەسێ خۆی بکوژێ لە ئاگری دۆزەخدا)

جوندوب (رضي الله عنه) لە پێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێ: (لە نەتەوەکانی پێش ئێوە پیاوێ هەبوو برینی لە لەش دەبێت و ئارامی لەسەر ناگرێ و خۆی دەکوژێ، خوای گەورە فەرمووی: (بەندەی من پەلەی لە مردنی خۆی کرد و منیش بەهەشتم لێ حەرام کرد).

## باب ثناء النّاس على المَيتْ

٢٥٩.عَنْ أَنَس بْن مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قال: مُرَّ بِجَنَازَةٍ فَأَثْنَوْا عَلَيْهَا خَيْرًا، فَقَالَ رسول الله (ﷺ): ((وَجَبَتْ، ثُمَّ مُرَّ بِأُخْرَى فَأَثْنَوْا عَلَيْهَا شَرًّا، فَقَالَ:

وَجَبَتْ)) فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: مَا وَجَبَتْ؟ قَالَ: ((هَذَا أَثْنَيْتُمْ عَلَيْهِ خَيْرًا فَوَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ، وَهَذَا أَثْنَيْتُمْ عَلَيْهِ شَرًّا فَوَجَبَتْ لَهُ النَّارُ، أَنْتُمْ شُهَدَاءُ اللَّهِ فِي الْأَرْضِ)). وفي رواية لسيدنا عمر بن الخطاب رضي الله عَنْهُ مثلُ هذا فَسُئِلَ: عَمَّ وَجَبَتْ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ؟ قَالَ: قُلْتُ كَمَا قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((أَيُّمَا مُسْلِمٍ شَهِدَ لَهُ أَرْبَعَةٌ بِخَيْرٍ أَدْخَلَهُ اللَّهُ الْجَنَّةَ))، فَقُلْنَا وَثَلَاثَةٌ؟ قَالَ ((وَثَلَاثَةٌ))، فَقُلْنَا وَاثْنَانِ؟ قَالَ ((وَاثْنَانِ))، ثُمَّ لَمْ نَسْأَلْهُ عَنْ الْوَاحِدِ.

## (بەشی/ باسکردنی مردوو بە چاکە)

**لە ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەفەرموێ تەرمی مردووێ رەت بوو بەلای پێغەمبەری خوادا (ﷺ) وە خەڵکەکەش بە چاکە باسی مردووەکەیان کرد پێغەمبەریش فەرمووی وا جیب بوو ئینجا دوایی ئەوە تەرمێکی تریان هێنا و خەڵکەکەش بە خراپە باسیان کرد پێغەمبەری خواش فەرمووی واجیب بوو، عومەری کوڕی خەتتاب فەرموی چی واجیب بوو ئەی پێغەمبەری خوا، فەرموی ئەو کەسەی کە ئێوە وەسفی بە چاکە بکەن ئەوا بەهەشت بۆی واجب دەبێ وە ئەو کەسەی کە ئێوە بە خراپە وەسفی بکەن دۆزەخ بۆی واجب دەبێ، ئێوە شاهێدی خوان لەسەر زەوی.**

**وە لە ریوایەتی تردا هاتووە کە عومەری کوڕی خەتتاب پرسیاری لە پێغەمبەر کرد دەربارەی چی واجیب بوو؟ دەفەرموێ ووتم بە پێغەمبەری خوا ئەویش فەرموی: (هەر موسڵمانێ چوار کەس شاهیدی چاکەی بۆ بدەن خوا دەیخاتە ناو بەهەشتەوە ووتمان ئەگەر سێ کەس شایەدی بۆ بدەن فەرموی ئەگەر سێ کەسیش بن دەفەرموێ ووتمان ئەگەر دوو کەس بن فەرمووی ئەگەر دوو کەسیش بن لە پاشان پرسیاری یەك کەسمان نەکرد.**

## باب خَير الزاد التقوى

٢٦٠. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ تَعالى عَنْهُمَا قَال: كَانَ أَهْلُ الْيَمَنِ يَحُجُّونَ وَلَا يَتَزَوَّدُونَ، وَيَقُولُونَ نَحْنُ الْمُتَوَكِّلُونَ، فَإِذَا قَدِمُوا مَكَّةَ سَأَلُوا النَّاسَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى﴿ وَتَزَوَّدُوا فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَىٰ ﴾.

## (بەشی چاکترین زاد و زەخیرە تەقوا و لە خوا ترسانە)

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسی (رضي الله عنهما) دەفەرموێ خەڵکی یەمەن حەجی ماڵی خوایان دەکرد و بێ زاد و زەخیرەبوون دەیان ووت پشتمان بە خوا بەستوە خوا ڕۆزی دەرمانە، کە دەهاتنە مەککە داوای شتیان لە خەڵکی دەکرد خوای گەورەش ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە : ﴿ وَتَزَوَّدُوا فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَىٰ ﴾ واتە، زاد و زەخیر پەیدا بکەن وە چاکترین زاد و زەخیرەش تەقوا و لە خواترسانە.

## باب صفة صلاة النبي عليه الصلاة والسّلام

٢٦١. عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَطَاءٍ أَنَّهُ كَانَ جَالِسًا مَعَ نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ) فَذَكَرْنَا صَلَاةَ النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ أَبُو حُمَيْدٍ السَّاعِدِيُّ: أَنَا كُنْتُ أَحْفَظَكُمْ لِصَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، رَأَيْتُهُ إِذَا كَبَّرَ جَعَلَ يَدَيْهِ حِذَاءَ مَنْكِبَيْهِ، وَإِذَا رَكَعَ أَمْكَنَ يَدَيْهِ مِنْ رُكْبَتَيْهِ، ثُمَّ هَصَرَ ظَهْرَهُ، فَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ اسْتَوَى حَتَّى يَعُودَ كُلُّ فَقَارٍ الى مَكَانَه، فَإِذَا سَجَدَ وَضَعَ يَدَيْهِ غَيْرَ مُفْتَرِشٍ يده وَلَا قَابِضِهِمَا، وَاسْتَقْبَلَ بِأَطْرَافِ أَصَابِعِ رِجْلَيْهِ الْقِبْلَةَ، فَإِذَا جَلَسَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ

جَلَسَ عَلَى رِجْلِهِ الْيُسْرَى وَنَصَبَ الْيُمْنَى، وَإِذَا جَلَسَ فِي الرَّكْعَةِ الْآخِرَةِ قَدَّمَ رِجْلَهُ الْيُسْرَى وَنَصَبَ الْأُخْرَى وَقَعَدَ عَلَى مَقْعَدَتِهِ.

## (بەشی/ شێوەی نوێژی پێغەمبەر (ﷺ))

موحەمەدی کوڕی عەمری کوڕی عەتا دەگێڕێتەوە کە لەگەڵ چەند هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) دانیشتبووین باسی نوێژی پێغەمبەرمان (ﷺ) دەکرد ئەبو حومەیدی ئەلساعیدی فەرمووی من چۆنیەتی نوێژی پێغەمبەرم لەبەر کردووەو دەیزانم کە دیومە کە (الله أكبر) نوێژ دابەستنی دەکرد هەردوو دەستی بەرز دەکردەوە تا بەرامبەر هەردوو شانی، وە کە روکوعی دەبرد هەردوو دەستی لەسەر ئەژنۆی دادەنا و لە پاشان پشتی بە تەواوی دەچەماندەوە، وە ئەگەر لە روکوع هەڵدەستاوە سەری بەرز دەکردەوە رێك و راست دەبۆوە هەتا هەموو بڕبڕەکانی پشتی دەچوونە شوێنی خۆیان، وە کە کڕنۆشی دەبرد و هەردوو باڵی دووردەخستەوە لە خۆی و سەری پەنجەکانی بەرەو قیبلە دادەنا و ناوپەنجەکانی جووت نەدەکردەوە کە دادەنیشت و رەکعاتی دووەم بۆ تەحیات لەسەر پێی چەپە دادەنیشت و پێی راستەی دەچەقاند وە ئەگەر لە رەکعەتی کۆتایی بوایە (تەحیاتی دووەمدا)پێی چەپەی لە پێشدا رادەخست و پێی راستی دەچەقاند وە لەسەر پاشەوەی خۆی دادەنیشت.

## باب إماطة الأذى عن الطريق الصدقة

٢٦٢. عَنْ أبي هُرَيرَة رضي الله عَنْهُ عَنْ النَّبي (ﷺ) أنه قال: ((تمِيطُ الأذَى عَنِ الطَّرِيقِ صَدَقَةٌ)).

## (بەشی لابردنی شتی ئازار لە ڕێگای خەڵکی بە خێر و صەدەقە حیسابە)

لە ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (شتێ ئازار و ئەزیەت لەسەر ڕێگای هاتووچۆی خەڵکی لابدە و بە خێر و صەدەقە بۆت حیسابە).

## باب يكره النَوم قَبْلَ العَشاء

٢٦٣. عَنْ أَبِي بَرْزَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ يَكْرَهُ النَّوْمَ قَبْلَ الْعِشَاءِ وَالْحَدِيثَ بَعْدَهَا.

## (بەشی/ نوستنی پێش نوێژی عیشا کەراهەتی هەیە)

ئەبی بەرزە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی ناخۆش بوو کە نووستن پێش نوێژی عیشا و قسەی نابەجێ کردن لە دوایی دا.

## باب فضل قول اللّهُمَ رَبّنا لَكَ الحَمْد

٢٦٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((إِذَا قَالَ الْإِمَامُ سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَقُولُوا: اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ، فَإِنَّهُ مَنْ وَافَقَ قَوْلُهُ قَوْلَ الْمَلَائِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ)).

## (بەشی فەزلی ووتنی (اللهم ربنا لك الحمد)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی كە ئیمام لە نوێژا ووتی (سَمِع الله لِمَن حَمِدهُ) ئێوەش بلێن (ربَنا لَكَ الحمد) چونكە ئەگەر ووتەی ئێوە و فریشتەكانی خوا گەیشتن بە یەكدا خوای گەورە لە گوناهی لە پێشتان دەبورێ.

## باب صفة صلاته عليه الصلاة والسلام

٢٦٥. وعَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْن بُحَيْنَةَ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعلى آلِهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا صَلَّى فَرَّجَ بَيْنَ يَدَيْهِ حَتَّى يَبْدُوَ بَيَاضُ إِبْطَيْهِ.

## (بەشی/ چۆنیەتی نوێژی پێغەمبەر (ﷺ))

لە عەبدوڵلای كوڕی بوحینە دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر نوێژی بكردابایە هەردوو دەستی لێك دوور دەكردەوە هەتا سپێتی بن باخەڵی بەدیار دەكەوت (لە سوجدەدا)

## باب السجُود على سَبعة أعظُمْ

٢٦٦. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وآله وَسَلَّمَ: ((أُمِرْتُ أَنْ أَسْجُدَ عَلَى سَبْعَةِ أَعْظُمٍ غيرَ الْجَبْهَةِ، وَأَشَارَ بِيَدِهِ عَلَى أَنْفِهِ وَالْيَدَيْنِ وَالرُّكْبَتَيْنِ وَأَطْرَافِ الْقَدَمَيْنِ، وَلَا نَكْفِتَ الثِّيَابَ وَالشَّعَرَ)).

## (بەشی/ كڕنۆش بردن لەسەر حەوت ئێسقان)

عەبدوڵلای كوڕی عەبباس (رضي الله عنهما) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی فەرمانم پێكراوەكە كڕنۆش بەرم لەسەر حەوت ئێسقان كە نێوچاوان،وە پێغەمبەر بەدەستی ئاماژەی كرد بە لوت و هەردوو بەری دەستی و هەردوو ئەژنۆی هەردوو پێی و وە جل و بەرگیش كۆنەكەیتەوە قژیش خڕ هەڵنەدەین.

## باب يستقبل الإمام النّاس، وفَضل غسل الجُمْعة

٢٦٧. عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ رَضيَ اللهُ عَنْهُ قَال: كَانَ رَسول الله (ﷺ) إذَا صَلَّى صَلَاةً أقْبَلَ عَلَيْنَا بِوَجْهِه.

## (بەشی/ رووانینی ئیمام بۆ خەڵکی، و فەزلی خۆشۆردن لە هەینیدا)

سەمورەی کوری جوندوب (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر نوێژی بۆ بکردبایە روو بە ئێمە دەکرد و تەماشای دەکردین (پشتی لە قیبلە دەکرد)

٢٦٨. عَنْ أبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ أنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: ((غُسْلُ يَوْمِ الْجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ)).

ئەبو سەعیدی خودری (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری (ﷺ) فەرمووی: (خۆ شۆردنی رۆژی هەینی پێویستە لەسەر هەموو کەسێکی بالق بوو).

## باب زيادة الإيمان، ومنْ غدا إلى المَسْجِد

قالَ اللهُ تَعالى: ﴿وَزِدْنَٰهُمْ هُدًى وَيَزْدَادَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِيمَٰنًا﴾

وَقال تَعالى أيضاً: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ﴾ ، فَإذا تَرك شَيئاً من الكمال فهو ناقص.

## (بەشی/ زیادبوونی ئیمان و
## وە کەسێ زوو بچێ بۆ مزگەوت)

خوای گەورە دەفەرموێ﴿وَزِدۡنَٰهُمۡ هُدٗى وَيَزۡدَادَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِيمَٰنٗا﴾ وە دەفەرموێ: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ﴾

واتە: ئێمەش زیاتر لە نوری ئیمان و هیدایەت بەهرەمەندی دەکەین وە بۆ ئەویش ئیمانداران زیاتر باوەڕیان دامەزراوبێت، وە ئەگەر شتی وازبێنی کە لە تەواو بوون دابێت ناتەواوە.

٢٦٩. عَنْ أَنَس بن مالك رضي الله عَنْهُ قال: قالَ رسول الله (ﷺ): ((يَخْرُجُ مِنْ النَّارِ مَنْ قَالَ لا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَفِي قَلْبِهِ وَزْنُ شَعِيرَةٍ مِنْ خَيْرٍ، وَيَخْرُجُ مِنْ النَّارِ مَنْ قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَفِي قَلْبِهِ وَزْنُ بُرَّةٍ مِنْ خَيْرٍ، وَيَخْرُجُ مِنْ النَّارِ مَنْ قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَفِي قَلْبِهِ وَزْنُ ذَرَّةٍ مِنْ خَيْرٍ)). قَالَ أَبُو عَبْد اللَّهِ قَالَ أَبَانُ حَدَّثَنَا قَتَادَةُ حَدَّثَنَا أَنَسٌ عَنْ النَّبِيِّ عَلَيهِ الصَّلَاةُ والسَّلام ((مِنْ إِيمَانٍ)) مَكَانَ ((مِنْ خَيْرٍ)).

ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەفەموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی کەسێ بڵێ (لا إله إلا الله) وە بەقەد دەنکەجۆیێ لە ئیمان و بڕوای هەبێت لە دڵیدا لە ئاگری دۆزەخ دێتە دەرەوە وە کەسێ بڵێ (لا اله إلا الله) وە لە دڵیدا بڕوای بەخوا هەبێ بەقەد دەنکە گەنمێ دێتە دەرەوە لە ئاگری دۆزەخ وە کەسێ بڵێ (لا اله الا الله) بە قەد تۆز قاڵێك ئیمان و بڕوای هەبێت لە دڵیدا.

ئەبو عەبدوللا (ئیمامی بوخاری) دەفەرمویٚ ئیبان فەرمووی قەتادە بۆی گێرامەوە کە ئەنەس بۆی گێرامەوە کە پێغەمبەر (ﷺ)(لە ئیمان) لە جیاتی ووشەی (خێر)ی بە کارهێناوە

٢٧٠.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((مَنْ غَدَا إِلَى الْمَسْجِدِ أَو رَاحَ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُ نُزُلَهُ مِنْ الْجَنَّةِ، كُلَّمَا غَدَا أَوْ رَاحَ)).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمویٚ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (کەسیٚ بچیٚ بۆ مزگەوت بۆ نوێژ و یادی خوا، خوای گەورە لە بەهەشتا جێگای بۆ ئامادەکردوە هەر کاتێك کە بچیٚ بگەڕێتەوە لە مزگەوت).

## باب من تَصدّقَ على غنّي

٢٧١.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((قَالَ رَجُلٌ لَأَتَصَدَّقَنَّ بِصَدَقَةٍ فَخَرَجَ بِصَدَقَتِهِ فَوَضَعَهَا فِي يَدِ سَارِقٍ فَأَصْبَحُوا يَتَحَدَّثُونَ تَصَدَّقَ عَلَى سَارِقٍ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ لَأَتَصَدَّقَنَّ بِصَدَقَةٍ، فَخَرَجَ بِصَدَقَتِهِ فَوَضَعَهَا فِي يَدَيْ زَانِيَةٍ فَأَصْبَحُوا يَتَحَدَّثُونَ تُصُدِّقَ اللَّيْلَةَ عَلَى زَانِيَةٍ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ عَلَى زَانِيَةٍ لَأَتَصَدَّقَنَّ بِصَدَقَةٍ، فَخَرَجَ بِصَدَقَتِهِ فَوَضَعَهَا فِي يَدَيْ غَنِيٍّ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ عَلَى سَارِقٍ وَعَلَى زَانِيَةٍ وَعَلَى غَنِيٍّ، فَأُتِيَ فَقِيلَ لَهُ: أَمَّا صَدَقَتُكَ عَلَى سَارِقٍ فَلَعَلَّهُ أَنْ يَسْتَعِفَّ عَنْ سَرِقَتِهِ، وَأَمَّا الزَّانِيَةُ فَلَعَلَّهَا أَنْ تَسْتَعِفَّ عَنْ زِنَاهَا، وَأَمَّا الْغَنِيُّ فَلَعَلَّهُ يَعْتَبِرُ فَيُنْفِقُ مِمَّا أَعْطَاهُ اللَّهُ)).

## (بەشی/ کەسێ خێر بکات بە دەوڵەمەندێ)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی پیاوێك وتی بریارم داوە خێرێك بکەم، وە خێرەکەی هەڵگرت و بەخشی بە دزێك، خەڵکی وتیان خێرێکی بە دزێك کردوە، پیاوەکە وتی خوایە شوکر بۆ تۆ بریار بێت خێرێك بکەم خێرەکەی هەڵگرت و بەخشی بە ئافرەتێکی داوێن پیس، خەڵکی کەوتنە باسکردنی، وتیان خێر بە داوێن پیس کراوە، کابرا وتی خوایە سوپاس بۆ تۆ بریار بێت خێرێك بکەم خێرەکەی هەڵگرت و بەخشی بە دەوڵەمەندێك، خەڵکی وتیان خێر بەدەوڵەمەند کراوە، کابرا وتی خوایە سوپاس بۆ تۆ لەسەر ئەوەی خێرەکە درا بە دزێك و ئافرەتێکی بەدرەوشت و دەوڵەمەندێك، وە لەخەودا پێیان وت ئەو خێرەی بەخشیت بە دزەکە سا بەڵکو واز لە دزی بهێنێت وە بە ئافرەتەکەش بەڵکو واز لە زینا بهێنێت وە ببێتە پەندێك بۆ دەوڵەمەندەکە کە ئەو ماڵەی خوای پێی داوە بیبەخشێ.

## باب الرضيع الناطق

٢٧٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: ((بَيْنَا امْرَأَةٌ تُرْضِعُ ابْنَهَا إِذْ مَرَّ بِهَا رَاكِبٌ وَهِيَ تُرْضِعُهُ، فَقَالَتْ اللَّهُمَّ لَا تُمِتْ ابْنِي حَتَّى يَكُونَ مِثْلَ هَذَا، فَقَالَ اللَّهُمَّ لَا تَجْعَلْنِي مِثْلَهُ، ثُمَّ رَجَعَ فِي الثَّدْيِ، وَمُرَّ بِامْرَأَةٍ تُجَرَّرُ وَيُلْعَبُ بِهَا، فَقَالَتْ: اللَّهُمَّ لَا تَجْعَلْ ابْنِي مِثْلَهَا، فَقَالَ: اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِثْلَهَا، فَقَالَ: أَمَّا الرَّاكِبُ فَإِنَّهُ كَافِرٌ، وَأَمَّا الْمَرْأَةُ فَإِنَّهُمْ يَقُولُونَ لَهَا تَزْنِي وَتَقُولُ حَسْبِيَ اللَّهُ، وَيَقُولُونَ تَسْرِقُ وَتَقُولُ حَسْبِيَ اللَّهُ)).

## (بەشی/ منالّە شیرەخۆرەکە کەوتە قسە کردن)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە گوێی لە پێغەمبەری خوا بوو دەیفەرموو: (لە ئوممەتەکانی پێشوو ئافرەتێ هەبوو شیری دەدا بە کوڕەکەی لەو کاتەدا سوارێك بەلایان تێپەڕی دایکەکە ووتی خوایە ئەم کوڕەم نەمرێ هەتاوەکو ئەم سوارەی لێ دێت لەوکاتەدا منالّەکە بە قسە هات و ووتی خوایە وەکو ئەم سوارەم لێ نێت، لە پاشان مەمکی گرتەوە و شیری خوارد و لەو کاتەدا ئافرەتێکی کارەکەرو کۆیلە تێپەڕی دایکی منالّە شیرەخۆرەکە ووتی خوایە ئەم منالّەم وەکو ئەم ئافرەتە لێ نەکەیت بەلّام منالّەکە مەمکی دایکی بەردا و ووتی خوایە وەکو ئەم ئافرەتەم لێ بکەیت، فەرمووی ئەو سوارە کافرە بووە ئافرەتە کۆیلەکە داوێن پاکە وخەلّکی تاوانی زینای پێ هەلّدەبەستن و ئەویش دەلّێ خوام بەسە من بێ تاوانم وە تاوانی دزی پێ هەلّدەبەستن ئەویش دەلّێ خوام بەسە و بێ تاوانم.

## باب فضل الأمانة

٢٧٣. وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَال: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((اشْتَرَى رَجُلٌ مِنْ رَجُلٍ عَقَارًا لَهُ فَوَجَدَ الرَّجُلُ الَّذِي اشْتَرَى الْعَقَارَ فِي عَقَارِهِ جَرَّةً فِيهَا ذَهَبٌ فَقَالَ لَهُ الَّذِي اشْتَرَى الْعَقَارَ خُذْ ذَهَبَكَ مِنِّي، إِنَّمَا اشْتَرَيْتُ مِنْكَ الْأَرْضَ وَلَمْ أَبْتَعْ مِنْكَ الذَّهَبَ، وَقَالَ الَّذِي لَهُ الْأَرْضُ إِنَّمَا بِعْتُكَ الْأَرْضَ وَمَا فِيهَا، فَتَحَاكَمَا إِلَى رَجُلٍ، فَقَالَ الَّذِي تَحَاكَمَا إِلَيْهِ: أَلَكُمَا وَلَدٌ؟ قَالَ أَحَدُهُمَا: لِي غُلَامٌ، وَقَالَ الْآخَرُ: لِي جَارِيَةٌ، قَالَ: أَنْكِحُوا الْغُلَامَ الْجَارِيَةَ، وَأَنْفِقُوا عَلَى أَنْفُسِهِمَا مِنْهُ وَتَصَدَّقَا)).

## ((بەشی/ فەزلی سپاردە و (ئەمانەت))

ئەبو هورەیرە دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی پیاوێك خانووی لە پیاوێكی تر كڕی ئەو پیاوەی خانووەكەی كڕی لە ناو زەوی خانووەكە كوپە زێڕێكی دۆزییەوە بە كابرای خاوەنی كۆنی ووت ئەم كوپەم لەزەوی تۆدا دۆزییەوە وەرە لێم وەرگرەوە ئەویش ووتی من زەوی و خانوەكەم بە هەموو شتێك كە لەناوی دایە پێم فرۆشتووی،سەرەنجام دادوەرییەكەیان بردە لای پیاوچاكێك ئەویش دادپەرەوەری لەنێوانیاندا كرد و ووتی پێیان ئێوە منداڵتان هەیە؟ یەكەمیان ووتی من كوڕێكم هەیە و ئەوی تریان ووتی من كچێكم هەیە، فەرمووی ئەو كچە لە كوڕەكە مارە بكەن و كوپەزێڕەكەش بۆیان سەرف بكەن و ئەوی تری بكەن بە خێر بۆیان.

## باب يستأثر الرجل، وسنْ صلاة ركْعَتين لِمَنْ يُقتل صبراً

٢٧٤.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ تَعالى عَلَيْهِ وَعلى آلِهِ وَسَلَّمَ عَشَرَةً عَيْنًا وَأَمَّرَ عَلَيْهِمْ عَاصِمَ بْنَ ثَابِتٍ الْأَنْصَارِيَّ جَدَّ عَاصِمِ بْنِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، حَتَّى إِذَا كَانُوا بِالْهَدَةِ بَيْنَ عَسْفَانَ وَمَكَّةَ ذُكِرُوا لِحَيٍّ مِنْ هُذَيْلٍ يُقَالُ لَهُمْ بَنُو لِحْيَانَ، فَنَفَرُوا لَهُمْ بِقَرِيبٍ مِنْ مِائَةِ رَجُلٍ رَامٍ فَاقْتَصُّوا آثَارَهُمْ حَتَّى وَجَدُوا مَأْكَلَهُمْ التَّمْرَ فِي مَنْزِلٍ نَزَلُوهُ، فَقَالُوا تَمْرُ يَثْرِبَ فَاتَّبَعُوا آثَارَهُمْ، فَلَمَّا أَحَسَّ بِهِمْ عَاصِمٌ وَأَصْحَابُهُ لَجَئُوا إِلَى مَوْضِعٍ فَأَحَاطَ بِهِمْ الْقَوْمُ فَقَالُوا لَهُمْ: انْزِلُوا فَأَعْطُوا بِأَيْدِيكُمْ وَلَكُمْ الْعَهْدُ وَالْمِيثَاقُ أَنْ لَا نَقْتُلَ أَحَدًا، فَقَالَ عَاصِمُ بْنُ ثَابِتٍ: أَيُّهَا الْقَوْمُ أَمَّا أَنَا فَلَا أَنْزِلُ فِي ذِمَّةِ كَافِرٍ، اللَّهُمَّ أَخْبِرْ عَنَّا نَبِيَّكَ (ﷺ)، فَرَمَوْهُمْ بِالنَّبْلِ فَقَتَلُوا عَاصِمًا وَنَزَلَ إِلَيْهِمْ ثَلَاثَةُ نَفَرٍ عَلَى

الْعَهْدِ وَالْمِيثَاقِ، مِنْهُمْ خُبَيْبٌ وَزَيْدُ بْنُ الدَّثِنَةِ وَرَجُلٌ، فَلَمَّا اسْتَمْكَنُوا مِنْهُمْ أَطْلَقُوا أَوْتَارَ قِسِيِّهِمْ فَرَبَطُوهُمْ بِهَا، قَالَ الرَّجُلُ الثَّالِثُ: هَذَا أَوَّلُ الْغَدْرِ، وَاللَّهِ لَا أَصْحَبُكُمْ، إِنَّ لِي بِهَؤُلَاءِ أُسْوَةً، يُرِيدُ الْقَتْلَ، فَجَرَّرُوهُ وَعَالَجُوهُ فَأَبَى أَنْ يَصْحَبَهُمْ (فقتلوه)، فَانْطُلِقَ بِخُبَيْبٍ وَزَيْدِ بْنِ الدَّثِنَةِ حَتَّى بَاعُوهُمَا (بمكة) بَعْدَ وَقْعَةِ بَدْرٍ، فَابْتَاعَ بَنُو الْحَارِثِ بْنِ عَامِرِ بْنِ نَوْفَلٍ خُبَيْبًا، وَكَانَ خُبَيْبٌ هُوَ (الذي) قَتَلَ الْحَارِثَ بْنَ عَامِرٍ يَوْمَ بَدْرٍ، فَلَبِثَ خُبَيْبٌ عِنْدَهُمْ أَسِيرًا حَتَّى أَجْمَعُوا (على) قَتْلَهُ فَاسْتَعَارَ مِنْ بَعْضِ بَنَاتِ الْحَارِثِ مُوسَى يَسْتَحِدُّ بِهَا، فَأَعَارَتْهُ، فَدَرَجَ بُنَيٌّ لَهَا وَهِيَ غَافِلَةٌ حَتَّى أَتَاهُ، فَوَجَدَتْهُ يُجْلِسهُ عَلَى فَخِذِهِ وَالْمُوسَى بِيَدِهِ، قَالَتْ: فَفَزِعْتُ فَزْعَةً عَرَفَهَا خُبَيْبٌ فَقَالَ: أَتَخْشَيْنَ أَنْ أَقْتُلَهُ؟ مَا كُنْتُ لِأَفْعَلَ ذَلِكَ، قَالَتْ: وَاللَّهِ مَا رَأَيْتُ أَسِيرًا خَيْرًا مِنْ خُبَيْبٍ، وَاللَّهِ لَقَدْ وَجَدْتُهُ يَوْمًا يَأْكُلُ قِطْفًا مِنْ عِنَبٍ فِي يَدِهِ وَإِنَّهُ لَمُوثَقٌ بِالْحَدِيدِ وَمَا بِمَكَّةَ مِنْ ثَمَرَةٍ، وَكَانَتْ تَقُولُ: إِنَّهُ لَرِزْقٌ رَزَقَهُ اللَّهُ خُبَيْبًا. فَلَمَّا خَرَجُوا بِهِ مِنْ الْحَرَمِ لِيَقْتُلُوهُ فِي الْحِلِّ، قَالَ لَهُمْ خُبَيْبٌ: دَعُونِي أُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ، فَتَرَكُوهُ فَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ، فَقَالَ: وَاللَّهِ لَوْلَا أَنْ تَحْسَبُوا أَنَّ مَا بِي جَزَعٌ لَزِدْتُ،

ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ أَحْصِهِمْ عَدَدًا وَاقْتُلْهُمْ بَدَدًا، وَلَا تُبْقِ مِنْهُمْ أَحَدًا، ثُمَّ أَنْشَأَ يَقُولُ:

فَلَسْتُ أُبَالِي حِينَ أُقْتَلُ مُسْلِمًا ... عَلَى أَيِّ جَنْبٍ كَانَ فِي اللَّهِ مَصْرَعِي

وَذَلِكَ فِي ذَاتِ الْإِلَهِ وَإِنْ يَشَأْ ... يُبَارِكْ عَلَى أَوْصَالِ شِلْوٍ مُمَزَّعِ

ثُمَّ قَامَ إِلَيْهِ أَبُو سِرْوَعَةَ عُقْبَةُ بْنُ الْحَارِثِ فَقَتَلَهُ، وَكَانَ خُبَيْبٌ هُوَ سَنَّ لِكُلِّ مُسْلِمٍ قُتِلَ صَبْرًا الصَّلَاةَ وَأَخْبَرَ –يعني النَّبي– أَصْحَابَهُ يَوْمَ أُصِيبُوا خَبَرَهُمْ وَبَعَثَ نَاسٌ مِنْ قُرَيْشٍ إِلَى عَاصِمِ بْنِ ثَابِتٍ حِينَ حُدِّثُوا أَنَّهُ قُتِلَ أَنْ يُؤْتَوْا بِشَيْءٍ

مِنْهُ يُعْرَفُ قَتَلَ رَجُلًا عَظِيمًا مِنْ عُظَمَائِهِمْ فَبَعَثَ اللَّهُ لِعَاصِمٍ مِثْلَ الظُّلَّةِ مِنْ الدَّبْرِ فَحَمَتْهُ مِنْ رُسُلِهِمْ فَلَمْ يَقْدِرُوا أَنْ يَقْطَعُوا مِنْهُ شَيْئًا.

**(بەشی/ فەزلی جگە لە خۆیان دەکەن بەسەر خۆیاندا، وە سوننەتی نوێژی دوو ڕەکعات پێش شەهید بوون لە پێناوی خوا)**

**ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێت:**

پێغەمبەر (ﷺ) سریەیەکی نارد کە پێکهاتبوون لە دە کەس بۆ چاوساغی و (عاصم)ی کوڕی سابتي ئەنصاری کردە ئەمیریان، کە باپیری عاصمی کوڕی عومەری کوڕی خەطاب بوو، ئەوانیش بەڕێکەوتن هەتا گەیشتنە (الهداة) کە جێگایەکە لە نێوان عەسفان و مەککە. هەواڵ درا بە هۆزێکی (بەنی هوزەیل) پێیان دەوترێ (بنو لحیان) ئەوانیش سەد کەسیان کۆکردەوە کە گشتیان تیرەنداز بوون، بە شوێنیان ڕۆیشتن تا جێگای خۆراکەکەیان دۆزینەوە کە خورمایان خوارد بوو. لە مەدینەوە وەك توێشوو هێنابوویان، ووتیان ئەمە خورمای (یەثریبە) جا پەلە بکەن بەجێ پێکانیاندا بڕۆن، کاتێ عاصم و هاوەڵەکانی ئەوانیان دی، پەنایان بردە شوێنێك ئەوانیش دەوریان دان پێیان وتن: دابەزن و خۆتان بدەن بە دەستەوە، پەیمانتان دەدەینێ و کەستان ناکوژین.

عاصمی کوڕی ثابت کە ئەمیری سریەکە بوو ووتی: بە نیسبەت منەوە سوێند بە خوا ئەمڕۆ من ناچمە پەنای هیچ بێ بڕوایەك، خوایە هاوارت لێ دەکەین هەواڵمان بگەیێنیتە پێغەمبەرەکەت کتوپڕ. بت پەرستەکان کەوتنە هێرش بۆ سەریان بەمەنجەنیق سەرەنجام ئەمیری سریەکە شەهید بوو کە عاصم بوو. سێ کەسەکەی تریان لەسەر وەعد و پەیمان دابەزینە خوارەوە کە خوبەیبی ئەنصاری و زەیدی کوڕی دەثینە و پیاوێکی تر بوون. کاتێ هاتنە

بەردەستیان دەست و قاچیان بەستنەوە و کەلەپچەیان کردن. پیاوی سێیەم وتی: ئەمە سەرەتای پەیمان شکاندنیانە، سوێند بە خوا لەگەڵتاندا نایەم ئەوان پێشەنگن بۆ من (مەبەستی کوژراوەکانە) ئەوانیش کەوتنە کێش کردنی و لێدانی، زۆری لەگەڵ خەریك بوون نەچوو لەگەڵیان سەرەنجام شەهیدیان کرد، ئینجا خوبەیب و زەیدیان برد لەگەڵ خۆیان تا لەمەککە فرۆشتنیان، ئەمە دوای جەنگی بەدر بوو. ئەوە بوو (بنو حارث بن عامر) خوبەیبیان کڕی، کە کاتی خۆی خوبەیب لە جەنگی بەدردا حاریثي کوڕی عامیری کوشتبوو، بۆیە خوبەیت بەدیلی لەلایان مایەوە.

کۆبونەوە بۆ کوشتنی خوبەیب وە کچەکەی حاریث وتی بۆی داوای گوێزانێکی کرد، خۆی پێ پاك بکاتەوە، ئەویش دەیداتێ، ئەوەبوو کاتێ ئاگام لە خۆم نەبوو. کوڕەکەمی بردبووە لای خۆی لەسەر رانی دایناوبوو گوێزانەکەشی بە دەستەوە بوو، منیش زۆر ترسام و رەنگم تێك چوو، خوبەیب هەستی پێ کرد ووتی: دەترسیت بیکوژم، هەرگیز شتی وا ناکەم و ئەوە ڕەوشتی من نییە، سوێند بە خوا هەرگیز دیلێکم نەدیوە لە خوبەیب چاکتربێ. سوێند بە خوا ڕۆژێکیان تەماشام کرد هێشوویەك ترێی لە بەردە ست دایە و دەیخوات، دەست و پێشی کۆت و زنجیر بوو، لەو ڕۆژەشدا یەك میوە لە مەککەدا نەبوو، بەڕاستی ئەوە ڕۆزییەك بوو خوای گەورە بۆ خوبەیبی ناردبوو. کاتێ بت پەرستەکان لە حەرەم دەریان کرد بۆ ئەوەی لە دەرەوەی حەرەم بیکوژن، خوبەیب پێی ووتن: لێم گەڕێن با دوو ڕکات نوێژ بکەم، ئەوانیش لێی گەڕان دوو ڕکات نوێژی کردو فەرمووی: ئەگەر لە بەر ئەوە نەبووایە کە بڵێن لە مردن دەترسێت، نوێژەکەم درێژ دەکردەوە، وە ئەم شیعرانەی دەوتەوە:

خوایە یەك یەك لەناویان ببە

وَلستُ أبالي حين أقتل مسلماً

على أي شَقٍ كانَ لله مصرعي

وذلك في ذات إلا له وأن يشأ

يُبارك علة أوصال شلو ممزّعِ

هیچ گرنگیەك نیە بەلامەوە كاتێك بە موسڵمانی دەكوژرێم

بەهەر لایەكدا بكەوم و بمرم لە ڕێی خوادا

ئەوەش لەبەر خاتری زاتی خوایە و ئەگەر بیەوێت

بەرەكەت و سۆز دەڕژێت بەسەر لاشەی پارچە پارچەكراودا

ئینجا كە ئەبو سروعەی عوقبە كوڕەكەی حاریثي شەهید كرد، خوبەبیش ئەو دوو ڕەكەعاتەی وەك سوننەتێك داهێنا بۆ هەر موسڵمانێك كەبەو جۆرە شەهید دەكرێ و دەكوژرێ. خوای گەورەش وەڵامی دوعاكەی عاصمی كوڕی ثابیتی دایەوە كە پێش شەهید بوونی پاڕایەوە، ئەوەبوو پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵ و بەسەرهاتی ئەوانی گێڕایەوە بۆ هاوەڵانی.

بێ باوەڕانی قوڕەیشبێت چەند كەسێكیان نارد كە زانیان عاصم كوژراوە، چونكە عاصم لە ڕۆژی بەدردا یەكێك لە سەرگەورەكانی قوڕەیشی كوشتبوو، ناردیان تا پارچەیەك لە جەستەی عاصم بێنن بۆ دڵنیایی خۆیان، بەڵام خوای گەورە كۆمەڵێك زەردەواڵەی وەك چەترێك نارده سەر جەنازەكەی عاصم، ئیتر كەس نەیوێرا لێی نزیك بێتەوە و گۆشت لە گیانی ببڕێت.

## باب ويؤثرون على أنْفسهم، وفَضلُ الطَهُور

٢٧٥. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَجُلًا أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ فَبَعَثَ إِلَى نِسَائِهِ فَقُلْنَ مَا مَعَنَا إِلَّا الْمَاءُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ تَعالى عَلَيْهِ وآلِهِ وَسَلَّمَ: ((مَنْ يَضُمُّ أَوْ يُضِيفُ هَذَا)) فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ الْأَنْصَارِ أَنَا، فَانْطَلَقَ بِهِ إِلَى امْرَأَتِهِ فَقَالَ أَكْرِمِي ضَيْفَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَتْ: مَا عِنْدَنَا إِلَّا قُوتُ صِبْيَانِي. فَقَالَ: هَيِّئِي طَعَامَكِ وَأَصْبِحِي سِرَاجَكِ، وَنَوِّمِي صِبْيَانَكِ إِذَا أَرَادُوا عَشَاءً، فَهَيَّأَتْ طَعَامَهَا وَأَصْبَحَتْ سِرَاجَهَا وَنَوَّمَتْ صِبْيَانَهَا ثُمَّ قَامَتْ كَأَنَّهَا تُصْلِحُ سِرَاجَهَا فَأَطْفَأَتْهُ فَجَعَلَا يُرِيَانِهِ كَأَنَّهُمَا يَأْكُلَانِ فَبَاتَا طَاوِيَيْنِ فَلَمَّا أَصْبَحَ غَدَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ضَحِكَ اللَّهُ اللَّيْلَةَ أَوْ عَجِبَ مِنْ فَعَالِكُمَا فَأَنْزَلَ اللَّهُ تعالى: ﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾. سورة الحشر.

## (بەشی/ فەزلی غەیری خۆیان لەسەر خۆیان و فەزلی دەستنوێژ)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پیاوێ هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆمیوانداری، ئەویش ناردی بۆ هەموو ماڵەکانی خۆی هەموویان وەڵامیان ئەوەبوو کە هیچ شتێکیان لە ماڵەوە نییە تەنها ئاو نەبێت، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی کێ میوانداری ئەم پیاوە دەکات لەو کاتەدا پیاوێکی ئەنصاری ووتی من ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وە میوانەکەی بردەوە بۆ ماڵی خۆی وە بە خێزانەکەی ووت رێزی بگرە ئەمە میوانی پێغەمبەری خوایە ئەویش ووتی سوێند بە خوا تەنها خواردنی مناڵەکانم شك

دەبەم هیچی ترمان نییە زیادبێت مێردەکەی ووتی دەی پێش وەخت منداڵەکان بنوێنە و خواردنەکە بۆ میوان ئامادە بکە و دابنێ و چراکە بکوژێنەوە بۆ ئەوەی وابزانێ کە چراکە چاك دەکەمەوە وە میوانەکە خواردنی خوارد و ئەوانیش لە قاپێکدا خەریکی تەقە تەقی قاپ و کەوچك بوو بە خاڵی بۆ ئەوەی میوان بزانێ ئەوانیش نان دەخۆن وە ئەو شەوە جگە لە میوانەکە هەموویان بێ خواردن شەویان کردەوە کە بەیانی داهات چوون بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەویش فەرمووی، خوای گەورە پێکەنینی بە ئێوە هاتووەکە لەو شتەی ئەو شەو کردتان بەرامبەر بە میوانەکەتان وە لەم کاتەدا ئەم ئایەتە دابەزی کە دەفەرموێ: ﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾ واتە: فەزلی ئەوان دەدەن بەسەر خۆیاندا هەرچەندە هەژار و نەداریشن، جا ئەوەی خۆی لە نەفس رەزیلی بپارێزێت و زاڵ بێت بەسەریدا، ئا ئەوانە هەر سەرفرازن. (تەفسیری ئاسان، ل٥٤٦)

## باب دعت الأم ولدها في الصّلاة وإتباع النساء الجنائز

٢٧٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وآله وَسَلَّمَ قَالَ لِبِلَالٍ عِنْدَ صَلَاةِ الْفَجْرِ: ((يَا بِلَالُ حَدِّثْنِي بِأَرْجَى عَمَلٍ عَمِلْتَهُ فِي الْإِسْلَامِ فَإِنِّي سَمِعْتُ دَفَّ نَعْلَيْكَ بَيْنَ يَدَيَّ فِي الْجَنَّةِ)) قَالَ: مَا عَمِلْتُ عَمَلًا أَرْجَى عِنْدِي أَنِّي لَمْ أَتَطَهَّرْ طَهُورًا فِي سَاعَةِ لَيْلٍ أَوْ نَهَارٍ إِلَّا صَلَّيْتُ بِذَلِكَ الطُّهُورِ مَا كُتِبَ لِي أَنْ أُصَلِّيَ.

## (بەشی بانگ کردنی دایکێك بۆ منالەکەی لەناو نوێژدا و چوونی ئافرەتان بەدوای تەرمی مردوودا)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی بەبیلال لە کاتی نوێژی بەیانی، ئەی بیلال پێم بڵێ چ کردەوەیەکی باشت کردوە لە ناو ئیسلامەتیدا کەوا من گوێم لە خشپەی پێڵاوەکانت بوو لە بەهەشتا لە نزیك منەوە؟ ووتی هیچ کردەوەیەکی وا گەورەم نیە تەنها ئەوەندە هەیە من هەر کاتێ دەستنوێژم هەبووبێ چ لە شەودا یان لە رۆژدا ئەوا چەندی بۆم بکرابێ بەو دەستنوێژە نوێژی سوننەتم پێ کردوە.

٢٧٧. عَنْ هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((نَادَتْ امْرَأَةٌ ابْنَهَا وَهُوَ فِي صَوْمَعَةٍ قَالَتْ يَا جُرَيْجُ قَالَ: اللَّهُمَّ أُمِّي وَصَلَاتِي ثُمَّ قَالَتْ يَا جُرَيْجُ قَالَ: اللَّهُمَّ أُمِّي وَصَلَاتِي، قَالَتْ يَا جُرَيْجُ قَالَ: اللَّهُمَّ أُمِّي وَصَلَاتِي قَالَتْ اللَّهُمَّ لَا يَمُوتُ جُرَيْجٌ حَتَّى يَنْظُرَ فِي وُجُوهِ الْمَيَامِيسِ، وَكَانَتْ تَأْوِي إِلَى صَوْمَعَتِهِ رَاعِيَةٌ تَرْعَى الْغَنَمَ فَوَلَدَتْ فَقِيلَ لَهَا مِمَّنْ هَذَا الْوَلَدُ؟ قَالَتْ: مِنْ جُرَيْجٍ نَزَلَ مِنْ صَوْمَعَتِهِ. قَالَ جُرَيْجٌ: أَيْنَ هَذِهِ الَّتِي تَزْعُمُ أَنَّ وَلَدَهَا لِي؟ قَالَ: يَا بَابُوسُ مَنْ أَبُوكَ؟ قَالَ: رَاعِي الْغَنَمِ)).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ لە نەتەوەکانی پێشوو پیاوێك هەبوو ناوی جورەیج بوو لە کاتێکدا نوێژی دەکرد دایکی بانگی کرد ئەی جورەیج ئەو لەناو نوێژا بوو لە دڵی خۆی ووتی خوایە وا دایکم بانگم دەکات وە لە ناو نوێژیشا دام، وە نوێژەکەی نەبڕی وەلامی دایکی نەدایەوە، لە پاشان هەم دیسان بانگی کردەوە هەم دیسان وەلامی دایکی نەدایەوە وە دایکی ووتی خوایە ئەم کوڕەم نەمرێنی هەتاکو دەم و چاوی ئافرەتێکی داوێن پیس دەبینێ، وە جورەیج لە پەرستگا

بوو خەریکی خواپەرستی بوو لە کاتێکدا ئافرەتێکی داوێن پیس رێی پێ گرت و قسەی لەگەڵ کرد و بەڵام ئەو وەڵامی نەدایەوە و ئافرەتەکەش ویستی سوکایەتی پێ بکات وە چوو بۆ لای شوانێك و داوێن پیسی لەگەڵ شوانەکە کرد و منداڵێکی لێ پەیدا بوو بە ناو خەڵکەکە دا تێپەڕی و وتی ئەم منداڵە لە جورەیجە، خەڵکەکەش لێی کۆبوونەوە ویستیان ئازاری بدەن ئینجا جورەیج ووتی منداڵەکەم بۆ لام بێنن پرسیاری لێ دەکەمەوە کە منداڵەکەیان هێنا ئەویش پێی ووت، کێ باوکتە، منداڵە شیرەخۆرەکە کەوتە قسە ووتی شوانی مەڕەکان باوکمەو من لە ئەوم.

٢٧٨. عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: نُهِينَا عَنْ اتِّبَاعِ الْجَنَائِزِ وَلَمْ يُعْزَمْ عَلَيْنَا.

ئوم عەطیە (رضي الله عنها) دەفەرموێ (قەدەغە کراوین لەوەی بە دوای تەرمی مردوودا بڕۆین بۆ گۆڕستان و، وە زۆر توندی لەسەر نەکردین.

## باب كراهة الصخب في الأسواق وصفة رسول الله في التوراة

٢٧٩. عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ قَالَ: لَقِيتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قُلْتُ أَخْبِرْنِي عَنْ صِفَةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ فِي التَّوْرَاةِ؟ قَالَ أَجَلْ. قال: وَاللَّهِ إِنَّهُ لَمَوْصُوفٌ فِي التَّوْرَاةِ بِبَعْضِ صِفَتِهِ فِي الْقُرْآنِ: يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا وَحِرْزًا لِلْأُمِّيِّينَ أَنْتَ عَبْدِي وَرَسُولِي سَمَّيْتُكَ المتَوَكِّلَ، لَيْسَ بِفَظٍّ وَلَا غَلِيظٍ وَلَا صَخَّابٍ فِي الْأَسْوَاقِ وَلَا يَدْفَعُ بِالسَّيِّئَةِ السَّيِّئَةَ وَلَكِنْ يَعْفُو وَيَغْفِرُ وَلَنْ يَقْبِضَهُ اللَّهُ حَتَّى

يُقِيمَ بِهِ الْمِلَّةَ الْعَوْجَاءَ بِأَنْ يَقُولُوا لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَيَفْتَحُ بِهِ أَعْيُنًا عُمْيًا وَآذَانًا صُمًّا وَقُلُوبًا غُلْفًا.

## (بەشی/ کەراهەتی گاڵەگاڵ کردن و دەنگ بەرزکردنەوە لە بازار و شێوەی ڕەوشتی پێغەمبەر لە کتێبی تەوڕات)

عەطای کوڕی یەسار دەفەرموێ: گەیشتم بە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصی (رضي الله عنهما) ووتم پێم بڵێ لە شێوە و ڕەوشتی پێغەمبەر (ﷺ) لە تەوڕات، ئەویش فەرمووی بەڵێ: فەرموی سوێندم بە خوا لە کتێبی تەوڕات هەندێ وەسفی کراوە کە لە قورئانیشدا هاتووە کە لەوانە: ئەی پێغەمبەر ئێمە تۆمان ڕەوانە کرد بە شاهید و بە مزگێنیدەر و ترسێنەر، ببی بە قەڵغان و پاراستن بۆ ئوممەتی نەخوێندەوار و تۆ بەندەی منی وە پێغەمبەری منی ناوم لێ ناوی بە (المتوكل) واتە –پشت بە خوا بەستوو– وە تۆ بەدڕەوشت نیت و توند و دڵ ڕەق نیت وە دەنگ بەرزناکەیتەوە لە بازاڕەکان و، وە کەسێ بە خراپە باست دەکات یان خراپەت لەگەڵ بکات تۆ بە چاکە وەڵامی دەدەیتەوە وە لێی دەبوری و عەفوی دەکەی وە خوای گەورە لە ناوت نابات هەتاکو ئوممەتی خوار و خێچ ڕاست دەکاتەوە بەوەی بڵێن (لا إله الا الله) هیچ پەرستراوێك نییە جگە لە الله نەبێت وە بە هۆی ئەم ووشەیەوە خوا چاوی کوێران، دەکاتەوە و گوێی گران چاك دەکاتەوە وە دڵی غافلیش بێدار و نەرم دەکاتەوە.

## باب التَسَتر في الغَسل، وكافِل اليَتِيم، وَكِتابة حاضري الجُمعة

٢٨٠.عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ عَنْ مَيْمُونَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما قَالَتْ: سَتَرْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) وَهُوَ يَغْتَسِلُ مِنْ الْجَنَابَةِ فَغَسَلَ يَدَيْهِ ثُمَّ صَبَّ بِيَمِينِهِ عَلَى شِمَالِهِ فَغَسَلَ فَرْجَهُ وَمَا أَصَابَهُ ثُمَّ مَسَحَ بِيَدِهِ عَلَى الْحَائِطِ أَوْ الْأَرْضِ ثُمَّ تَوَضَّأَ وُضُوءَهُ لِلصَّلَاةِ غَيْرَ رِجْلَيْهِ ثُمَّ أَفَاضَ الماءَ عَلَى جَسَدِهِ ثُمَّ تَنَحَّى فَغَسَلَ قَدَمَيْهِ.

## (بەشی/ خۆ داپۆشین لە کاتی خۆشۆردن (خۆپەنادان)، وە سەرپەشتی هەتیوان، نووسین و تۆمارکردنی پاداشتی هاتنی بۆ نوێژ)

عەبدوڵلای کوڕی عەبباس لە مەیمونە (رضي الله عنهما) دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێ پەنای پێغەمبەرم دا و پەردەپۆشم بۆ کرد لە کاتی خۆشۆردنی لە لەش گرانی، وە ئینجا هەردوو دەستی شۆرد و لە پاشان ئاوی بە دەستی راستی بەلای چەپی خۆی داکرد و ئینجا عەورەتی خۆی پاك کردەوە و لە پاشان دەستی بە دیوار یان زەوی داهێنا و لە پاشان دەستی شۆرد تەنها پێیەکانی نەشۆرد لە پاشان ئاوی بە هەموو لەشی دا کرد و لەپاشان کەمێك دوور کەوتەوە پێیەکانی شۆرد.

٢٨١.عَنْ سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((أَنَا وَكَافِلُ الْيَتِيمِ فِي الْجَنَّةِ هَكَذَا، وَقَالَ بِإِصْبَعَيْهِ السَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى)).

سەهلی کوڕی سەعد (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (من و ئەوانەی سەرپەرشتیاری هەتیوان دەکەن لە بەهەشتا ئاواین-راوییەکە دەفەرموێ-پەنجەی شادە و ناوەڕاستی لێك نزیك کردنەوە).

٢٨٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ تَعالى عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((مَنْ اغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ غُسْلَ الْجَنَابَةِ ثُمَّ رَاحَ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَدَنَةً وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الثَّانِيَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَقَرَةً، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الثَّالِثَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ كَبْشًا أَقْرَنَ، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الرَّابِعَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ دَجَاجَةً، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الْخَامِسَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَيْضَةً فَإِذَا خَرَجَ الْإِمَامُ حَضَرَتْ الْمَلَائِكَةُ يَسْتَمِعُونَ الذِّكْرَ)).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموێ: (کەسێ رۆژی هەینی خۆی شۆرد و چوو بۆ مزگەوت لە کاتی یەکەمەوە وەکو ئەوە وایە کە ووشترێکی کردبێتە قوربانی لە ئەجر و پاداشتدا وە ئەوەی لە کاتی پاش ئەو بێت وەکو مانگایەکی کردبێتە قوربانی وایە ، وە ئەوەی لە کاتی پاش ئەو بێت وەکو بەرانێکی کردبێتە قوربانی وایە وە ئەوەی لە پاش ئەو بێت وەکو مریشکێکی کردبێتە قوربانی وایە وە ئەوەی لە کاتی پاش هەمووان دێت وەکو هێلکەیەکی کردبێتە قوربانی وایە وە لەو کاتەی کە ئیمام دەچێت بۆ ووتار دان فریشتەکانی خوا ئامادەی ناو مزگەوت دەبن و گوێ بۆ ووتار و یادی خوا دەگرن.

## باب قيام الليل

﴿لَا تُبْطِلُوا۟ صَدَقَـٰتِكُم بِٱلْمَنِّ وَٱلْأَذَىٰ﴾

٢٨٣. عَنْ عبدالله بن عمر رضي الله عنهما قال: كَانَ الرَّجُلُ فِي حَيَاةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ إِذَا رَأَى رُؤْيَا قَصَّهَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ فَتَمَنَّيْتُ أَنْ أَرَى رُؤْيَا فَأَقُصَّهَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)

وَكُنْتُ غُلَامًا وَكُنْتُ أَنَامُ فِي الْمَسْجِدِ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ فَرَأَيْتُ فِي النَّوْمِ كَأَنَّ مَلَكَيْنِ أَخَذَانِي فَذَهَبَا بِي إِلَى النَّارِ فَإِذَا هِيَ مَطْوِيَّةٌ كَطَيِّ الْبِئْرِ وَإِذَا لَهَا قَرْنَانِ وَإِذَا فِيهَا أُنَاسٌ قَدْ عَرَفْتُهُمْ فَجَعَلْتُ أَقُولُ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ النَّارِ قَالَ فَلَقِيَنِي مَلَكٌ آخَرُ فَقَالَ لِي: لَمْ تُرَعْ، فَقَصَصْتُهَا عَلَى حَفْصَةَ فَقَصَّتْهَا حَفْصَةُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: ((نِعْمَ الرَّجُلُ عَبْدُ اللَّهِ لَوْ كَانَ يُصَلِّي مِنْ اللَّيْلِ! فَكَانَ بَعْدُ لَا يَنَامُ مِنْ اللَّيْلِ إِلَّا قَلِيلًا)).

قال تعالى: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُبۡطِلُواْ صَدَقَـٰتِكُم بِٱلۡمَنِّ وَٱلۡأَذَىٰ ﴾ إلى قولِه: ﴿ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَـٰفِرِينَ ﴾.

قال إبن عباس رضي الله عَنْهُما: ((صلْداً)) لَيْسَ عَلَيه شَيءٌ وَقالَ عِكْرِمَةُ: ((وابِلٌ)) مَطَرٌ شَديدٌ ((وَالطَّلُّ)) النَّدى.

## (بەشی/ شەو نوێژ و ئایەتی

## ﴿ لَا تُبۡطِلُواْ صَدَقَـٰتِكُم بِٱلۡمَنِّ وَٱلۡأَذَىٰ ﴾)

**عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنه) دەفەرموێ لە زەمانی پێغەمبەردا هەرکەسێ خەوی بدیبایە بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگێڕایەوە و منیش ئاواتەخوازم کە خەوێکم دیبایە و بۆم گێرابایەوە و من منداڵ بووم لە مزگەوت دەخەوتم لە زەمانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) جارێکیان خەوم لێکەوت و لە خەوما بینیم دوو فریشتە هاتن منیان برد بۆ ناو ئاگرێك و چواردەوری وەکو بیر دیواری لێ کرابوو وە دوو شاخی هەبوو وەکو شاخی چەرخی سەربیر وە چەند کەسێکی واتێدابوو دەمناسیەوە ئیتر دەستم کرد بە دوعا کردن ووتم پەنا دەگرم بەخوا لە ئاگری دۆزەخ، فەرمووی گەیشتم بە فریشتەیەك بە منی فەرموو مەترسە، جا منیش ئەم خەوەم بۆ حەفصەی خوشکم گێڕایەوە و کە**

خێزانی پێغەمبەر بوو (ﷺ) ئەویش خەوەکەی بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) گێرایەوە، پێغەمبەری خوا فەرمووی عەبدوڵلا پیاوێکی چاکە بریا با شەونوێژی بکردبایە.

وە سالمی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عومەر فەرمووی ئیتر لەوەولا عەبدوڵلا شەو کەمێکی نەبێ نەدەنووست شەونوێژی دەکرد.

وە خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُبۡطِلُواْ صَدَقَٰتِكُم بِٱلۡمَنِّ وَٱلۡأَذَىٰ ﴾ إلى قوله: ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾.

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە نەکەن خێر و پاداشتی چاکەتان پوچ بکەنەوە بە منەتنان و دڵ ئازاردانی هەژاران وەکو ئەو کەسەی ماڵ و سامانی خۆی لەبەر چاوی خەڵکی ببەخشێت بۆ ریاکاری و خولفاندن و ئیمان و بڕوای بە خوا و رۆژی دوای نەبێت جا نمونەی ئەو جۆرە کەسانە وەکو بەردێکی ساف وان کە هەندێك خۆلی بەسەرەوە بێ وە بارانێکی بە لێزمەی بەسەردا بێت و خۆلەکەی لەسەر لاببات وە بەرەق و تەقی بەجێ بهێڵێ وە حەقیقەتی دەریکەوێت ئینجا ئەم جۆرە ریا بازانە و بێ باوەڕانە و منەت کارانە هیچ جۆرە بەهرەیەك لەو بەخشینە یان بەدەست ناهێنن بێگومان خوای گەورە رێنمونی گەلی بێ باوەڕ ناکات.

عەبدوڵلای کوڕی عەبباس دەفەرموێ ووشەی ((صَلْداً)) واتە هیچ لەسەر نەبێت وە عیکرمە فەرموی ((وابِلٌ)) واتە بارانێکی بەلێزمە، ووشەی ((وَالطَّلُّ)) ئەو بەردەی کە سپی و لوس بێت هیچ خۆڵێکی لەسەر نەبێت.

٢٨٤.عَنْ خَوْلَةَ الْأَنْصَارِيَّةِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: ((إِنَّ رِجَالًا يَتَخَوَّضُونَ فِي مَالِ اللَّهِ بِغَيْرِ حَقٍّ فَلَهُمُ النَّارُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)).

له خەولەی ئەنصاری (رضي الله عنها) دەفەرموێ گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو دەیفەرموو: (هەندێك لە پیاوان چەپ و گوپ دەكەن لە ماڵی خوا بۆ خۆیان دەستی بەسەردا دەگرن بەبێ ئەوەی مافیان بەسەریەوە هەبێ ئەوانە ئاگری دۆزەخ بۆیان ئامادە كراوە.

٢٨٥. عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((فِي الْجَنَّةِ ثَمَانِيَةُ أَبْوَابٍ فِيهَا بَابٌ يُسَمَّى الرَّيَّانَ لَا يَدْخُلُهُ إِلَّا الصَّائِمُونَ)).

له سەهلی كوڕی سەعد (رضي الله عنه) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) كە دەفەرموێ: (بەهەشت هەشت دەرگای هەیە دەرگایەكیان پێی دەوترێت (رَّیان) واتە تێر ئاو، تەنها ئەوانەی بەرۆژوون لێی دەخۆنەوە).

## باب التوبة والنهي عنْ قَتْل النساء في الغزو

٢٨٦. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ تَعالى عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَال: ((كَانَ فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ رَجُلٌ قَتَلَ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ إِنْسَانًا ثُمَّ خَرَجَ يَسْأَلُ فَأَتَى رَاهِبًا فَسَأَلَهُ فَقَالَ لَهُ هَلْ لِي مِنْ تَوْبَةٍ قَالَ لَا: فَقَتَلَهُ، فَجَعَلَ يَسْأَلُ فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ ائْتِ قَرْيَةَ كَذَا فَأَدْرَكَهُ الْمَوْتُ فَنَاءَ بِصَدْرِهِ نَحْوَهَا فَاخْتَصَمَتْ فِيهِ مَلَائِكَةُ الرَّحْمَةِ وَمَلَائِكَةُ الْعَذَابِ فَأَوْحَى اللَّهُ إِلَى هَذِهِ أَنْ تَقَرَّبِي وَأَوْحَى اللَّهُ إِلَى هَذِهِ أَنْ تَبَاعَدِي وَقَالَ قِيسُوا مَا بَيْنَهُمَا فَوُجِدَ إِلَى هَذِهِ أَقْرَبَ بِشِبْرٍ فَغُفِرَ لَهُ)).

## (بەشی/ تەوبە کردن، و نەهی کردن
## لە کوشتنی ئافرەت لە جەنگا)

ئەبی سەعید خودری لە پێغەمبەری خوا دەگێڕێتەوە (ﷺ) کە دەفەرموێ: (لە نەوەی ئیسرائیل پیاوێ هەبوو نۆهەد و نۆکەسی کوشتبوو دوایی ویبیستی تۆبە بکات قەشەیەکی گاوریان پێ نیشان دا و پرسیاری لێ کرد و ئەویش ووتی تۆبەت بۆ نییە ئەویشی کوشت سەدی تەواو کرد وە دوایی خوناسێکی تریان پێ نیشان دا و ئەویش پێی ووت بڕۆ بۆ فلانە گوند لەوێ کۆمەڵێ خواپەرستی لێیە و لەگەڵ ئەوان خواپەرستی بکە ئەویش بەرێ کەوت و لە ڕێگادا مەرگ یەخەی گرت و کۆچی دوایی کرد و بۆ وەرگرتنی گیانی ئەم پیاوە فریشتەی بەزەیی و فریشتەی سزا بووە دەمەقاڵیان ئەویان دەیووت من وەری دەگرم ئەوی تریان دەیووت من وەری دەگرم وە خوای گەورە سروشی بۆیان نارد کەوا بە فریشتەی سزای فەرموو لێی دوورکەوە وە ئەو شوێنەی کە لێی هاتووە بپیون لەگەڵ ئەو شوێنەی بۆی دەچێت وە کە پێوایان دیتیان بۆ ئەو جێگای بۆی دەچێت بستێك زیاتر بوو لەوی تریان و خوای بەبەزەیی لێی خۆش بوو.

٢٨٧. عَنْ نَافِعٍ عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: وُجِدَتْ امْرَأَةٌ مَقْتُولَةً فِي بَعْضِ مَغَازِي رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ فَنَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ عَنْ قَتْلِ النِّسَاءِ وَالصِّبْيَانِ.

نافیع لە عەبدوڵلای کوڕی عومەر دەگێڕێتەوە (رضي الله عنهما) کە دەفەرموێ ئافرەتێ بە کوژراوی لە جەنگێك لە جەنگەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دۆزرایەوە وە پێغەمبەری خوا نەهی کرد لە کوشتنی ئافرەتان و منالان.

## باب مِنْ أسْمائه(ﷺ)

٢٨٨. عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ عَنْ أبِيهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَال: سَمِعتُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَقول: ((أنَا الْمَاحِي الَّذِي يَمْحُو اللَّهُ بِي الْكُفْرَ وَأنَا الْحَاشِرُ الَّذِي يُحْشَرُ النَّاسُ عَلَى قَدَمِي وَأنَا الْعَاقِبُ)).

## (بەشی/ لە ناوەکانی پێغەمبەر (ﷺ))

جوبەیری کوڕی موطعەم لە باوکی (رضي الله عنه) دەفەرموێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) فەرموی: (من لابەرم واتە بەهۆی منەوە خوا کوفر و بێ باوەڕی لادەبات وە کۆکەرەوەم کە خوای گەورە خەڵکی کۆدەکاتەوە لە ژێر پێی مندا، من دوایین مۆری پێغەمبەرایەتیم، وە پێغەمبەری تر لە پاش خۆم نایەت).

## باب الدَعوةَ للوَليمةً، والحجامة، والعذرة

٢٨٩. عَنْ أنسٍ رَضِيَ اللَّهُ تَعالى عَنْهُ أنَّهُ كَانَ يَقُولُ: شَرُّ الطَّعَامِ طَعَامُ الْوَلِيمَةِ يُدْعَى لَهَا الْأغْنِيَاءُ وَيُتْرَكُ الْفُقَرَاءُ، وَمَنْ تَرَكَ الدَّعْوَةَ فَقَدْ عَصَى اللَّهَ وَرَسُولَهُ(ﷺ).

## (بەشی/ بانگ کردن بۆ داوەتی ژن گواستنەوە وە کەلەشاخ گرتن وە نەخۆشی (عُذرة))

ئەنەس (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێ: خراپترین خواردن خواردنی ژن گواستنەوەیە ئەو کاتەی کە دەوڵەمەندان بانگ دەکەن و واز لە هەژاران دێنن وە ئەگەر کەسێ بانگ کرا و بە گوێرەی شەریعەت بوو، وە نەچوو ئەوا بێ فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی کردووە.

٢٩٠.عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ تَعالى عَنْهُ أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ أَجْرِ الْحَجَّامِ فَقَالَ: احْتَجَمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ حَجَمَهُ أَبُو طَيْبَةَ وَأَعْطَاهُ صَاعَيْنِ مِنْ طَعَامٍ وَكَلَّمَ مَوَالِيَهُ فَخَفَّفُوا عَنْهُ وَقَالَ: ((إِنَّ أَمْثَلَ مَا تَدَاوَيْتُمْ بِهِ الْحِجَامَةُ وَالْقُسْطُ الْبَحْرِيُّ)). قَالَ: ((لَا تُعَذِّبُوا صِبْيَانَكُمْ بِالْغَمْزِ مِنْ الْعُذْرَةِ وَعَلَيْكُمْ بِالْقُسْطِ)).

ئەنەس (رضي الله تعالى عنه) پرسیاری لێ کرا دەربارەی کرێی کەلەشاخ گرتن فەرمووی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەلەشاخی بۆ کراوە لەلایەن ئەبو تەیبە و دوو صاع لە خواردنی داپێ و بەگەورەکەی ووت باری سەرشانی سووك بکە و یارمەتی بدە چونکە بەندە بوو وە فەرمووی (ﷺ) چاکترین و باشترین شتێ کە چارەسەری پێ بکەن کەلەشاخ و بەکارهێنانی داری عودی دەریاییە وە فەرموی منداڵەکانتان ئازار مەدەن بەوەی پەنجە (قورگی بکەن لە نەخۆشی (العذرة) کە نەخۆشییەکە دەبێتە هۆی هەوکردن و ئەستوربوونی قورگ وە ئەو داری هیندیە بەکاربهێنن کە جاران بۆ دەرمان بەکاریان دەهێنا.

٢٩١.عَنْ أُمِّ قَيْسٍ بِنْتَ مِحْصَنٍ وَكَانَتْ مِنْ الْمُهَاجِرَاتِ الْأُوَلِ اللَّاتِي بَايَعْنَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ وَهِيَ أُخْتُ عُكَاشَةَ بْنِ مِحْصَنٍ أَخْبَرَتْهُ أَنَّهَا أَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَدْ عَلَّقَتْ عَلَيْهِ مِنْ الْعُذْرَةِ فَقَالَ: ((اتَّقُوا اللَّهَ عَلامَ تَدْغَرُونَ أَوْلَادَكُمْ بِهَذِهِ الْأَعْلَاقِ؟ عَلَيْكُمْ بِهَذَا الْعُودِ الْهِنْدِيِّ فَإِنَّ فِيهِ سَبْعَةَ أَشْفِيَةٍ مِنْهَا ذَاتُ الْجَنْبِ -يُرِيدُ الْكُسْتَ، يَعْنِي الْقُسْطَ)).

لە ئوم قەیس کچی محصن (رضي الله عنهما) دەگێڕێتەوە کە یەکێکە لە ئافرەتە کۆچکردووەکان کە پەیمانیان دا بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە خوشکی عکاشەی کوڕی موحصن بوو کە هات بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ)

که کوڕێکی ساوای خۆمم پێ بوو که دوومەڵ لەناو قوڕگی هاتبوو به پەنجە دوومەڵەکەم تەقاند پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی له خوا بترسن ئەوە بۆ منالەکانتان وابەم شێوەیە ئازار دەدەن بە گوشینی دوومەڵ لە قوڕگیدا بەڵکو له باتی ئەوە بە داری هیندی دەرمانی بکەن چونکە ئەم داره دەرمانی حەوت دەردە بەم شێوەیە بەکاردەهێنن ئەم داره دەکوتن و ڕۆنەکەی لێ دەگرن و دەیکەنە ناو کونەلوتی منالەکه.

## باب وضع الرِّجل على الأخرى وكَيفَ يكُون الرّجل في أهلهِ

٢٩٢. عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ عَنْ عَمِّهِ أَنَّهُ أَبْصَرَ النَّبِيَّ (ﷺ) يَضْطَجِعُ فِي الْمَسْجِدِ رَافِعًا إِحْدَى رِجْلَيْهِ عَلَى الْأُخْرَى.

## (بەشی/ قاچ خستنەسەر قاچ لەکانی ڕاکشاندا وه پیاو له ماڵەوه چی دەکات له کاروباری ماڵەوه)

له عەبادی کوڕی تەمیم لە مامی دەگێڕێتەوە کە چاوی بە پێغەمبەر (ﷺ) کەوت لەناو مزگەوتا ڕاکشا، بوو قاچێکی خستەسەر قاچەکەی تر.

٢٩٣. عَنْ إِبْرَاهِيمَ عَنْ الْأَسْوَدِ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ مَا كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَصْنَعُ فِي أَهْلِهِ قَالَتْ: كَانَ فِي مِهْنَةِ أَهْلِهِ فَإِذَا حَضَرَتْ الصَّلَاةُ قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ.

له ئیبراهیم لەئەسوەد دەفەرموێ پرسیارم لە عائیشەخان کرد (رضي الله عنها) دەربارەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) له ئیش و کاری ماڵەوەیدا. فەرمووی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ئیش و کاری ناوماڵ دا بوو تا کاتێك کاتی نوێژدا دەهات دەچوو بۆ نوێژ.

## باب يكره التَمادح

٢٩٤.عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ عَنْ أَبِيهِ أَنَّ رَجُلًا ذُكِرَ عِنْدَ النَّبِيِّ (ﷺ) فَأَثْنَى عَلَيْهِ رَجُلٌ خَيْرًا فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): ((وَيْحَكَ قَطَعْتَ عُنُقَ صَاحِبِكَ يَقُولُهُ مِرَارًا –إِنْ كَانَ أَحَدُكُمْ مَادِحًا لَا مَحَالَةَ فَلْيَقُلْ أَحْسِبُ كَذَا وَكَذَا إِنْ كَانَ يُرَى أَنَّهُ كَذَلِكَ وَحَسِيبُهُ اللَّهُ وَلَا يُزَكِّي عَلَى اللَّهِ أَحَدًا، قَالَ وُهَيْبٌ عَنْ خَالِدٍ: فقال وَيْلَكَ (أي بدل ويحك))).

## (بەشی/ کەراهەتی هەیە مەدح کردن)

له عەبدولرەحمانی کوڕی ئەبی بەکره له باوکی دەگێڕێتەوەکه پیاوێ باسی پیاوێکی تر به باشه لەلای پێغەمبەری خوا کرد (ﷺ) ئەویش فەرمووی: (هاوار بۆ تۆ ئەستۆی براکەت بڕی، وه چەند جارێ دووبارەی کردەوه، وه فەرمووی ئەگەر کەسێکتان ویستی مەدح و سەنای براکەی بکات بابڵێ وایدەزانم ئاوا و ئاوایه ئەمەش به مەرجی ئەوه ئەو کابرایه ڕێی تێ بچێ که وەك ئەو دەڵێ وابێ نەوەك مەدحەکەی درۆی ڕووت بێ ئیتر خودا بۆ خۆی ئاگای له دڵیەتی و به پێی زانیاری دڵی پاداش دەداتەوه بەڵام به هیچ جۆر نابێ بڕیار بدات بڵێ فولانەکەس لەلای خودا باشه و پاکه چونکەشتی وا بەس خودا بۆ خۆی دەزانێ.

## باب ما يُقال عند النَوم وبَعدهُ ، وَكيفية الصّلاة على رسول اللهِ (ﷺ)

٢٩٥.عَنْ حُذَيْفَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ قَالَ: ((بِاسْمِكَ أَمُوتُ وَأَحْيَا)) وَإِذَا قَامَ قَالَ: ((الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَا وَإِلَيْهِ النُّشُورُ)).

## (بەشی/ چ دەڵێی لە کاتی نوستن و چۆنیەتی سەڵاوات دان لە سەر پێغەمبەری خوا (ﷺ))

حوذەیفە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر بیویستبا بچوبایە سەر جێگای نوستن ئەم دوعایەی دەکرد (بإسمكَ أموت وأحيا) واتە: بەناوی تۆ دەمرم و زیندوو دەکرێمەوە، وە ئەگەر لە خەو هەڵسابایە ئەم دوعایەی دەکرد (الحمد للهِ الذي أحيانا بعدمَا أماتنا وإليهِ النشور) واتە: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خودایەی کە زیندووی کردوینەتەوە لەپاش ئەوەی ئێمەی مراند وە گەڕانەوەشمان بۆ لای ئەوە.

٢٩٦. عَنْ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَبِي لَيْلَى قَالَ: لَقِيَنِي كَعْبُ بْنُ عُجْرَةَ فَقَالَ: أَلَا أُهْدِي لَكَ هَدِيَّةً، إِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ خَرَجَ عَلَيْنَا فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ قَدْ عَلِمْنَا كَيْفَ نُسَلِّمُ عَلَيْكَ فَكَيْفَ نُصَلِّي عَلَيْكَ؟ قَالَ ((قُولُوا اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ)).

عەبدولرەحمانی کوڕی ئەبی لەیلا دەفەرموێ گەیشتم بە کەعبی کوڕی عەجرە فەرمووی ئایا بەخشیشێکت پێشکەش بکەم؟ کە پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژێك هاتە ناومان وتمان ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە زانیمان چۆن سڵاوت لێ بکەین، بەڵام چۆن صەڵاوەتت لەسەر لێ بدەین؟ ئەویش فەرمووی بڵێن: (قُولُوا اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ) واتە: خوایە بڕێژە ڕەحمەت بەسەر موحەمەد و خانەوادەی موحەمەد و هەروەکو ڕەحمەت و بەرەکەتت ڕژاندوە بەسەر ئیبراهیم و

خانەوادەی ئیبراهیم وە تۆش سوپاس کراو و سەربەرزی وە خوایە بڕێژە ڕەحمەت بەسەر موحەمەد و ئال و خانەوادەی موحەمەد هەروەکو ڕژاندۆتە سەر خانەوادەی ئیبراهیم وە خۆشی و سوپاس کراو و سەر بڵندی بەسەر هەمووواندا).

## باب الدعاء إذا إنتبه بالليل

٢٩٧. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ تَعالى عَنْهُمَا قَالَ: بِتُّ عِنْدَ مَيْمُونَةَ فَقَامَ النَّبِيُّ ((ﷺ)) فَأَتَى حَاجَتَهُ فَغَسَلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ ثُمَّ نَامَ ثُمَّ قَامَ فَأَتَى الْقِرْبَةَ فَأَطْلَقَ شِنَاقَهَا ثُمَّ تَوَضَّأَ وُضُوءًا بَيْنَ وُضُوءَيْنِ لَمْ يُكْثِرْ وَقَدْ أَبْلَغَ فَصَلَّى فَقُمْتُ فَتَمَطَّيْتُ كَرَاهِيَةَ أَنْ يَرَى أَنِّي كُنْتُ أَتَّقِيهِ فَتَوَضَّأْتُ فَقَامَ يُصَلِّي فَقُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ فَأَخَذَ بِأُذُنِي فَأَدَارَنِي عَنْ يَمِينِهِ فَتَامَّتْ صَلَاتُهُ ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً ثُمَّ اضْطَجَعَ فَنَامَ حَتَّى نَفَخَ، وَكَانَ إِذَا نَامَ نَفَخَ، فَآذَنَهُ بِلَالٌ بِالصَّلَاةِ فَصَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ وَكَانَ يَقُولُ فِي دُعَائِهِ: ((اللَّهُمَّ اجْعَلْ فِي قَلْبِي نُورًا وَفِي بَصَرِي نُورًا وَفِي سَمْعِي نُورًا وَعَنْ يَمِينِي نُورًا وَعَنْ يَسَارِي نُورًا وَفَوْقِي نُورًا وَتَحْتِي نُورًا وَأَمَامِي نُورًا وَخَلْفِي نُورًا وَاجْعَلْ لِي نُورًا)).

## (بەشی/ نزای لەخەو هەڵسان لە شەودا)

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (رضي الله عنهما) دەگێڕێتەوە کە دەفەرمووێ لەلای پورم مەیمونە بووم (خێزانی پێغەمبەر بوو) شەوبوو پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە خەو هەڵسا و چوو بۆ لای تارەت کردن و ئینجا هاتەوە دەم و چاو و دەستەکانی شۆرد و لە پاشان نوستەوە لە پاشان هەڵسایەوە و چوو بۆ لای دەمی (شەربەی) کردەوە و دەست نویژی شۆرد کە دەست نوێژەکە لە نێوان دوو دەست نوێژدا بوو نە ئەوەندە ئاو سەرف کردن بوو نە ئەوەندەش ناتەواو بەڵکو تەواو ناوەنجی بوو وە هەڵسا نوێژی کرد منیش بە

دزی هەڵسام نەبادا ئەو بزانێ من چاودێری دەکەم وە دەستنوێژم شۆرد و ئەویش نوێژی دەکرد وە چووم لەلای چەپی وەستام ئەویش بە گوێ منی راکێشا بردمی بۆ لای راستی وە بەتەواوی سیانزە رکعەت نوێژی کرد لە پاشان پاڵکەوت و خەوت هەتاکو پرخەی لێوە هات، وە عادەتی وابوو کە دەنوست پرخەی لێوە دەهات وە بیلالیش هات و بانگی دا بۆ نوێژ و وە پێغەمبەریش هەڵسا و نوێژی کرد و دەستنوێژی نەشۆرد وە لە دوعاکانی دا دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ اجْعَلْ فِي قَلْبِي نُورًا وَفِي بَصَرِي نُورًا وَفِي سَمْعِي نُورًا وَعَنْ يَمِينِي نُورًا وَعَنْ يَسَارِي نُورًا وَفَوْقِي نُورًا وَتَحْتِي نُورًا وَأَمَامِي نُورًا وَخَلْفِي نُورًا وَاجْعَلْ لِي نُورًا)

واتە: خوایە بگێرە بۆ من نور و رووناکی لە ناو دڵ و دەروونم و چاوم و گوێچکەم و لای راستم و چەپم و لای سەرەوەم و ژێرەوەم و پێش و پاشم و وە بگێرە نور و رووناکی بۆ ناو هەناوم.

## باب ما يبقى مع الميت وما يرجع والنذر، والحرص على الإمارة

٢٩٨. عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ رضي الله تَعالى عَنْهُ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ تَعالى عَلَيْهِ وآله وَسَلَّمَ: ((يَتْبَعُ الْمَيِّتَ ثَلَاثَةٌ فَيَرْجِعُ اثْنَانِ وَيَبْقَى مَعَهُ وَاحِدٌ يَتْبَعُهُ أَهْلُهُ وَمَالُهُ وَعَمَلُهُ فَيَرْجِعُ أَهْلُهُ وَمَالُهُ وَيَبْقَى عَمَلُهُ)).

## (بەشی/ ئەوەی بەجێ دەمێنێ لەگەڵ مردوو لە گۆڕ دا و ئەوەی دەگەڕێتەوە، نەزر کردن و بە ئومێدبوون بۆ سەروکاری خەڵکان)

ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەیفەرموو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (سێ شتی بە دوای مردوو دەکەون بۆ گۆڕستان لەوێ دووانیان دەگەڕێنەوە وە یەکێکیان بەجێ دەمینێ، کەس و کاری و ماڵ و سامانی دەگەڕێنەوە، و بەڵام کردەوەی لەگەڵی بەجی دەمێنێ).

## باب الحَث على النَصيحة

٢٩٩. قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((إِذَا اسْتَنْصَحَ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ فَلْيَنْصَحْ لَهُ)).

## (بەشی/ هاندان بۆ ئامۆژگاری کردن)

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر یەکێکتان داوای ئامۆژگاری کرد لە براکەی با ئامۆژگاری چاکەی بکات).

## باب الحلال بيِّن والحرام بيِّن

٣٠٠. عَنْ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَال: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) ((الْحَلالُ بَيِّنٌ وَالْحَرَامُ بَيِّنٌ وَبَيْنَهُمَا أُمُورٌ مُشْتَبِهَةٌ فَمَنْ تَرَكَ مَا شُبِّهَ مِنْ الْإِثْمِ كَانَ لِمَا اسْتَبَانَ أَتْرَكَ، وَمَنْ اجْتَرَأَ عَلَى مَا يَشُكُّ فِيهِ مِنْ الْإِثْمِ أَوْشَكَ أَنْ يُوَاقِعَ مَا اسْتَبَانَ، وَالْمَعَاصِي حِمَى اللَّهِ مَنْ يَرْتَعْ حَوْلَ الْحِمَى يُوشِكُ أَنْ يُوَاقِعَهُ)).

## (بەشی/ حەلاڵ و حەرام ئاشکرا و روونن)

نوعمانی کوڕی بەشیر (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی حەلاڵ روون و ئاشکرایە و حەرامیش روون و ئاشکرایە، وە لەنێوانیاندا شتانێ هەن کە بەحەلاڵیش دەشوبهێن و بە حەرامیش دەشوبهێن وە هەر کەسێ تەرکی شوبهەی بکا ئەوەی کە دیارە حەرام چاکتری تەرك ئەکا، ئەوەی جورئەت بکاتەسەر شوبهەی گوناھ نزیکە بکەوێتە ناو گوناهەوە...گوناھ و حەرام قەدەغەی خودایە، هەرکەسێ لە دەوری قەدەغەکراودا ئاژەڵ بلەوەرێنێ نزیکە بچیتە ناو قەدەغە و حەرامەوە.

## باب الولد للفراش

٣٠١. قَالَ صَلَّى اللَّهُ تعالى عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ وَلِلْعَاهِرِ الْحَجَرُ)).

## (بەشی/ منداڵ بۆ ئەو کەسەیە کە سەرجێی لەگەڵ دایکی کراوە)

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (منداڵ ناوی ئەوباوکە هەڵدەگرێ کە سەرجێی لەگەڵ دایکیدا کردووە، وە بۆ ئافرەتێ زیناکەریش بێ ئومێدییە و هیچ مافێکی لەسەر منداڵەکە نییە).

## باب من لم يُبالِ من حيث الكَسب

٣٠٢.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَال: ((يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ لَا يُبَالِي الْمَرْءُ مَا أَخَذَ مِنْهُ أَمِنَ الْحَلَالِ أَمْ مِنْ الْحَرَامِ)).

## (بەشی/ گرنگی نەدان بە هەرچی کۆبکەیتەوە لە ماڵ و سامان)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی کاتێك و زەمانێك بەسەر خەڵكاندا دێت مرۆڤ گرنگی نادات بەوەی دەستی دەکەوێت لە ماڵ و سامان چ بە حەرامی بێت یان بە حەڵاڵی بێت.

## باب البسط في الرزق

٣٠٣. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُبْسَطَ لَهُ فِي رِزْقِهِ أَوْ يُنْسَأَ لَهُ فِي أَثَرِهِ فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ)).

## (بەشی/ رزق و رۆزی زۆربوون)

ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەفەرموێ گوێم لەپێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) فەرمووی: (کەسێ پێی خۆشە ماڵ و سامان و رزق و رۆزی و تەمەنی پڕ خێر و زۆر بێت با سەردانی خزم و خوێش بکات).

## باب كسب الرجل أو عمله بيدهِ

٣٠٤. عَنْ الْمِقْدَامِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ تَعالى عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((مَا أَكَلَ أَحَدٌ طَعَامًا قَطُّ خَيْرًا مِنْ أَنْ يَأْكُلَ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ)).

## (بەشی/ کاروکاسبی پیاو بە دەستی خۆی بیکات)

لە میقدام (رضي الله عنه) لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێ: (کەستان ئەو خواردنەی نەخواردوە باشتر و چاکتر بێت لەوەی بە دەستی خۆی پەیدای دەکات).

٣٠٥. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((رَحِمَ اللَّهُ رَجُلًا سَمْحًا إِذَا بَاعَ وَإِذَا اشْتَرَى وَإِذَا اقْتَضَى)).

جابرى كوڕى عەبدوڵلا (رضي الله عنه) لە پێغەمبەرى خوا (ﷺ) دەگێڕێتەوە كە فەرموويەتى: (ڕەحمەتى خوا لەو پياوەى كە نەرم و نيانەو خۆش مەشرەب بێ لەكاتى كڕين و فرۆشتن و دادوەريدا).

## باب منْ أنظر مَعْسراً

٣٠٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((كَانَ تَاجِرٌ يُدَايِنُ النَّاسَ فَإِذَا رَأَى مُعْسِرًا قَالَ لِفِتْيَانِهِ تَجَاوَزُوا عَنْهُ لَعَلَّ اللَّهَ أَنْ يَتَجَاوَزَ عَنَّا، فَتَجَاوَزَ عَنْهُ)).

## (بەشى/ كەسێ مۆڵەتى بارگرانى يان قەرزارى بدات)

ئەبو هورەيرە (رضي الله عنه) لە پێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە كە دەفەرمووێ: (بازرگانێ شتى بە قەرز دەدا بە خەڵكى وە ئەگەر يەكێكى بيديبايە قەرزەكەى بە زەحمەت بۆ دەدرايەوە بە غولامەكانى خۆى دەگوت چاوپۆشى لەمە بكەن و مۆڵەتى پێ بدەن ئومێدەوارم خواى گەورەش چاوپۆشيمان لێ بكات، وە خواى گەورە چاوپۆشى لێ كرد و لێى خۆش بوو).

## باب ما يمحق الكسب في البيع

٣٠٧. عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ رَضِيَ اللَّهُ تَعالى عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((الْبَيِّعَانِ بِالْخِيَارِ مَا لَمْ يَتَفَرَّقَا فَإِنْ صَدَقَا وَبَيَّنَا بُورِكَ لَهُمَا فِي بَيْعِهِمَا وَإِنْ كَتَمَا وَكَذَبَا مُحِقَتْ بَرَكَةُ بَيْعِهِمَا)).

## (بەشی/ ئەو شتەی لە کڕین و فرۆشتن دا خێر و بێری دەبا)

حەکیمی کوڕی حیزام (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (فرۆشیار وکڕیار هەردووکیان سەرپشکن لە بە ئەنجام گەیاندنی پەیمانەکە مادەم لەیەك جیا نەبوونەوە جا ئەگەر لەگەڵ یەکدا راست و دروست بن و عەیبی شتەکەیان دەرخست خوا بەرەکەت دەخاتە نێو مامەڵەکەیان، بەڵام ئەگەر عەیبەکەیان شاردەوە و درۆیان لەگەڵ یەکتری کرد خوای گەورە پیت و بەرەکەتی تیادا ناهێڵێ).

## باب أكل الرِّبا

٣٠٨.عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَال: قَالَ رَسُول الله (ﷺ): ((رَأَيْتُ اللَّيْلَةَ رَجُلَيْنِ أَتَيَانِي فَأَخْرَجَانِي إِلَى أَرْضٍ مُقَدَّسَةٍ، فَانْطَلَقْنَا حَتَّى أَتَيْنَا عَلَى نَهَرٍ مِنْ دَمٍ فِيهِ رَجُلٌ قَائِمٌ، وَعَلَى وَسَطِ النَّهَرِ رَجُلٌ بَيْنَ يَدَيْهِ حِجَارَةٌ فَأَقْبَلَ الرَّجُلُ الَّذِي فِي النَّهَرِ فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَخْرُجَ رَمَى الرَّجُلُ بِحَجَرٍ فِي فِيهِ فَرَدَّهُ حَيْثُ كَانَ، فَجَعَلَ كُلَّمَا جَاءَ لِيَخْرُجَ رَمَى فِي فِيهِ بِحَجَرٍ فَيَرْجِعُ كَمَا كَانَ، فَقُلْتُ: مَا هَذَا؟ فَقَالَ: الَّذِي رَأَيْتَهُ فِي النَّهَرِ آكِلُ الرِّبَا)).

## (بەشی/ ریبا خۆری)

سەمورەی کوڕی جوندوب (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (ئەم شەو لە خەوما دیتم دوو پیاو هاتن منیان بردە زەوی و شوێنێکی پیرۆز تا گەیشتینە روبارێك لە خوێن وە لەسەر لێواری رووبارەکە پیاوێك وەستابوو چەند بەردێکی لەبەردەمی خۆی دانابوو وە پیاوێکیش لەناو روبارەکە بوو، وە هەر کات دەیویست بێتە دەرەوە ئەوی لەسەر لێوارەکە بوو

بەردێکی تێ دەگرت و لە دەمی دەدا و دەیگەڕاندەوە ناوەڕاستی روبارەکە هەم دیسان دەیویست بێتە دەرەوە هەم دیسان بەدرێکی تێ دەگرت و بە هەمان شێوە دووبارەی دەکردەوە وە منیش ووتم ئەم پیاوە چی کردوە و کێیە پێیان ووتم ئەمەی لە ناوەڕاستی روبارەکە وەستاوە ئەوەیان ریبا خۆرە).

## باب الحلف لترويج السلعة

٣٠٩.عَنْ أبي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أن النَّبيَّ (ﷺ) قال: ((الْحَلِفُ مُنَفِّقَةٌ لِلسِّلْعَةِ مُمْحِقَةٌ لِلْبَرَكَةِ))

## (بەشی/ سوێند خواردن بۆ برەودانی کەل و پەل و فرۆشتن)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی سوێندخواردن رەواج بە کەل و پەل دەدات بەڵام پیت وبەرەکەتی تیادا ناهێڵێ.

## باب طلب جليس الصالح

٣١٠. عَنْ بُرْدَةَ بْنَ أَبِي مُوسَى عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) ((مَثَلُ الْجَلِيسِ الصَّالِحِ وَالْجَلِيسِ السَّوْءِ كَمَثَلِ صَاحِبِ الْمِسْكِ وَكِيرِ الْحَدَّادِ، لَا يَعْدَمُكَ مِنْ صَاحِبِ الْمِسْكِ إِمَّا تَشْتَرِيهِ أَوْ تَجِدُ رِيحَهُ، وَكِيرُ الْحَدَّادِ يُحْرِقُ بَدَنَكَ أَوْ ثَوْبَكَ أَوْ تَجِدُ مِنْهُ رِيحًا خَبِيثَةً)).

## (بەشی/ داواکردنی برادەرایەتی پیاوی چاك)

ئەبی بوردەی کوڕی ئەبی موسا لە باوکی (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی نمونەی هاورێیەتی پیاوچاکان و پیاوخراپان وەکو نمونەی خاوەن میسك فرۆش و کوورەی ئاسنگەرە، وە لە خاوەن میسکەکە زیانت پێ ناگات یان یان میسکی لێ دەکڕی و یان لەبۆنی خۆشی سودی لێ وەردەگریّ بەڵام ئەوی کوورەی ئاسنگەر ئەگەر لێی نزیك ببیتەوە ئەوا لە شت دەسوتێ وە یان جل و بەرگت وەیان هەر هیچ نەبێ بۆنی ناخۆشت پێ دەگات لێی.

## باب العمل الخالص لله سُبحانهُ وتعالى

٣١١. عَنْ عبد الله بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ رسول الله صَلَى اللهُ عَلَيه وَعَلى آلِهِ وسلم قال: ((خَرَجَ ثَلَاثَةٌ يَمْشُونَ فَأَصَابَهُمْ الْمَطَرُ فَدَخَلُوا فِي غَارٍ فِي جَبَلٍ فَانْحَطَّتْ عَلَيْهِمْ صَخْرَةٌ، قَالَ: فَقَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: ادْعُوا اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ بِأَفْضَلِ عَمَلٍ عَمِلْتُمُوهُ، فَقَالَ أَحَدُهُمْ: اللَّهُمَّ إِنِّي كَانَ لِي أَبَوَانِ شَيْخَانِ كَبِيرَانِ، فَكُنْتُ أَخْرُجُ فَأَرْعَى ثُمَّ أَجِيءُ بِالْحِلَابِ فَآتِي بِهِ أَبَوَيَّ فَيَشْرَبَانِ، ثُمَّ أَسْقِي الصِّبْيَةَ وَأَهْلِي وَامْرَأَتِي، فَاحْتَبَسْتُ لَيْلَةً فَجِئْتُ فَإِذَا هُمَا نَائِمَانِ، قَالَ: فَكَرِهْتُ أَنْ أُوقِظَهُمَا وَالصِّبْيَةُ يَتَضَاغَوْنَ عِنْدَ رِجْلَيَّ، فَلَمْ يَزَلْ ذَلِكَ دَأْبِي وَدَأْبَهُمَا حَتَّى طَلَعَ الْفَجْرُ، اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنِّي فَعَلْتُ ذَلِكَ ابْتِغَاءَ وَجْهِكَ فَافْرُجْ عَنَّا فُرْجَةً نَرَى مِنْهَا السَّمَاءَ. قَالَ: فَفُرِجَ عَنْهُمْ. وَقَالَ الْآخَرُ: اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنِّي كُنْتُ أُحِبُّ امْرَأَةً مِنْ بَنَاتِ عَمِّي كَأَشَدِّ مَا يُحِبُّ الرَّجُلُ النِّسَاءَ، فَقَالَتْ لَا تَنَالُ ذَلِكَ مِنْهَا حَتَّى تُعْطِيَهَا مِائَةَ دِينَارٍ، فَسَعَيْتُ حَتَّى جَمَعْتُهَا، فَلَمَّا قَعَدْتُ بَيْنَ رِجْلَيْهَا قَالَتْ اتَّقِ اللَّهَ وَلَا تَفُضَّ الْخَاتَمَ إِلَّا بِحَقِّهِ، فَقُمْتُ وَتَرَكْتُهَا، فَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنِّي فَعَلْتُ ذَلِكَ ابْتِغَاءَ وَجْهِكَ فَافْرُجْ عَنَّا

فُرْجَةً، قَالَ فَفَرَجَ عَنْهُمْ الثُّلُثَيْنِ، وَقَالَ الْآخَرُ: اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنِّي اسْتَأْجَرْتُ أَجِيرًا بِفَرَقٍ مِنْ ذُرَةٍ فَأَعْطَيْتُهُ فَأَبَى ذَلِكَ أَنْ يَأْخُذَ فَعَمَدْتُ إِلَى ذَلِكَ الْفَرَقِ فَزَرَعْتُهُ حَتَّى اشْتَرَيْتُ مِنْهُ بَقَرًا وَرَاعِيهَا ثُمَّ جَاءَ فَقَالَ: يَا عَبْدَ اللَّهِ أَعْطِنِي حَقِّي، فَقُلْتُ: انْطَلِقْ إِلَى تِلْكَ الْبَقَرِ وَرَاعِيهَا فَإِنَّهَا لَكَ، فَقَالَ: أَتَسْتَهْزِئُ بِي، قَالَ فَقُلْتُ: مَا أَسْتَهْزِئُ بِكَ وَلَكِنَّهَا لَكَ، اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنِّي فَعَلْتُ ذَلِكَ ابْتِغَاءَ وَجْهِكَ فَافْرُجْ عَنَّا فَكُشِفَ عَنْهُمْ)).

## (بەشی/ کردەوەی چاك و پاك بۆ خوای گەورە)

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنه) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (لە ئوممەتەکانی پێش ئێوە سێ کەس لە ئاوەدانیی دەرچوون، لە کاتێکدا کە لە ناوچەیەکی شاخاوی دا ڕێیان دەکرد، دای کردە باران، بارانێکی زۆر بە شێوەیەك ناچار بوون خۆیان بگەیننە ئەشکەوتێکی ئەو نزیکە-چوونە ناو ئەشکەوتەکە-بەر لەوەی باران تەواو ببێت و بێنە دەرەوە- لە ئەشکەوتەوە بەردێك تلێر بوەوە و هاتە خوارەوە، دەرگای ئەشکەوتەکەی گرت و-بەهیچ شێوەیەك ماوەی دەرچوونیان نەبوو، ووتیان: هەر کامیان کردەوەی چاکی هەیە و تەنها لەبەر ڕەزامەندی خوایش ئەنجامی داوە، با بیکاتە هۆیەك و لە خوا پێی بپاڕێتەوە، بەشکوم ڕەحمیان لە گەڵا بکات، یەکێکیان ڕووی کردە خوای پەروەردگار-و ووتی: خوایە من دایك و باوکێکی زۆر پیرم هەبوو. هەمو ئێوارەیەك ئەبوایە شیرم بهێنایە و پێش هەموو کەس دەرخواردی ئەوانم بدایە، ڕۆژێکیان بەهۆی گەڕان بە دوای شتێکدا دوا کەوتم و زوو نەگەڕامەوە، کە گەڕامەوە بینیم خەوتوون، منیش قاپە شیرەکەم بە دەستەوە بوو لەسەر سەریان ڕاوەستام، پێم خۆش نەبوو

ماڵ و منداڵەکەم لە پێش ئەوانەوە شیرەکە بخۆنەوە و چاوەڕێ بووم بێدار ببنەوە.

ئەوەبوو هەستان لە بەرەبەیاندا و شیرەکەیان خوارد، سا خوایە ئەگەر ئەم کارەم لەبەر ڕەزامەندیی تۆ کردووە، دەرگای مەرحەمەتت لێمان بکەرەوە و ڕزگارمان بکە. ئەوەندەیان زانی بەردەکە کەمێ جولا، بەڵام نەیاندەتوانی بێنە دەرەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی پاشان ئەوی تریان ووتی: پەروەردگار! من کچێکی ئامۆزام هەبوو، لە ڕادەبەدەر خۆشم دەویست، داوام لێ کرد خۆی بدات بە دەستەوە و کاری حەرامم لەگەڵ بکات، بەڵام ئەو خۆی نەدا بەدەستەوە، تا ئەوەبوو ساڵێکی گرانیی هاتە پێش و تەنگی بە ئافرەتەکە هەڵچنی و پەنای هێنا بۆ من، منیش سەد دیناری (زێڕم) دایە و بەو مەرجەی خۆی بدات بە دەستەوە، ئەویش ڕازی بوو. هەتا کاتێ ئیشەکەم بۆ دەستەبەر بوو چوومە پێشەوە لێی پێی ووتم: (لەخوا بترسە) من بۆ تۆ حەڵاڵ نیم و بە حەڵاڵی نەبێت بۆت نییە پەردەی شەرمم بشکێنی. منیش نەموێرا دەستی بۆ ببەم و لێ دوورکەوتمەوە، لەکاتێکدا لە ڕادەبەدەر خۆشم دەویست. دەستیشم لە زێڕەکە هەڵگرت  کە پێم بەخشیبوو. خوای پەروەردگارم! ئەگەر ئەو کارەم لەبەر ڕەزامەندی تۆ کردووە، ئەوا دەرگای مەرحەمەتت لێمان بکەرەوە و رزگارمان بکە! لەو کاتەدا بەردەکە کەمێکی تر جولا، بەلام هێشتا نەیاندەتوانی بێنە دەرەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: پاشان سێیەمیان ووتی: پەروەردگار! من چەند کەسێکم بەکرێ گرتبوو، تا کارێکم بۆ ئەنجام بدەن، هەر یەکەیان کرێی خۆیم پێ دا جگە لە کرێکارێکیان کرێکەی وەرنەگرت و ڕۆی، منیش خستمە ئیشەوە تا زۆر بوو هەندێ مانگام پێ کڕی پاش ماوەیەك هات بۆ لام و ووتی: ئەی بەندەی خوا! کرێکەی

خۆمم بدەرێ، منیش پێم ووت: سەیرکە...هەرچی تۆ ئەیبینی لە ووشتر و مانگا و مەڕ و کۆیلە، لە کریکەی تۆ پەیدا بووە، وتی: ئەی بەندەی خوا گاڵتەم پێ مەکە، منیش وتم گاڵتەت پێ ناکەم ئەویش هەمووی دایە بەرو بردیەوە بێ ئەوەی هیچی لێ بەجێ بهێڵێ، سا خوایە! ئەگەر من ئەو کارەم لەبەر رەزامەندی تۆ کردووە، دەرگای مەرحەمەتت لێمان بکەرەوە و رزگارمان بکە، دیسان بەردەکە جولاو هاتنە دەرەوەو چوون بەرێی خۆیانەوە.

## باب سيدنا إبراهيم وَزَوْجته وحفظ اللهُ لهُما

٣١٢.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ تعالى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَال: هَاجَرَ إِبْرَاهِيمُ عَلَيْهِ السَّلَام بِسَارَةَ فَدَخَلَ بِهَا قَرْيَةً فِيهَا مَلِكٌ مِنْ الْمُلُوك أَوْ جَبَّارٌ مِنْ الْجَبَابِرَة، فَقِيلَ دَخَلَ إِبْرَاهِيمُ بِامْرَأَةٍ هِيَ مِنْ أَحْسَنِ النِّسَاءِ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ أَنْ يَا إِبْرَاهِيمُ مَنْ هَذِهِ الَّتِي مَعَكَ؟ قَالَ هِيَ أُخْتِي، ثُمَّ رجعَ إِلَيْهَا فَقَالَ لَا تُكَذِّبِي حَدِيثِي فَإِنِّي أَخْبَرْتُهُمْ أَنَّك أُخْتِي، وَاللَّهِ إِنَّهُ ما عَلَى وَجهِ الْأَرْضِ مُؤْمِنٌ غَيْرِي وَغَيْرُك، فَأَرْسَلَ بِهَا إِلَيْهِ، فَقَامَ إِلَيْهَا فَقَامَتْ تَتوضَّأُ وَتُصَلِّي، فَقَالَتْ: اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتُ آمَنْتُ بِكَ وَبِرَسُولِكَ وَأَحْصَنْتُ فَرْجِي إِلَّا عَلَى زَوْجِي فَلَا تُسَلِّطْ عَلَيَّ الْكَافِرَ، فَغُطَّ حَتَّى رَكَضَ بِرِجْلِه، قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: قَالَتْ اللَّهُمَّ إِنْ يَمُتْ يُقَالُ هِيَ قَتَلَتْهُ، فَأُرْسِلَ، ثُمَّ قَامَ إِلَيْهَا فَقَامَتْ تَتَوَضَّأُ وَتُصَلِّي وَتَقُولُ اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتُ آمَنْتُ بِكَ وَبِرَسُولِكَ وَأَحْصَنْتُ فَرْجِي إِلَّا عَلَى زَوْجِي فَلَا تُسَلِّطْ عَلَيَّ هَذَا الْكَافِرَ، فَغُطَّ حَتَّى رَكَضَ بِرِجْلِه، قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَقَالَتْ اللَّهُمَّ إِنْ يَمُتْ فَيُقَالُ هِيَ قَتَلَتْهُ، فَأُرْسِلَ فِي الثَّانِيَةِ أَوْ فِي الثَّالِثَة، فَقَالَ: وَاللَّهِ مَا أَرْسَلْتُمْ إِلَيَّ إِلَّا شَيْطَانًا، ارْجِعُوهَا إِلَى إِبْرَاهِيم عليه السَّلام وَأَعْطُوهَا هاجَرَ، فَرَجَعَتْ إِلَى إِبْرَاهِيمَ عَلَيْهِ السَّلَام فَقَالَتْ: أَشَعَرْتَ أَنَّ اللَّهَ كَبَتَ الْكَافِرَ وَأَخْدَمَ وَلِيدَةً)).

## (بەشی/ گەورەمان ئیبراهیم (علیه السلام) و خێزانەکەی و پاراستنی لەلایەن خواوە)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێ: (ئیبراهیم پێغەمبەر (علیه السلام) لەگەڵ سارەی خێزانی کۆچ دەکەن بۆ وولاتێ ڕێگایان کەوتە شارێو پاشایەکی ستەمکاری لێ دەبێ و پاسەوانەکانیش پادشا ئاگادار دەکەن کە ئیبراهیم هاتووە و ئافرەتێکی جوانی لەگەڵ دایە و ئەویش دەنێرێ بەدوایاندا و پێی دەڵێت ئەم ئافرەتە چیت دەبێت، ئەویش دەفەرمووێ ئەوە خوشکمە وە لە پاشان ئیبراهیم دەچێتە لای سارە و پێی دەڵێت بە درۆم مەخەرەوە بە پادشام ووتووە ئەمە خوشکمە سوێندم بەخوا لەسەر زەوی ئیمانداری نییە جگە لە من و تۆ نەبێت لە پاشان پادشا ناردی بە دوای سارە و ئەویش لە پێشدا دەستنوێژی شۆرد و نوێژی کرد وفەرموی ئەی خوایە ئەگەر من ئیمان و بڕوام بەتۆ و بە پێغەمبەرەکەت هێناوە وە داوێنم پاراستووە تەنها بۆ مێردم نەبێ، خوایە گیان ئەم کافرە و بێ بڕوایە زاڵ نەکەی بەسەرمدا ئینجا زۆردارەکە ویستی دەستی خراپەی بۆ ببات لە پەل و پۆ دەکەوێ هەناسەی دەگیرێ و دەست دەکات بە لرخە لرخ، ئەبو هورەیرە دەفەرموێ سارە خاتوون فەرموی خوایە مەی کوژە نەبادا بڵێت ئەو کوشتوویەتی ئینجا وازی لێ هێنا وە چاك بۆوە وە هەم دیسان ویستی پەلاماری بدات بانگی کردەوە وە سارەش هەم دیسان هەڵسا و دەستنوێژی گرت و نوێژی کرد و لە خوا پاڕایایەوە وتی خوایە گیان ئەگەر من بڕوام بە تۆ و پێغەمبەرەکەت هێناوە داوێنی خۆم پاراستووە تەنها بۆ مێردم نەبێ ئەم ستەمکارە زاڵ نەکەی بەسەرمدا، دیسان کە ویستی پەلاماری بدات دەستی وشك بوو لە پەل و پۆ کەوت و ئەبو هورەیرە

دەفەرموێ سارە خاتوون فەرموی خوایە ئێستا ئەگەر بمرێ دەڵێن تۆ کوشتووتە دیسان لە جاری سێیەم و دووەم دیسان هەمان کرداری پێ روداوە لەپاشان ستەمکارەکە ووتی بەخوا ئەوەی بۆتان ناردوم ئەوە ئادەمی نیە و جنۆکەیە بیێ نێرنەوە بۆ لای ئیبراهیم و نۆکەری خۆمان کە هاجەرەیە بیدەنێ، ئینجا گەڕایەوە بۆ لای ئیبراهیم (علیه السلام) فەرموی خۆ ئاگات لێ بوو چۆن خوا ئەو بێ باوەڕەی کۆ لە کۆتا و ئەم کارەکەرەشی بۆمان رەخساند کە هاجەرەیە.

## باب بيعْ التصاوير التي ليْسَ فِيها روح

٣١٣.عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي الْحَسَنِ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا إِذْ أَتَاهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا أَبَن عَبَّاسٍ إِنِّي إِنْسَانٌ إِنَّمَا مَعِيشَتِي مِنْ صَنْعَةِ يَدِي، وَإِنِّي أَصْنَعُ هَذِهِ التَّصَاوِيرَ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: لَا أُحَدِّثُكَ إِلَّا مَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِه وَسَلَّمَ، سَمِعْتُهُ يَقُول: ((مَنْ صَوَّرَ صُورَةً فَإِنَّ اللَّهَ مُعَذِّبُهُ حَتَّى يَنْفُخَ فِيهَا الرُّوحَ، وَلَيْسَ بِنَافِخٍ فِيهَا أَبَدًا))، فَرَبَا الرَّجُلُ رَبْوَةً شَدِيدَةً وَاصْفَرَّ وَجْهُهُ، فَقَالَ: وَيْحَكَ، إِنْ أَبَيْتَ إِلَّا أَنْ تَصْنَعَ فَعَلَيْكَ بِهَذَا الشَّجَرِ وكُلِّ شَيْءٍ لَيْسَ فِيهِ رُوحٌ.

## (بەشی/ فرۆشتنی وێنەکان کە گیانی تیا نەبێ)

لە سەعیدی کوڕی ئەبی الحسن دەفەرموێ لەلای عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (رضي الله عنهما) دانیشتووین پیاوێ ووتی ئەی عەبدوڵلای کوڕی عەبباس کارو باسبیم ئەوەیە کە وێنە بە دەستی خۆم دروست دەکەم وە ژیانی رۆژانەی پێ دابین دەکەم. وە عەبدوڵلای کوڕی عەبباس فەرموی ئایا فەرمودەیەکت بۆ بگێڕمەوە کە لە پێغەمبەری خوام بیستووە کە دەیفەرموو

کەسێ وێنە بکێشێ خوای گەورە ئازاری دەدات هەتاکو داوای لێ دەکرێ کە گیان بکا بەبەریدا و ناتوانێ گیان بکا بە لاشەیدا، ئینجا پیاوەکە رەنگی گۆڕا و خەم دایگرتن و رەنگی زەرد بوو فەرمووی هاوار بۆت ئەگەر هەر پێویستت پێی هەیە ئەوا وێنەی گژوگیا و شاخ و داخ بکە جگە لە گیاندار.

## باب إثم من باع حُرّاً

٢١٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: ((قَالَ اللَّهُ: ثَلَاثَةٌ أَنَا خَصْمُهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ رَجُلٌ أَعْطَى بِي ثُمَّ غَدَرَ، وَرَجُلٌ بَاعَ حُرًّا فَأَكَلَ ثَمَنَهُ، وَرَجُلٌ اسْتَأْجَرَ أَجِيرًا فَاسْتَوْفَى مِنْهُ وَلَمْ يُعْطِ أَجْرَهُ)).

### (بەشی/ کەسێ ئازادکراوێ بفرۆشێ و بیکاتە بە بەندە)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرموێ: (خوای گەورە دەفەرموێ: سێ چین هەن من دوژمنایەتیان دەکەم لەرۆژی قیامەت، پیاوێ عەهد و پەیمان بدا و لەسەر ئیسلامەتی وە دوای پاشگەز ببێتەوە لێی، وە پیاوێ ئازاد کراوێ بفرۆشێ وە نرخەکەی بخوات وە پیاوێ بەکرێ بگرێ و ئیشی بۆ بکات کرێیەکەی پێ نەدات).

## باب الكيل على البائِع، والمعطي، وبيع الذهب بالذهب، والمزابنة

٣١٥.عَنْ الْمِقْدَامِ بْنِ مَعْدِي يكَرِبَ (الزُّبَيدي) رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَال: ((كِيلُوا طَعَامَكُمْ يُبَارَكْ لَكُمْ فيه)).

## (بەشی/ کێشان و دان لەسەر فرۆشیار و فرۆشتنی زێڕ بە زێڕ و مامەڵەی موزابەنە)

لە مقدام کوڕی مەعدی یەکرەب زوبەیدی (رضي الله عنه) لە پێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە فەرمویەتی: (لەکاتی کڕینو فرۆشتندا خواردەمەنیەکانتان بکێشن و خوای گەورە پیت و بەرەکەتی تێ دەخات.

٣١٦. قَالَ رَسول الله صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وآلِهِ وَسَلَّمَ: ((اكْتَالُوا حَتَّى تَسْتَوْفُوا))، وَيُذْكَرُ عَنْ سَيدنا عُثْمَانَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَعلى آلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَهُ: ((إِذَا بِعْتَ فَكِلْ وَإِذَا ابْتَعْتَ فَاكْتَلْ)).

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: شت بکێشن بە تەواوی وە دەگێڕێتەوە گەورەمان عوسمان (رضي الله عنه) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو ئەگەر شتێکت فرۆشت بیکێشە وە ئەگەر کڕیووتەوە هەم دیسان بیکێشنەوە.

٣١٧.عَنْ إِبْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ قال: قالَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((مَنْ ابْتَاعَ طَعَامًا فَلَا يَبِعْهُ حَتَّى يَسْتَوْفِيَهُ)).

لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی کەسێ خۆراکێکی کڕی با بەتەواوی بیکێشێ لە پاشان وەری بگرێ ئینجا بیفرۆشێتەوە.

٣١٨.قَالَ أَبُو بَكْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لَا تَبِيعُوا الذَّهَبَ بِالذَّهَبِ إِلَّا سَوَاءً بِسَوَاءٍ، وَبِيعُوا الذَّهَبَ بِالْفِضَّةِ وَالْفِضَّةَ بِالذَّهَبِ كَيْفَ شِئْتُمْ)).

ئەبو بەکرە (رضي الله عنه) فەرموی پێغەمبەر خوا (ﷺ) فەرموی زێر بە زێر مەفرۆشن مەگەر سەر بە سەر و بێ باقی بەڵام زێر بە زیو یان زیو بە زێر چۆنی پێتان خۆشە وا بکەن!

٣١٩.عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((لَا تَتَبَايَعُوا الثَّمَرَ حَتَّى يَبْدُوَ صَلَاحُهُ، وَلَا تَبِيعُوا الثَّمَرَ بِالتَّمْرِ)).

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (رضي الله عنهما) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (میوە مەفرۆشن تاکو پێ دەگات و بە کەڵکی خواردن دێت وە روتاب مەفرۆشن بە خورمای گەییوی تەواو).

## باب في الحوالة

٣٢٠.وَعَنْهُ أيضاً أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((مَطْلُ الْغَنِيِّ ظُلْمٌ فَإِذَا أُتْبِعَ أَحَدُكُمْ عَلَى مَلِيءٍ فَلْيَتَّبِعْ)).

## (بەشی/ حەواڵەکردن)

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری (ﷺ) فەرموی: (قەرز کوێری پیاوی دەوڵەمەند گەلێ ستەمە و ناڕەوایە ئەگەر کەسێکتان لەلایەنی قەرزارەکەی خۆیەوە بەرەو رووی پیاوێکی دەوڵەمەندکرایەوە کە ئەو پیاوە دەوڵەمەندە لە باتی قەرزارەکەی خۆی قەرزەکەی پێ بداتەوە، ئەوە با بچێ قەرزەکەی لەو دەوڵەمەندە وەربگرێتەوە)

وه له شهرعدا ووشهى حهواله كردن واته: گواستنهوهى مافێك له ئهستۆى كهسێكهوه بۆ ئهستۆى كه سێكى تر واته فرۆشتنى قهرزه به قهرز بهڵام لهبهر پێویستى رێگهى پێدراوه.

## باب الكفالة

٣٢١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) أَنَّهُ ذَكَرَ رَجُلًا مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ سَأَلَ بَعْضَ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنْ يُسْلِفَهُ أَلْفَ دِينَارٍ. فَقَالَ ائْتِنِي بِالشُّهَدَاءِ أُشْهِدُهُمْ. فَقَالَ ((كَفَى بِاللَّهِ شَهِيدًا)). قَالَ فَأْتِنِي بِالْكَفِيلِ. قَالَ كَفَى بِاللَّهِ كَفِيلًا. قَالَ صَدَقْتَ. فَدَفَعَهَا إِلَيْهِ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى فَخَرَجَ فِي الْبَحْرِ فَقَضَى حَاجَتَهُ ثُمَّ الْتَمَسَ مَرْكَبًا يَرْكَبُه يَقْدَمُ عَلَيْهِ لِلْأَجَلِ الَّذِي أَجَّلَهُ فَلَمْ يَجِدْ مَرْكَبًا فَأَخَذَ خَشَبَةً فَنَقَرَهَا فَأَدْخَلَ فِيهَا أَلْفَ دِينَارٍ وَصَحِيفَةً مِنْهُ إِلَى صَاحِبِهِ ثُمَّ زَجَّجَ مَوْضِعَهَا ثُمَّ أَتَى بِهَا إِلَى الْبَحْرِ فَقَالَ: اللَّهُمَّ إِنَّكَ تَعْلَمُ أَنِّي كُنْتُ تَسَلَّفْتُ فُلَانًا أَلْفَ دِينَارٍ فَسَأَلَنِي كَفِيلًا فَقُلْتُ كَفَى بِاللَّهِ كَفِيلًا فَرَضِيَ بِكَ وَسَأَلَنِي شَهِيدًا فَقُلْتُ كَفَى بِاللَّهِ شَهِيدًا فَرَضِيَ بِكَ، وَأَنِّي جَهَدْتُ أَنْ أَجِدَ مَرْكَبًا أَبْعَثُ إِلَيْهِ الَّذِي لَهُ فَلَمْ أَقْدِرْ وَإِنِّي أَسْتَوْدِعُكَهَا، فَرَمَى بِهَا فِي الْبَحْرِ حَتَّى وَلَجَتْ فِيهِ ثُمَّ انْصَرَفَ، وَهُوَ فِي ذَلِكَ يَلْتَمِسُ مَرْكَبًا يَخْرُجُ إِلَى بَلَدِهِ، فَخَرَجَ الرَّجُلُ الَّذِي كَانَ أَسْلَفَهُ يَنْظُرُ لَعَلَّ مَرْكَبًا قَدْ جَاءَ بِمَالِهِ، فَإِذَا بِالْخَشَبَةِ الَّتِي فِيهَا الْمَالُ فَأَخَذَهَا لِأَهْلِهِ حَطَبًا، فَلَمَّا نَشَرَهَا وَجَدَ الْمَالَ وَالصَّحِيفَةَ ثُمَّ قَدِمَ الَّذِي كَانَ أَسْلَفَهُ فَأَتَى بِالْأَلْفِ دِينَارٍ فَقَالَ: وَاللَّهِ مَا زِلْتُ جَاهِدًا فِي طَلَبِ مَرْكَبٍ لِآتِيَكَ بِمَالِكَ فَمَا وَجَدْتُ مَرْكَبًا قَبْلَ الَّذِي أَتَيْتُ فِيهِ، قَالَ: هَلْ كُنْتَ بَعَثْتَ إِلَيَّ بِشَيْءٍ؟ قَالَ: أُخْبِرُكَ أَنِّي لَمْ أَجِدْ مَرْكَبًا قَبْلَ الَّذِي جِئْتُ

فيهِ، قَالَ: فَإِنَّ اللَّهَ قَدْ أَدَّى عَنْكَ الَّذِي بَعَثْتَ فِي الْخَشَبَةِ فَانْصَرِفْ بِالْأَلْفِ الدِّينَارِ رَاشِدًا.

## (بەشی کەفالەت کردن)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە: کە (پیاوێك لە بەنی ئیسرائیل داوای لە پیاوێکی تری بەنی ئیسرائیل دەکات کە هەزار دینار (واتە هەزار مسقال ئاڵتون)ی بە قەرز بداتێ، ئەویش ووتی بڕۆ چەند شاهێدێکم بۆ بێنە، بیان کەم بە شاهید، ووتی: خوا بەسە بۆ شاهێدیی، ووتی: دەی بڕۆ کەفیلم بۆ بێنە، ووتی: خوا بەسە بۆ کەفیلی، ووتی: راست ئەکەی. ئینجا هەزار دینارەکەی بە قەرز دا پێی تا دوای ماوەیەکی دیاریکراو بۆی بێنێتەوە. پاشان کابرا ناوچەکەی بەجێ هێشت و سواری کەشتی بوو، کارەکەی ئەنجام دا وپاشان ویستی سواری کەشتی بێت و بێتەوە بۆ لای (خاوەنی قەرزەکە) و لە کاتی دیاریکراودا بگاتەوە ئەوێ. کەچی کەشتی دەست نەکەوت. ئینجا تەختە دارێکی هێنا و کۆڵی و هەزار دینارەکە و نامەیەکی تێخست بۆ خاوەن پارە، پاشان هەڵکۆڵینەکەی داپۆشی و هێنای بۆ دەریاکە و ووتی: ئەی پەروەردگارم، تۆ چاك دەزانیی کەوا من هەزار دینارم لە فلان کەس بە قەرز وەرگرت، داوای کەفیلی لێ کردم ووتم: خوا بەسە بۆ کەفیلی، ئەویش بە کەفیلیی تۆ ڕازی بوو، داوای شاهێدیشی لێ کردم، ووتم: خوا بەسە بۆ شاهێدیی، بەوەش ڕازی بوو. منیش ئەوەتا هەوڵ و تەقەلایەکی زۆرم داو هەرچی لە تواناما بوو بەختم کرد بۆ دەستخستنی کەشتیەکە تا ئەو پارەیەی وا بەلامەوە بۆی بنێرم، بەلام نەمتوانی، (ئەی پەروەردگارم) وا ئەم تەختە دارە ئەسپێرم بە تۆ، بۆم بگەیەنیت). تەختە داری فڕێ دایە ناو دەریاوە، تا لە ناو ئاوەکەدا گوم بوو، ئەمیش گەڕایەوە،

له كاتەدا كەوتە هەوڵدان تا كەشتییەكی دەست بكەوێ بگەڕێتەوە وولاتی خۆی، پیاوی خاوەن پارەیش لە ماڵ دەرچوو تەماشای دەكرد بە شكوم كەشتییەك پەیدا بێت پارەكەی بۆ بێنێتەوە، كتوپڕ تەختە دارەكە كە پارەكەی تیابوو دەركەوت ئەمیش هێنایەوە بۆ ماڵ تا بیكەنە سوتەمەنی، كە لەتی كرد دەبینی پارەكە و نامەكەی تێدایە، پاشان پیاوەكە كە قەرزی لێ وەرگرتبوو پەیدا بوو هەزار دینارەكەی بۆ هێنایەوە ووتی: سوێند بە خوا تا ئێستا بەوپەڕی توانامەوە هەوڵم داوە تا كەشتیم دەست بكەوێت و پارەكەت بۆ بهێنمەوە، بەلام پێش ئەم كەشتییەی پێی هاتمەوە یەك كەشتیم نەدیوە. ووتی: ئایا تۆ لەوە پێش هیچت بۆمن ناردووە؟ ووتی: من پێت ڕائەگەیەنم پێش ئەم كەشتییەی من پێی هاتووم كەشتی ترم دەست نەكەوتووە، ووتی: ئەو پارەیەی كە تۆ لە ناو تەختەدارەكەدا ناردبووت، خوای گەورە گەیاندی و قەرزەكەی بۆ دایتەوە، هەزار دیناری خۆت بۆ خۆت.

## باب المسلم في كيل معلوم

٣٢٢. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَدِمَ النَّبِي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ الْمَدِينَةَ وَالنَّاسُ يُسْلِفُونَ فِي التمَرِ الْعَامَ وَالْعَامَيْنِ، فَقَالَ (ﷺ): ((مَنْ سَلَّفَ فِي تَمْرٍ فَلْيُسْلِفْ فِي كَيْلٍ مَعْلُومٍ وَوَزْنٍ مَعْلُومٍ)).

## (بەشی/ سەلەم لە پێوان و كێشانی زانراو)

عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس (رضي الله عنهما) دەفەرموێ (كاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتە مەدینە خەڵكەكە بۆ بەروبومی خورما ساڵێك و دوو ساڵ سەلەمیان ئەكرد ئەویش فەرمووی هەركەس سەلەم بكات با پێوانە و كێشانەی و وادەكەی دیاری كراو بێت).

سەلەم لە شەرعا: بریتیە لە فرۆشتینی شتێکی دیاریکراو لەزیمەدا بە نرخێکی پێش خراو (ئەوەی پێویستە بە زانیاری زیاتر هەیە با سەیری فقه السنه بکات).

٣٢٣. عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: اشْتَرَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ طَعَامًا مِنْ يَهُودِيٍّ بِنَسِيئَةٍ وَرَهَنَهُ دِرْعًا لَهُ مِنْ حَدِيدٍ.

عائیشە (رضي الله عنها) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا خواردنێکی لە جولەکەیەك کڕی (تیروکەوانەکەی) بە رەهن (بارمتە) دانا لای جولەکەکە.

## (كتاب المزارعة)

## باب فضل الحرث والغرس

٣٢٤. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِي عَلَيهِ الصَّلاةُ وَالسَّلام قالَ: ((مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَغْرِسُ غَرْسًا أَوْ يَزْرَعُ زَرْعًا فَيَأْكُلُ مِنْهُ طَيْرٌ أَوْ إِنْسَانٌ أَوْ بَهِيمَةٌ إِلَّا كَانَ لَهُ بِهِ صَدَقَةٌ)).

## (نامەی کشتوکاڵ (المزارعه))

## (بەشی/ فەزلی جۆت کردن و زەوی کێلاّن)

ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگێرێتەوە کە دەفەرموێ: (هەر موسڵمانێ نەمامێ بنێژێ یان کشتوکاڵی بکات ئەوا ئەگەر باڵندە یان ئادەمی یان ئاژەڵ لێی بخوات بۆ خاوەنەکەی دەبێتە خێر و صەدەقە لە رۆژی قیامەت).

## باب إقتناء الكلب للحرث

٣٢٥.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِي (ﷺ) قال: ((مَنْ أَمْسَكَ كَلْبًا فَإِنَّهُ يَنْقُصُ كُلَّ يَوْمٍ مِنْ عَمَلِهِ قِيرَاطٌ إِلَّا كَلْبَ حَرْثٍ أَوْ مَاشِيَةٍ)).

## (بەشی/ راگرتنی سەگ بۆ کشتوکاڵ)

لە ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە دەفەرموێ کەسێ سەگێك رابگرێ بێ هودە ئەوا هەموو رۆژێ بە قەد قیراطي کردەوەی چاکەی کەم دەکات تەنها سەگ راگرتن بۆ کشتوکاڵ و پاسەوانی و مەڕ و ماڵات.

٣٢٦. عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ أَنَّه رَأَى سِكَّةً وَشَيْئًا مِنْ آلَةِ الْحَرْثِ، فَقَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُول: ((لَا يَدْخُلُ هَذَا بَيْتَ قَوْمٍ إِلَّا أَدْخَلَهُ الذُّلَّ)).

ئەبو ئومامەی باهیلی لە ماڵێکا ئامێری کشتوکاڵ و کێڵانی دیت وەکو (هەوجار و گاسن) فەرمووی گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) فەرمووی ئەمە سەر بکا بەهەر ماڵێ خودا دەیکا بە مایەی ژێردەستی و کەساسی بۆیان.

مەبەست لەم فەرمودەیە ئەوەیە موسڵمان سەرنەکەنە کشت و کاڵ و ماڵداری بە جۆرێکی وا کە واز لە هێزی سەربازی و جیهاد و تێکۆشان بهێنن وە هەتاکو ئەویش دیارە لە هەژاران و فەلاح و جوتیار کەساس تر و بێنەواتر نییە.

٣٢٧. عَنْ أَبِي هُرِيرة رضي الله عَنْهُ قال: قال رسول الله (ﷺ): ((مَنْ كَانَتْ لَهُ أَرْضٌ فَلْيَزْرَعْهَا أَوْ لِيَمْنَحْهَا أَخَاهُ، فَإِنْ أَبَى فَلْيُمْسِكْ أَرْضَهُ))

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی کەسێ زەوی هەبوو با بیچێنێ یان بیداتە براکەی با دابچێنێ وە ئەگەر ئەویش نەی کرد ئەوا زەوی خۆی رابگرێت.

٣٢٨. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما: إِنَّ أَمْثَلَ مَا أَنْتُمْ صَانِعُونَ أَنْ تَسْتَأْجِرُوا الْأَرْضَ الْبَيْضَاءَ مِنْ السَّنَةِ إِلَى السَّنَةِ.

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەفەرموێ: (چاکترین شتێ کە ئێوە دەیکەن ئەوەیە کە زەوی رووت و بێ کشت و کاڵ بەکرێ بدرێ لەو ساڵەوە بۆ ساڵێکی تر).

٣٢٩. عَنْ حَنْظَلَةَ بْنِ قَيْسٍ عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ قَالَ: حَدَّثَنِي عَمَّايَ أَنَّهُمْ كَانُوا يُكْرُونَ الْأَرْضَ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (ﷺ)بِمَا يَنْبُتُ عَلَى الْأَرْبِعَاءِ أَوْ شَيْءٍ يَسْتَثْنِيهِ صَاحِبُ الْأَرْضِ، فَنَهَى النَّبِيُّ (ﷺ) عَنْ ذَلِكَ، فَقُلْتُ لِرَافِعٍ: فَكَيْفَ هِيَ بِالدِّينَارِ وَالدِّرْهَمِ؟ فَقَالَ رَافِعٌ: لَيْسَ بِهَا بَأْسٌ بِالدِّينَارِ وَالدِّرْهَمِ.

حەنظەلەی کوڕی قەیس لە رافیعی کوڕی خەدیج دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێ مامەم بۆی باسکردم لە زەمانی پێغەمبەر (ﷺ) ئێمە زەویمان دەدا بە موڵکانە لەسەر ئەم شێوەیە پارچەیەکمان لە زەوییەکە دیاری دەکرد و ئەو پارچەیەمان دادەچاند بۆ خاوەنی زەوییەکە لە باتی ملکانەو، ئەویتریش بۆ وەر زێرەکە دایدەچاند بۆ خۆی جا زۆر جار هەبوو لە پارچە زەوی، باشی دەهێنا لە کشتوکاڵ و بەڵام پارچەکەی تر باشی ناهێنا لە بەروبووم لە کاتی دروێنە و خەرماندا دەبوو بە ناکۆکیمان لەبەر ئەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەهی کردووە، هەتا ناکۆکی و ناخۆشی پەیدا نەبێ ووتم بە رافیع ئەگەر بە پارە بوایە ووتی هیچ شتی تیادا نییە و بەڵام لەو کاتەدا وا باونەبوو و بەپارە.

## باب تَحريم بيع الخَمر والميتة وثمن الكلب

٣٣٠. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ (عَامَ الْفَتْحِ وَهُوَ بِمَكَّةَ): ((إِنَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ حَرَّمَ بَيْعَ الْخَمْرِ وَالْمَيْتَةِ وَالْخِنْزِيرِ وَالْأَصْنَامِ))، فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْتَ شُحُومَ الْمَيْتَةِ فَإِنَّهَا يُطْلَى بِهَا السُّفُنُ وَيُدْهَنُ بِهَا الْجُلُودُ وَيَسْتَصْبِحُ بِهَا النَّاسُ؟ فَقَالَ: ((هُوَ حَرَامٌ))، ثُمَّ قَالَ النَّبِيّ (ﷺ) عِنْدَ ذَلِكَ: ((قَاتَلَ اللَّهُ الْيَهُودَ إِنَّ اللَّهَ لَمَّا حَرَّمَ شُحُومَهَا جَمَلُوهُ ثُمَّ بَاعُوهُ فَأَكَلُوا ثَمَنَهُ)).

## (بەشی/ قەدەغەکردنی فرۆشتنی مەی و مردار بوو و کرێی سەگ)

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رضي الله عنهما) دەگێڕێتەوە کە گوێی لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەیفەرموو لە ساڵی فەتحی مەککە بوو، خواو پێغەمبەرەکەی قەدەغە و حەرامی فرۆشتنی مەی و مردارەبو وە بەراز و بت یان کردووە، وترا ئەی پێغەمبەری خوا ئایا بەزوپیوی مردارەبوو کە کەشتی پێ چەور دەکرێت چۆنە و پێستەی پێ چەور دەکەن و بەکاری دەهێنن، فەرمووی خوا بچی بە گژ جولەکەکاندا لەو کاتەی کە خوای گەورە بەز و پیوی ئاژەڵی مردارەبووی لەسەر حەڕام کردبوون ئەوان خۆشەیان دەکرد و جوانیان دەکرد و دەیان فرۆشت و پارەکەیان دەخوارد.

٣٣١. عَنْ أبي مسعود الأنصاري رضي الله عَنْهُ أَنَّ النَّبي عَليهِ الصَّلاةُ وَالسَّلام نهى عَنْ ثَمَنِ الكَلب (كما نهى (ﷺ) عَن) مَهْرِ البَغِيِّ وَحُلْوَانُ الكَاهِنِ.

لە ئەبی مەسعودی ئەنصاری (رضي الله عنه) لە پێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە نەهی کردووە لە وەرگرتنی پارەی فرۆشتنی سەگ و هەروەها

نەهی کردووە لە وەرگرتنی مارەیی ئافرەتی داوێن پیس و وە لە دانی پارەی فاڵچی و جادوگەر لەسەر فاڵ و جادوویانەوە.

## (كتاب الإجارة)

## باب إستئجار الرجل الصالح، وقول الله تعالى:

﴿إِنَّ خَيْرَ مَنِ ٱسْتَـْٔجَرْتَ ٱلْقَوِىُّ ٱلْأَمِينُ﴾

٣٣٢. عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): ((الْخَازِنُ الْأَمِينُ الَّذِي يُؤَدِّي مَا أُمِرَ بِهِ طَيِّبَةً نَفْسُهُ أَحَدُ الْمُتَصَدِّقِينَ))

## (نامەی بەکرێدان)

## (بەشی/ بەکرێگرتنی پیاو وچاکەکە و خوای گەورە دەفەرموێ :﴿إِنَّ خَيْرَ مَنِ ٱسْتَـْٔجَرْتَ ٱلْقَوِىُّ ٱلْأَمِينُ﴾)

ئەبو مووسای ئەشعەری (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: خەزینەداری ئەمین و دەستپاك ئەوەی ئەنجامی دەدات کە فەرمانی پێکراوە بەوەقێ خۆشحال بێت بەئەنجام دانی ئەوە یەکێکە لە چاکەکاران.

٣٣٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((مَا بَعَثَ اللَّهُ نَبِيًّا إِلَّا رَعَى الْغَنَمَ، فَقَالَ أَصْحَابُهُ: وَأَنْتَ؟ قَالَ: نَعَمْ، كُنْتُ أَرْعَاهَا عَلَى قَرَارِيطَ لِأَهْلِ مَكَّةَ)).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لە پێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێ هەر پێغەمبەرێ کە خوا ناردویەتی شوانی مەڕی کردوە، هاوەڵان وتیان تۆش؟ فەرموی بەڵێ منیش شوانی مەرم کردووە بۆ خەڵکی مەككە بە چەند قیراطي.

٣٣٤.عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ بَعَثَ مُعَاذًا إِلَى الْيَمَنِ فَقَالَ: ((اتَّقِ دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ فَإِنَّهُ لَيْسَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ اللَّهِ حِجَابٌ)).

**عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (رضي الله عنهما) لە پێغەمبەری خوا دەگێڕێتەوە (ﷺ) کە موعازی کوڕی جەبەلی نارد بۆ یەمەن پێی فەرموو خۆت بپارێزە لەنزای ستەم لێکراو چونکە لەنێوان ئەو و خودا هیچ پەردەیەك نییە.**

٣٣٥.عَنْ حُصَيْنٍ عَنْ عَامِرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما قَال: سَمِعْتُ النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ يَقُولُ: أَعْطَانِي أَبِي عَطِيَّةً فَقَالَتْ عَمْرَةُ بِنْتُ رَوَاحَةَ: لَا أَرْضَى حَتَّى تُشْهِدَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَأَتَى رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: إِنِّي أَعْطَيْتُ ابْنِي مِنْ عَمْرَةَ بِنْتِ رَوَاحَةَ فَأَمَرَتْنِي أَنْ أُشْهِدَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، {ف}قَالَ {عَلَيهِ الصَّلاةُ والسَّلام}: ((أَعْطَيْتَ سَائِرَ وَلَدِكَ مِثْلَ هَذَا))؟ قَالَ: لا، قَالَ: ((فَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْدِلُوا بَيْنَ أَوْلَادِكُمْ))، قَالَ: فَرَجَعَ فَرَدَّ عَطِيَّتَهُ.

**لە حوصەین لە عامیر (رضي الله عنهما) دەفەرموێ گوێم لە نوعمانی کوڕی بەشیر بوو (رضي الله عنه) لەسەر مینبەر ووتاری دەدا فەرمووی: باوکم بەخشیشێکی پێ بەخشیم وە عەمرەی کچی رەواحە ووتی: رازی نیم هەتا ئاگاداری پێغەمبەری خوا نەکەن، هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) ووتی من داومە بە کوڕم لە عەمرەی کچی رەواحە وە ئەویش فەرمانی پێ کردوم کە تۆش ئاگاداربی وە پێغەمبەری خوا (علیه السلام) فەرموی ئایا داوتە بە هەموو کوڕەکانت ئەم بەخششە؟**

**ئەویش ووتی نەخێر، فەرموی دە لە خوا بترسێ وە دادپەروەری بکە لەنێوان منداڵەکانتان، دەڵێ گەڕایەوە بەخششەکەی لێ وەرگرتەوە.**

٣٣٦.  عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((أَحَقُّ الشُّرُوطِ أَنْ تُوفُوا بِهِ مَا اسْتَحْلَلْتُمْ بِهِ الْفُرُوجَ)).

له عوتبەی کوڕی عامیر (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (لە پێشترین مەرج کە ئەبێ بەجێ بهێندرێ، ئەو مەرجەیە کە ئافرەتی پێ حەلاڵ ئەکەن بۆ خۆتان).

## باب الشروط في الوقف، وتصرف الوُلاة، والريان للصائم

٣٣٧.  عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنْ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ أَصَابَ أَرْضًا بِخَيْبَرَ فَأَتَى النَّبِيَّ عليه الصَّلَاةُ وَالسَّلَام يَسْتَأْمِرُهُ فِيهَا، فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أَصَبْتُ أَرْضًا بِخَيْبَرَ لَمْ أُصِبْ مَالًا قَطُّ أَنْفَسَ عِنْدِي مِنْهُ، فَمَا تَأْمُرُ بِهِ؟ قَالَ: ((إِنْ شِئْتَ حَبَسْتَ أَصْلَهَا وَتَصَدَّقْتَ بِهَا))، قَالَ: فَتَصَدَّقَ بِهَا عُمَرُ –أَنَّهُ لَا يُبَاعُ وَلَا يُوهَبُ وَلَا يُورَثُ، وَتَصَدَّقَ بِهَا فِي الْفُقَرَاءِ وَفِي الْقُرْبَى وَفِي الرِّقَابِ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ وَالضَّيْفِ، لَا جُنَاحَ عَلَى مَنْ وَلِيَهَا أَنْ يَأْكُلَ مِنْهَا بِالْمَعْرُوفِ وَيُطْعِمَ غَيْرَ مُتَمَوِّلٍ، فَحَدَّثْتُ بِهِ ابْنَ سِيرِينَ فَقَالَ: غَيْرَ مُتَأَثِّلٍ مَالاً.

## (بەشی/ مەرج لە وەقف کردن و سەرپەرشتی سەرداران، وە رەیان بۆ رۆژووەوان)

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) زەویەکی لە جەنگی خەیبەر دەست کەوتووبوو هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی ئەی پێغەمبەری خوا من هیچ ماڵێکم

ئەوەندەی پارچە زەوییەکەی خەیبەر لەلام بەنرخ تر نییە تۆ چ فەرمانێکم پێ دەکەی دەربارەی ئەو زەوییە پێغەمبەر فەرموی ئەگەر حەز دەکەی ئەصلەکەی وەقف بکە و بەرهەمەکەی بکە بە خێر، عومەریش کردی بە وەقف کە نەفرۆشێت وە نەبەخشرێت وە بە میرات نەگیرێت و بەروبوومەکەی کرد بە خێر و دابەشی کرد بەسەر هەژاران و خزمەکانی هەروەها بۆ ئازادکرنی بەندە لە رێگای خودا و بۆ سەر رێبوارانی بەجێ ماو و میوانەوە وە گوناه نییە لەسەر ئەو کەسەی کە سەرپەرشتی دەکات لێ بخوات بە مەرجێ نەیکەن بە موڵکی خۆیان.

## باب اليَمين الفاجرة

٣٣٨. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مَسعود رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَال: ((مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ يَقْتَطِعُ بِهَا مَالَ امْرِئٍ مُسْلِمٍ هُوَ عَلَيْهَا فَاجِرٌ لَقِيَ اللَّهَ وَهُوَ عَلَيْهِ غَضْبَانُ)).

## (بەشی/ سوێند خواردنی بەدرۆ)

لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (رضي الله عنه) لە پێغەمبەرەوە دەگێرێتەوە (ﷺ) کە دەفەرموێ: (کەسێ سوێند بخوا بۆ ئەوەی ماڵی موسڵمانێ بەستەم بۆ خۆی دابرێ بە درۆ و بەستەم ئەوا کە دەگاتە خزمەتی خوا خوای گەورە زۆر لێی تورەیە).

## (كتاب المساقاة)

## باب إثم من منع إبن السبيل من الماء

٢٣٩. عَنْ أبي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَال: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((ثَلَاثَةٌ لَا يَنْظُرُ اللَّهُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ: رَجُلٌ كَانَ لَهُ فَضْلُ مَاءٍ بِالطَّرِيقِ فَمَنَعَهُ مِنْ ابْنِ السَّبِيلِ وَرَجُلٌ بَايَعَ إِمَامًا لَا يُبَايِعُهُ إِلَّا لِدُنْيَا فَإِنْ أَعْطَاهُ مِنْهَا رَضِيَ وَإِنْ لَمْ يُعْطِهِ مِنْهَا سَخِطَ، وَرَجُلٌ أَقَامَ سِلْعَتَهُ بَعْدَ الْعَصْرِ، فَقَالَ وَاللَّهِ الَّذِي لَا إِلَهَ غَيْرُهُ لَقَدْ أَعْطَيْتُ بِهَا كَذَا وَكَذَا، فَصَدَّقَهُ رَجُلٌ، ثُمَّ قَرَأَ ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَـٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا ﴾ الآية.

## (نامەی باخەوانی)

## (بەشی/ گوناهی کەسێ قەدەغەی ئاو بکات لە خەڵکی)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) فەرموی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی لە رۆژی قیامەت ئەم سێ کەسە خوای گەورە نە بە چاوی رەحمەت تەماشایان دەکات و نە لە تاوان پاکیان دەکاتەوە سەرەڕای ئەوەش سزایەکی بەسۆیان بۆ ئامادە کراوە: پیاوێ کە زیادە ئاوی هەبێ و لەسەرە رێی بێ و لە رێبواری قەدەغە بکا، پیاوێکیش پەیمان بدا بە پێشەوا و سەیری بەرژەوەندی دنیای خۆی بکات ئەگەر پێشەوا بەشی دا ئەویش بەگوێی بکا ئەگەر پێشەواکەی بەشی نەدا ئەویش ناڕازی بێ و بە گوێی نەکا، وە پیاوێکیش کە لە پاش عەسر کاتی بازار داخستن وە سوێند بخوا و بڵێ سوێندم بەو خوایەی کە جگە لە خۆی کەسی تر نییە لە پێش تۆدا ئەوەندەیان داومێ نەمداوە گەڵێ زیاتر لەتۆ، وە پیاوەکەش بڕوای پێ بکات و لێی بکڕێت بەو نرخە

درۆیەی، لە پاش ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشۡتَرُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَأَيۡمَٰنِهِمۡ ثَمَنٗا قَلِيلًا ﴾ الآية...ولهم عذاب اليم.

واتە: ئەو کەسانەی کە پەیمانی خودا و سوێندی خۆیان دەفرۆشن بە بەهایەکی کەمی دنیای دەیان گۆڕنەوە ئەوانە لە پاشەڕۆژدا بێ بەش و بارن لە هەموو خۆشیەکی قیامەت، وەخوای گەورە قسەیان لەگەڵ ناکات و بە چاوی رەحمەت تەماشایان ناکات و پاکیان نەکاتەوە وە سزای بە ئێشیان بۆ هەیە.

## باب فضل سقي الماء

٣٤٠. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((بَيْنَا رَجُلٌ يَمْشِي فَاشْتَدَّ عَلَيْهِ الْعَطَشُ فَنَزَلَ بِئْرًا فَشَرِبَ مِنْهَا ثُمَّ خَرَجَ فَإِذَا بِكَلْبٍ يَلْهَثُ يَأْكُلُ الثَّرَى مِنْ الْعَطَشِ، فَقَالَ لَقَدْ بَلَغَ هَذَا مِثْلُ الَّذِي بَلَغَ بِي، فَمَلَأَ خُفَّهُ ثُمَّ أَمْسَكَهُ بِفِيهِ، ثُمَّ رَقِيَ فَسَقَى الْكَلْبَ فَشَكَرَ اللَّهُ لَهُ فَغَفَرَ لَهُ)) قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَإِنَّ لَنَا فِي الْبَهَائِمِ أَجْرًا؟ قَالَ: فِي كُلِّ كَبِدٍ رَطْبَةٍ أَجْرٌ.

## (بەشی/ فەزلی ئاودان)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (جارێ پیاوێك لە رێگایەك دەڕۆیی تێنوێتی زۆری بۆ هێنا بیرێکی دۆزیەوە و چووە ناوی و تێر ئاوی خواردەوە کاتێ کە هاتە دەرەوە لە لێواری بیرەکە سەگێکی بینی زمانی دەرهێنا بوو لە تێنویەتی خۆڵی دەخوارد، جا پیاوەکە لەبەر خۆیەوە گوتی ئەم سەگەش وەکو من تێنویەتی جا رۆیشتە ناو بیرەکەوە و بە پێڵاوەکانی ئاوی هەڵکێشا و دای بە سەگەکە تاکو تێری

خوارد جا خوای گەورە لەسەر ئەم چاکەیە بەرامبەر بەم گیاندارە سوپاسی کرد و لێی خۆش بوو، هاوەڵان وتیان ئەی نێردراوی خوا دیارە هەر چاکەیێ لەگەڵ گیانەوەر بکرێ بە خێر و پاداشت هەیە؟ فەرموی بەڵێ وایە هەر چاکەیەێ لەگەڵ گیانداریێ بکرێ کە تەڕایی ژیانی تێدابێ خێرێکی گەورەیە).

## باب في الخيل وسقي الدواب والنّاس من الأنهار

٣٤١. وَعَنْهُ أيضاً أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((الْخَيْلُ لِرَجُلٍ أَجْرٌ وَلِرَجُلٍ سِتْرٌ وَرَجُلٍ وِزْرٌ، فَأَمَّا الَّذِي لَهُ أَجْرٌ فَرَجُلٌ رَبَطَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَأَطَالَ بِهَا فِي مَرْجٍ أَوْ رَوْضَةٍ، فَمَا أَصَابَتْ فِي طِيَلِهَا ذَلِكَ مِنْ الْمَرْجِ أَوْ الرَّوْضَةِ، كَانَتْ لَهُ حَسَنَاتٍ، وَلَوْ أَنَّهُ انْقَطَعَ طِيَلُهَا فَاسْتَنَّتْ شَرَفًا أَوْ شَرَفَيْنِ كَانَتْ آثَارُهَا وَأَرْوَاثُهَا حَسَنَاتٍ لَهُ، وَلَوْ أَنَّهَا مَرَّتْ بِنَهَرٍ فَشَرِبَتْ مِنْهُ وَلَمْ يُرِدْ أَنْ يَسْقِيَ كَانَ ذَلِكَ حَسَنَاتٍ لَهُ فَهِيَ لِذَلِكَ أَجْرٌ. وَرَجُلٌ رَبَطَهَا تَغَنِّيًا وَتَعَفُّفًا ثُمَّ لَمْ يَنْسَ حَقَّ اللَّهِ فِي رِقَابِهَا وَلَا ظُهُورِهَا فَهِيَ لِذَلِكَ سِتْرٌ. وَرَجُلٌ رَبَطَهَا فَخْرًا وَرِيَاءً وَنِوَاءً لِأَهْلِ الْإِسْلَامِ فَهِيَ عَلَى ذَلِكَ وِزْرٌ)).

## (بەشی/ ئەسپ و تێر ئاوکردنی گیانەوەران و خەڵکانیش لە ئاوی روباردا)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی ئەسپ و وڵاخەبەرزە بۆ هەندێ کەس ئەجر و پاداشتە و بۆ هەندێ کەس پەردە و داپۆشەری عەیب و حالیەتی وە بۆ هەندێ کەس مایەی شەروتاوانە، بۆهەندێکی مایە ئەجر و پاداشە کە رایدەگرێ، بۆ غەزاکردن و جیهاد لە رێگای خودا لەمێرگێکدا یان لە مێرغوزارێکدا بە گوریسێ دەیبەستیتەوە ئیتر

ئەو ولاخە هەرچی بخوات لەو مێرگە و هەر چەند بلەوەڕێ یان بە ژمارەی تەرس و میزەکەی و یان گوریسەکەی بپسێنێ و سەری دووسەر غار غارێن بکات و یان یاری بکات و بە وانە هەمووی خوا خێر پاداشت بۆ خاوەنەکەی دەنوسێ یان وە خوا بە ژمارەی شوێن سم و تەرس و میزەکەی و ئەو ئاوانەی کە دەیخواتەوە خوا خێر و چاکە بۆ خاوەنەکەی دەنوسێ.

وە ئەوەی رایدەگرێ بۆ ئەوەی لە خەڵکی بێ نیاز بێ و کاروکاسبی پێ بکات وە ئەو مافەی خودا داویەتی ئەوا بۆ ئەو پەردەو داپۆشەرە، وە بۆ ئەو کەسەش مایەی تاوان و شەڕە کە کەسێ رایدەگرێ بۆ چاو و شانازی و فەخر و ریابازی بەسەر گەڵی ئیسلامدا ئەمە بۆ ئەو مایەی شەڕ و خراپەیە.

## (كتاب الاستقراض)

## باب منْ أخذَ أموال النّاس يريد أداءها، وَمنْ أخذها يريد إتلافها

٣٤٢.وَعَنْهُ أيضاً رَضي الله عَنْهُ عَنْ النَّبيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِه وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَال: ((مَنْ أَخَذَ أَمْوَالَ النَّاسِ يُرِيدُ أَدَاءَهَا أَدَّى اللَّهُ عَنْهُ، وَمَنْ أَخَذَ يُرِيدُ إِتْلَافَهَا أَتْلَفَهُ اللَّهُ)).

## (نامەی قەرز وەرگرتنەوە (قەرزکردن)

## (بەشی/ کەسێ ماڵی خەڵك وەردەگرێ بیەوێ بیداتەوە و ئەو کەسەی بیەوێ تەفر و تونای بکات)

لە ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە پێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرموێ کەسێ ماڵی خەڵکی وەرگرت بە قەرز و ویستی بیداتەوە خوای گەورە یارمەتی دەدات بۆ دانەوەی، وەکەسێ وەریگرت و نیەتی نەدانەوەی هەبوو خوای گەورە ماڵەکەی تەفر و تونا دەکات.

## باب اللقطة

٣٤٣.عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ فَسَأَلَهُ عَنْ اللُّقَطَةِ فَقَالَ: ((اعْرِفْ عِفَاصَهَا وَوِكَاءَهَا ثُمَّ عَرِّفْهَا سَنَةً فَإِنْ جَاءَ صَاحِبُهَا وَإِلَّا فَشَأْنَكَ بِهَا)).

## (بەشی/ دۆزراوە (اللقطة) )

**لە زەیدی کوڕی خالید (رضي الله عنه) دەفەرموێ پیاوێ هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) پرسیاری دەربارەی شتی بزربوو کرد ئەویش فەرموی: (تورەگەکە و پەتەکەی و ژمارەکەی بناسە و باش سەیری بکە لە پاشان بۆ ماوەی ساڵێك بانگەوازی بۆ بکە ئەگەر دوای ئەو ساڵەش خاوەنی هەبوو بیدەرەوە ئەگەر نەبوو بۆ خۆتە چی لێ دەکەی).**

٣٤٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَ لِرَجُلٍ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَعلى آلِهِ وَسَلَّمَ سِنٌّ مِنْ الْإِبِلِ فَجَاءَهُ يَتَقَاضَاهُ، فَقَالَ (ﷺ): ((أَعْطُوهُ)) فَطَلَبُوا سِنَّهُ فَلَمْ يَجِدُوا لَهُ إِلَّا سِنًّا فَوْقَهَا، فَقَالَ: ((أَعْطُوهُ))، فَقَالَ: أَوْفَيْتَنِي وَفَى اللّٰهُ بِكَ، قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَعلى آلِهِ وَسَلَّمَ: ((إِنَّ خِيَارَكُمْ أَحْسَنُكُمْ قَضَاءً)).

**ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پیاوێ قەرزی لەسەر پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) کە ووشترێك بوو هاتە خزمەتی و داوای قەرزی کرد و بە توندی قسەی کرد لە خزمەتیا ئەویش فەرموی بیدەنەوە وشترێکی وەك ووشترەکەی خۆی هاوەڵان ووتیان ئەی پێغەمبەر ئەوە لە ووشترەکەی خۆی چاکترە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی بیدەنێ چونکە چاکترینی ئێوە ئەو کەسەیە چاکتر قەرز بداتەوە.**

## باب من إستعاذ بالله من الدّيْن

٣٤٥. عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهَا قالَت: كانَ رَسُولُ اللّٰهِ (ﷺ) يَدْعُو فِي الصَّلَاة: ((اللّٰهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ الْمَأْثَمِ وَالْمَغْرَمِ فَقَالَ لَهُ قَائِلٌ: مَا أَكْثَرَ مَا تَسْتَعِيذُ يَا رَسُولَ اللّٰهِ مِنْ الْمَغْرَمِ؟ قَالَ: ((إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا غَرِمَ حَدَّثَ فَكَذَبَ وَوَعَدَ فَأَخْلَفَ)).

## (بەشی/ کەسێ خۆپەنا بدات بە خوا لە قەرزاری)

عائیشە خان (رضي الله عنها) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەناو نوێژ ئەم نزایەی دەکرد: (اللّٰهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ الْمَأْثَمِ وَالْمَغْرَمِ) واتە: خوایە خۆم پەنا دەدەم بە تۆ لە تاوان و قەرزاری وە لە و کاتەدا یەکێك ووتی ئەوە بۆ ئەوەندە پەنا دەگری لە قەرزاری ئەی نێرراوی خوا؟ پێغەمبەریش فەرموی پیاو ئەگەر کەوتە ژێر باری قەرز و قوڵەوە قسەی دەکات درۆی لەگەڵ دەکات وە بەڵێن و پەیمان دەدات و نا یگەیەنێتە سەر.

٣٤٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ عَنْ رَسُول الله (ﷺ) قَال: ((مَنْ تَرَكَ مَالًا فَلِوَرَثَتِهِ، وَمَنْ تَرَكَ كَلًّا فَإِلَيْنَا)).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لە پێغەمبەر (ﷺ) دەگێرێتەوە کە دەفەرموێ کەسێ ماڵ و سامانی لە پاش بەجێ ما دەبێت بە میرات بۆ میراتگرانی وە ئەگەر قەرزی لەسەر بوو ئەوە لەسەر ئێمەیە بۆ بدەینەوە.

٣٤٧. وَعَنْهُ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَال: ((مَا مِنْ مُؤْمِنٍ إِلَّا وَأَنَا أَوْلَى بِهِ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ، اقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ ﴿ٱلنَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ﴾

فَأَيُّمَا مُؤْمِنٍ مَاتَ وَتَرَكَ مَالًا فَلْيَرِثْهُ عَصَبَتُهُ مَنْ كَانُوا، وَمَنْ تَرَكَ دَيْنًا أَوْ ضَيَاعًا فَلْيَأْتِنِي فَأَنَا مَوْلَاهُ)).

**له ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (من نزیکترم لە موسڵمان لە دونیا و دوا ڕۆژ لە خۆیان وە ئەگەر حەز دەکەن ئەم ئایەتە بخوێننەوە:﴿ ٱلنَّبِيُّ أَوۡلَىٰ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ مِنۡ أَنفُسِهِمۡ ﴾ واتە: پێغەمبەر لە پێشترە لە موسڵمان لە خۆیان وە جا ئەگەر موسڵمانێ مرد و ماڵی لە پاش بەجێ ما با کەس و کاری ماڵ و سامانی بەمیرات ببەن، بەڵام ئەگەر قەرزی لەسەر بوو قەرزەکەی لەسەر من، من بۆی دەدەمەوە وەکەسێ مردوو منالی ووردی لەپاش بەجێ ما با بێن بۆ لای من بەخێویان دەکەم.)**

## باب ما ينهى عن إضاعة المال

٣٤٨.عَنْ الْمُغِيرَةِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَال: قَالَ رَسُول اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((إِنَّ اللَّهَ حَرَّمَ عَلَيْكُمْ عُقُوقَ الْأُمَّهَاتِ وَوَأْدَ الْبَنَاتِ وَمَنَعَ وَهَاتِ، وَكَرِهَ لَكُمْ قِيلَ وَقَالَ وَكَثْرَةَ السُّؤَالِ وَإِضَاعَةَ الْمَالِ)).

## (بەشی/ نەهی کردن لە ماڵ بەزایەدان)

**موغیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ خوای گەورە حەرام و قەدەغەی کردوە لەسەرتان لە شکاندنی دڵی دایك و باوك و وە زیندە بە چاڵ کردنی کچان وە قەدەغەکردنی ماف لەسەرتان وە خوای گەورە پێی ناخۆشە بۆ ئێوە لە ووشەی ووتیانو گوتیان دەیانگوت، زۆر پرسیار کردن و سوال کردن و ماڵ بەزایەدان.**

٣٤٩. وَعَنْ ابْن عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَجُلٌ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: إِنِّي أُخْدَعُ فِي الْبُيُوعِ، فَقَالَ: ((إِذَا بَايَعْتَ فَقُلْ لَا خِلَابَةَ فَكَانَ الرَّجُلُ يَقُولُهُ)).

له عەبدوڵلای کوڕی عومەر (رضي الله عنه) دەفەرموێ پیاوێ بە پێغەمبەری ووت (ﷺ) کە لە سەودا و مامەڵەدا دەخەڵەتێ، پێغەمبەری خوا فەرمووی ئەگەر سەودا و مامەڵە دەکەی بڵێ بێ فروفێڵ و قوڵبڕین.

## باب قصاص المظالم

٣٥٠. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((إِذَا خَلَصَ الْمُؤْمِنُونَ مِنْ النَّارِ حُبِسُوا بِقَنْطَرَةٍ بَيْنَ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ فَيَتَقَاصُّونَ أو يَتَقَاضَوْنَ مَظَالِمَ كَانَتْ بَيْنَهُمْ فِي الدُّنْيَا. حَتَّى إِذَا نُقُّوا وَهُذِّبُوا أُذِنَ لَهُمْ بِدُخُولِ الْجَنَّةِ، فَوَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ (ﷺ) بِيَدِهِ لَأَحَدُهُمْ بِمَسْكَنِهِ فِي الْجَنَّةِ أَدَلُّ بِمَنْزِلِهِ كَانَ فِي الدُّنْيَا)).

## (بەشی/ تۆڵەکردن لە ستەمکار)

ئەبو سەعیدی خودری (رضي الله عنه)لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێ: (ئیمانداران کاتێ رزگاریان دەبێ لە چنگی ئاگری دۆزەخ لەسەر پردێ لە نێوان ئاگر و بەهەشت رادەگیرێن هەتاکو تۆڵەی ئەو ناهەقیانەی لە دونیادا لە یەکتریان کردوە لێیان ئەسەنرێ هەتا بە تەواوی پاك دەبنەوە هەقی کەس لەسەر کەس نامێنێ ئەوجا رێگەیان پێ دەدرێ بۆ ناو بەهەشت و دەسا بەو کەسەی گیانی موحەمەد (ﷺ)ی بەدەستە یەك بەیەکیان لە ماڵەکانی دونیایان باشتر و شارەزاتری ماڵەکانی خۆیانن لەناو بەهەشتدا وەکە ئەمە یەکەم جاریانە کە دەچنە ناوی.

٣٥١. عَنْ صَفْوَانَ بْنِ مُحْرِزٍ الْمَازِنِيِّ قَالَ: بَيْنَمَا أَنَا أَمْشِي مَعَ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا آخِذٌ بِيَدِهِ إِذْ عَرَضَ رَجُلٌ فَقَالَ: كَيْفَ سَمِعْتَ رَسُولَ اللَّهِ فِي النَّجْوَى؟ فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((إِنَّ اللَّهَ يُدْنِي الْمُؤْمِنَ فَيَضَعُ عَلَيْهِ كَنَفَهُ وَيَسْتُرُهُ، فَيَقُولُ: أَتَعْرِفُ ذَنْبَ كَذَا، أَتَعْرِفُ ذَنْبَ كَذَا؟ فَيَقُولُ: نَعَمْ، أَيْ رَبِّ، حَتَّى إِذَا قَرَّرَهُ بِذُنُوبِهِ، وَرَأَى فِي نَفْسِهِ أَنَّهُ هَلَكَ، قَالَ {تَعالى}: سَتَرْتُهَا عَلَيْكَ فِي الدُّنْيَا وَأَنَا أَغْفِرُهَا لَكَ الْيَوْمَ فَيُعْطَى كِتَابَ حَسَنَاتِهِ وَأَمَّا الْكَافِرُ وَالْمُنَافِقُ فَيَقُولُ الْأَشْهَادُ: هَؤُلَاءِ الَّذِينَ كَذَبُوا عَلَى رَبِّهِمْ، أَلَا لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ)).

له سەفوانی کوڕی میحرەزی مازنی دەفەرموێ من لەگەڵ عەبدوڵلای کوڕی عومەری دەڕۆیشتین دەستم لەناو دەستی دابوو، پیاوێ بە عەبدوڵلای کوڕی عومەری ووت چۆن گوێت لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەربارەی چرپەی قسەدا فەرمووی گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو دەیفەرموو لە ڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە نزیك دەبێتەوە لە مرۆڤی بڕواداردا بە ڕەنگێ پەنای دەدات و دەیپارێزێ وە پێی دەفەرموێ لە فلانە ڕۆژ فلانە گوناهت کرد وە لە فولانە شوێن گوناهت کرد ئەویش دەڵێ پەروەردگارم هەتا دان بە تاوانی خۆی دەنێ وە وا دادەنێ کە تیاچووە بەڵام خوای پەروەردگار دەفەرموێ من لە دونیا پەنام دای و لێم داپۆشی وە ئێستا وا لێت خۆش بووم و پەڕەی چاکەکانی پێ دەدرێت و وە بێ بڕوایانیش و دووڕووەکان لەبەر چاوی شایەتەکانی جار دەدرێ و دەڵێ (هَؤُلَاءِ الَّذِينَ كَذَبُوا عَلَى رَبِّهِمْ، أَلَا لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ) واتە: ئەوانە بوون درۆیان بەدەم خواوە دەکرد کە بزانن نەفرین و لەعنەت لەسەر ستەمکارانە.

## باب المسلم أخو المُسلِم يعاونهُ ويُواسِيه

٣٥٢.وعَنْهُ أيضاً أنَّ النَّبيَّ (ﷺ) قالَ: ((الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ لَا يَظْلِمُهُ وَلَا يُسْلِمُهُ، وَمَنْ كَانَ فِي حَاجَةِ أَخِيهِ كَانَ اللَّهُ فِي حَاجَتِهِ، وَمَنْ فَرَّجَ عَنْ مُسْلِمٍ كُرْبَةً فَرَّجَ اللَّهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرُبَاتِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِمًا سَتَرَهُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)).

## (بەشی/ موسڵمان برای موسڵمانە، یارمەتیدەر و بەدەمەوە هاتن)

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (رضي الله عنه) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: (موسڵمان برای موسڵمانە، نابێ ستەمی لێ بکات یان بیداتە دەست ناحەزانی وە کەسێ لە پێویستی برای خۆی دابێ خواش لە پێویستی ئەو دایە وە کەسێ ناخۆشییەك لەسەر موسڵمانێ لابدات خوای گەورە ناخۆشیەك لە ناخۆشیەکانی رۆژی قیامەت لەسەر ئەو لادەبات وە کەسێ عەیب و ئەنگی موسڵمانێ داپۆشێ خوای گەورەش عەیبی ئەو دادەپۆشێ).

٣٥٣.عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((انْصُرْ أَخَاكَ ظَالِمًا أَوْ مَظْلُومًا))، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَذَا نَنْصُرُهُ مَظْلُومًا فَكَيْفَ نَنْصُرُهُ ظَالِمًا؟ قَالَ: ((تَأْخُذُ فَوْقَ يَدَيْهِ)).

ئەنەس (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی یارمەتی برای خۆت بدە و سەری بخە لەسەر حەق چ ستەمکار بێت یان ستەم لێکراو بێت، هاوەڵان وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە ئەگەر ستەم لێکراو بێت بەسەری دەخەین، ئەی ئەگەر ستەمکار بێت چۆن سەری خەین؟ فەرموی دەستی بگرە و مەیەڵە ستەم بکات.

## باب الظلم ظلمات

٣٥٤.عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((الظُّلْمُ ظُلُمَاتٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)).

### (بەشی/ ستەم تاریکییە لە ڕۆژی دوایی)

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (رضي الله عنهما) لە پێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێ: (ستەم تاریکییە لە ڕۆژی دوایی).

## باب مَنْ كَانَ لَهُ مظلمة عند الرجل فحللها له

٣٥٥.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ النَّبِي (ﷺ): ((مَنْ كَانَتْ لَهُ مَظْلَمَةٌ لأَحَدٍ مِنْ عِرْضِهِ أَوْ شَيْءٍ فَلْيَتَحَلَّلْهُ مِنْهُ الْيَوْمَ قَبْلَ أَنْ لَا يَكُونَ دِينَارٌ وَلَا دِرْهَمٌ، إِنْ كَانَ لَهُ عَمَلٌ صَالِحٌ أُخِذَ مِنْهُ بِقَدْرِ مَظْلَمَتِهِ وَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ حَسَنَاتٌ أُخِذَ مِنْ سَيِّئَاتِ صَاحِبِهِ فَحُمِلَ عَلَيْهِ)).

### (بەشی/ کەسێ ستەمی لەلای پیاوێك بێت و داوای گەردەن ئازادی لێ بکات)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی کەسێ ستەمی لە کەسێك کردبێ لە ناموسی یان لە ماڵ بێت با داوای گەردەن ئازادی لێ بکات پێش ئەو ڕۆژەی کە نە دینار و دیرهەم فریای ناکەوێ و نابێ ئەگەر لە ڕۆژی دوایی کردەوەی چاکەی ببێ بە قەد ستەمەکەی لە پاداشتی کردەوەی لێ دەسێنن ئەیدەن بە خاوەنی حەق وە ئەگەر کردەوەی چاکەی نەبێ ئەوا لە گوناهی خاوەن حەق هەڵدەگرن دەخەنە سەر ئەستۆی ئەو.

## باب إثم من ظلّم شيئاً من الأرض

٣٥٦. عَنْ سَعِيد بْنَ زَيْدٍ رَضِيَ اللّٰهُ تَعالى عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبيَّ عَليهِ الصَّلاةُ وَالسَّلام يَقُولُ: ((مَنْ ظَلَمَ مِنْ الْأَرْضِ شَيْئًا طُوِّقَهُ مِنْ سَبْعِ أَرَضِينَ)).

## (بەشی/ تاوانی کەسێ ستەم بکات لەسەر زەوی)

سەعیدی کوڕی زەید (رضي الله عنهما) دەفەرموێ گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەیفەرموو: (کەسێ ستەم لە کەسێ بکات بە قەد بستێ لە زەوی تا حەوت تەبەقی زەوی ئەکرێ بە تەوقی ملی).

## باب ألدّ الخصام

٣٥٧. عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهَا عَنْ النَّبيِّ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((إِنَّ أَبْغَضَ الرِّجَالِ إِلَى اللّٰهِ الْأَلَدُّ الْخَصِمُ)).

## (بەشی/ ڕق ئەستوور شەرنگێزی)

عائیشە خان (رضي الله عنها) لە پێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێ: (لەلای خوای گەورە ڕەزاگرانترین کەس ئەوانەن کە ڕق ئەستور و دەم درێژ بن).

٣٥٨. عَنْ زَيْنَب بِنْتَ أُمِّ سَلَمَةَ أَنَّ أُمَّهَا أُمَّ سَلَمَةَ أَخْبَرَتْهَا عَنْ النَّبيِّ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ سَمِعَ خُصُومَةً بِبَابِ حُجْرَتِهِ فَخَرَجَ إِلَيْهِمْ فَقَالَ: ((إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ وَإِنَّهُ يَأْتِينِي الْخَصْمُ فَلَعَلَّ بَعْضَكُمْ أَنْ يَكُونَ أَبْلَغَ مِنْ بَعْضٍ فَأَحْسِبُ أَنَّهُ صَدَقَ فَأَقْضِيَ لَهُ بِذَلِكَ، فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ بِحَقِّ مُسْلِمٍ فَإِنَّمَا هِيَ قِطْعَةٌ مِنَ النَّارِ فَلْيَأْخُذْهَا أَوْ فَلْيَتْرُكْهَا)).

له زەینەبی کچی ئوم سەلەمە کە دایکی ئوم سەلەمە دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر (ﷺ) کە گوێی لە شەڕە قسەیەك بوو لەبەردەم ماڵەکەی وە بۆیان هاتە دەرەوە فەرمووی منیش هەر ئادەمیزدام وەك ئێوە، غەیب زان نیم لەبەر ئەوە بەپێی قسەی ئێوە بڕیار دەدەم وە زۆرجاران ڕێ دەکەوێ یەکێکتان لە ئەوی تریان دەم درێژ و قسە زانترە منیش وا دەزانم کە ڕاست دەکات وە لەم ڕووەوە بڕیاری بۆ دەدەم وە هەقەکەی بۆ دادەنێم جا ئەگەر کەسێ لەسەر قسەکانی ناڕەوای خۆی، من شتێ بۆی بڕیار بدەم ئەوە با وەری نەگرێ چونکە ئەگەر وەریگرێ بەشێ لە ئاگری دۆزەخی وەرگرتووە با وازی لێ بهێنێ و وەری نەگرێ.

٣٥٩.عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((أَرْبَعٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ كَانَ مُنَافِقًا –أَوْ مَنْ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنَ النِّفَاقِ حَتَّى يَدَعَهَا– إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ وَإِذَا عَاهَدَ غَدَرَ وَإِذَا خَاصَمَ فَجَرَ)).

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (رضي الله عنهما) لە پێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێ: (چوار سیفەت هەن کەسێ لێی بێتەجێ یان سیفەتێك لەو سیفەتانەی هەبێ ئەوە مونافیق و دووڕووە هەتا وازدێنێ ئەوانیش: ئەگەر قسەی کرد درۆی کرد وە ئەگەر پەیمان و بەڵێنی دا نەیباتە سەر وە ئەگەر پەیمانی دا ستەمی لێ کرد وە ئەگەر دەمەقاڵێ کرد تاوانی زیاتری ئەنجام دا).

## باب قصاص من المظلوم

٣٦٠. عَنْ أَبِي الْخَيْرِ عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: قُلْنَا لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: إِنَّكَ تَبْعَثُنَا فَنَنْزِلُ بِقَوْمٍ لَا يَقْرُونَا فَمَا تَرَى فِيهِ؟ فَقَالَ لَنَا: ((إِنْ نَزَلْتُمْ بِقَوْمٍ فَأُمِرَ لَكُمْ بِمَا يَنْبَغِي لِلضَّيْفِ فَاقْبَلُوا، فَإِنْ لَمْ يَفْعَلُوا فَخُذُوا مِنْهُمْ حَقَّ الضَّيْفِ)).

## (بەشی/ تۆڵەی ستەم لێكراو)

لە ئەبی خەیر لە عوقبەی كوڕی عامر دەفەرموێ ووتمان بە پێغەمبەر (ﷺ) تۆ ئێمە دەنێری بۆ ناو هەندێ گوند و دێهات وە ئەوانیش میوانداریمان ناكەن و خواردنمان پێ نادەن ئایا چی بكەین؟ ئەویش فەرموی ئەگەر بەلای گوندێكا دابەزین و فەرمانیان پێ بكەن كە چ بۆ میوان ئامادە دەكەن ئەوەش بۆ ئێوە بكەن ئەگەر رازی بوون‌و وە ئەگەر نەیان كرد ئەوا بە قەدەر مافی میوانداری خواردنیان لێ بسەنن.

## باب لايمنع جار جارهُ

٣٦١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((لَا يَمْنَعْ جَارٌ جَارَهُ أَنْ يَغْرِزَ خَشَبَهُ فِي جِدَارِهِ)).

## (بەشی/ كەسێ بۆ دراوسێیەكەی قەدەغە نەكات)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (با هیچ دراوسێیەك لە دراوسێیەكەی خۆی قەدەغە نەكات كە دەستەك یان گوێسەوانە لەسەر دیواری ئەو قایم بكات).

## باب الجلوس في أفنية الدور على الصعدات

٣٦٢. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((إِيَّاكُمْ وَالْجُلُوسَ عَلَى الطُّرُقَاتِ))، فَقَالُوا: مَا لَنَا بُدٌّ إِنَّمَا هِيَ مَجَالِسُنَا نَتَحَدَّثُ فِيهَا قَالَ: ((فَإِذَا أَبَيْتُمْ إِلَّا الْمَجَالِسَ فَأَعْطُوا الطَّرِيقَ حَقَّهَا))، قَالُوا: وَمَا حَقُّ الطَّرِيقِ ؟قَالَ: ((غَضُّ الْبَصَرِ، وَكَفُّ الْأَذَى، وَرَدُّ السَّلَامِ، وَأَمْرٌ بِالْمَعْرُوفِ وَنَهْيٌ عَنْ الْمُنْكَرِ))

### (بەشی/ دانیشتن لەسەر ڕێگای خەڵکی و بن دیواری خانوو)

ئەبی سەعیدی خودری (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر دەفەرموێ: (نەکەن لەسەر ڕێگاویان دانیشن، هاوەڵان ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چارمان نییە کە دەبێ لێی دانیبیشین ئەوێ نەبێ فەرموی: کەوایە دەبێ مافی ڕێگاویان بدەن، گوتیان مافی ڕێگاویان چییە؟ فەرموی چاوتان پارێزراو بکەن لە ئاست تەماشاکردنی خەڵکی و ئازاری خەڵك مەدەن، وە وەڵامی سڵاوی خەڵکی بدەنەوە و فەرمان بە چاکە بکەن و قەدەغەی خراپە بکەن).

## باب أخذ ما يؤذي في الطريق وإزالته، وإماطة الأذى

٣٦٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: ((بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي بِطَرِيقٍ وَجَدَ غُصْنَ شَوْكٍ فَأَخَذَهُ فَشَكَرَ اللَّهُ لَهُ فَغَفَرَ لَهُ)).

### (بەشی/ کەسێ شتی بە ئازار لەسەر ڕێگای خەڵکی لابدات)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لە پێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: (پێش ئێوە پیاوێ بە ڕێگایەکدا دەڕۆیشت و چاوی بە لقە دارێك کەوت لەسەر ڕێگای خەڵکی لایبرد و دووری خستەوە خوای گەورەش سوپاسی کرد و لێی خۆش بوو).

## باب النهب بغير إذن صاحبة

٣٦٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((لَا يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَسْرِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَنْتَهِبُ نُهْبَةً يَرْفَعُ النَّاسُ فِيهَا أَبْصَارَهُمْ حِينَ يَنْتَهِبُهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ)).

## (بەشی/ تالاَن بردن و برۆ کردن بەبێ مۆڵەتی خاوەنی)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (کەسێ کە داوین پیسی ئەنجام دا لەو کاتە هیچ ئیمان و بڕوای لە لەشیدا نامێنێ وە کەسێ دزی بکات لەوکاتەدا هیچ بڕوای لە دڵی نامێنێت. وە کەسێ تالاَن و برۆ لە ماڵی خەڵکی دەکات کە ئاگایان لێ نەبێت و بیخوات لەو کاتەدا هیچ ئیمان و بڕوای لە دڵیدا نامێنێت).

## باب كسر الصليب وقتل الخنزير

٣٦٥. وَعَنْهُ أيضاً أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) يَقول: ((لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَنْزِلَ فِيكُمْ ابْنُ مَرْيَمَ حَكَمًا مُقْسِطًا، فَيَكْسِرَ الصَّلِيبَ وَيَقْتُلَ الْخِنْزِيرَ وَيَضَعَ الْجِزْيَةَ وَيَفِيضَ الْمَالُ حَتَّى لَا يَقْبَلَهُ أَحَدٌ)).

## (بەشی شکاندنی خاچ و کوشتنی بەراز)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە گوێی لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەیفەرمو: (قیامەت هەڵناستێ هەتا عیسای کوڕی مریەم (علیه السلام) دادەبەزێتە سەر زەوی و فەرمان بەدادپەروەری دەکات وە خاچ دەشکێنێ و بەرازیش دەکوژێ و جیزیە و سەرانە هەڵدەگرێ و ماڵ و سامانیش ئەوەندە زۆر دەبێت کە کەس وەری ناگرێ).

## باب من قاتل دون مالهِ

٣٦٦. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ عليهِ الصَّلاةُ والسَّلام يَقُولُ: ((مَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ)).

## (بەشی/ کەسێ لەسەر ماڵ و سامانی خۆی بکوژرێ)

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنهما) دەفەرموێ گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بوو دەیفەرموو: (کەسێ بکوژرێ لەسەر ماڵ و سامانی بە ناهەقی ئەوە شەهیدە).

## باب الخطأ والنسيان والعمل بالنية

٣٦٧. قالَ رَسُولُ اللهِ صلى الله عليه وآلهِ وسلم: ((لِكُلِّ امْرِئٍ مَانَوَى، وَلا نِيَّةَ لِلْمُخْطِىءِ وَالنَّاسِي)).

## (بەشی/ هەڵە و لەبیرچوون و کردوە بە نیەتە)

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (هەموو کەسێك بە پاداشتی نیاز و نیەتی خۆی دەگا و وە نیەت بۆ کەسێ نییە کە هەڵە بیکا، وەلەبیری بچێ)

٣٦٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسول الله (ﷺ): ((إِنَّ اللَّهَ تَجَاوَزَ لِي عَنْ أُمَّتِي مَا وَسْوَسَتْ بِهِ صُدُورُهَا، مَا لَمْ تَعْمَلْ أَوْ تَكَلَّمْ)).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی خوای گەورە ناتان گرێ بە خەتەرە و خەیاڵی و وەسوەسەی ناو دڵتان بەڵکو بە کردەوە و قسە پێکردنی تاوانبار دەبن.

٣٦٩. عَنْ عُمَر بْنِ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّةِ وَلِامْرِئٍ مَا نَوَى، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى اللهِ وَرَسُولِهِ فَهِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ

وَرَسُولِهِ، وَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إلى دُنْيَا يُصِيبُهَا أَوْ امْرَأَةٍ يَتَزَوَّجُهَا فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ)).

لەعومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) لە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (هەموو کار و کردەوەیەك بەپێی نیاز و نیەتی خاوەنەکەیەتی، بۆ هەموو کەسێکیش بەپێی نیاز و نیەتی خۆی پاداشت دەکرێتەوە وە کەسێ مەبەستی لە کۆچکردنەکەی لە مەککەوە بۆ مەدینە بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی بێت ئەوا کۆچەکەی بۆ خوا و پێغەمبەرەوەو لێی وەردەگیرێ وە کەسێ کۆچکردنەکەی بۆ دونیا و ماڵ و سەروەت و سامان و ژنخوازی بێت ئەوا کۆچکردنەکەی بەپێی نیازی خۆییەتی).

## باب إذا أتى أحدكم خادمه بطعام

٣٧٠.عَنْ أبي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قال: ((إِذَا أَتَى أَحَدَكُمْ خَادِمُهُ بِطَعَامِهِ فَإِنْ لَمْ يُجْلِسْهُ مَعَهُ فَلْيُنَاوِلْهُ لُقْمَةً أَوْ لُقْمَتَيْنِ أَوْ أُكْلَةً أَوْ أُكْلَتَيْنِ فَإِنَّهُ وَلِيَ عِلَاجَهُ)).

## (بەشی/ ئەگەر نۆکەری یەکێکتان خواردنی بۆهێنان با پاروێ یان زیاتر لە گەڵتان بخوات)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی ئەگەر نوکەر و غولامتان خواردنی بۆ هێنان ئەوا با لەگەڵتان دانیشێ و بخوات ئەگینا با پاروێ یان دوو پاروو پێی بدەن چونکە ئەمە بۆ ئەو باشترە.

## باب إذا ضرب أحَدُكُمْ خادمهُ فليجتنب الوجه

٣٧١.وَعَنْهُ أيضاً عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَال: ((إِذَا قَاتَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَجْتَنِبْ الْوَجْهَ)).

## (بەشی/ ئەگەر یەکێکتان لە خادیمەکە یان نۆکەری خۆی دا با لەلای دەم و چاوی نەدات)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لە پێغەمبەر (ﷺ) دەگێرێتەوە کە دەفەرموێ: (ئەگەر یەکێکتان دەمەقاڵێ لەگەڵ نۆکەری خۆی کرد با خۆی بپارێزێ لە لێدانی لە دەم و چاوی).

## (كتاب الهبة)

## باب الهبة، وفضلها والتحريض عليها

٣٧٢. وَعَنْهُ أيضاً عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((يَا نِسَاءَ الْمُسْلِمَاتِ لَا تَحْقِرَنَّ جَارَةٌ لِجَارَتِهَا وَلَوْ فِرْسِنَ شَاةٍ)).

## (نامەی پێدان (بەخشین) (الهبة))

## (بەشی/ بەخشین و پێدان و هاندان بۆی)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لە پێغەمبەر (ﷺ) دەگێرێتەوە کە دەفەرموێ: (ئەی ئافرەتانی موسڵمان دیاری و بەخشین بۆ دراوسێیەکانتان ببەن و بە کەمی مەزانن وە ئەگەر بە قەد سمی مەڕێکیش بێت).

## باب النهي عن الرجوع في الهبة

٣٧٣. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أنَّه قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): ((لَيْسَ لَنَا مَثَلُ السَّوْءِ العَائِدُ فِي هِبَتِهِ كَالْكَلْبِ يَقِيءُ ثُمَّ يَعُودُ فِي قَيْئِهِ)).

## (بەشی/ نەهی کردن لە پەشیمانبوونەوەی بەخشین)

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (رضي الله عنهما) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (رەفتاری ناشیرین لە ئێمەوە دوورە، وە ئەو کەسەی شتێ بدات بە یەکێك دوایی لێی بسەنێتەوە وەك ئەوە وایە کە سەگ سەرلەنوێ رشانەوەی خۆی بخواتەوە).

## باب الشركة في الأرضين وغيرها

٣٧٤.عَنْ جَابِرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما قال: إِنَّمَا جَعَلَ النَّبي (ﷺ) الشُّفْعَةَ فِي كُلِّ مَا لَمْ يُقْسَمْ، فَإِذَا وَقَعَتْ الْحُدُودُ وَصُرِّفَتْ الطُّرُقُ فَلَا شُفْعَةَ)).

## (بەشی/ هاوبەشی (الشراكە) لەزەوییەکاندا)

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (رضي الله عنهما) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) هەڵگرتنەوەی (شوفعە)ی داناوە لەسەر هەموو ئەو شتەی کە هاوبەشییانەی کە بەش نەکرابوون، چ خانوبێت یان زەوی بێت یان باخ یان بێستان، جا ئەگەر سنوریان لە نێوان دانا و رێگایان لێ دروست کرد لەناودا ئەوە هەڵگرتنەوەی (شوفعەی) لەسەر نامێنێ.

(بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی بابەتی (شوفعە) سەیری (فقه السنه) بکە).

## باب هبة المرأة لغَير زوجها

٣٧٥. عَنْ أَسْمَاءَ بنت أبي بكر رَضِيَ اللهُ عَنها أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((أَنْفِقِي وَلَا تُحْصِي فَيُحْصِيَ اللَّهُ عَلَيْكِ، وَلَا تُوعِي فَيُوعِيَ اللَّهُ عَلَيْكِ)).

## (بەشی/ بەخشینی ئافرەت بۆ جگە لە مێردی)

ئەسمای کچی ئەبو بەکر (رضي الله عنهما) لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێ: ماڵو سامان ببەخشە و ژماردنی مەکە، چونکە ئەگەر ژماردت خواش بە ژماردن لەسەرت دەنوسێ وە تورەگەکەت یان هەمبانەکەت دامەخە و بۆ ئەوەی خوا خێر و فەزل لەسەرت دانەخات).

## باب قول الحَق

٢٧٦. قَالَ (ﷺ): ((إِنَّ لِصَاحِبِ الْحَقِّ مَقَالًا وَأَفْضَلُكُمْ أَحْسَنُكُمْ قَضَاءً)).

## (بەشی/ ووتەی حەق و راستی)

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (با خاوەن مافەکە قسەی خۆی بکات، و چاکترین کەس ئەو کەسەیە کە جوانترین دادوەر بێت).

## باب لايشَهْدُ المُؤمِنُ علَى جور إذا شَهِدَ

٢٧٧. عَنْ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: سَأَلَتْ أُمِّي أَبِي بَعْضَ الْمَوْهِبَةِ لِي مِنْ مَالِهِ، ثُمَّ بَدَا لَهُ فَوَهَبَهَا لِي، فَقَالَتْ: لَا أَرْضَى حَتَّى تُشْهِدَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآله وَسَلَّمَ فَأَخَذَ بِيَدِي وَأَنَا غُلَامٌ فَأَتَى بِيَ النَّبِيَّ عليه الصَّلَاةُ والسَّلام فَقَالَ: إِنَّ أُمَّهُ بِنْتَ رَوَاحَةَ سَأَلَتْنِي بَعْضَ الْمَوْهِبَةِ لِهَذَا، قَالَ: ((أَلَكَ وَلَدٌ سِوَاهُ))؟ قَالَ: نَعَمْ، فَأُرَاهُ قَالَ: ((لَا تُشْهِدْنِي عَلَى جَوْرٍ)). وَقَالَ أَبُو حَرِيزٍ عَنْ الشَّعْبِيِّ: لَا أَشْهَدُ عَلَى جَوْرٍ.

## (بەشی/ ئیماندار لەسەر ستەم شاهێدی نادات)

نوعمانی کوڕی بەشیر (رضي الله عنهما) دەفەرموێ: داوام لە دایکی باوکم کرد بۆ بەخشین وە هەندێك لە ماڵەکەی پێدام و دایکم ووتی رازی نابم تاکو بە

ئاگاداری پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەبێت ئینجا دەستی گرتم و بردمی بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی دایکی کچی رەواحە داوای بەخششی لێم کردوە پێغەمبەر فەرموی ئایا منالی ترت هەیە جگە لەمە؟ فەرموی بەڵێ. پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی کەسێکی تر بکە بە شاهێد من شاهێدی نادەم لەسەر جەور و ستەم.

وە ئەبو حەریز لە شەعبی گێڕاوەتەوە: (من نابم بە شاهێد لەسەر جەور و ستەم).

٣٧٨. عَنْ عِمْرَانَ بْنَ حُصَيْنٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسول الله (ﷺ): ((خَيْرُكُمْ قَرْنِي ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ)) ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ. قَالَ عِمْرَانُ: لَا أَدْرِي أَذَكَرَ النَّبِيُّ (ﷺ) بَعْدُ قَرْنَيْنِ أَوْ ثَلَاثَةً قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): ((إِنَّ بَعْدَكُمْ قَوْمًا يَخُونُونَ وَلَا يُؤْتَمَنُونَ وَيَشْهَدُونَ وَلَا يُسْتَشْهَدُونَ وَيَنْذِرُونَ وَلَا يَفُونَ وَيَظْهَرُ فِيهِمْ السِّمَنُ))

عمرانی کوڕی حوصەین (رضي الله عنهما) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی چاکترین چەرخ و کات چەرخی منە لە پاشان ئەوانەی لەدوای منەوە دێن، وە ئەوانەیە لە دوای ئەوانەوە دێن، وە عیمران ووتی نازانم تا پێغەمبەری خوا لەپاش چەرخی خۆی باسی دوو چەرخی کردیان سێ، پێغەمبەر فەرموی لە پاش ئێوە گەلێ پەیدا دەبن ناپاکی دەکەن و بە ئەمیندار دادەنرێ وە شاهێدی دەدەن جێگای شایەتی دان نین وە بە شاهید ناچن لەبەر بێ دینی، وە نەزر دەکەن و جێبەجێی ناکەن وە پیاوی زلّ و قەڵەو لەناویاندا پەیدا دەبن.

## باب شهادة الزور، ولاكذب في الإصلاح

٣٧٩. عَنْ أَنَسٍ بن مالِك رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: سُئِلَ رَسُول الله (ﷺ) عَنْ الْكَبَائِرِ فقَالَ: ((الْإِشْرَاكُ بِاللَّهِ وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ وَقَتْلُ النَّفْسِ وَشَهَادَةُ الزُّورِ)).

قال تعالى: ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَشۡهَدُونَ ٱلزُّورَ ﴾.

## (بەشی/ شاهیدی دان بە درۆ، بە درۆ حیساب نیە بۆ چاککردنی نێوان خەڵکی)

ئەنەس کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەفەرموێ پرسیار لە پێغەمبەر کرا دەربارەی تاوانە گەورەکان فەرموی (ﷺ) شەریك و هاوەڵ بڕیاردان بۆ خوا، و دڵی دایك و باوك ڕەنجاندن، وەکوشتنی کەسێك بەناهەق وە شاهێدی دان بە درۆ.

وە خوا دەفەرموێ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَشۡهَدُونَ ٱلزُّورَ ﴾ واتە: بڕواداران ئەو کەسانەن کە شایەتی بەدرۆ نادەن.

٣٨٠.عَنْ أُمَّ كُلْثُومٍ بِنْتَ عُقْبَةَ قالَتْ: قال النَّبيُّ (ﷺ): ((لَيْسَ الْكَذَّابُ الَّذِي يُصْلِحُ بَيْنَ النَّاسِ فَيَنْمِي خَيْرًا، أَوْ يَقُولُ خَيْرًا)).

ئوم کەلسوم کچی عوقبە دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەو کەسە بە درۆزن دانانرێ کە درۆی لە نێوان دوو کەس بکات بە مەبەستی چاکترکردنی نێوان دوو کەس).

## باب ما جاء في البَيِنة على المدعي

٣٨١.قَالَ تَعَالَى:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيۡنٍ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى فَٱكۡتُبُوهُۚ وَلۡيَكۡتُب بَّيۡنَكُمۡ كَاتِبُۢ بِٱلۡعَدۡلِۚ وَلَا يَأۡبَ كَاتِبٌ أَن يَكۡتُبَ

كَمَا عَلَّمَهُ ٱللَّهُ فَلْيَكْتُبْ وَلْيُمْلِلِ ٱلَّذِى عَلَيْهِ ٱلْحَقُّ وَلْيَتَّقِ ٱللَّهَ رَبَّهُۥ وَلَا يَبْخَسْ مِنْهُ شَيْـًٔا فَإِن كَانَ ٱلَّذِى عَلَيْهِ ٱلْحَقُّ سَفِيهًا أَوْ ضَعِيفًا أَوْ لَا يَسْتَطِيعُ أَن يُمِلَّ هُوَ فَلْيُمْلِلْ وَلِيُّهُۥ بِٱلْعَدْلِ وَٱسْتَشْهِدُوا۟ شَهِيدَيْنِ مِن رِّجَالِكُمْ فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَٱمْرَأَتَانِ مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ أَن تَضِلَّ إِحْدَىٰهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَىٰهُمَا ٱلْأُخْرَىٰ وَلَا يَأْبَ ٱلشُّهَدَآءُ إِذَا مَا دُعُوا۟ وَلَا تَسْـَٔمُوٓا۟ أَن تَكْتُبُوهُ صَغِيرًا أَوْ كَبِيرًا إِلَىٰٓ أَجَلِهِۦ ذَٰلِكُمْ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ وَأَقْوَمُ لِلشَّهَٰدَةِ وَأَدْنَىٰٓ أَلَّا تَرْتَابُوٓا۟ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً حَاضِرَةً تُدِيرُونَهَا بَيْنَكُمْ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَلَّا تَكْتُبُوهَا وَأَشْهِدُوٓا۟ إِذَا تَبَايَعْتُمْ وَلَا يُضَآرَّ كَاتِبٌ وَلَا شَهِيدٌ وَإِن تَفْعَلُوا۟ فَإِنَّهُۥ فُسُوقٌۢ بِكُمْ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱللَّهُ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴾ .

وقوله تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُونُوا۟ قَوَّٰمِينَ بِٱلْقِسْطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَوِ ٱلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ إِن يَكُنْ غَنِيًّا أَوْ فَقِيرًا فَٱللَّهُ أَوْلَىٰ بِهِمَا فَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلْهَوَىٰٓ أَن تَعْدِلُوا۟ وَإِن تَلْوُۥٓا۟ أَوْ تُعْرِضُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا﴾.

## (بەشی/ دەربارەی بەڵگە لەسەر داواکەر)

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيْنٍ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى فَٱكْتُبُوهُ وَلْيَكْتُب بَّيْنَكُمْ كَاتِبٌۢ بِٱلْعَدْلِ وَلَا يَأْبَ كَاتِبٌ أَن يَكْتُبَ كَمَا عَلَّمَهُ ٱللَّهُ فَلْيَكْتُبْ وَلْيُمْلِلِ ٱلَّذِى عَلَيْهِ ٱلْحَقُّ وَلْيَتَّقِ ٱللَّهَ رَبَّهُۥ وَلَا

يَبْخَسْ مِنْهُ شَيْئًا فَإِن كَانَ ٱلَّذِى عَلَيْهِ ٱلْحَقُّ سَفِيهًا أَوْ ضَعِيفًا أَوْ لَا يَسْتَطِيعُ أَن يُمِلَّ هُوَ فَلْيُمْلِلْ وَلِيُّهُۥ بِٱلْعَدْلِ وَٱسْتَشْهِدُوا۟ شَهِيدَيْنِ مِن رِّجَالِكُمْ فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَٱمْرَأَتَانِ مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ أَن تَضِلَّ إِحْدَىٰهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَىٰهُمَا ٱلْأُخْرَىٰ وَلَا يَأْبَ ٱلشُّهَدَآءُ إِذَا مَا دُعُوا۟ وَلَا تَسْـَٔمُوٓا۟ أَن تَكْتُبُوهُ صَغِيرًا أَوْ كَبِيرًا إِلَىٰٓ أَجَلِهِۦ ذَٰلِكُمْ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ وَأَقْوَمُ لِلشَّهَٰدَةِ وَأَدْنَىٰٓ أَلَّا تَرْتَابُوٓا۟ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً حَاضِرَةً تُدِيرُونَهَا بَيْنَكُمْ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَلَّا تَكْتُبُوهَا وَأَشْهِدُوٓا۟ إِذَا تَبَايَعْتُمْ وَلَا يُضَآرَّ كَاتِبٌ وَلَا شَهِيدٌ وَإِن تَفْعَلُوا۟ فَإِنَّهُۥ فُسُوقٌۢ بِكُمْ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱللَّهُ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴾ (سورەتی البقرة: ٢٨٢)

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر قەرزێکتان کرد لە یەکتر تا ماوەیەکی دیاریکراو، ئەوە بینوسن و با نووسەرێك کە دادپەروەر بێت بەڕاستی و دروستی لە نێوانتاندا بینوسێت، با هیچ نووسەرێك سەرپێچی نەکات لە نوسین، هەروەك چۆن خوا فێری کردووە با بنووسێت: (خۆ ئەگەر کەسێك خوێندەوار نەبێت) ئەوەی کە حەقەکەی بەسەرەوەیە و قەرزەکەی لایە بابەدەمی خۆی (ئەندازەی قەرزەکەی) بە کاتبەکە بڵێت و لە خوای پەروەردگاری بترسێت و چاوپۆشی لە هیچی نەکات و لێی کەم نەکاتەوە، خۆ ئەگەر ئەوەی قەرزەکەی لەسەرە هەڵەشە بوو، یا لاواز بوو (منداڵ یان بەساڵاچوو بوو) یا نەیدەتوانی دان بە حەقەکەدا بنێت (کەوڕلاڵ بوو) با بەخێوکەر، یا سەرپەرشتیکارەکەی دادگەرانە حەقیقەت و راستی قەرزەکەی

بلّێت و با دوو پیاو لە خۆتان شایەتی لەسەر (قەرز و مامەڵە) بگرن، ئەگەر دوو پیاو دەستنەکەوتن بۆ شایەتی، با پیاوێك یان دوو ئافرەت شایەتییەکە بدەن لەو کەسانەی کە رازین بە شایەتیدانیان، نەوەکو یەکێك لە (ئافرەتەکان) بیری بچێت، با ئەوی تریان بیری بهێنێتەوە و شایەتەکان نابێت کە کاتێك داواکران خۆ وێڵ بکەن و ئامادە نەبن، بێزار مەبن لەوەی کە (قەرز) بنووسن، کەم بێت یان زۆر و تا ماوەی دیاریکراوی، بەروونی با یاداشت بکرێت، ئەنجامدانی مەسەلەی قەرزتان بەو شێوە دادپەروەرانەیە و پەسەندترە لای خوا (لە نووسین)، ئەوسا چاکتر دەتوانن شایەتی راگرن و نزیکترن لەوەی گومان و دوو دڵی بە یەکتر نەبەن (مافی کەس تیا نەچێت)، مەگەر بازرگانییەك بێت لەبەر دەستاندا و لە نێو خۆتاندا بیگێڕن و کڕین و فرۆشتن ئەنجام بدەن، ئەوە گوناهتان ناگات کە ناینووسن، (چونکە ئاسان نییە و مامەڵە دوادەخات، هەتا بۆتان دەکرێت) شایەت بگرن کاتێك کڕین و فرۆشتنتان ئەنجام داو نابێت نووسەر و شایەت ئازار بدرێن و بێزار بکرێن، خۆ ئەگەر شتی وا بەکەن ئەوە بەراستی مانای وایە ئێوە لە چەندەها فەرمانبەرداری دەرچوون، جا لە خوا بترسن و خۆ بپارێزن و خوا فێری ئەو شتانەتان دەکات (کە خێری تیایە بۆ دنیا و پاداشتی قیامەیت لە دوایە) و خوا بەهەموو شتێك زانایە.

وە خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُونُوا۟ قَوَّٰمِينَ بِٱلْقِسْطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَوِ ٱلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ ۚ إِن يَكُنْ غَنِيًّا أَوْ فَقِيرًا فَٱللَّهُ أَوْلَىٰ بِهِمَا ۖ فَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلْهَوَىٰٓ أَن تَعْدِلُوا۟ ۚ وَإِن تَلْوُۥٓا۟ أَوْ تُعْرِضُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە هەمیشە راگری

دادووەری بن و شایەتی بۆ خوا بدەن، با شایەتیەکەشتان زیانی بۆ خۆتان و دایك و باوکتان یان خزمانیش هەبێت، ئەگەر کەسێك لەوانە دەوڵەمەند بوو یان هەژار خوا بەرژەوەندی ئەوان چاکتر دەزانێ لە ئێوە( واتە بە تەماعی دەوڵەمەندی لە دادپەروەری لامەدەن بەهۆی نەداری و بەزەیی بێ جێ لە حەق لامەدەن، نەکەن شوێن ئارەزووی نەفس بکەون لە دادپەروەری لابدەن، جا ئەگەر ئێوە پێچ لێ بدەن، یان پشت هەلکەن، ئەوە چاك بزانن خوا ئاگادارە بە کار و کردەوەتان.

## باب يحلف المدعي عليه حيث وجبت عليه اليمين

٣٨٢. قَالَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ وَهُوَ فِيهَا فَاجِرٌ لِيَقْتَطِعَ بِهَا مَالَ امْرِئٍ مُسْلِمٍ لَقِيَ اللَّهَ وَهُوَ عَلَيْهِ غَضْبَانُ)).

## (بەشی/ سوێند خواردنی داواکار لە کاتی پێویستی سوێنددا)

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (کەسێ سوێند بە درۆ بخوات بۆ ئەوەی ماڵی موسڵمانێ بۆ خۆی بە ستەم گلداتەوە، کە دەگاتەوە لای خوا خوای گەورە زۆر لێ تورەیە).

٣٨٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((ثَلَاثَةٌ لَا يُكَلِّمُهُمْ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ: رَجُلٌ عَلَى فَضْلِ مَاءٍ بِالطَّرِيقِ يَمْنَعُ مِنْهُ ابْنَ السَّبِيلِ وَرَجُلٌ بَايَعَ رَجُلاً لَا يُبَايِعُهُ إِلَّا لِدُنْيَاهُ، فَإِنْ أَعْطَاهُ مَا يُرِيدُ وَفَى لَهُ وَإِلَّا لَمْ يَفِ، وَرَجُلٌ ساوم رَجُلًا بَعْدَ الْعَصْرِ فَحَلَفَ بِاللَّهِ لَقَدْ أُعْطِيَ بِهَا كَذَا وَكَذَا، فَأَخَذَهَا)).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (سێ چین هەن خوای گەورە قسەیان لەگەڵ ناکات و پاکیان ناکاتەوە لە ڕۆژی دوایی سزای بە ئازاریان بۆ هەیە: پیاوێ زیادە ئاوی هەبێ لەسەر ڕێگای خەڵکی و قەدەغەی بکات لە(ڕێبواران) وە پیاوێ پەیمان بدات بە پیاوێ بۆ دونیا بێت ئەگەر پێی بەخشی ڕازی بێت و ئەگەرنا پەیڕەوی ناکات، وە پیاوێ شتێك بفرۆشێت لەپاش نوێژی عەسر سوێندی بە درۆ لەسەری بخوات و بڵێ بەخوا بەمەندەم کڕیوە و بەمەندە دەدەم بەدرۆ و پیاوەکەش پێی باوەڕ بکات و لێی بکڕێ).

## باب الوفاء بالوعد والصدق والأمانة

٣٨٤.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلَاثٌ إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ)).

## (بەشی/ بەجێ گەیاندنی پەیمان و ڕاستی و دەستپاکی)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (نیشانەی موونافیق و دووڕوو سێ شتە: ئەگەر قسە بکات درۆی لەگەڵ بکات وە ئەگەر سپاردەی لا دانرا ناپاکی لەگەڵ بکات وە ئەگەر پەیمان و بەڵێنی دا نەیباتەسەر).

## باب كل ما لم يرد في الشرع باطل

٣٨٥. عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قالَ: ((مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ فِيهِ فَهُوَ رَدٌّ)).

## (بەشی/ هەرچی لە چوارچێوەی شەرعدا نەبێت بەتاڵە و قبوڵ نییە)

عائیشە خان (رضي الله عنها) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی کەسێ شتێ لەدیندا بهێنێ کە لە ئاینی ئیسلام دانەبێ ڕەت دەکرێتەوە و لێی وەرناگیرێ.

## باب فضل الإصلاح بين النّاس والعدل بينَهُمْ

٣٨٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِي (ﷺ) قال: ((كُلُّ سُلَامَى مِنْ النَّاس عَلَيْهِ صَدَقَةٌ، كُلَّ يَوْمٍ تَطْلُعُ فِيهِ الشَّمْسُ يَعْدِلُ بَيْنَ النَّاسِ صَدَقَةٌ)).

## (بەشی/ فەزلی چاککردنی نێوانی خەڵك و دادپەروەری لە نێواندا)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (هەموو جومگەیەك لە لەشی ئادەمیزاد دا چاکەیەکی لەسەرە هەموو ڕۆژێك کە خۆر هەڵدێت نێوانی خەڵکی چاك بکەیت بە خێر و چاکە حیسابە).

## باب ما لايجوز من الشروط، ولا يبيع حاضر لباد

٣٨٧. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((لَا يَبِيعْ حَاضِرٌ لِبَادٍ، وَلَا تَنَاجَشُوا، وَلَا يَزِيدَنَّ عَلَى بَيْعِ أَخِيهِ، وَلَا يَخْطُبَنَّ عَلَى خِطْبَتِهِ، وَلَا تَسْأَلْ الْمَرْأَةُ طَلَاقَ أُخْتِهَا لِتَسْتَكْفِئَ إِنَاءَهَا)).

## (بەشی/ ئەو مەرجانەی کە دروست نین، وە نەفرۆشتنی خەڵکی شار شت بە لادێ)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (با ئەوەی لە شارە نەبێ بە دەڵاڵ بۆ خەڵکی لادێ بۆ شتی بۆ بفرۆشێ بە هەرزان لەبن دەستی دەریهێنێ ئەویش کە لەلادێ هاتووە نازانێ نرخی بازاڕ چەندە، وەنەهی کردووە لەکەسێ پارەی زیاد ئەکات بەسەر مامەڵەی براکەیدا، وە کەسیش خوازبێنی لەسەر خوازبێنی براکەی نەکات وە دروست نییە ژن داوای تەڵاقدانی خوشکی ئاینی خۆی بکات خۆی بخا بە شوێنی ئەو ژنەدا).

## باب فضل الصدقة عند الموت

٣٨٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: جاءَ رَجُلٌ إلى رَسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ وَقال: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُّ الصَّدَقَةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: ((أَنْ تَصَدَّقَ وَأَنْتَ صَحِيحٌ حَرِيصٌ تَأْمُلُ الْغِنَى وَتَخْشَى الْفَقْرَ، وَلَا تُمْهِلْ حَتَّى إِذَا بَلَغَتْ الْحُلْقُومَ قُلْتَ لِفُلَانٍ كَذَا وَقَدْ كَانَ لِفُلَانٍ)).

## (بەشی/ فەزلی خێر و صەدەقە لە کاتی سەرەمەرگدا)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پیاوێ هاتە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) ووتی ئەی پێغەمبەری خوا چ خێر و صەدەقەیەك لە هەموویان گەورەترە، فەرموی ئەو چاکە و صەدەقەیە کە ساغ وسەلامەت بی و بە هیوای دەوڵەمەندی بووی و بترسێی لە هەژاری، وەتەمبەڵی مەکە و مۆڵەتی چاکەکردن بدەی و تا دەگەییە ئەو کاتە کە روحت دەگاتە قورگ و ئەو کاتە بڵێی با ئەو ماڵ و سامانە ئەوەندی بۆ فڵانەکەس و ئەوەندی بۆ فڵانەکەس بێت).

## باب من وقف لأقاربه

٣٨٩. عَنْ أَنَس بن مالك رضي الله عَنْه قَالَ: قال النَّبِيُّ (ﷺ) لِأَبِي طَلْحَةَ زَيد بن سَهل ((اجْعَلْهَا لِفُقَرَاءِ أَقَارِبِكَ، فَجَعَلَهَا لِحَسَّانَ بن ثابت وَأُبَيٍّ بْنِ كَعْبٍ)).

## (بەشی/ وەقفکردنی صەدەقە بۆ خزمە نزیکەکان)

ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) بە تەڵحەی (زەیدی کوڕی سەهل)ی فەرموو کە ویستی باخێك بکات بە وەقف، وەقفی بکات بۆ خوا کە پێغەمبەری خوا فەرموی ئەم باخە بگێڕەوە بۆ خزمە هەژارە نزیکەکانت، دەڵێ دایە حەسانی کوڕی سابیت و ئوبەی کوڕی کەعب.

## باب أكل مال اليتامى من السبع الموبقات

٣٩٠.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((اجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ))، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَا هُنَّ؟ قَالَ: ((الشِّرْكُ بِاللَّهِ، وَالسِّحْرُ، وَقَتْلُ النَّفْسِ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ، وَأَكْلُ الرِّبَا، وَأَكْلُ مَالِ الْيَتِيمِ، وَالتَّوَلِّي يَوْمَ الزَّحْفِ، وَقَذْفُ الْمُحْصَنَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ الْغَافِلَاتِ)).

## (بەشی/ خواردنی ماڵی هەتیوان لە حەوت تاوانە گەورەکانە)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێ: (خۆتان بپارێزن لە حەوت تاوانە لەناوبەرەکان، هاوەڵان وتیان ئەوانە چین ئەی پێغەمبەری خوا، فەرموی: هاوەڵ دانان بۆ خوا و، جادوکردن و کوشتنی یەکێك بەبێ هۆ، وە خواردنی ریبا و سوو، وە خواردنی ماڵی هەتیوان و پشتکردن لەجیهاد و تێکۆشان و هەڵاتنی، وە بوختان کردن بە ئافرەتی ئیمانداری بێ ئاگا).

## باب فضل الجهاد

٣٩١.قال صلى الله عليه وآلهِ وسلم: ((أفْضَلَ الْجِهَادِ حَجٌّ مَبْرُورٌ)).

### (بەشی/ فەزلی جیهاد و تێکۆشان)

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (بەڕێزترینو گەورەترین جیهاد و تێکۆشان لەڕێی خودا حەجی تەواو و وەرگیراوە).

## باب من هُمْ أفضل النّاس

٣٩٢. عَنْ أبي سَعِيد الْخُدْرِيَّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أيُّ النَّاسِ أفْضَلُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وآلهِ وَسَلَّمَ: ((مُؤْمِنٌ يُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِنَفْسِهِ وَمَالِهِ، قِيلَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: ((مُؤْمِنٌ فِي شِعْبٍ مِنْ الشِّعَابِ يَتَّقِي اللَّهَ وَيَدَعُ النَّاسَ مِنْ شَرِّهِ)).

### (بەشی/ کێن ئەوانەی باشترینی خەڵکین)

ئەبو سەعیدی خودری (رضي الله عنه) دەفەرموێ ووترا ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کێ لە هەموو کەس بەڕێزترە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئیمانداری بە گیان و بە ماڵ لە ڕێگای خودا تێبکۆشێ، گوتیان ئەی دوای ئەو کێ باشترین کەسە، فەرمووی ئیمانداری لە پەنایەکا سەری خۆی کز دەگرێ و بە جوانی خواپەرستی دەکات وە لە خوای گەورە دەترسێ و ئازاری کەس نادات).

٣٩٣. عَنْ أبي هُرَيْرَةَ رضي الله عَنْه قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وآلهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: ((مَثَلُ الْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ –وَاللَّهُ أعْلَمُ بِمَنْ يُجَاهِدُ فِي سَبِيلِهِ– كَمَثَلِ الصَّائِمِ الْقَائِمِ، وَتَوَكَّلَ اللَّهُ لِلْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِهِ بِأنْ يَتَوَفَّاهُ أنْ يُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ، أوْ يَرْجِعَهُ سَالِمًا مَعَ أجْرٍ أوْ غَنِيمَةٍ)).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) فەرمووی: (نموونەی کەسێ لە ڕێگایێ بچێ بۆ جیهاد و تێکۆشان وە خواش دەزانێ کێ لە پێناوی ئەو تێدەکۆشێ، وەك وێنەی ئەو کەسەی کە بەشەو شەونوێژ و بەڕۆژیش هەر بەردەوام بەڕۆژوو بێت وە خودا بوو بە دەستەبەری ئەو کەسەی کە جیهاد دەکات یەك لەم دوو بەهرەیەی پێ بدات کە ئەگەر خوای گەورە لە جیهاد گیانی کێشا یەکسەر دەیباتە ناو بەهەشتەوە، وە ئەگەر بەسەلامەتی گەڕایەوە بە پاداشت و دەستکەوتی تالانی پێ خەڵات دەکات).

## باب درجات المجاهدين، والشُهداء في سبيل الله

٣٩٤.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قال: قالَ رَسول الله (ﷺ): ((مَنْ آمَنَ بِاللّٰهِ وَرَسُولِهِ، وَأَقَامَ الصَّلَاةَ، وَصَامَ رَمَضَانَ، كَانَ حَقًّا عَلَى اللّٰهِ أَنْ يُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ، جاهَدَ فِي سَبِيلِ اللّٰهِ أَوْ جَلَسَ فِي أَرْضِهِ الَّتِي وُلِدَ فِيهَا)). فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللّٰهِ، أَلا نُبَشِّرُ النَّاس؟ قَالَ: ((إِنَّ فِي الْجَنَّةِ مِائَةَ دَرَجَةٍ أَعَدَّهَا اللّٰهُ لِلْمُجَاهِدِينَ فِي سَبِيلِ الله، ما بَيْنَ الدَّرَجَتَيْنِ كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ، فَإِذَا سَأَلْتُمُ اللّٰهَ فَسَلُوهُ الْفِرْدَوْسَ فَإِنَّهُ أَوْسَطُ الْجَنَّةِ وَأَعْلَى الْجَنَّةِ أراهُ قالَ وَفَوْقَهُ عَرْشُ الرَّحْمَنِ، وَمِنْهُ تَفَجَّرُ أَنْهَارُ الْجَنَّةِ)).

## (بەشی/ پلە و پایەکانی خەبات کاران و شەهیدانی ڕێبازی خودا)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (کەسێ ئیمان و بڕوای بەخوا و پێغەمبەرەکەی هێنا و نوێژ و مانگی ڕەمەزانی ئەنجامداو بەڕۆژوو بوو ئەوا لەسەر خوا پێویست دەکات کە بیباتە

بەهەشتەوە، وە جیهاد و تێکۆشانی کرد لە پێناوی خودا و یان لەو شوێنەی لە دایك بووە دانیشت، هاوەڵان وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئایا مزگێنی بدەین بە خەڵکی؟ فەرمووی لە بەهەشتدا سەد پلە هەیە خوا ئامادەی کردووە بۆ خەباتکەرانی رێبازی خوا، وە لە نێوان هەر دوو پلەیەکدا وەکو نێوانی زەوی و ئاسمانە، وە ئەگەر داوای بەهەشتان لە خوا کرد داوای فیردەوس بکەن، چونکە ناوەندی هەموو بەهەشتەکانە و لە هەموویان بەرزترە و راوییەکە دەڵێ وا دەبینم وا لە سەریەوە عەرشی خوای میهرەبانەوە هەموو رووبارەکانی بەهەشت لە نێوویدا هەڵدەقوڵێن).

٣٩٥.عَنْ سَمُرَةَ بن جندب رضي الله عَنْه قَال: قالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِه وَسَلَّمَ: ((رَأَيْتُ اللَّيْلَةَ رَجُلَيْنِ أَتَيَانِي فَصَعِدَا بِي الشَّجَرَةَ، فَأَدْخَلَانِي دَارًا هِيَ أَحْسَنُ وَأَفْضَلُ لَمْ أَرَ قَطُّ أَحْسَنَ مِنْهَا، قَالا: أَمَّا هَذِهِ فَدَارُ الشُّهَدَاءِ)).

سەمورەی کوڕی جوندوب (رضي الله عنه) فەرموی پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (ئەم شەو لەخەوا دوو پیاو هاتن منیان بردە سەر درەختێك وە منیان بردە ناو کۆشکێك کە جوانترین و چاکترینم نەبینی لەو پێمیان فەرموو ئەمە خانوو و کۆشکی شەهیدانە).

## باب من يخرج في سبيل الله

٣٩٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِي (ﷺ) قَال: ((وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَا يُكْلَمُ أَحَدٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَنْ يُكْلَمُ فِي سَبِيلِهِ إِلَّا جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَاللَّوْنُ لَوْنُ الدَّمِ وَالرِّيحُ رِيحُ الْمِسْكِ)).

## (بەشی/ ئەو کەسەی دەربچێ بۆ غەزا لە پێناوی خودا)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێ: (سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە کەسێ زامار بێت لە پێناوی خودا وە هەر خۆی دەزانی کێ زاماری لە پێناوی ئەودا، ئەوە کە دەگاتە ڕۆژی قیامەت زامارەکەی لەسەر شێوەی خۆیەتی و ڕەنگی ڕەنگی خوێنە و بۆنی بۆنی میسکە).

## باب الجنّة تحْتَ بارِقة السيوف

٣٩٧. عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي أَوْفَى رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((وَاعْلَمُوا أَنَّ الْجَنَّةَ تَحْتَ ظِلَالِ السُّيُوفِ)).

## (بەشی/ بەهەشت لە ژێر بریسکەی شمشێران دایە)

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی ئەوفا (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (بزانن بەهەشت لە ژێر سێبەری شمشێران دایە).

## باب من طَلب الولد للجِهاد،
## وهو سيدنا سليمان عليه السلام

٣٩٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((قَالَ سُلَيْمَانُ بْنُ دَاوُدَ عَلَيْهِمَا السَّلَام لَأَطُوفَنَّ اللَّيْلَةَ عَلَى مِائَةِ امْرَأَةٍ – أَوْ تِسْعٍ وَتِسْعِينَ– كُلُّهُنَّ يَأْتِي بِفَارِسٍ يُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، فَقَالَ لَهُ صَاحِبُهُ: قُل إِنْ شَاءَ اللَّهُ، فَلَمْ يَقُلْ إِنْ شَاءَ اللَّهُ فَلَمْ يَحْمِلْ مِنْهُنَّ إِلَّا امْرَأَةٌ وَاحِدَةٌ، جَاءَتْ بِشِقِّ رَجُلٍ، وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَوْ قَالَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ لَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فُرْسَانًا أَجْمَعُونَ)).

## (بەشی/ کەسێ داوا لە منداڵەکانی بکات بۆ جیهاد کە ئەویش حەزرەتی سولەیمان (علیه السلام) بوو)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (حەزرەتی سولێمانی کوڕی داود پێغەمبەر (علیها السلام) فەرموی ئەم شەوە سەرجێی لەگەڵ هەر سەد ژنەکانم یان نۆوەد و نۆ ژنی دەکەم و هەریەکێکیان منالێکی ببێ و گەورە بێ و رەوانەی جەنگیان دەکەم لە پێناوی خودا وە ئەو فریشتەی لەگەڵی بوو ووتی بڵێ ئەگەر خوا حەز کات (إن شاء الله) بەڵام نەی ووت وە بەو هەموو ئافرەتانە تەنیا یەکێکیان منالێکی بوو نیوە منالّ بوو (کەمئەندام) بوو، پێغەمبەری خوا فەرمووی سوێندم بەوەی گیانی موحەمەدی بەدەستە ئەگەر بیووتبایە (إن شاء الله) ئەوا هەموو ئافرەتەکان منالّیان دەبوو دەبوون بە کۆمەڵە سواری لە پێناوی خودا جەنگیان دەکرد).

## باب التعوذ من الجبن وغيره

٣٩٩. عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَقُولُ: ((اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ وَالْجُبْنِ وَالْهَرَمِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ)).

## (بەشی خوپەنادان بە خوا لە ترسنۆکی و شتی تر)

ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) عادەتی وابوو دەیفەرموو: (خوایە من پەنات پێ دەگرم لە بێ دەستەڵاتی و تەمبەڵی و ترسنۆکی و پیری، و پەنات پێ دەگرم لە فیتنە و ئاشۆبی مردوان و زیندوان و وە پەنا دەگرم لە سزای ناوگۆڕ).

## باب الشهداء خمسة

٤٠٠. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((الشُّهَدَاءُ خَمْسَةٌ، الْمَطْعُونُ وَالْمَبْطُونُ وَالْغَرِقُ وَصَاحِبُ الْهَدْمِ وَالشَّهِيدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ)).

## (بەشی/ شەهیدان پێنج جۆرن)

ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (شەهیدان پێنج جۆرن: ئەوەی بە نەخۆشی تاعوون بمرێ و ئەوەی بە ژانەسك و ئەوەی لە ئاودا بخنکێ و ئەوەی خانووی بەسەر دابکەوێ وە ئەوەی شەهید ببێ لە جەنگا لە پێناوی خودادا).

## باب فضل الصوم في سبيل الله تعالى

٤٠١. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسول الله (ﷺ) يَقُولُ: ((مَنْ صَامَ يَوْمًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ بَعَّدَ وَجْهَهُ عَنْ النَّارِ سَبْعِينَ خَرِيفًا)).

## (بەشی/ فەزلی رۆژوو لە پێناوی خودا)

ئەبو سەعیدی خودری (رضي الله عنه) دەفەرموێ گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) فەرموی: (کەسێ رۆژێ لە پێناوی خودا بەرۆژوو بێ خوای گەورە ئاگری دۆزەخی لێ دوور دەکاتەوە دووری حەفتا ساڵ).

## باب فضل النفقة في سبيل الله

٤٠٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: ((مَنْ أَنْفَقَ زَوْجَيْنِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ دَعَاهُ خَزَنَةُ الْجَنَّةِ كُلُّ خَزَنَةِ بَابٍ، أَيْ قَالُوا هَلُمَّ))، قَالَ أَبُو بَكْرٍ

رضي الله عَنْهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، ذَاكَ الَّذِي لَا تَوَى عَلَيْهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): ((إِنِّي لَأَرْجُو أَنْ تَكُونَ مِنْهُمْ)).

## (بەشی/ فەزلی ماڵ بەخشین لەپێناوی خودا)

**ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (کەسێ دوو جۆرە ماڵ و سامان یان دوو رەگەز ببەخشێ لە پێناوی خودا بانگ دەکرێت لە هەموو دەرگاکانی بەهەشت دەرگاوانەکان پێی دەڵێن بۆ ئەم دەرگایە وەرە، ئینجا ئەبو بەکر (رضي الله عنه) فەرموی ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە ئەوەیە کە لە هیچ دەرگایەك قەدەغە ناکرێ، پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) من داواکارم لەخوا تۆ لەوان حیساب بکات).**

٤٠٣. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَامَ عَلَى الْمِنْبَرِ فَقَالَ إِنَّمَا أَخْشَى عَلَيْكُمْ مِنْ بَعْدِي مَا يُفْتَحُ عَلَيْكُمْ مِنْ بَرَكَاتِ الْأَرْضِ ثُمَّ ذَكَرَ زَهْرَةَ الدُّنْيَا فَبَدَأَ بِإِحْدَاهُمَا وَثَنَّى بِالْأُخْرَى فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَوَيَأْتِي الْخَيْرُ بِالشَّرِّ فَسَكَتَ عَنْهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قُلْنَا يُوحَى إِلَيْهِ وَسَكَتَ النَّاسُ كَأَنَّ عَلَى رُءُوسِهِمْ الطَّيْرَ ثُمَّ إِنَّهُ مَسَحَ عَنْ وَجْهِهِ الرُّحَضَاءَ فَقَالَ أَيْنَ السَّائِلُ آنِفًا أَوَخَيْرٌ هُوَ ثَلَاثًا إِنَّ الْخَيْرَ لَا يَأْتِي إِلَّا بِالْخَيْرِ وَإِنَّهُ كُلَّمَا يُنْبِتُ الرَّبِيعُ مَا يَقْتُلُ حَبَطًا أَوْ يُلِمُّ حَتَّى إِذَا امْتَلَأَتْ خَاصِرَتَاهَا اسْتَقْبَلَتْ الشَّمْسَ فَثَلَطَتْ وَبَالَتْ ثُمَّ رَتَعَتْ وَإِنَّ هَذَا الْمَالَ خَضِرَةٌ حُلْوَةٌ وَنِعْمَ صَاحِبُ الْمُسْلِمِ لِمَنْ أَخَذَهُ بِحَقِّهِ فَجَعَلَهُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالْيَتَامَى وَابْنِ السَّبِيلِ وَمَنْ لَمْ يَأْخُذْهُ بِحَقِّهِ فَهُوَ كَالْآكِلِ الَّذِي لَا يَشْبَعُ وَيَكُونُ عَلَيْهِ شَهِيدًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ.

**ئەبو سەعیدی خودری (رضي الله عنه) فەرموی رۆژێ پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر دوانگەکە دانیشت و ئێمەش لە دەوری دانیشتین، فەرمووی: (من زۆرتر**

لەوە مەترسیتان لێدەکەم، کە خودا لەپیت و فەڕی زەوی دەری دەهێنێ بۆتان) عەرزی کرا: مەبەست لە پیت و فەڕی زەوی چییە؟ فەرمووی: (ئەوەیە کە دەبێ بە مایەی ئارایشت و ڕەونەقی ژیانی جیهان، وەك زێڕ و زیو و سامانی تر، پیاوێ عەرزی کرد: قوربان! بۆچی شتی وا دەبێ کە ئەم خێر و خۆشییە ببێ بە مایەی خراپ و شەڕ).

پێغەمبەر (ﷺ) هەتا ماوەیێ ڕاما و مات و خامۆش بوو گووتیان بە پرسیارەکەرەکە: ئەوە چیتە هەر لە خۆتەوە، بەبێ ئەوە پێغەمبەر قسەت لەگەڵ بکات، قسەی لەگەڵ دەکەی؟ خامۆشییەکەی پێغەمبەر (ﷺ) درێژەی کێشا، هەتا گومانمان بۆ ئەوە چوو کە لەم بارەیەوە سرووش (وەحی –نیگا)ی بۆ بێ، پاش ماوەیێ باراناوی ئارەقی ناوچەوانی خۆی سڕی و فەرمووی: (کوا پرسیار کەرەکە؟) وەك بڵێی پرسیارەکەیی پێ خۆش بێ وابوو،پیاوەکە گوتی: قوربان! ئەمەتام، فەرمووی: (خێر هەر خێر دێنێ، و چاکە هەردەبێ بەهۆی چاکە، کەواتە: خێر شەڕ ناهێنێ!

بەڵام ماڵی دونیا وەك سەوزەگیای بەهار ناسك و نازدارە هەموو کەسێ کەم یان زۆر حەزی لێ دەکات، وە ئەوەی بەشێوەی پەیدای بکات لەسەر شێوەی ڕەوا جێگەی بکا ئەمە و ئەوەی بەشێوەی ناڕەوا پەیدای بکات وەك ئاژەڵ وایە کە ئاژەڵی گیاخۆر کە بەدەم و جەم دەیخوا تا کەلەکەی هەڵدێ، ئەوجا خۆی دەدا بە خۆر و دەست دەکا بە کاوێژ و بە ئاسایی ڕیخ ومیزی خۆی دەکا و لە پاشدا هەمیشە لەسەر ئەم یاسا و دەستوورە تێهەڵ دەچێتەوە، لە گیاخواردن و چان گرتنی خۆی، ئەوە ئاژەڵە هیچی لێ نایەت.

لە ڕاستیدا ئەم ماڵە میوەیەکی سەوز و خۆشە وە هاریکارێکی چاکە، بۆ ئەو موسڵمانەی کە بەشی نەدار و هەتیوی لێ دەدات، وە ئەوەی کە ماڵ بە

ناڕەوا پەیدا بکا وەك ژەمەنبردە وایە، هەر دەخوا و تێر ناخوا، وە ڕۆژی قیامەتیش دەبێ بە شایەت لەسەری).

## باب حق الله سبحانه وتعالى على عباده

٤٠٤. عَنْ مُعَاذٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ كُنْتُ رِدْفَ النَّبِيِّ (ﷺ) عَلَى حِمَارٍ يُقَالُ لَهُ عُفَيْرٌ فَقَالَ يَا مُعَاذُ هَلْ تَدْرِي ماحَقُّ اللَّهِ عَلَى عِبَادِهِ وَمَا حَقُّ الْعِبَادِ عَلَى اللَّهِ قُلْتُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ قَالَ فَإِنَّ حَقَّ اللَّهِ عَلَى الْعِبَادِ أَنْ يَعْبُدُوهُ وَلَا يُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا وَحَقَّ الْعِبَادِ عَلَى اللَّهِ أَنْ لَا يُعَذِّبَ مَنْ لَا يُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفَلَا أُبَشِّرُ بِهِ النَّاسَ قَالَ لَا تُبَشِّرْهُمْ فَيَتَّكِلُوا.

## (بەشی/ مافی خوای گەورە لەسەر بەندەکانی)

موعاز (رضي الله عنه) دەفەرموێ لە پشت پێغەمبەری خوا (ﷺ) سواری گوێدرێژێك بووم پێی دەوترا (عوفەیر) فەرموی: (ئەی موعاز ئایا دەزانی مافی خوا بەسەر بەندەکانیەوە چییە و مافی بەندەکان بەسەر خواوە چییە؟ ووتم خوا و پێغەمبەرەکەی دەزانن فەرموی مافی خوا بەسەر بەندەکانی ئەوەیە کە بە جوانی بیپەرستن و هاوبەشی بۆ بڕیار نەدەن وە مافی بەندەکانیش لەسەر خوا ئەوەیە کە سزای ئەو کەسە نەدات کە هاوەڵی بۆ بڕیار نەداوە، ئەوجا گوتم ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ئەم مژدەیە بدەم بە خەڵکی هەتا خۆشیان تێ بکەوێ فەرمووی نەخێر نەبادا پشت بەم مژدەیە ببەستن و لە کردەوەی چاکدا سارد ببنەوە).

## باب الشؤم من ثلاث

٤٠٥. عَنْ ابن عباس رضي الله عنهما أن رسول الله قال: ((إِنَّمَا الشُّؤْمُ فِي ثَلَاثَةٍ فِي الْفَرَسِ وَالْمَرْأَةِ وَالدَّارِ)).

### (بەشی/ شوم و بەدبەخت لەسێ شتان دایە)

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (رضي الله عنهما) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: ( شوم و بەدبوی لە سێ شتان دایە لە وولاخ و ئەسپ دا وە لەژن دا وەلەخانووبەرەدایە).

## باب فضل منْ حَمل متاع صاحبه في السفر

٤٠٦.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ كُلُّ سُلَامَى عَلَيْهِ صَدَقَةٌ كُلَّ يَوْمٍ يُعِينُ الرَّجُلَ فِي دَابَّتِهِ يُحَامِلُهُ عَلَيْهَا أَوْ يَرْفَعُ عَلَيْهَا مَتَاعَهُ صَدَقَةٌ وَالْكَلِمَةُ الطَّيِّبَةُ صدقة صدقة وَكُلُّ خَطْوَةٍ يَمْشِيهَا إِلَى الصَّلَاةِ صَدَقَةٌ وَدَلُّ الطَّرِيقِ صَدَقَةٌ

### (بەشی/ فەزلی کەسێ کەل وپەلی هاوڕێیەکەی هەڵدەگرێ لە سەفەردا)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (هەموو جومگەیێ لەلەشی مرۆڤدا خێر و صەدەقەی بۆ هەیە، هەموو رۆژێك پیاوێ یارمەتی براکەی بدا بۆ سواربوونی وولاخەکەی یان کەل و پەلی بۆ هەلگرێ یان بۆی باربکات بە خێر و صەدەقە حیسابە، وە ووتەیەکی خۆش و چاك بەخێر حیسابە وە هەر هەنگاوێ دەهاوێژێ بۆ نوێژ بە خێر و صەدەقە حیسابە وە یەکێك رێگای پێ نیشان بدەی بەخێر حیسابە).

## باب رباط يوم في سبيل الله لنصر دينه

٤٠٧. عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ رِبَاطُ يَوْمٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ خَيْرٌ مِنْ الدُّنْيَا وَمَا عَلَيْهَا وَمَوْضِعُ سَوْطِ أَحَدِكُمْ مِنْ الْجَنَّةِ خَيْرٌ مِنْ الدُّنْيَا وَمَا عَلَيْهَا وَالرَّوْحَةُ يَرُوحُهَا الْعَبْدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَوْ الْغَدْوَةُ خَيْرٌ مِنْ الدُّنْيَا وَمَا عَلَيْهَا.

## (بەشی/ پاسەوانی رۆژێك
## لە رێگای خودا بۆ سەرخستنی دینی خوا)

سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (پاسەوانی رۆژێ لە رێگای خودا باشترە و چاکترە لە دونیا و ئەوەی لە سەر دونیا دایە وە بەقەد جێگەی قەمچییەك لە قەمچییەکانی ئێوە لە بەهەشتدا لە هەرچی لەسەر زەوی دایە چاکترە وە تاقی کۆششی تێکۆشان لە رێگەی خودا تاقی بەیانی بێت یان ئێوارە لە هەموو دونیا و هەرچی لەسەر دونیادا چاکترە).

## باب إكرام الضعفاء

٤٠٨. عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ رَأَى سَعْدٌ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ لَهُ فَضْلًا عَلَى مَنْ دُونَهُ فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) هَلْ تُنْصَرُونَ وَتُرْزَقُونَ إِلَّا بِضُعَفَائِكُمْ.

## (بەشی/ رێزگرتنی بێ هێزان)

موصعەبی کوڕی سەعد دەفەرموێ، باوکم بۆی گێڕامەوە فەرموی خۆم بە فەزلتر و گەورەتر دادەنا لەچاو کەسانی لەخۆم خوارتر لە یارانی پێغەمبەر (ﷺ)، وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی کاری وا جوان نییە، مەگەر ئێوە بەهۆی دوعا و نزای بێ هێزانتان رزق و رۆزی دەدرێن و سەردەخرێن بەسەر دوژامنەکانتانەوە).

## باب لا تغتر بالعمل

٤٠٩. عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) الْتَقَى هُوَ وَالْمُشْرِكُونَ فَاقْتَتَلُوا فَلَمَّا مَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)إِلَى عَسْكَرِهِ وَمَالَ الْآخَرُونَ إِلَى عَسْكَرِهِمْ وَفِي أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)رَجُلٌ لَا يَدَعُ لَهُمْ شَاذَّةً وَلَا فَاذَّةً إِلَّا اتَّبَعَهَا يَضْرِبُهَا بِسَيْفِهِ فَقَالَ مَا أَجْزَأَ مِنَّا الْيَوْمَ أَحَدٌ كَمَا أَجْزَأَ فُلَانٌ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)أَمَا إِنَّهُ مِنْ أَهْلِ النَّارِ فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ الْقَوْمِ أَنَا صَاحِبُهُ قَالَ فَخَرَجَ مَعَهُ كُلَّمَا وَقَفَ وَقَفَ مَعَهُ وَإِذَا أَسْرَعَ أَسْرَعَ مَعَهُ قَالَ فَجُرِحَ الرَّجُلُ جُرْحًا شَدِيدًا فَاسْتَعْجَلَ الْمَوْتَ فَوَضَعَ نَصْلَ سَيْفِهِ بِالْأَرْضِ وَذُبَابَهُ بَيْنَ ثَدْيَيْهِ ثُمَّ تَحَامَلَ فَقَتَلَ نَفْسَهُ فَخَرَجَ الرَّجُلُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ أَشْهَدُ أَنَّكَ رَسُولُ اللَّهِ قَالَ وَمَا ذَاكَ قَالَ الرَّجُلُ الَّذِي ذَكَرْتَ آنِفًا أَنَّهُ مِنْ أَهْلِ النَّارِ فَأَعْظَمَ النَّاسُ ذَلِكَ فَقُلْتُ أَنَا لَكُمْ بِهِ فَخَرَجْتُ فِي طَلَبِهِ ثُمَّ جُرِحَ جُرْحًا شَدِيدًا فَاسْتَعْجَلَ الْمَوْتَ فَوَضَعَ نَصْلَ سَيْفِهِ فِي الْأَرْضِ وَذُبَابَهُ بَيْنَ ثَدْيَيْهِ ثُمَّ تَحَامَلَ عَلَيْهِ فَقَتَلَ نَفْسَهُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عِنْدَ ذَلِكَ إِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ الْجَنَّةِ فِيمَا يَبْدُو لِلنَّاسِ وَهُوَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ النَّارِ فِيمَا يَبْدُو لِلنَّاسِ وَهُوَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ.

## (بەشی/ کردەوە فریوت نەدات)

سەهلی کوڕی سەعد (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەیشت بە بێ باوەڕان و جەنگ لە نێوانیان روویدا، جا کاتێ هەردوولا کشانەوە لە مەیدانی شەڕدا بۆ سەربازگەکەی خۆیان، پیاوێ لەناو یارانی پێغەمبەر (ﷺ) زۆر بوێرانە شەڕی دەکرد و ئازایەتی دەنواند کە دەگەیشت بەهەر بێ باوەڕێکدا سەری لە لەشی جیادەکردەوە هاوەڵانی ووتیان بەراستی ئەم کەلە پیاوە زۆر ئازایە و فریامان کەوت، پێغەمبەری خوا فەرموی ئەم

پیاوە بۆ خەڵکی دۆزەخە، پیاوێ تر لە یاران ووتی دەبێ بزانم ئەو پیاوە بۆ خەڵکی دۆزەخە بە دوای داکەوت و پیاوەکە بۆ کوێ ڕۆیشتبا ئەویش بە دوای دەکەوت تا کاتێ ئەم پیاوە زامدار دەبێ و زامەکەی سەخت دەبێ و شمشێرەکەی لە زەوی داچەقاند خۆی کرد بە سەریداو خۆی کوشت وە هاوەڵەکەی گەڕایەوە لای پێغەمبەری خوا و فەرموی (شایەتی دەدەم کە تۆ پێغەمبەری خوای) ئەویش فەرموی بۆچی، ووتی ئەوەی تۆ فەرموت ئەم پیاوە جێگای دۆزەخە من بەدوایدا ڕۆیشتم جا کاتێ زامدار بوو خۆی بە شمشێرەکەی خۆی کوشت و ئینجا پێغەمبەر فەرموی پیاوی وا هەیە کردار و ڕەفتاری لەلای خەڵك بەکرداری بەهەشتییە بەڵام خەڵکی دۆزەخە وە پیاوی واش هەیە کردار و ڕەفتاری لەلای خەڵکی بە دۆزەخی وە دیارە و خەڵکی بەهەشتە).

## باب قتال اليهود

٤١٠. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُقَاتِلُوا الْيَهُودَ حَتَّى يَقُولَ الْحَجَرُ الذي وَرَاءَهُ الْيَهُودِيُّ يَا مُسْلِمُ هَذَا يَهُودِيٌّ وَرَائِي فَاقْتُلْهُ.

## (بەشی/ شەڕکردن لەگەڵ جولەکە)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (قیامەت هەڵناستێ هەتا شەر لەگەڵ جولەکە دەکەن و هەتا وای لێ دێت ئەو دار و بەردەی جولەکە خۆی لەبن حەشارداوە بانگی موسڵمانان دەکات و دەڵێت ئەی موسڵمان ئەوە جولەکەیە لە پشت من خۆی حەشار داوە وەرە بیکوژە).

## باب قتال الترك

٤١١. عَنْ عَمْرُو بْنُ تَغْلِبَ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) إِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ تُقَاتِلُوا قَوْمًا يَنْتَعِلُونَ نِعَالَ الشَّعَرِ، وَإِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ تُقَاتِلُوا قَوْمًا عِرَاضَ الْوُجُوهِ كَأَنَّ وُجُوهَهُمْ الْمَجَانُّ الْمُطْرَقَةُ.

## (بەشی/ شەڕکردن لەگەڵ تورك)

عەمری کوڕی تەغلب دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (لە نیشانەکانی هاتنی رۆژی دوایی ئەوەیە کە شەڕ لەگەڵ نەتەوەیەك دەکەن کە پێڵاوی بە موو دروست کراوییان لە پێیە).

وە لە نیشانەکانی رۆژی دوایی ئەوەیە شەڕ لەگەڵ نەتەوەیەك دەکەن کە دەم و چاویان پانە و وەکو قەڵغانی بە چەرم داپۆشراوە.

## باب السمع والطّاعة للإمام وقتاله(ﷺ)

٤١٢. عَنْ عبدالله بنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ)قَالَ السَّمْعُ وَالطَّاعَةُ حَقٌّ مَا لَمْ يُؤْمَرْ بِالْمَعْصِيَةِ فَإِذَا أُمِرَ بِمَعْصِيَةٍ فَلَا سَمْعَ وَلَا طَاعَةَ.

## (بەشی/ گوێڕایەڵی و بەگوێ کردنی پێشەوا و شەرەکانی پێغەمبەر)

لە عەبدوڵلای کوڕی عومەر (رضي الله عنهما) لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێ: (گوێڕایەڵی و بەگوێ کردنی ئەوکەسە بکە فەرمان ڕەوایەتیتان دەکات لەسەر حەق و ڕاستیدا وە ئەگەر بۆ فەرمانی خوای کرد ئەو کاتە گوێڕایەڵی و بەگوێ کردنی نامێنێ).

٤١٣. عَنْ سَالِمٍ أَبِي النَّضْرِ مَوْلَى عُمَرَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ وَكَانَ كَاتِبًا لَهُ قَالَ كَتَبَ إِلَيْهِ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي أَوْفَى رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا كان النبي (عليه الصلاة والسلام) إذا لَمْ يقاتل أول النّهار أخّرَ القتال حتى تزول الشمس وقَدْ قَامَ فِي النَّاسِ خَطِيبًا فقَالَ (ﷺ) أَيُّهَا النَّاسُ لَا تَتَمَنَّوْا لِقَاءَ الْعَدُوِّ وَسَلُوا اللَّهَ الْعَافِيَةَ فَإِذَا لَقِيتُمُوهُمْ فَاصْبِرُوا وَاعْلَمُوا أَنَّ الْجَنَّةَ تَحْتَ ظِلَالِ السُّيُوفِ ثُمَّ قَالَ(ﷺ) اللَّهُمَّ مُنْزِلَ الْكِتَابِ وَمُجْرِيَ السَّحَابِ وَهَازِمَ الْأَحْزَابِ اهْزِمْهُمْ وَانْصُرْنَا عَلَيْهِمْ).

له سالیمی ئەبی (النَّضْرِ) نۆکەری عومەر کوڕی عەبدوڵلا دەگێڕێتەوە کە نوسەری عومەر بوو فەرمووی عەبدوڵلای کوڕی ئەبی ئەوفا (رضي الله عنه) نوسی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) عادەتی وابوو ئەگەر لە سەرەتای بەیانیدا شەڕی نەکردبا ئەوا دوای دەخست بۆ دوای نیوەڕۆ، وە هەڵدەستا و ووتاری دەدا و بۆ خەڵکی و فەرمووی ئەی خەڵکینە ئاوات مەخوازن بۆ گەیشتن و بەرەنگاربوونەوەی دوژمن بەڵکو لە خودا داوای ئاسودەیی و بێوەیی بکەن، وە کاتێکیش کە تووشی دوژمن بوون خۆگر و بە پشووبن وە بزانن بە هەشت لەژێر سێبەری شمشێران دایە لە پاشان فەرموی (اللَّهُمَّ مُنْزِلَ الْكِتَابِ وَمُجْرِيَ السَّحَابِ وَهَازِمَ الْأَحْزَابِ اهْزِمْهُمْ وَانْصُرْنَا عَلَيْهِمْ)

خوایە ئەو کەسەی کە قورئانت بەخەڵات نارده خوارەوە بە توانای خۆت با هەڵدەکەیت وە کۆمەڵی ئەحزاب لەرۆژی ئەحزاب تێك شکاند ئەی خودایە تێکیان بشکێنە و سەرمان بخە بەسەریاندا.

٤١٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي مَا تَخَلَّفْتُ عَنْ سَرِيَّةٍ وَلَكِنْ لَا أَجِدُ حَمُولَةً وَلَا أَجِدُ مَا أَحْمِلُهُمْ عَلَيْهِ وَيَشُقُّ عَلَيَّ أَنْ يَتَخَلَّفُوا عَنِّي وَلَوَدِدْتُ أَنِّي قَاتَلْتُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَقُتِلْتُ ثُمَّ أُحْيِيتُ ثُمَّ قُتِلْتُ ثُمَّ أُحْيِيتُ، ثُم قُتِلْتُ ثم أحْيَيْت.

له ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) له پێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: (ئەگەر ئەزیەت و ئازار نەبوایە لەسەر ئۆمەتی خۆم له هیچ سریەیەك دواناده‌کەوتم بەڵام وولاخی سوارم نیە و ئەو وولاخ و ئیسترانەم بۆ پەیدا نابێت وە زەحمەت دەبێت لەسەر ئەوکەسانەی کە توانای داراییان نییە حەز دەکەن لەگەڵم بێن وە پێم خۆشە شەڕ بکەم لە پێناوی خوا و بکوژرێم و له پاشان زیندوو بکرێمەوە لەپاشان بکوژرێم وە زیندوو بکرێمەوە دیسان حەز دەکەم بکوژرێم و زیندو بکرێمەوە).

## باب يكره رفع الصوت في التكبير

٤١٥. عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَكُنَّا إِذَا أَشْرَفْنَا عَلَى وَادٍ هَلَّلْنَا وَكَبَّرْنَا وارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُنَا فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَا أَيُّهَا النَّاسُ ارْبَعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ فَإِنَّكُمْ لَا تَدْعُونَ أَصَمَّ وَلَا غَائِبًا إِنَّهُ مَعَكُمْ إِنَّهُ سَمِيعٌ قَرِيبٌ تَبَارَكَ اسْمُهُ وَتَعَالَى جَدُّهُ.

## (بەشی/ کەراهەتی هەیە دەنگ بەرزکردنەوە بە(الله أکبر) کردن له دەشت بۆ جیهاد و جەنگا)

ئەبی موسای ئەشعەری (رضي الله عنه) دەفەرموێ ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا بووین (ﷺ) کە دەگەیشتن بەسەر کێوێك کە دەیڕوانیە سەر دۆڵێکدا بە دەنگی بەرز لااله الا الله، (الله أکبر)مان دەکرد وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی ئەی خەڵکینە دەنگتان نزم بکەنەوە چونکە ئێوە بانگی یەکێك ناکەن کە کەڕ و نادیار بێت ئەو کە خواتانە لەگەڵ ئێوەیە و گوێی لێیە و نزیکە لێتانەوە پیرۆز بێت ناوی بەرز و بڵندە.

## باب يكتب للمُسافِر والمَريضْ
## ما كانا يعملانه في الإقامة والصحةٌ

٤١٦.وعنْهُ أيضاً قال: قَالَ رَسُولُ اللّهِ (ﷺ) إِذَا مَرِضَ الْعَبْدُ أَوْ سَافَرَ كُتِبَ لَهُ مِثْلُ مَا كَانَ يَعْمَلُ مُقِيمًا صَحِيحًا.

**(بەشی/ ئەوەی لە کاتی لەش ساغی و لەسەرفەر نەبوون چی کردووە بۆ ئەو کاتەش کە لە سەفەر بێ و یا نەخۆش بێت ئەوەی بۆ دەنوسرێ لە خێر و خواپەرستی)**

ئەبو موسای ئەشعەری (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر بەندەیەك نەخۆش بوو یان لە سەفەردا بوو، ئەگەر لەکاتی لە ماڵەوەیە و ساغ و سەلامەتە چی بۆ دەنوسرێ لە خێر و چاکە ئەوا لەو کاتەش کە نەخۆشە و لەسەفەرە ئەوەی بۆ دەنوسرێ).

## باب كراهة السير وحده

٤١٧.عَنْ عَبْدالله بن عمر رضي الله عنهما أنَّ رسول الله (ﷺ) قال: ((لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ فِي الوَحْدَةِ مَا أَعْلَم مَا سَارَ رَاكِبٌ بِلَيْلٍ وَحْدَهُ)).

**(بەشی/ کەراهەتی هەیە بە تەنیا ڕۆیشتن لە شەوا)**

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (رضي الله عنهما) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (ئەگەر ئەو کەسەی کە بەتەنیا لە شەوا ڕێ دەکات دەڕوات بزانێ چەندە خراپە ئەوا بەشەو قەت بە تەنیا ناڕوات).

## باب فضل من أسلم من أهل الكتابين

٤١٨. عَنْ صَالِحِ بْنُ حَيّ أَبي حَسَنٍ قَالَ سَمِعْتُ الشَّعْبِيَّ يَقُولُ حَدَّثَنِي أَبُو بُرْدَةَ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَاهُ رضي الله عَنْهُ يقول: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ ((ثَلَاثَةٌ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُمْ مَرَّتَيْنِ، الرَّجُلُ تَكُونُ لَهُ الْأَمَةُ فَيُحْسِنُ تَعْلِيمَهَا وَيُؤَدِّبُهَا فَيُحْسِنُ أَدَبَهَا ثُمَّ يُعْتِقُهَا فَيَتَزَوَّجُهَا فَلَهُ أَجْرَانِ، وَمُؤْمِنُ أَهْلِ الْكِتَابِ الَّذِي كَانَ مُؤْمِنًا، ثُمَّ آمَنَ بِالنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَهُ أَجْرَانِ، وَالْعَبْدُ الَّذِي يُؤَدِّي حَقَّ اللَّهِ وَيَنْصَحُ لِسَيِّدِهِ لَهُ أَجران)).

## (بەشی/ فەزلی ئەوەی موسڵمان دەبێ لە خاوەن نامەکان (أهل الكتاب))

لە صالحی کوڕی حەی (ئەبی حەسەن) دەفەرموێ گوێم لە شەعبی بوو دەیفەرموو ئەبو بەردە بۆی گێڕامەوە کە گوێی لە باوکی بووە (رضي الله عنه) دەیفەرموو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (سێ چین هەن ئەجر و پاداشتیان دووقات پێ دەدرێتەوە کە ئەوانیش: پیاوێ کەنیزەکی هەبێ و فێری زانیاری و زانستی بکات بە جوانترین شێوە و پەروەردەیان بکات لە پاشان ئازادی بکات و دوای مارەی بکاتەوە ئەوە دوو ئەجری هەیە، وە ئیمانداری لە خاوەن نامەکان (أهل الكتاب) کە ئیمان و بڕوای هەبووبێ و لە پاشان بڕوای بە من بهێنێ ئەوە دوو ئەجری هەیە وە ئەو بەندەی کە مافی گەورەکەی بدات و پاشان مافی خوا ئەوەش دوو پاداشتی بۆ هەیە).

## باب قتل الجنس المؤذي

٤١٩. عَنْ أبي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَال: قالَ رَسُولُ الله (ﷺ)قَرَصَتْ نَمْلَةٌ نَبِيًّا مِنْ الْأَنْبِيَاءِ فَأَمَرَ بِقَرْيَةِ النَّمْلِ فَأُحْرِقَتْ، فَأَوْحَى اللَّهُ إِلَيْهِ أَأَنْ قَرَصَتْكَ نَمْلَةٌ أَحْرَقْتَ أُمَّةً مِن الْأُمَمِ تُسَبِّحُ الله تَعالى؟)).

## (بەشی/ كوشتنی ئەو ڕەگەزەی كە ئازاری هەیە)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ جارێ مێروولەیەك پێغەمبەرێ لە پێغەمبەرانی خوا دەگەزێ و پێغەمبەرەكەش فەرمانی كرد شارە مێرولەكەیان سوتاند، خوای گەورە وەحی بۆ نارد و گلەیی لێ كرد خۆ تۆ تاقە میرولەیەك تۆی گەزت كەچی نەتەوەیەكت لە نەتەوەكانی سوتاند كە تەسبیحاتی خوایان دەكرد.

## باب يكره التنازع والإختلاف

٤٢٠. عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي بُرْدَةَ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) (لَما) بَعَثَ مُعَاذًا وَأَبَا مُوسَى الأشعري إِلَى الْيَمَنِ قَالَ (لهما): ((يَسِّرَا وَلَا تُعَسِّرَا، وَبَشِّرَا وَلَا تُنَفِّرَا، وَتَطَاوَعَا وَلَا تَخْتَلِفَا)).

## (بەشی/ كراهەت بوونی لێك دابڕان جیاوازی و پەرتەوازەیی)

لەسەعیدی كوڕی ئەبی بەردە لەباوكی لەباپیری دەگێرێتەوە پێغەمبەر (ﷺ) موعازو ئەبو موسای ئەشعەری نارد بۆ یەمەن و پێیانی فەرموو و ئیش و كار ئاسان كەن و كارگران و قورسی مەكەن و مزگێنی دەرین و خەڵك مەتەكێنەوە لە دیندا وە یەكدی گرین و پەرتەوازە مەبن.

## باب فكاك الأسير

٤٢١. عَنْ أَبِي مُوسَى الأشعري رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ قَال: قالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((فُكُّوا الْعَانِيَ، وَأَطْعِمُوا الْجَائِعَ، وَعُودُوا الْمَرِيضَ)).

## (بەشی/ بەرەڵاکردنی دیل و داماوان)

ئەبو موسای ئەشعەری (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (دیل و داماو و رزگار بکەن و برسییەکان تێر بکەن و بچن بۆ سەردانی نەخۆشان).

## باب الغلول وقول الله تعالى

﴿وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ﴾

٤٢٢. عَنْ أبي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) ذَكَرَ الْغُلُولَ فَعَظَّمَهُ وَعَظَّمَ أَمْرَهُ، قَالَ: ((لَا أُلْفِيَنَّ أَحدَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى رَقَبَتِهِ شَاةٌ لَهَا ثُغَاءٌ، عَلَى رَقَبَتِهِ فَرَسٌ لَهُ حَمْحَمَةٌ يَقُولُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَغِثْنِي، فَأَقُولُ لَا أَمْلِكُ لَكَ مِنَ اللهِ شَيْئًا، قَدْ أَبْلَغْتُكَ وَعَلَى رَقَبَتِهِ بَعِيرٌ لَهُ رُغَاءٌ، يَقُولُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَغِثْنِي، فَأَقُولُ لَا أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا قَدْ أَبْلَغْتُكَ وَعَلَى رَقَبَتِهِ صَامِتٌ فَيَقُولُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَغِثْنِي، فَأَقُولُ لَا أَمْلِكُ لَكَ {من الله} شَيْئًا قَدْ أَبْلَغْتُكَ أَوْ عَلَى رَقَبَتِهِ رِقَاعٌ تَخْفِقُ فَيَقُولُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَغِثْنِي، فَأَقُولُ لَا أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا قَدْ أَبْلَغْتُكَ.

## (بەشی/ دزی کردن لە تاڵانی جەنگی و ئایەتی

﴿وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ﴾)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) باسی دزی کرد لە تاڵانی جەنگی و بە گەورەی وە سف کرد و بە گەورەی دانا و فەرمووی: (نامەوێ بگەم بە یەکێکتان لە رۆژی قیامەت و مەڕێکی یان بزنێکی

لەسەر شانی بێت و بارەبارِ بکات ویان ئەسپێکی لەسەرشانی بێت وبحیلێنیَ وە بێت بۆ لام بلّیَ ئەی پێغەمبەری خوا فریام کەوە منیش دەلّێم من هیچم بۆتۆ پیَ ناکریَ من لە پێشوودا ئاگادارم کردی، یان لەسەر شانی ووشتر ببیَ و دەنگی لێوە بێت و بلّیَ ئەی پێغەمبەری خوا فریام کەوە منیش دەلّێم هیچم بۆت پیَ ناکریَ لە پێشوودا پێم راگەیاندووی یان لەسەر شانی زێرِ و زیو بار کرابیَ، بێت بۆ لام بلّیَ فریام کەوە منیش پێی دەلّێم هیچم بۆتان پیَ ناکریَ لەدونیادا پێم راگەیاندووی یان لەسەر شانی کالاّ و قوماش هەبێت، بێت بۆ لام و بلّیَ ئەی پێغەمبەر فریام کەوە منیش دەلّێم هیچم بۆت پیَ ناکریَ لە دونیادا پێم راگەیاندووی)).

## باب الخمس لنوائب النبي عليه الصلاة والسلام والمساكين وإيثار أهل الصفة والأرامل

٤٢٣. عَنْ عَلِي رضي الله عَنْهُ أَنَّ فَاطِمَةَ عَلَيْهَا السَّلَام اشْتَكَتْ مَا تَلْقَى مِنْ الرَّحَى مِمَّا تَطْحَنُ فَبَلَغَهَا أَنَّ النبي (ﷺ) أُتِيَ بِسَبْيٍ فَأَتَتْهُ تَسْأَلُهُ خَادِمًا فَلَمْ تُوَافِقْهُ فَذَكَرَتْ لِعَائِشَةَ (رضي الله عنها) فَجَاءَ النَّبِيُّ (ﷺ) فَذَكَرَتْ ذَلِكَ عَائِشَةُ لَهُ فَأَتَانَا وَقَدْ دَخَلْنَا مَضَاجِعَنَا فَذَهَبْنَا لِنَقُومَ فَقَالَ عَلَى مَكَانِكُمَا حَتَّى وَجَدْتُ بَرْدَ قَدَمَيْهِ عَلَى صَدْرِي فَقَالَ أَلَا أَدُلُّكُمَا عَلَى خَيْرٍ مِمَّا سَأَلْتُمَانِي؟ إِذَا أَخَذْتُمَا مَضَاجِعَكُمَا فَكَبِّرَا اللَّهَ أَرْبَعًا وَثَلَاثِينَ وَاحْمَدَا ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ وَسَبِّحَا ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ فَإِنَّ ذَلِكَ خَيْرٌ لَكُمَا مِمَّا سَأَلْتُمَاهُ.

## (بەشی/ پێنج یەك بۆ خزمەكانی پێغەمبەر و هەژاران و پێ دانی خەڵكی صوففە و بێوەژنان)

لەعەلی (رضي الله تعالي عنه) دەگێڕێتەوە كە فاتیمە (عليها السلام) شكاتی حاڵی خۆی كرد لەدەستاڕ كردن و ماندوبوونی نان كردن، وە جا كۆمەڵێ كەنیزەك بە تالانی جەنگییان بۆ پێغەمبەر هێنا، فاتیمەش بە ئومێدی ئەوەی یەكێك لەو كەنیزانەی پێ بدری بۆ خزمەتی ماڵەوەی چوو بۆ لای پێغەمبەر بەڵام لەماڵ نەبوو وە بۆ عائیشەی گێڕایەوە وە كاتێ پێغەمبەر هاتەوە عائیشە ئەم ووتەی فاتیمەی بۆ گێڕایەوە وە پێغەمبەر هاتەلامان لەوكاتە ئێمە راكشا بووین دەمانوویست بخەوین، من وویستم لەبەری هەڵسم، فەرمووی لە شوێنی خۆتان بن لە نێوان من و فاتیمە دانیشت هەتا هەستم بە ساردی قاچەكانی كرد دەكەوتە سەر سنگم فەرمووی باشتێكتان فێر بكەم كە زۆر لەوە باشترە كە داواتان كردبوو لەمن، كاتێ راكشان لەسەر نوێنەكانتان سی و چوار جار بڵێن (الله أكبر) وە سی و سێ جار بڵێن (الحمد لله) وە سی و سێ جار بڵێن (سبحان الله) ئەوە بوو ئێوە باشترە لەوەی داواتان كردبوو لە كارەكەر.

٤٢٤. عَنْ مُعَاوِيَةَ بن أبي سفيان رَضي الله تعالى عَنهما قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَنْ يُرِدْ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ وَاللَّهُ الْمُعْطِي وَأَنَا الْقَاسِمُ وَلَا تَزَالُ هَذِهِ الْأُمَّةُ ظَاهِرِينَ عَلَى مَنْ خَالَفَهُمْ حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللَّهِ وَهُمْ ظَاهِرُونَ.

لە موعاویەی كوڕی ئەبو سوفیان (رضي الله عنهما) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (كەسێ خوا بیەوێ تووشی خێر و خۆشی بكات شارەزایی لە ئایینی دەكات، من تەنیا ئەوەندەم بەدەستە كە ئەم فەرمایشتە

و شەریعەتە دابەش بکەم و بەس وە خوا دەدات و دەیبەخشێ وە ئەم ئوممەتی ئیسلامە هەر بەردەوام دەبن لەسەر ئاینی خوا هەتا نزیکی رۆژی قیامەت ئەوەی لە دژیان بێ زیانیان پێ ناگەیەنێ).

## باب عطاؤه عليه الصلاة والسلام منْ خمس للمؤلفة قلوبهم وغيرهم

٤٢٥. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ كُنْتُ أَمْشِي مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) وَعَلَيْهِ بُرْدٌ نَجْرَانِيٌّ غَلِيظُ الْحَاشِيَةِ فَأَدْرَكَهُ أَعْرَابِيٌّ فَجَذَبَهُ جَذْبَةً شَدِيدَةً حَتَّى نَظَرْتُ إِلَى صَفْحَةِ عَاتِقِ النَّبِيِّ (ﷺ)قَدْ أَثَّرَتْ بِهِ حَاشِيَةُ الرِّدَاءِ مِنْ شِدَّةِ جَذْبَتِهِ ثُمَّ قَالَ مُرْ لِي مِنْ مَالِ اللَّهِ الَّذِي عِنْدَكَ فَالْتَفَتَ إِلَيْهِ فَضَحِكَ ثُمَّ أَمَرَ لَهُ بِعَطَاءٍ

## (بەشی/ بەخشینی پێغەمبەری خوا عليه السلام لەپێنج یەك بەشی بۆ ئەوانەی تازە موسڵمان بوون بۆ دڵ راگیریان و ئەوانی تر)

ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەفەرموێ من لەگەڵ پێغەمبەری خوا دەڕۆیشتم پێغەمبەری خواش بەرماڵێکی نەجرانی ئەستوری لەسەرشانی دابوو، گەیشت بە عارەبێکی دەشتەکی و یەخەی پێغەمبەری گرت و بەتوندی بەرماڵەکەی لەسەرشانی راکێشا و کە تەماشای شانی پێغەمبەرم کرد سور هەڵگەڕابوو دەشتەکییەکە ووتی ئەی موحەمەد بەشم بدە لەو ماڵەی خوا پێی داوی ئینجا پێغەمبەریش تەماشای کرد و بە دەم بە پێکەنینەوە فەرمانی کرد بە شتێ کە بدەن بەو عارەبە.

٤٢٦. عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ أَخبَرَنِي أَبِي أَنَّهُ بَيْنَا هُوَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وَمَعَهُ النَّاسُ مقبلاً عَنْ غزوَة حُنَيْنٍ عَلَقَتْ رسول

الله صلى الله عليه وآله وسلم الأعراب يَسْأَلُونَهُ حَتَّى اضْطَرُّوهُ إِلَى سَمُرَةٍ فَخَطِفَتْ رِدَاءَهُ، فَوَقَفَ رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وآله وَسَلَّمَ فَقَالَ: ((أَعْطُونِي رِدَائِي، فَلَوْ كَانَ عَدَدُ هَذِهِ الْعِضَاهِ نَعَمًا لَقَسَمْتُهُ بَيْنَكُمْ، ثُمَّ لَا تَجِدُونِي بَخِيلًا وَلَا كَذُوبًا وَلَا جَبَانًا)).

**له موحەمەدی کوڕی جوبەیری کوڕی (مُطْعِمٍ) (رضي الله عنه) دەفەرموێ باوکم بۆی گێڕامەوە کەوا ئەو لەگەڵ پێغەمبەری خوا بوو وە لە پاڵ خەڵکی لە جەنگی حوونەین دەگەڕانەوە عارەبە دەشتەیەکیان پێ گەیشتن و داوای بەشیان لێ کرد و تەنگیان پێ هەڵچنی ئاڵاندیانە بن دارێکی دڕکاوی عەباکەی لە دڕکێك ئاڵا ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) راوەستا و فەرموی عەباکەم بدەنەوە ئەگەر بەقەد ئەم دڕکانە ئاژەڵم هەبێ هەمووی دابەش دەکەم بەسەرتاندا قەت بەرژدی و چروکی و درۆزنی و ترسنۆکی من نابینن.**

## باب المنافسة في الدنيا وأخذ الجزية من اليهود والنصاري والمجوس

٤٢٧.عَنْ عَمْرِو بْنَ عَوْفٍ الْأَنْصَارِيَّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) بَعَثَ أَبَا عُبَيْدَةَ بْنَ الْجَرَّاحِ إِلَى الْبَحْرَيْنِ يَأْتِي بِجِزْيَتِهَا وَكَانَ النبي عَلَيهِ الصلاة والسّلام هُوَ صَالَحَ أَهْلَ الْبَحْرَيْنِ وَأَمَّرَ عَلَيْهِمْ الْعَلَاءَ بْنَ الْحَضْرَمِيِّ فَسَمِعَتْ الْأَنْصَارُ بِقُدُومِ أَبِي عُبَيْدَةَ بمال من البحرين فَوَافَتْ صَلَاةَ الصُّبْحِ مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) فَلَمَّا صَلَّى بِهِمْ الْفَجْرَ انْصَرَفَ فَتَعَرَّضُوا لَهُ فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حِينَ رَآهُمْ وَقَالَ أَظُنُّكُمْ قَدْ سَمِعْتُمْ أَنَّ أَبَا عُبَيْدَةَ قَدْ جَاءَ بِشَيْءٍ قَالُوا أَجَلْ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ فَأَبْشِرُوا وَأَمِّلُوا مَا يَسُرُّكُمْ فَوَاللَّهِ لَا الْفَقْرَ أَخْشَى عَلَيْكُمْ وَلَكِنْ

أَخْشَى عَلَيْكُمْ أَنْ تُبْسَطَ عَلَيْكُمْ الدُّنْيَا كَمَا بُسِطَتْ عَلَى مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ فَتَنَافَسُوهَا كَمَا تَنَافَسُوهَا وَتُهْلِكَكُمْ كَمَا أَهْلَكَتْهُمْ.

## (بەشی/ پێشبرکێ و مونافەسەکردن لەدونیادا، وە وەرگرتنی جزیە و سەرانە لە جولەکە و گاور و ئاگرپەرستەکان)

عەمری کوڕی عەوفی ئەنصاری دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەراحی نارد بۆ بەحرەین بۆ وەرگرتنی سەرانە (الجزیە) وە پێغەمبەر لەگەڵ خەڵکی بەحرەین ڕێك کەوتووبوو، وە عەلائی کوڕی حوزرومی کردبوو بەسەرداریان وە ئەنصارییەکان زانیان بە گەڕانەوەی ئەبو عوبەیدە لە بەحرەین بە ماڵ و سامانەوە ئیتر بۆ نوێژی بەیانی هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا و ئەویش نوێژی بەیانی بۆ کردن و گەڕایەوە جا ئەنصارییەکان لەوکاتەدا داوای بەشیان لێ کرد پێغەمبەریش لەو کاتەدا بزەیەك گرتی و فەرمووی وا دەزانم گوێتان لێ بوو کە ئەبو عوبەیدە شتی لەگەڵ خۆی هێناوە ئەوانیش وتیان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی مژدەبی لەئێوە خۆشیتان لێ بێت بەزاتی خوا قەسەم لە هەژاریتان ناترسم بە پێچەوانەوە مەترسی ئەوەم هەیە کە ئێوەش وەك ئوممەتەکانی پێشوو خۆشی دونیا  ڕووتان تێ بکات و دونیا بێت بە پیرتانەوە ئێوەش وەك ئەوان بە دەست و دەم پەلاماری دونیا بدەن و باوەشی پیا بکەن و بە هیلاك بچن چۆن ئەوان بە هیلاك چوون.

## باب ما يحذر من الغدر

وقوله تعالى: ﴿وَإِن يُرِيدُوٓاْ أَن يَخۡدَعُوكَ فَإِنَّ حَسۡبَكَ ٱللَّهُۚ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَيَّدَكَ بِنَصۡرِهِۦ وَبِٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٦٢﴾ وَأَلَّفَ بَيۡنَ قُلُوبِهِمۡۚ لَوۡ أَنفَقۡتَ مَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مَّآ أَلَّفۡتَ بَيۡنَ قُلُوبِهِمۡ﴾

## (بەشى/ خۆپاريزى لە غەدر و ستەم كردن)

**خواى گەورە دەفەرموێ ﴿وَإِن يُرِيدُوٓاْ أَن يَخۡدَعُوكَ فَإِنَّ حَسۡبَكَ ٱللَّهُۚ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَيَّدَكَ بِنَصۡرِهِۦ وَبِٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٦٢﴾ وَأَلَّفَ بَيۡنَ قُلُوبِهِمۡۚ لَوۡ أَنفَقۡتَ مَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مَّآ أَلَّفۡتَ بَيۡنَ قُلُوبِهِمۡ﴾ خۆ ئەگەر خوانەناسان بە داخوازى ريّك كەوتنو ئاشتى وويستيان بتخەڵەتێنن ئەوە دڵنيابە كە پشتيوانى خوا بەسە بۆت چونكە هەر ئەو زاتە كاتى خۆى پشتيوانى لىّ كردوون و سەرى خستبوون ئيماندارانى كردە هۆيەك بۆ سەركەوتن وە دڵەكانتانى بەست بەيەكەوە.**

**٤٢٨.عَنْ عَوْف بْنَ مَالِكٍ رَضي اللهُ عَنْهُ قَال: أَتَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ وَهُوَ فِي قُبَّةٍ مِنْ أَدَمٍ فَقَالَ: ((اعْدُدْ سِتًّا بَيْنَ يَدَيْ السَّاعَةِ، ثُمَّ فَتْحُ بَيْتِ الْمَقْدِسِ، ثُمَّ مُوْتَانٌ يَأْخُذُ فِيكُمْ كَقُعَاصِ الْغَنَمِ، ثُمَّ اسْتِفَاضَةُ الْمَالِ حَتَّى يُعْطَى الرَّجُلُ مِائَةَ دِينَارٍ فَيَظَلُّ سَاخِطًا، ثُمَّ فِتْنَةٌ لَا يَبْقَى بَيْتٌ مِنْ الْعَرَبِ إِلَّا دَخَلَتْهُ مَوتى، ثُمَّ هُدْنَةٌ تَكُونُ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ بَنِي الْأَصْفَرِ، فَيَغْدِرُونَ فَيَأْتُونَكُمْ تَحْتَ ثَمَانِينَ غَايَةً تَحْتَ كُلِّ غَايَةٍ اثْنَا عَشَرَ أَلْفًا)).**

عەوف كوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەفەرموێ لە جەنگی تەبوك هاتم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەناو گومەزێكی چەرمیدا بوو فەرمووی لە بەردەم هاتنی رۆژی قیامەت ئەم شەش شتانە بژمێرە، لەپاشان ئازاد كردنی قودس و ئەوجا مردنی بەكۆمەڵ وەكو نەخۆشییەك كە ڕانەمەڕێ بگرێ ئاوا مردنی زۆرتان لەناودا پەیدا دەبێ، ئەوجا ماڵ و سامان بە جۆرێكی وا زۆر دەبێ بە لێشاو بەسەرتان دەبارێ پیاوی وا هەیە سەد دیناری بدرێتێ هێشتا هەر لالوتە و پێی ناخۆشە، ئینجا فیتنەیەك پەیدا دەبێ هیچ ماڵی عەرەب نامێنێ فیتنە و ئاژاوەی تێ نەكەوێ، ئەوجا لە نێوان ئێوە و رۆمدا رێككەوتن و صوڵحێك پەیدا دەبێ، وە دوایی ئەوان ناپاك دەبن و پەیمان دەشكێنن بە هەشتا ئاڵاوە دێن بەرەو رووتان لە ژێر هەر ئاڵایەكدا دوانزە هەزار كەس دەبێت.

## باب إثم الغادر

٤٢٩.عَنْ عَبد الله بْنِ عُمَر رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَسول اللهِ (ﷺ) قال: ((لِكُلِّ غَادِرٍ لِوَاءٌ يُنْصَبُ بِغَدْرَتِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)).

## (بەشی/ تاوانی ستەمكار)

عەبدوڵلای كوڕی عومەر (رضي الله عنهما) دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا دەفەرموێ: ( لە رۆژی قیامەت بۆ هەر ستەمكارێ ئاڵایەكی تایبەتی خۆی هەیە بۆی دادەچەقێنن بەهۆی ئەو ستەمەی كە كردوویەتی هەتا پێی دەناسرێتەوە).

## باب بدء الخلق

٤٣٠. عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ) وَعَقَلْتُ نَاقَتِي بِالْبَابِ فَأَتَاهُ نَاسٌ مِنْ بَنِي تَمِيمٍ فَقَالَ(ص) اقْبَلُوا الْبُشْرَى يَا بَنِي تَمِيمٍ قَالُوا قَدْ بَشَّرْتَنَا فَأَعْطِنَا مَرَّتَيْنِ ثُمَّ دَخَلَ عَلَيْهِ نَاسٌ مِنْ أَهْلِ الْيَمَنِ فَقَالَ اقْبَلُوا الْبُشْرَى يَا أَهْلَ الْيَمَنِ إِذْ لَمْ يَقْبَلْهَا بَنُو تَمِيمٍ قَالُوا قَدْ قَبِلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالُوا جِئْنَاكَ نَسْأَلُكَ عَنْ هَذَا الْأَمْرِ قَالَ (ﷺ) كَانَ اللَّهُ وَلَمْ يَكُنْ شَيْءٌ غَيْرُهُ وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ وَكَتَبَ فِي الذِّكْرِ كُلَّ شَيْءٍ وَخَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ)).

## (بەشی / دەستپێکی دروستکراوان)

عیمرانی کوڕی حوصەین (رضي الله عنهما) دەفەرموێ چوومە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وە لەبەردەم مزگەوتی دا ووشترەکەم بەخ داو کۆمەڵێ لە بەنی تەمیم هاتن بۆ خزمەتی، فەرموی پێیان ئەی هۆزی تەمیم مزگێنی وەرگرن، ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا مژدەت پێ داوین چییە بمان دەرێ، دوو جار پێغەمبەر ئاوای پێ فەرموون ئەوانیش لە مەبەستی پێغەمبەر نەگەیشتن، فەرموی پێغەمبەر تێك چوو لە پاشان کۆمەڵێ لە خەڵکی یەمەن هاتنە خزمەتی وە پێی فەرمون ئەی خەڵکی یەمەن کە بەنی تەمیم مژدەیان قەبوڵ نەکرد ئێوە قەبوڵی بکەن ئەوانیش ووتیان قەبوڵمان کرد ئەی پێغەمبەری خوا، ووتیان هاتوین بۆ لات پرسیارت لێ دەکەین لە دروستبوونی دروستکراوان، ئیتر پێغەمبەر فەرموی خوای گەورە هەر هەبووە و دەمێنێ و جگە لەو کەسی تر نەبووە وەعەرش و بارەگای خودا لەسەر ئاوە وە لەلای

خۆی هەموو شتێکی نووسیوە لە دروستبوونی ئاسمانەکان و زەوی باس کردوە.

٤٣١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((لَمَّا قَضَى اللَّهُ الْخَلْقَ كَتَبَ فِي كِتَابِهِ فَهُوَ عِنْدَهُ فَوْقَ الْعَرْشِ إِنَّ رَحْمَتِي غَلَبَتْ غَضَبِي)).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (خوای گەورە لەو کاتەی دروستبوونی دروستکراوانی خۆی بۆوە لەپەڕاوێ نووسی کە لەلای خۆیەتی لەسەر عەرشی دای ناوە کە دەفەرموێ: (بەزەیی و رەحمەتی من زاڵە بەسەر خەشم و تورەییمدا).

## باب ذكر الملائكة، وأحب الله يحبكَ النّاس، وأطوار خلق النطفة

٤٣٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ إِذَا أَحَبَّ اللَّهُ الْعَبْدَ نَادَى جِبْرِيلَ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ فُلَانًا فَأَحْبِبْهُ فَيُحِبُّهُ جِبْرِيلُ فَيُنَادِي جِبْرِيلُ فِي أَهْلِ السَّمَاءِ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ فُلَانًا فَأَحِبُّوهُ فَيُحِبُّهُ أَهْلُ السَّمَاءِ ثُمَّ يُوضَعُ لَهُ الْقَبُولُ فِي الْأَرْضِ.

## (بەشی/ باسی فریشتەکان، وە ئەوەی خوا خۆشی بوێ خەڵکیش خۆشیان دەوێ وە هەنگاوەکانی دروست بوونی ئادەمی)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی ئەگەر خوا بەندەی خۆی خۆش ویست بانگی جوبرائیل دەکات و پێی دەڵێت خوا فولانەکەسی خۆش ویست تۆش خۆشت بوێ وە جوبرائیلیش خۆشی دەوێ وە جوبرائیل بانگەواز دەکات لە خەڵکی ئاسمانەکان کەوا خوای گەورە

فولآنە کەسی خۆش دەویٚ ئێوەش خۆشتان بویٚ ئەوانیش خۆشیان دەویٚ، لەپاشان بە هەمان شێوەش لەزەوی قەبولٚ و خۆشەویستی بۆ دێت.

٤٣٣.عَنْ زَيْدِ بْنِ وَهْبٍ قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بن مسعود (رضي الله عنه) حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَهُوَ الصَّادِقُ الْمَصْدُوقُ قَالَ إِنَّ أَحَدَكُمْ يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا ثُمَّ يَكُونُ عَلَقَةً مِثْلَ ذَلِكَ ثُمَّ يَكُونُ مُضْغَةً مِثْلَ ذَلِكَ ثُمَّ يَبْعَثُ اللَّهُ مَلَكًا فَيُؤْمَرُ بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ وَيُقَالُ لَهُ اكْتُبْ عَمَلَهُ وَرِزْقَهُ وَأَجَلَهُ وَشَقِيٌّ أَوْ سَعِيدٌ ثُمَّ يُنْفَخُ فِيهِ الرُّوحُ فَإِنَّ الرَّجُلَ مِنْكُمْ لَيَعْمَلُ حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجَنَّةِ إِلَّا ذِرَاعٌ فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ كِتَابُهُ فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ، أَهْلِ النَّارِ وَيَعْمَلُ، بعمل اهل النار حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ النَّارِ إِلَّا ذِرَاعٌ فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ.

زەیدی کوڕی وەهب دەفەرمویٚ: عەبدوڵلآی کوڕی مەسعود (رضي الله تعالى عنه) بۆی گێراینەوە کە دەیفەرموو راستگۆ (ﷺ) دەفەرمووی:

هەریەکیٚ لە ئێوە کە خودا دروستی دەکات چل رۆژ لە سکی دایکیا بە دڵۆپە ئاویٚ (نطفة) وە کۆدەکرێتەوە و دەمێنێتەوە ئینجا بە چل رۆژی تریش دەبیٚ بە پارچە خوێنێکی مەییو (عَلَقة) لە پاشان بە چل رۆژی تر دەبیٚ بە پارچە گۆشت بە قەد پارویٚ (مضغة) ئینجا لەپاش ئەم ماوەیە گیانی دەکریٚ بە بەریدا جا خودا فەرمان دەکات بە نووسینی چوار ووشە کە رزق و رۆزی و ئەجەل و تەمەنی و کار و کردەوەی وە بەد بەختە یان بەختیار و کامەرانە. وە کەسی وا هەیە کردار و رەفتاری وەك بەهەشتییە، بەلآم نامەی چارەنووسی دەستپێشخەری لیٚ دەکا و دەست دەکات بە کردنی کاری خەڵکی دۆزەخ و دەچێتە دۆزەخەوە، وەکەسی وا هەیە بە کردار و رەفتار لە

خەڵکی دۆزەخ دەچێ بەڵام نامەی چارەنوسی پێش دەستی لێ دەکا و ئاخیر خێر دەبێ و دەست بە کاری چاکە دەکات و دەچێتە بەهەشتەوە.

٤٣٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) إِذَا كَانَ يَوْمُ الْجُمُعَةِ كَانَ عَلَى كُلِّ بَابٍ مِنْ أَبْوَابِ الْمَسْجِدِ الْمَلَائِكَةُ يَكْتُبُونَ الْأَوَّلَ فَالْأَوَّلَ فَإِذَا جَلَسَ الْإِمَامُ طَوَوْا الصُّحُفَ وَجَاءُوا يَسْتَمِعُونَ الذِّكْرَ.

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لە پێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێ ئەگەر ڕۆژی هەینی داهات لەبەر دەرگاکانی هەموو مزگەوتەکاندا فریشتە ئامادە دەبن و قەڵەم و پەڕاو بە دەستەوەن یەك لە دوای یەك ناوی ئەو کەسانە دەنوسن کە دێن بۆ نوێژی هەینی، تا ئەو کاتەی ووتارخوێن ووتار دەدات و ئەوانیش دێن و پەڕاوەکان دەپێچنەوە گوێ لە ووتار ڕادەگرن.

٤٣٥. عَنْ أَبِي ذَرٍّ رَضِيَ اللَّهُ تعالى عَنْهُ قَال: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) : ((قَالَ لِي جِبْرِيلُ مَنْ مَاتَ مِنْ أُمَّتِكَ لَا يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا دَخَلَ الْجَنَّةَ أَوْ لَمْ يَدْخُلْ النَّارَ قَالَ أبو ذر: وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ؟ قَالَ رسول الله (ﷺ): (وإنْ)

ئەبو زەر (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی جوبرائیل پێی فەرموم (عليه السلام) کەسێ لە ئۆممەتی تۆ بمرێ و شەریك و هاوەڵی بۆ خوا بڕیار نەدات دەچێتە بەهەشتەوە یان ناچێتە دۆزەخ، ئەبو زەر ووتی ئەگەر زینا و دزی کردبێ؟ پێغەمبەری(ص) فەرموی ئەگەر ئەویشی کردبێ.

٤٣٦. عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: حَشَوْتُ لِلنَّبِيِّ (ﷺ) وِسَادَةً فِيهَا تَمَاثِيلُ كَأَنَّهَا نُمْرُقَةٌ فَجَاءَ فَقَامَ بَيْنَ الْبَابَيْنِ وَجَعَلَ يَتَغَيَّرُ وَجْهُهُ فَقُلْتُ مَا لَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ مَا بَالُ هَذِهِ الْوِسَادَةِ قَالَتْ وِسَادَةٌ جَعَلْتُهَا لَكَ لِتَضْطَجِعَ عَلَيْهَا قَالَ أَمَا عَلِمْتِ أَنَّ الْمَلَائِكَةَ لَا تَدْخُلُ بَيْتًا فِيهِ صُورَةٌ وَأَنَّ مَنْ صَنَعَ الصُّورَةَ يُعَذَّبُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَقُولُ أَحْيُوا مَا خَلَقْتُمْ.

عائیشەخان (رضي الله عنها) دەفەرموێ : بەرماڵێکم بۆ پێغەمبەر (ﷺ) راخست بۆ ئەوەی لەسەری بخەوێ وە هەندێك وێنەی تیابوو کە هاتەوە تەماشای کرد ئینجا رەنگی گۆڕا منیش ووتم ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە چیتە بۆ رەنگت تێك چووە، ئەویش فەرمووی ئەم بەرماڵە چییە؟ منیش پێم ووت ئەم بەرماڵەم بۆ راخستووی کە لەسەری بخەوی، فەرموی ئایا نازانی فریشتەکانی خوا ناچنە ئەو ماڵەی کە وێنەی تیا دابێ وەکەسێ ئەم وێنانە دروست بکات لە رۆژی دوایی سزا دەدرێت و پێی دەوترێت زیندوو بکەنەوە و رۆحی بکەن بەبەریدا ئەوەی دروستان کردوە.

## باب من دعا إمرأته إلى فراشه فأبت

٤٣٧.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) إِذَا دَعَا الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ إِلَى فِرَاشِهِ فَأَبَتْ فَبَاتَ غَضْبَاناً عَلَيْهَا لَعَنَتْهَا الْمَلَائِكَةُ حَتَّى تُصْبِحَ.

## (بەشی/ کەسێ داوای سەرجێی لە ئافرەتێ بکات و ئەویش خۆی لێ قەدەغە بکات)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی کاتێ پیاو داوای سەرجێی (جیماع) لە ئافرەتی خۆی کرد و ئەویش ملی نەدا و گوێڕایەڵێ نەکرد ئەو شەوە هەتاکو بەیانی فریشتانی خوا لەعنەت و نەفرین لەو ئافرەتە دەکەن.

## باب صفة الجنة وأهلها وَما أعدَّ لَهُمْ

٤٣٨.عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ قَالَ النبي (ﷺ) إِذَا مَاتَ أَحَدُكُمْ فَإِنَّهُ يُعْرَضُ عَلَيْهِ مَقْعَدُهُ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ فَإِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَمِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ وَإِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ فَمِنْ أَهْلِ النَّارِ.

## (بەشی/ شێوەی بەهەشت وخەڵکەکەی و ئەوەی بۆیان ئامادەکراوە)

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (رضي الله عنهما) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (ئەگەر کەسێ لە ئێوە مرد هەموو بەیانیان و ئێواران شوێنی خۆی پێ نیشان دەدرێت ئەگەر بەهەشتی بێت بە هەشت و وە ئەگەر دۆزەخی بێت، دۆزەخ).

٤٣٩.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ عَنْ رَسُولُ الله (ﷺ) قال قَالَ اللهُ عز وجل: أَعْدَدْتُ لِعِبَادِي الصَّالِحِينَ مَا لَا عَيْنٌ رَأَتْ وَلَا أُذُنٌ سَمِعَتْ وَلَا خَطَرَ عَلَى قَلْبِ بَشَرٍ، فَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ ﴾.

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: خوای گەورە دەفەرموێ( ئامادەم کردوە بۆ بەندە چاکەکانم شتێ کە نەچاو شوێنی وای نەدیتوە وە گوێ نەی بیستووە وە بەخەتەرە و خەیاڵیش بەسەر دڵی هیچ کەسێکدا نەهاتووە).ئەگەر حەز دەکەن ئەم ئایەتە بخوێننەوە ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ ﴾.واتە: نەفسی ئادەم نازانێ کە چ شتێکی شاراوەی بۆ ئامادەکراوە کە چاوولا پێ روون بێتەوە.

٤٤٠. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنّ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: أَوَّلُ زُمْرَةٍ تَلِجُ الْجَنَّةَ صُورَتُهُمْ عَلَى صُورَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ لَا يَبْصُقُونَ فِيهَا وَلَا يَمْتَخِطُونَ

وَلَا يَتَغَوَّطُونَ آنِيَتُهُمْ فِيهَا الذَّهَبُ أَمْشَاطُهُمْ مِنْ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَمَجَامِرُهُمْ الْأَلُوَّةُ وَرَشْحُهُمْ الْمِسْكُ وَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمْ زَوْجَتَانِ يُرَى مُخُّ سُوقِهِمَا مِنْ وَرَاءِ اللَّحْمِ مِنْ الْحُسْنِ لَا اخْتِلَافَ بَيْنَهُمْ وَلَا تَبَاغُضَ قُلُوبُهُمْ قَلْبٌ وَاحِدٌ يُسَبِّحُونَ اللَّهَ بُكْرَةً وَعَشِيًّا.

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (یەکەم دەستەیێ کە دەچنە بەهەشت لەسەر شێوەی مانگی شەوی چواردە ئاوا گەشن و نازدارن لەناو بەهەشتیەکاندا دیارن وە نە تفیان هەیە و وە نە میز و پیسایی و نە بەڵغەمیان هەیە، وە قاپ و قاچاغیان لە زێڕە و ئەو شانەی سەریان پێ شانە دەکەن لە زێڕەو زیوە ئارەقەیان بۆنی میسکە و ئافرەتاکانیان پەری چاوگەشن وە بۆ هەر یەکێکیان دوو ئافرەتی رێك و ناسکن کە موخی ئێسکی قاچیان لەناو گۆشتدا دیارن لە بەر جوانی، وە رق و کینە لەنێوانیان دانییە وە دڵیان وەکو دڵی پیاوێکە وەیادی خودا دەکەن بەیانیان و ئێواران).

٤٤١. عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ رضي اللهُ عنهُ عنْ النبي(ﷺ) قَالَ لَيَدْخُلَنَّ الْجَنَّةَ مِنْ أُمَّتِي سَبْعُونَ أَلْفًا أَوْ سَبْعَمِائَةِ أَلْفٍ لَا يَدْخُلُ أَوَّلُهُمْ حَتَّى يَدْخُلَ آخِرُهُمْ وُجُوهُهُمْ عَلَى صُورَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ.

سەهلی کوڕی سەعد (رضي الله عنه) فەرموی پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (لەئوممەتی من حەفتا هەزار یان حەوت سەد هەزار دەچنە بەهەشت سەرەتایەکەیان ناچێ تاکو کۆتاییەکەیان نەچێت وە دەم و چاویان گەشاوەیە وەکو وێنەی مانگی شەوی چواردە).

## باب صفة النّار وأهلها فيها

٤٤٢. عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) اشْتَكَتْ النَّارُ إِلَى رَبِّهَا، فَقَالَتْ رَبِّ أَكَلَ بَعْضِي بَعْضًا، فَأَذِنَ لَهَا بِنَفَسَيْنِ نَفَسٍ فِي الشِّتَاءِ وَنَفَسٍ فِي الصَّيْفِ فَأَشَدُّ مَا تَجِدُونَ مِنْ الْحَرِّ وَأَشَدُّ مَا تَجِدُونَ مِنْ الزَّمْهَرِيرِ.

## (بەشی/ شێوەی ئاگری دۆزەخ و خەڵکەکەی تیادا)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (ئاگری دۆزەخ شکاتی حاڵی خۆی کرد لەلای پەروەردگاری و ووتی پەروەردگارم هەندێکم هەندێکی خواردەوە ئینجا خوا مۆڵەتی دا کە دووجار هەناسە بدات یەکێکیان لە هاویندا و ئەوەی تریان لەزستاندا و وە لە هاوین کە بە توندترین گەرمییە لە هاویندا، وە توندترین ساردیە لە زستاندا).

٤٤٣. وَعَنْهُ أيضاً قال: قال (ﷺ) قَالَ نَارُكُمْ جُزْءٌ مِنْ سَبْعِينَ جُزْءًا مِنْ نَارِ جَهَنَّمَ قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنْ كَانَتْ لَكَافِيَةً قَالَ فُضِّلَتْ عَلَيْهِنَّ بِتِسْعَةٍ وَسِتِّينَ جُزْءًا كُلُّهُنَّ مِثْلُ حَرِّهَا.

دیسان لە ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (ئەو ئاگرەی ئێوە بەکاردەهێنن بەشێکە لە حەفتا بەشی ئاگری دۆزەخ، ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا خۆ ئاگری دۆزەخ بەقەد ئاگری دونیا گەرم بێ بەسە، فەرموی دەسا شەست و نۆ جار لەم ئاگرەی ئێوە گەرم ترە).

٤٤٤. عَنْ أُسامة بن زيد بن الحارث رَضِي الله عَنْهُ قال: قال رسول الله صلى الله عليه وآلِه وسلم: ((يُجَاءُ بِالرَّجُلِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيُلْقَى فِي النَّارِ فَتَنْدَلِقُ أَقْتَابُهُ فِي النَّارِ فَيَدُورُ كَمَا يَدُورُ الْحِمَارُ بِرَحَاهُ فَيَجْتَمِعُ أَهْلُ النَّارِ عَلَيْهِ فَيَقُولُونَ أَيْ

فُلَانُ مَا شَأْنُكَ أَلَيْسَ كُنْتَ تَأْمُرُنَا بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَانَا عَنْ الْمُنْكَرِ قَالَ كُنْتُ آمُرُكُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَلَا آتِيهِ وَأَنْهَاكُمْ عَنْ الْمُنْكَرِ وَآتِيهِ)).

**ئوسامەی کوڕی زەیدی کوڕی حاریس (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (لە ڕۆژی قیامەت دا بازێ پیاوێنن دەیخەنە ناو ئاگری دۆزەخ ریخۆڵەکانی دەدرێنەدەرەوە وەك چۆن گوێدرێژ بە دەوری ئاعور دەسورێتەوە ئەوانیش ئاوها بە دەوری خۆی دەسورێتەوە وە خەڵکی دۆزەخ لێی کۆدەبنەوە پێی دەڵێن تۆ فلانە کەس نیت بۆچی کەوتویتە ناو دۆزەخ ئایا تۆ فەرمانت بە ئێمە دەکرد بە چاکە و قەدەغەت دەکردین لە خراپە ئەویش دەڵێ بەڵێ فەرمانی چاکەم لەگەڵ دەکردن بەڵام خۆم نەم دەکرد وە قەدەغەی خراپەم دەکرد و وەخۆم دەم کرد).**

## باب إتقاء الشياطين

٤٤٥. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ أَمَا إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا أَتَى أَهْلَهُ قَالَ بِسْمِ اللَّهِ اللَّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ وَجَنِّبْ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا فَرُزِقَا وَلَدًا لَمْ يَضُرَّهُ الشَّيْطَانُ.

## (بەشی/ خۆپاراستن لە شەیتانەکان)

**لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (رضي الله عنهما) لە پێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێ: (کاتێ یەکێ لە ئێوە دەیەوێ سەرجێی لەگەڵ خێزانی خۆی بکات وە بڵێ (بەناوی خوا خوایە شەیتانمان لە کۆڵ بکەرەوە و دووربخەرەوە وە شەیتانیش دوور بخەرەوە لەو منداڵەی دەیدەی بە ئێمە، ئەگەر لەم جار خوا منداڵی پێ بەخشین هەرگیز شەیتان زیانی بۆیان نابێت).**

٤٤٦.عَنْ جَابِرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ إِذَا اسْتَجْنَحَ اللَّيْلُ أَوْ كَانَ جُنْحُ اللَّيْلِ فَكُفُّوا صِبْيَانَكُمْ فَإِنَّ الشَّيَاطِينَ تَنْتَشِرُ حِينَئِذٍ فَإِذَا ذَهَبَ سَاعَةٌ مِنْ الْعِشَاءِ فَخَلُّوهُمْ وَأَغْلِقْ بَابَكَ وَاذْكُرْ اسْمَ اللَّهِ وَأَطْفِئْ مِصْبَاحَكَ وَاذْكُرْ اسْمَ اللَّهِ وَأَوْكِ سِقَاءَكَ وَاذْكُرْ اسْمَ اللَّهِ وَخَمِّرْ إِنَاءَكَ وَاذْكُرْ اسْمَ اللَّهِ وَلَوْ تَعْرُضُ عَلَيْهِ شَيْئًا.

جابیر (رضي الله عنه) له پێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە كە دەفەرمویَ: (كە سەرەتای شەو داهات-یان تاریكی شەو باڵی كێشا- ئیتر لەو كاتەدا منالەكانتان بگرنەوە وە نەهێڵن بێنە دەرەوە و بڵاوببنەوە چونكە شەیتانەكان لەو كاتەدا پەرش و بڵاودەبنەوە، وە ئەگەر كاتی عیشا تێپەڕی ئیتر رێگای هامۆشییان لیَ مەگرن، دەرگاكەت دابخە و ناوی خودا بهێنەوە چراكەت بكوژێنەوە و ناوی خوا بهێنە وە دەمی كوندەی ئاو و مەشكە و دۆڵچە و هەمبانە دابخەن و ناوی خوای لەسەر بهێنن و قاپ و قاچاغی سەری لەسەری دابنێن و ناوی خوا بهێنن بۆ ئەوەی شتی بەسەردا نەڕوات).

٤٤٧.عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ رَضِي الله عَنْهُما عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعلى آلِه وَسَلَّمَ: ((الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ مِنْ اللَّهِ وَالْحُلُمُ مِنْ الشَّيْطَانِ فَإِذَا حَلَمَ أَحَدُكُمْ حُلُمًا يَخَافُهُ فَلْيَبْصُقْ عَنْ يَسَارِهِ وَلْيَتَعَوَّذْ بِاللَّهِ مِنْ شَرِّهَا فَإِنَّهَا لَا تَضُرُّهُ)).

عەبدوڵڵای كوڕی ئەبی قەتادە (رضي الله عنهما) لەباوكی دەگێڕێتەوە كە دەفەرمویَ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (خەوی چاك لەلایەن خواوەیەو خەوی خراپیش لەلایەن شەیتانەوەیە، وە ئەگەر كەسیَ خەوی دیت و ترسا لێی با تف لەلای چەپی بكاتو خۆی پەنابدات بە خوا لە خراپەی، ئەوا زیانی بۆ ئەو نابێت).

٤٤٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ مَنْ قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ فِي يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ كَانَتْ لَهُ عَدْلَ عَشْرِ رِقَابٍ وَكُتِبَتْ لَهُ مِائَةُ حَسَنَةٍ وَمُحِيَتْ عَنْهُ مِائَةُ سَيِّئَةٍ وَكَانَتْ لَهُ حِرْزًا مِنْ الشَّيْطَانِ يَوْمَهُ ذَلِكَ حَتَّى يُمْسِيَ وَلَمْ يَأْتِ أَحَدٌ بِأَفْضَلَ مِمَّا جَاءَ بِهِ إِلَّا أَحَدٌ عَمِلَ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ.

**ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی کەسێ ئەم زیکرە بڵێ: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) لە ڕۆژێکدا سەد جار ئەوا وەکو دە بەندی ئازاد کردبێ وایە و خێری سەد چاکەی بۆ دەنوسرێ و سەد تاوانی لەسەر لادەچێت و وە ئەو ڕۆژە تاکو ئێوارە لە شەر و خراپەی شەیتان بەدوور دەبێت وە کەسێ بەقەد ئەو گەورەتر لەو نیە تەنها ئەگەر یەکێکی تر لەو زیاتر بکات.**

٤٤٩. وَعَنْهُ أيضاً أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ إِذَا سَمِعْتُمْ صِيَاحَ الدِّيَكَةِ فَاسْأَلُوا اللَّهَ مِنْ فَضْلِهِ فَإِنَّهَا رَأَتْ مَلَكًا وَإِذَا سَمِعْتُمْ نَهِيقَ الْحِمَارِ فَتَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنْ الشَّيْطَانِ فَإِنَّهُ رَأَى شَيْطَانًا.

**ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر گوێتان لە دەنگی بانگی کەڵەشێر بوو داوای پیت و بەرەکەت و فەزڵی لە خوابکەن چونکە ئەو فریشتانی خوا دەبینێ، وە ئەگەر گوێتان لە دەنگی زەڕەی گوێدرێژ بوون پەنا بدەن بەخوا لە شەیتان چونکە شەیتانی بینیوە).**

## باب الدواب الفواسِق

٤٥٠. عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ خَمْسٌ فَوَاسِقُ يُقْتَلْنَ فِي الْحَرَمِ الْفَأْرَةُ وَالْعَقْرَبُ وَالْحُدَيَّا وَالْغُرَابُ وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ.

### (بەشی/ ئەو گیانەوەرانەی کە خراپن)

عائیشە (رضي الله عنها) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (پێنج گیانەوەر هەن ئەگەر ئێوە لە خاکی حەرەم دابن دروستە کوشتنیان ئەوانیش: مشك و دووپشك و كوڵارە و قەڵەرەشە و سەگی هار (نەهێنی گر)).

## باب كراهة قتل الهِّرة

٤٥١. عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ دَخَلَتْ امْرَأَةٌ النَّارَ فِي هِرَّةٍ رَبَطَتْهَا فَلَمْ تُطْعِمْهَا وَلَمْ تَدَعْهَا تَأْكُلُ مِنْ خَشَاشِ الْأَرْضِ.

### (بەشی کەراهەتی کوشتنی پشیلە)

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنهما) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە دەفەرموێ: (ئافرەتێ چووەناو ئاگری دۆزەخ بەهۆی پشیلەیەکەوە بەندی کرد و خواردنی پێ نەداو وە بەڕەڵای نەکرد تاکوبۆخۆی لە خۆراکی زەوی بخوات تاکو مرد).

## باب إذا وقعَ الذباب في الإناء

٤٥٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ عَنْ رَسولَ الله (ﷺ) قَالَ إِذَا وَقَعَ الذُّبَابُ فِي شَرَابِ أَحَدِكُمْ فَلْيَغْمِسْهُ ثُمَّ لِيَنْزِعْهُ فَإِنَّ فِي إِحْدَى جَنَاحَيْهِ دَاءً وَالْأُخْرَى شِفَاءً.

## (بەشی/ ئەگەر میشوولە کەوتە ناو خواردنەوەتانەوە)

ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (ئەگەر مێشوولە کەوتە ناو خواردنەوەی یەکێکتان با هەموو نقومی خواردنەوەکە (ئاوەکە) بکات دوای دەری بهێنێ و خواردنەوەکە بخواتەوە چونکە لابالێکی دەردە و لابالەکەی تری شیفا و چاکردنەوەی تیایە).

## باب إزالة كبيرة بفضل سقي الماء

٤٥٣. وَعَنْهُ أيضاً أنَّ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) قَالَ غُفِرَ لامْرَأَةٍ مُومِسَةٍ مَرَّتْ بِكَلْبٍ عَلَى رَأْسِ رَكِيٍّ يَلْهَثُ قَالَ كَادَ يَقْتُلُهُ الْعَطَشُ فَنَزَعَتْ خُفَّهَا فَأَوْثَقَتْهُ بِخِمَارِهَا فَنَزَعَتْ لَهُ مِنْ الْمَاءِ فَغُفِرَ لَهَا بِذَلِكَ.

## (بەشی/ لاچوونی گوناهی گەورە بەهۆی ئاودانی گیانەوەرێك)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (خوای گەورە لە ئافرەتێکی داوێن پیسی بورد و لێی خۆش بوو کە بەلای سەگێك دا رابورد و دیتی لە لێواری پردێك وەستاوە لە تێنویان نزیك بووە بمرێ ئەویش بە پێڵاوەکانی ئاوی بە جلەکانی هەڵکێشا لەناو بیرەکە وە سەگەکەی تێری ئاو کرد خواش لێی بورد بەهۆی ئەم چاکەوەیەوە).

## باب خلق آدم صلوات الله وسلامه عليه، وذريتهُ

٤٥٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أنّ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: خَلَقَ اللهُ آدَمَ عليه الصلاة والسلام وَطُولُهُ سِتُّونَ ذِرَاعًا ثُمَّ قَالَ اذْهَبْ فَسَلِّمْ عَلَى أُولَئِكَ مِنْ الْمَلَائِكَةِ فَاسْتَمِعْ مَا يُحَيُّونَكَ تَحِيَّتُكَ وَتَحِيَّةُ ذُرِّيَّتِكَ فَقَالَ السَّلَامُ عَلَيْكُمْ فَقَالُوا السَّلَامُ عَلَيْكَ وَرَحْمَةُ اللهِ فَكُلُّ مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ عَلَى صُورَةِ آدَمَ فَلَمْ يَزَلْ الْخَلْقُ يَنْقُصُ حَتَّى الْآنَ.

## (بەشی/ دروستکردنی (ئادەم)
## علیه السلام و نەوەکانی ئەو)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (خوای گەورە ئادەمی دروست کرد درێژی بەژن و باڵای شەست باڵ بوو لە پاشان پێی فەرموو برۆ سڵاو لەو فریشتانە بکە و گوێیان بۆ بگرە چۆن وەڵامی سڵاوی خۆت و نەوەکانت دەدەنەوە، ئەویش وتی (السلام علیکم) وتیان (السلام علیك ورحمه الله) وە هەرکەسێ بچێتە بەهەشت لەسەر شێوەی ئادەمی دەبێت وە بەردەوام خەڵکی بەژن و باڵایان کەم دەبێت و کورت دەبێت هەتاکو ئێستا).

٤٥٥. وَعَنْهُ أيضاً أَنَّ رَسُولُ الله (ﷺ) قالَ إِنَّ أَوَّلَ زُمْرَةٍ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ عَلَى صُورَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ عَلَى أَشَدِّ كَوْكَبٍ دُرِّيٍّ فِي السَّمَاءِ إِضَاءَةً لَا يَبُولُونَ وَلَا يَتَغَوَّطُونَ وَلَا يَتْفِلُونَ وَلَا يَمْتَخِطُونَ أَمْشَاطُهُمْ الذَّهَبُ وَرَشْحُهُمْ الْمِسْكُ وَمَجَامِرُهُمْ الْأَلُوَّةُ الْأَنْجُوجُ عُودُ الطِّيبِ وَأَزْوَاجُهُمْ الْحُورُ الْعِينُ عَلَى خَلْقِ رَجُلٍ وَاحِدٍ عَلَى صُورَةِ أَبِيهِمْ آدَمَ سِتُّونَ ذِرَاعًا فِي السَّمَاءِ.

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێ: (یەکەم تاقمێ کە دەچنە بەهەشتەوە لەسەر شێوەی مانگی لەشەوی چواردە وە ئەوانەی لە پاش ئەوان دێن لەشێوەی ئەستێرەی درەوشاوەن کە ئاسمان دەرازێننەوە گەشاوەترن وەنەمیزیان هەیە و نەپاشەڕۆ وە نە تف و بەڵغەمیان، شانەیان لە زێڕە و ئارەقەیان بۆنی میسکە و بوخوریان عودە و وە خێزانەکانیان حۆری چاوگەورە و گەشن، لەسەر شێوەی دروستبوونی پیاوێکن لەسەر شێوەی باوکیان کە ئادەمە ئادەمن کە شەست باڵە بەژن و باڵایان لە ئاسمان).

## باب الأرواح جنود مجندة

٤٥٦. عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ الْأَرْوَاحُ جُنُودٌ مُجَنَّدَةٌ فَمَا تَعَارَفَ مِنْهَا ائْتَلَفَ وَمَا تَنَاكَرَ مِنْهَا اخْتَلَفَ.

## (بەشی/ گیان سەربازی مەشقکراوە)

عائیشە خان (رضي الله عنها) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) بوو فەرموی: (گیانەکان (روح) سەربازی مەشقکراون، ئەوەی ئاشنای لەگەڵ بکات هۆگری دەبێ و ئەوەی نەیناسێ لێی دوور دەکەوێتەوە).

## باب ما جاء في سيدنا إبراهيم الخليلْ صلوات اللهِ وسلامهُ عليهِ

٤٥٧.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَال: قَالَ رَسُولُ اللهُ (ﷺ): ((اخْتَتَنَ إِبْرَاهِيمُ عَلَيْهِ السَّلَام وَهُوَ ابْنُ ثَمَانِينَ سَنَةً بِالْقَدُّومِ)).

## (بەشی/ دەربارەی حەزرەتی ئیبراهیم (علیه الصلاه والسلام))

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (ئیبراهیم پێغەمبەر (علیه السلام) لە تەمەنی هەشتا ساڵی لە گوندی قودوم خۆی سوننەت کرد).

٤٥٨.عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ يَرْحَمُ اللَّهُ أُمَّ إِسْمَاعِيلَ لَوْلَا أَنَّهَا عَجِلَتْ لَكَانَ زَمْزَمُ عَيْنًا مَعِينًا

عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (رضي الله عنهما) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (رەحمەتی خوا لە دایکی ئیسماعیل بێ ئەگەر پەلەی نەکردبا لە ئاوی زەمزەم، کانی زەمزەم دەبو بە کانیا و بە خوڕ ئاوی لەبەر دەڕۆیشت).

٤٥٩.عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يُعَوِّذُ الْحَسَنَ وَالْحُسَيْنَ وَيَقُولُ: ((إِنَّ أَبَاكُمَا كَانَ يُعَوِّذُ بِهَا إِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّةِ مِنْ كُلِّ شَيْطَانٍ وَهَامَّةٍ وَمِنْ كُلِّ عَيْنٍ لَامَّةٍ)).

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (رضي الله عنهما) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) دوعای چاوپیس و چاوزاری بۆ حەسەن و حوسێن (کچەزای) خۆی دەکرد و دەیفەرموو (أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّةِ مِنْ كُلِّ شَيْطَانٍ وَهَامَّةٍ وَمِنْ كُلِّ عَيْنٍ لَامَّةٍ) واتە: لە پەنای ووشە تەواوەکانی خوا لامەدەن لە زیانی هەموو شەیتانێ، وە خودا بتانپارێزێ لە گەزتنی هەموو مێرووڵەیێ وە بێ چاوینی بێ لە چاو پیسی تاوانبار) دەیفەرموو بابە گەورەتان ئیبراهیم لە کاتی خۆی بەم ووشانە دوعای چاوزاری بۆ ئیسماعیل و ئیسحاقی کوری دەکرد.

## باب سبب نتن اللحم

٤٦٠.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) لَوْلَا بَنُو إِسْرَائِيلَ لَمْ يَخْنَزْ اللَّحْمُ وَلَوْلَا حَوَّاءُ لَمْ تَخُنْ أُنْثَى زَوْجَهَا الدَّهْرَ.

## (بەشی/ هۆی گەنی بوونی گۆشت)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (ئەگەر بەهۆی جولەکانەوە نەبوایە هەرگیز گۆشت گەنیو نەدەبوو وە ئەگەر بەهۆی دایکە حەواش نەبوایە هەتا هەتایە هیچ ژنێ گزی و ناپاکی لە مێردی خۆی نەدەکرد چونکە لە پێش دا حەوا لە بەهەشتدا فریودرا وە ئادەمیشی فریودا و لە بەهەشت دەرکران)

## باب صلاة داود عليهِ السلام وصيامهُ

٤٦١.عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو قَال: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَحَبُّ الصِّيَامِ إِلَى اللَّهِ صِيَامُ دَاوُدَ كَانَ يَصُومُ يَوْمًا وَيُفْطِرُ يَوْمًا وَأَحَبُّ الصَّلَاةِ إِلَى اللَّهِ صَلَاةُ دَاوُدَ كَانَ يَنَامُ نِصْفَ اللَّيْلِ وَيَقُومُ ثُلُثَهُ وَيَنَامُ سُدُسَهُ.

## (بەشی/ نوێژی داود و ڕۆژووەكەی (عليه السلام))

عەبدوڵڵای كوڕی عەمر دەفەرموێ پێغەمبەری خوا پێی فەرموم (ﷺ) خۆشەویسترین ڕۆژوو، ڕۆژووی داودە (عليه السلام) كە ڕۆژێك نا ڕۆژێك بە ڕۆژەوە دەبوو، وە خۆشەویسترین نوێژیش لەلای خوا نوێژی داود پێغەمبەر (عليه السلام) كە لە شەودا تا نیوەی شەو دەنوست و سێیەكی هەڵدەستا و لەشەش یەكی شەو دەنوستەوە.

## باب تهافت النّاس كالفراش

٤٦٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَاللهُ عَنْهُ قالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ مَثَلِي وَمَثَلُ النَّاسِ كَمَثَلِ رَجُلٍ اسْتَوْقَدَ نَارًا فَجَعَلَ الْفَرَاشُ وَهَذِهِ الدَّوَابُّ تَقَعُ فِي النَّارِ.

## (بەشی/ هەڵمەت بردنی خەڵكان بۆ دونیا وەكو پەپولە)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەیفەرموو: (نموونەی من و خەڵكان وەكو نمونەی پیاوێكە ئاگرێك دادەگیرسێنی و ئینجا پەپولەكانیش و میشولەش بەدەوری دا پەلە بكەن وپەلاماری چراكە بدەن و لە ئەنجام دا خۆیان دەخەنە ناو ئاگرەكە و دەسوتێن).

## باب نزول عيسى إبن مريم عليهِ السلام

٤٦٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَيُوشِكَنَّ أَنْ يَنْزِلَ فِيكُمْ ابْنُ مَرْيَمَ حَكَمًا عَدْلًا فَيَكْسِرَ الصَّلِيبَ وَيَقْتُلَ الْخِنْزِيرَ وَيَضَعَ الْجِزْيَةَ وَيَفِيضَ الْمَالُ حَتَّى لَا يَقْبَلَهُ أَحَدٌ حَتَّى تَكُونَ السَّجْدَةُ الْوَاحِدَةُ خَيْرًا مِنْ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا.

## (بەشی/ دابەزینی عیسای کوڕی مەریەم (علیه السلام)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (سوێندم بەوەی گیانی منی بەدەستە نزیکە عیسای کوڕی مەریەم دابەزێتە خوارەوە بۆلاتان و بەدادپەرەوری حوکم بکات لە نێوانتان و خاچ بشکێنێ بەرازان دەکوژێ وە جیزیە و سەرانە هەڵدەگرێ، ماڵ و سامانیش زۆر دەبێت و کەس وەری ناگرێ وە نوێژ و خواپەرستی ئەوەندە کەم دەبێتەوە کە وای لێ دێت یەك کرنۆش بردن بۆ خوا لەهەموو دونیا و ئەوەی لە ناوی دایە باشترە).

## باب ما ذكَرَ عنْ بني إسرائيل

٤٦٤. عنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضي الله عَنْهُ أَنَّ رَسُول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِه وَسَلَّمَ قَال: ((كَانَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ تَسُوسُهُمْ الْأَنْبِيَاءُ كُلَّمَا هَلَكَ نَبِيٌّ خَلَفَهُ نَبِيٌّ وَإِنَّهُ لَا نَبِيَّ بَعْدِي وَسَيَكُونُ خُلَفَاءُ فَيَكْثُرُونَ قَالُوا فَمَا تَأْمُرُنَا قَالَ فُوا بِبَيْعَةِ الْأَوَّلِ فَالْأَوَّلِ أَعْطُوهُمْ حَقَّهُمْ فَإِنَّ اللَّهَ سَائِلُهُمْ عَمَّا اسْتَرْعَاهُمْ)).

## (بەشی/ باسی بەنی ئیسرائیل)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی بەنی ئیسرائیلیەکان کاروباریان سپاردبوو بە پێغەمبەرەکانیانەوە هەر پێغەمبەری کۆچی بکردبا پێغەمبەرێکی تر جێگای ئەوی دەگرتەوە و رێنمایی خەڵکی

دەكرد وەبزانن كە هیچ پێغەمبەرێ لەدوای من نایەت و دواین پێغەمبەرم وە لە پاش خۆم جۆرەهاجێنشینێ پەیدا دەبن و هاوەڵان ووتیان چۆن فەرمانما پێ دەكەی؟ پێغەمبەری خوا فەرموی فەرمانی جێنشینی یەكەمەوە لە یەكەم جێبەجێ بكەن و وە مافی خۆیان بدەن چونكە خوای گەورە پرسیارتان لێ دەكات بەرامبەر ئەوانەی لە ژێر دەستیان دان.

٤٦٥. عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَسُولِ الله (ﷺ) قَالَ: إِنَّمَا أَجَلُكُمْ فِي أَجَلِ مَنْ خَلَا مِنْ الْأُمَمِ مَا بَيْنَ صَلَاةِ الْعَصْرِ إِلَى مَغْرِبِ الشَّمْسِ، وَإِنَّمَا مَثَلُكُمْ وَمَثَلُ الْيَهُودِ وَالنَّصَارَى كَرَجُلٍ اسْتَعْمَلَ عُمَّالًا فَقَالَ مَنْ يَعْمَلُ لِي إِلَى نِصْفِ النَّهَارِ عَلَى قِيرَاطٍ قِيرَاطٍ، فَعَمِلَتْ الْيَهُودُ إِلَى نِصْفِ النَّهَارِ عَلَى قِيرَاطٍ قِيرَاطٍ ثُمَّ قَالَ مَنْ يَعْمَلُ لِي مِنْ نِصْفِ النَّهَارِ إِلَى صَلَاةِ الْعَصْرِ عَلَى قِيرَاطٍ قِيرَاطٍ؟ فَعَمِلَتْ النَّصَارَى مِنْ نِصْفِ النَّهَارِ إِلَى صَلَاةِ الْعَصْرِ عَلَى قِيرَاطٍ قِيرَاطٍ ثُمَّ قَالَ مَنْ يَعْمَلُ لِي مِنْ صَلَاةِ الْعَصْرِ إِلَى مَغْرِبِ الشَّمْسِ عَلَى قِيرَاطَيْنِ قِيرَاطَيْنِ قال فَأَنْتُمْ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ مِنْ صَلَاةِ الْعَصْرِ إِلَى مَغْرِبِ الشَّمْسِ عَلَى قِيرَاطَيْنِ قِيرَاطَيْنِ أَلَا لَكُمْ الْأَجْرُ مَرَّتَيْنِ فَغَضِبَتْ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى فَقَالُوا نَحْنُ أَكْثَرُ عَمَلًا وَأَقَلُّ عَطَاءً، قَالَ اللَّهُ هَلْ ظَلَمْتُكُمْ مِنْ حَقِّكُمْ شَيْئًا، قَالُوا: لَا، قَالَ فَإِنَّهُ فَضْلِي أُعْطِيهِ مَنْ شِئْتُ.

ئیبن عومەر (رضي الله عنه) دەفەرموێ كە پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو: (ماوەی مانەوەی ئێوە لەچاو مانەوەی ئەو نەتەوانەی تردا كە لە پێش ئێوەوە لە جیهاندا بوون كەمە، بەقەد نێوانی عەسر و خۆرئاوا بوونە).

وە نمونەی ئێوە و نمونەی جولەكە و گاور وەكو پیاوێكە چەند كرێكارێ بەكرێ بگرێ پێیان بلێت كێ كارم بۆ بكات لە بەیانیەوە تاكو نیوەڕۆ بەیەك قیرات وە جولەكەكان كاریان لە بەیانیەوە تاكو نیوەڕۆ كرد، ئیتر كۆڵیان دا،

وە هەریەکەی سەر و قیراتیان پێ درا، وە لە پاشان گاورەکان هاتن کاریان کرد لە نیوەڕۆ هەتا نوێژی عەسر کۆڵیان دا، ئەوانیش یەکی سەر و قیراتی خۆیان وەرگرت، ئینجا ئەم قورئانە بەخەڵاتی درا بە ئێمە، وە ئێمە تا نوێژی شێوان کارمان پێی کرد، واتە: هەتا کاتی نزیکی کۆتایی جیهان، وە یەکی سەر و دو قیراتمان وەرگرت، جا دەستەی تەورات و ئینجیل گوتیان: ئەی پەروەردگاری ئێمە! بۆ بەمانە یەکی سەر و دوو قیراتت داو، بەڵام بە ئێمە یەکێ سەر و یەك قیرات؟ لەگەڵ ئەوەشدا کە ئێمە کارمان لەوان زۆرتر کردووە؟ خودای سەروەریش دەفەرموێ: ئایا لە پاداشی خۆتان هیچ کەمترم پێداون، دەڵێن نەخێر دەفەرموێ ئەوە بەش و بەهرەی خۆم بە کێ ئارەزوو بکەم دەیدەمێ.

٤٦٦. عَنْ جُنْدُب بِنُ عَبْدُ الله رَضي الله عَنْهُ قال: قَالَ رَسُولُ اللّه (ﷺ)كَانَ فِيمَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ رَجُلٌ بِهِ جُرْحٌ فَجَزِعَ فَأَخَذَ سِكِّينًا فَحَزَّ بِهَا يَدَهُ فَمَا رَقَأَ الدَّمُ حَتَّى مَاتَ قَالَ اللَّهُ تَعَالَى بَادَرَنِي عَبْدِي بِنَفْسِهِ حَرَّمْتُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ.

لە جوندوبی کوڕی عەبدوڵلا (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی لە پێش ئیوە پیاوێ هەبوو لە جەنگا زامدار بوو زۆر ئازاری پێ گەیشت لە پاشان چەقۆیەکی هێنا و دەستی خۆی پێداهێنا بڕیەوە خوێنی زۆری لێهات تاکو بە هۆی ئەوەوە مرد خوای گەورە فەرموی بەندەی من پەلەی کرد لەگیانی خۆی بوە هۆی ئەوەی خۆی بکوژێ، منیش بەهەشتم لێی حەرام کردوە.

٤٦٧. عَنْ أبي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللّهِ (ﷺ) قالَ: ((إِنَّ ثَلَاثَةً من بَنِي إِسْرَائِيلَ أَبْرَصَ وَأَقْرَعَ وَأَعْمَى بَدَا للهِ أَنْ يَبْتَلِيَهُمْ فَبَعَثَ إِلَيْهِمْ مَلَكًا فَأَتَى الْأَبْرَصَ فَقَالَ أَيُّ شَيْءٍ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قَالَ لَوْنٌ حَسَنٌ وَجِلْدٌ حَسَنٌ قَدْ قَذِرَنِي

النَّاسُ قَالَ فَمَسَحَهُ فَذَهَبَ عَنْهُ فَأُعْطِيَ لَوْنًا حَسَنًا وَجِلْدًا حَسَنًا فَقَالَ أَيُّ الْمَالِ أَحَبُّ إِلَيْكَ قَالَ الْإِبِلُ أَوْ قَالَ الْبَقَرُ هُوَ شَكَّ فِي ذَلِكَ إِنَّ الْأَبْرَصَ وَالْأَقْرَعَ قَالَ أَحَدُهُمَا الْإِبِلُ وَقَالَ الْآخَرُ الْبَقَرُ فَأُعْطِيَ نَاقَةً عُشَرَاءَ فَقَالَ يُبَارَكُ لَكَ فِيهَا وَأَتَى الْأَقْرَعَ فَقَالَ أَيُّ شَيْءٍ أَحَبُّ إِلَيْكَ قَالَ شَعَرٌ حَسَنٌ وَيَذْهَبُ عَنِّي هَذَا قَدْ قَذِرَنِي النَّاسُ قَالَ فَمَسَحَهُ فَذَهَبَ وَأُعْطِيَ شَعَرًا حَسَنًا قَالَ فَأَيُّ الْمَالِ أَحَبُّ إِلَيْكَ قَالَ الْبَقَرُ قَالَ فَأَعْطَاهُ بَقَرَةً حَامِلاً، وَقَالَ يُبَارَكُ لَكَ فِيهَا، وَأَتَى الْأَعْمَى فَقَالَ: أَيُّ شَيْءٍ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قَالَ الْغَنَمُ فَأَعْطَاهُ شَاةً وَالِدًا فَأُنْتِجَ هَذَانِ وَوَلَّدَ هَذَا فَكَانَ لِهَذَا وَادٍ مِنْ إِبِلٍ وَلِهَذَا وَادٍ مِنْ بَقَرٍ وَلِهَذَا وَادٍ مِنْ الْغَنَمِ ثُمَّ إِنَّهُ أَتَى الْأَبْرَصَ فِي صُورَتِهِ وَهَيْئَتِهِ فَقَالَ رَجُلٌ مِسْكِينٌ تَقَطَّعَتْ بِيَ الْحِبَالُ فِي سَفَرِي فَلَا بَلَاغَ الْيَوْمَ إِلَّا بِاللَّهِ ثُمَّ بِكَ أَسْأَلُكَ بِالَّذِي أَعْطَاكَ اللَّوْنَ الْحَسَنَ وَالْجِلْدَ الْحَسَنَ وَالْمَالَ، بَعِيرًا أَتَبَلَّغُ عَلَيْهِ فِي سَفَرِي فَقَالَ لَهُ إِنَّ الْحُقُوقَ كَثِيرَةٌ فَقَالَ لَهُ كَأَنِّي أَعْرِفُكَ أَلَمْ تَكُنْ أَبْرَصَ يَقْذَرُكَ النَّاسُ، فَقِيرًا فَأَعْطَاكَ اللَّهُ فَقَالَ لَقَدْ وَرِثْتُ لِكَابِرٍ عَنْ كَابِرٍ فَقَالَ إِنْ كُنْتَ كَاذِبًا فَصَيَّرَكَ اللَّهُ إِلَى مَا كُنْتَ وَأَتَى الْأَقْرَعَ فِي صُورَتِهِ وَهَيْئَتِهِ فَقَالَ لَهُ مِثْلَ مَا قَالَ لِهَذَا فَرَدَّ عَلَيْهِ مِثْلَ مَا رَدَّ عَلَيْهِ هَذَا فَقَالَ إِنْ كُنْتَ كَاذِبًا فَصَيَّرَكَ اللَّهُ إِلَى مَا كُنْتَ وَأَتَى الْأَعْمَى فِي صُورَتِهِ فَقَالَ رَجُلٌ مِسْكِينٌ وَابْنُ سَبِيلٍ وَتَقَطَّعَتْ بِيَ الْحِبَالُ فِي سَفَرِي فَلَا بَلَاغَ الْيَوْمَ إِلَّا بِاللَّهِ ثُمَّ بِكَ أَسْأَلُكَ بِالَّذِي رَدَّ عَلَيْكَ بَصَرَكَ شَاةً، أَتَبَلَّغُ بِهَا فِي سَفَرِي فَقَالَ قَدْ كُنْتُ أَعْمَى فَرَدَّ اللَّهُ بَصَرِي وَفَقِيرًا فَقَدْ أَغْنَانِي فَخُذْ مَا شِئْتَ فَوَاللَّهِ لَا أَجْهَدُكَ الْيَوْمَ بِشَيْءٍ أَخَذْتَهُ لِلَّهِ فَقَالَ أَمْسِكْ مَالَكَ فَإِنَّمَا ابْتُلِيتُمْ فَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنْكَ وَسَخِطَ عَلَى صَاحِبَيْكَ)).

**ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (سێ كەس لە بەنی ئیسرائیل، بەڵەكێك و كەچەڵێك و كوێرێك،**

خوای گەورە لاشەی هەریەکەیانی توشی دەردێك کردووە، فریشتەیەك دەنێرێتە لایان، دێتە لای کابرای بەڵەك و لێی دەپرسێ: لە هەموو شتێك زیاتر چیت پێ خۆشە؟ ووتی: ڕەنگێکی جوان و پێستێکی جوان چونکە خەڵکی قێزی لێ دەکەنەوە. فریشتەکە دەستێکی بەسەر لەشیدا هێنا و بە فەرمانی خوا چاك بووەوە و ڕەنگێکی جوان و پێستێکی جوانی پێ بەخشرا، پاشان لێی پرسی: ئەی چ ماڵ و سامانێکت بەلاوە خۆشە؟ ووتی: وشتر، یان ووتی: مانگا (ڕاویی گومانی هەبوو). ئەوەبوو بەڵەکەکە و کەچەڵەکە یەکێکیان داوای ووشتری کرد و ئەوی تریان داوای مانگای کرد. ئەوەبوو ووشترێکی سکپڕی پێ دا کە سکەکەی لە مانگی دەیەمیدا بوو، لە خوایش داوای بەرەکەتی بۆ کرد. پاشان هاتە لای کەچەڵەکە و ووتی: لە هەموو شتێ زیاتر چیت پێ خۆشە؟ ووتی: قژێکی جوان و ئەم کەچەڵییەم نەمێنێ، چونکە خەڵکی قێزم لێ دەکەنەوە فریشتەکە دەستێکی بەسەردا هێنا و (بە فەرمانی خوا) چاك بوەوە و، قژێکی جوانی پێ بەخشرا. پاشان لێی پرسی: ئەی چ ماڵ و سامانێکت بەلاوە خۆشەویستە؟ ووتی: مانگا ئەوەبوو مانگایەکی ئاوسی پێ داو، لە خوایش داوای بەرەکەتی بۆ کرد. پاشان هاتە لای پیاوە کوێرەکە ووتی: لە هەموو شتێ زیاتر چییت پێ خۆشە؟ ووتی: خوای گەورە چاوەکانم پێ ببەخشێتەوە، فریشتەکە دەستی بەسەردا هێنا و خوای گەورە بینای پێ بەخشییەوە، پاشان لێی پرسی:ئەی چ ماڵ و سامانێکت بەلاوە خۆشەویستە؟ ووتی: مەڕ، ئەویش مەڕێکی سکپڕی پێدا. (بە فەرمانی خوا) ووشتر و مانگا و مەڕەکە کەوتنە زاوزێ، ئەمیان بووە خاوەنی یەك ووشترو ئەویانپڕی یەك شیو مانگا و ئەوی تریان پڕی یەك شیو مەڕی هەبوو. پاشان فریشتەکە بەهەمان شێوە هاتە لای بەڵەکەکە ووتی: پیاوێکی هەژارە و لە شوێنێکی

دوورەوە هاتووە و پارە و پولی لێ براوە و پەنای خوایە پاشان تۆ. جا لەبەر خاتری ئەو خوایەی کە ئەم ڕەنگە جوانەو ئەم پێستە جوانە و ئەم ماڵ و سامانەی پێ بەخشیویت ووشترێکم پێ بدە تا سواری ببم و بم گەیەنێتە جێی خۆم لەم گەشتەکەمدا. ووتی (کاکە!) ئێمە زۆرمان لە ئەستۆ دایە، ئەویش پێی ووتی: وابزانم من تۆ دەناسم، تۆ پیاوێکی بەڵەکی نەخۆش نەبوویت کە خەڵکیی قێزیان لێ دەکردیتەوە، هەژار نەبوویت خوا پێی بەخشیت؟ ووتی: ئەم ماڵ و سامانە پشتا و پشت بۆم ماوەتەوە. فریشتەکە ووتی: ئەگەر درۆزن بیت خوا وەکو خۆتت لێ بکاتەوە، پاشان فریشتەکە لە شێوەی جاری یەکەم دا چوو بۆ لای کابرای کەچەڵ و هەمان شتی پێ ووت: ئەویش هەمان وەڵامی ئەوی دایەوە. فریشتەکە دووعای لێکرد و ووتی: ئەگەر درۆزن بیت خوا وەکو خۆتت لێ بکاتەوە. پاشان لە شێوەی جاری یەکەمدا چوو بۆ لای ئەو پیاوەی جاران کوێر بوو ووتی: پیاوێکی هەژارم و ڕێبوارێکی دەست کورتم کە لە سەفەردا پارە و پولم لێ براوە، مەگەر خوای گەورە پاشان تۆ فریام بکەوێت. داوات لێ دەکەم لەبەر خاتر ئەو خوایەی کە چاوەکانتی چاك کردنەوە مەڕێکم پێ بدەی هەتا پێی بگەڕێمەوە ماڵەوە. ئەویش ووتی: من پیاوێکی کوێر بووم خوای گەورە چاوەکانمی پێ بەخشیمەوە هەژار بووم خوای گەورە دەوڵەمەندی کردم، لەناو ئەو مەڕ و ماڵاتەدا چیت پێ خۆشە هەڵی بژێرە، دە بەخوا هەرچی هەڵبژێری لەبەر ڕەزامەندی خوا دەست بە ڕووتەوە نانێم. فریشتەکەش لە وەڵامدا ووتی: سەروەت و سامانی خۆت بۆ خۆت، ئەمە بەڵکو تاقیکردنەوەیەك بوو بۆتان (هەرسێکتان) جا خوای گەورە لە تۆ ڕازی بوو، بەڵام لە هەردوو هاوەڵەکەت ڕەنجا).

٤٦٨. عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا أَنَّ قُرَيْشًا أَهَمَّهُمْ شَأْنُ الْمَرْأَةِ الْمَخْزُومِيَّةِ الَّتِي سَرَقَتْ فَقَالُوا وَمَنْ يُكَلِّمُ فِيهَا رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالُوا وَمَنْ يَجْتَرِئُ عَلَيْهِ إِلَّا أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ حِبُّ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَكَلَّمَهُ أُسَامَةُ فَقَالَ النبي (ﷺ) أَتَشْفَعُ فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللَّهِ ثُمَّ قَامَ فَاخْتَطَبَ ثُمَّ قَالَ إِنَّمَا أَهْلَكَ الَّذِينَ قَبْلَكُمْ أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا سَرَقَ فِيهِمْ الشَّرِيفُ تَرَكُوهُ وَإِذَا سَرَقَ فِيهِمْ الضَّعِيفُ أَقَامُوا عَلَيْهِ الْحَدَّ وَايْمُ اللَّهِ لَوْ أَنَّ فَاطِمَةَ بْنَةَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ لَقَطَعْتُ يَدَهَا

دایکمان عائیشه (رضي الله عنها) دەفەرموێت ئەو ئافرەتە مەخزومیە دزی کرد هۆزی قورەیشی زۆر غەمبار کرد و پیاوەی سەرقاڵ بوو بوون ووتیان: کێ بچێت تکای بۆ بکات لای پێغەمبەر (واتە بە مەبەستی ئەوەی دەستی نەبڕێت) ووتیان: جگە لە ئوسامەی کوڕی زەید کە خۆشەویستی پێغەمبەری خوایە (ﷺ)کێ هەیە جورئەتی ئەوە بکات؟

ئەوەبوو ئوسامە لەو بارەیەوە عەرزی کرد کە دەستی نەبڕێت.

پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمووی: (ئایا لە جێبەجێ کردنی سنورەکانی خوادا تکا دەکەیت؟). پاشان لەناو هاوەڵاندا هەستایە سەرپێ و ووتاری دا و فەرمووی: (بەڕاستی ئوممەتانی پێش ئێوە بەهۆی ئەوەوە لەناوچوون کە عادەتیان وابوو ئەگەر کەسێکی دەسەڵاتدار و خانەدان دزی لە ناویاندا بکردایە وازیان لێ دەهێنا و ئەگەر کەسێکی لاواز و بێ دەستەڵاتیش دزی لە ناویاندا بکردایە یاسایان لەسەر جێبەجێ دەکرد. وە سوێند بە خوا ئەگەر فاتیمەی کچی موحەمەدیش دزی بکات دەستی دەبڕم).

٤٦٩. عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ قَالَ رسُول الله (ﷺ) إِنَّ مِمَّا أَدْرَكَ النَّاسُ مِنْ كَلَامِ النُّبُوَّةِ إِذَا لَمْ تَسْتَحِ فَاصْنَعْ مَا شِئْتَ.

ئەبی مەسعود (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەوەی لە خورەوشتی پێغەمبەرانی پێشین ماوەتەوە بەخەڵکی گەیشتووە ئەوەیە ئەگەر شەرم و حەیات نییە چی دەکەی بیکە).

٤٧٠. عَنْ ابْنِ عُمَر أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((بَيْنَمَا رَجُلٌ يَجُرُّ إِزَارَهُ مِنْ الْخُيَلَاءِ خُسِفَ بِهِ فَهُوَ يَتَجَلْجَلُ فِي الْأَرْضِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ)).

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (رضي الله عنهما) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (پیاوێ لە ئۆممەتەانی پێشوو جل و پۆشاکی خۆی ئەوەندە درێژ بوو لە زەوی دەخشا بۆ فیز و دەعیە و خۆ بە گەورە زانین لەبەر ئەوە خوای گەورە بە ناخی زەویدا بردە خوارێ هەتا ڕۆژی قیامەت).

## باب الكذب في النسب والرؤيا

٤٧١. عَنْ وَاثِلَةَ بْنَ الْأَسْقَعِ رَضِي الله عَنْهُ قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((إِنَّ مِنْ أَعْظَمِ الْفِرَى أَنْ يَدَّعِيَ الرَّجُلُ إِلَى غَيْرِ أَبِيهِ أَوْ يُرِيَ عَيْنَهُ مَا لَمْ تَرَ أَوْ يَقُولُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) مَا لَمْ يَقُلْ)).

## (بەشی/ درۆ کردن لە نەسەب، وە خەوا)

لە واسیلەی کوڕی ئەسقەع دەگێڕێتەوە (رضي الله عنه) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (لە هەموو درۆیەك گەورەتر ئەوەیە کەسێك خۆی هەڵبداتەوە بە باوکێك و ئەو کەسە باوکیشی نەبێ، وە کەسێك خەوێك بۆ خۆی دروست بکات بە درۆ بەیانی خۆی بۆ خەڵکی بگێڕێتەوە یان ووتەیێ بە زاری پێغەمبەری خوا هەڵبەستێ کە نەی ووتبێ).

## باب خاتم النبين جاء مكملاً للبهاء

٤٧٢.عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) مَثَلِي وَمَثَلُ الْأَنْبِيَاءِ كَرَجُلٍ بَنَى دَارًا فَأَكْمَلَهَا وَأَحْسَنَهَا إِلَّا مَوْضِعَ لَبِنَةٍ فَجَعَلَ النَّاسُ يَدْخُلُونَهَا وَيَتَعَجَّبُونَ وَيَقُولُونَ لَوْلَا مَوْضِعُ اللَّبِنَةِ.

## (بەشی/ دواین پێغەمبەر و بە هاتنی ئەو پێغەمبەرایەتی تەواو و جوان بوو)

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رضي الله عنهما) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (نمونەی من و نمونەی پێغەمبەران وەکو پیاوێکە خانویەك دروست بکات و تەواوی بکات و جوانی بکات، تەنها شوێنی خشتێکی تەواو نەبێت وە لە دواییدا خەڵکی کە دێن بۆ سەردانی ئەم خانوە و تەماشای دەکەن و سەریان سوڕ دەمێنێ لە جوانی ئەم خانووە و دەڵێن خۆزگە جێگای ئەم خشتەش لە شوێنی خۆی بایە و خانەوەکە تێر و تەسەل دەبوو {وە خشتەکەش پێغەمبەری خوایە کە بە هاتنی ئەو ئایین تەواو بوو}.

## باب صفات رسول الله (ﷺ)

٤٧٣.عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) أَجْوَدَ النَّاسِ وَأَجْوَدُ مَا يَكُونُ فِي رَمَضَانَ حِينَ يَلْقَاهُ جِبْرِيلُ وَكَانَ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَام يَلْقَاهُ فِي كُلِّ لَيْلَةٍ مِنْ رَمَضَانَ فَيُدَارِسُهُ الْقُرْآنَ فَلَرَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَجْوَدُ بِالْخَيْرِ مِنْ الرِّيحِ الْمُرْسَلَةِ.

## (بەشی/ شێوەو سیفاتی پێغەمبەری خوا (ﷺ))

عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (رضي الله عنهما) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەخشندەو سەخییەکەی لەوێنەی خۆی نەبوو لە ڕەمەزانیشا جوبرائیل

دەهاتە لای و دەوری قورئانی بۆ دەکرد و جا لەم کاتەدا لە هەموو کاتێکی تردا بەخشندە بوو، وە جوبرائیل عادەتی وابوو لە رەمەزان هەموو شەوێ دەهات دەرسی قورئانی پێ دەکردەوە ئەوەندە بەخشندە و خێربەخشین بوو وەکو بای هەڵکراو لە هەر چوار لاوە دەیبەخشی و نەی دەگرتەوە).

٤٧٤. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ لَمْ يَكُنْ النَّبِيُّ (ﷺ) فَاحِشًا وَلَا مُتَفَحِّشًا وَكَانَ(ﷺ) يَقُولُ إِنَّ مِنْ خِيَارِكُمْ أَحْسَنَكُمْ أَخْلَاقًا.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنهما) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ): (زمان پیس و دەم پیس نەبوو، وە عادەتی وابوو دەیفەرموو باشترین کەس ئەوەیە کە خورەوشتی جوان بێت).

٤٧٥. عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ مَا خُيِّرَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بَيْنَ أَمْرَيْنِ إِلَّا أَخَذَ أَيْسَرَهُمَا مَا لَمْ يَكُنْ إِثْمًا فَإِنْ كَانَ إِثْمًا كَانَ أَبْعَدَ النَّاسِ مِنْهُ وَمَا انْتَقَمَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) لِنَفْسِهِ إِلَّا أَنْ تُنْتَهَكَ حُرْمَةُ اللَّهِ فَيَنْتَقِمَ لِلَّهِ بِهَا.

عائیشەخان (رضي الله عنها) دەفەرموێ پێغەمبەر لە هەر کارێکا ئەگەر سەرپشك کرابا لە نێوان دوو شتا ئەوا ئاسانەکەیانی هەڵدەبژارد ئەگەر تاوان و گوناه نەبووایە، وە ئەگەر بۆ تاوانی لێ بهاتبایە لە هەموو کەسان زیاتر دوورە پەرێز بوو لێی، وە لەهیچ کەسێك تۆڵەی خۆی نەدەکردەوە تەنهائەگەر سنوری خوا ببەزایاندبیایە ئەوا تۆڵەی دەکردەوە.

٤٧٦. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) أَشَدَّ حَيَاءً مِنْ الْعَذْرَاءِ فِي خِدْرِهَا.

ئەبو سەعیدی خودری (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر بە شەرم و حەیا بوو هەتا لە کچی ژێر پەردەش زیاتر.

٤٧٧. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ مَا عَابَ رسول الله (ﷺ) طَعَامًا قَطُّ إِنْ اشْتَهَاهُ أَكَلَهُ وَإِلَّا تَرَكَهُ.

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) قەت عەیب و نەنگی لە خواردن نەدەگرت ئەگەر حەزی بکردبایە دەیخوارد ئەگینا وازی لێ دەهێنا و نەیدەخوارد.

٤٧٨. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((تُقَاتِلُكُمْ الْيَهُودُ فَتُسَلَّطُونَ عَلَيْهِمْ ثُمَّ يَقُولُ الْحَجَرُ يَا مُسْلِمُ هَذَا يَهُودِيٌّ وَرَائِي فَاقْتُلْهُ)).

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنهما) دەفەرموێ گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەیفەرموو: (جولەکە شەڕتان لەگەڵ دەکەن وە ئێوە زاڵ دەبن بەسەریان داو هەتا وای لێ دێت دار و بەرد هاوار دەکات و دەڵێت ئەی موسڵمان ئەوە جولەکەیە لە پەنای من خۆی حەشارداوە وەرە بیکوژە).

٤٧٩. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن عُمَر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((رَأَيْتُ النَّاسَ مُجْتَمِعِينَ فِي صَعِيدٍ فَقَامَ أَبُو بَكْرٍ فَنَزَعَ ذَنُوبًا أَوْ ذَنُوبَيْنِ وَفِي بَعْضِ نَزْعِهِ ضَعْفٌ وَاللَّهُ يَغْفِرُ لَهُ ثُمَّ أَخَذَهَا عُمَرُ فَاسْتَحَالَتْ بِيَدِهِ غَرْبًا فَلَمْ أَرَ عَبْقَرِيًّا فِي النَّاسِ يَفْرِي فَرِيَّهُ حَتَّى ضَرَبَ النَّاسُ بِعَطَنٍ)).

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنهما) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (جارێ لە خەوما خەڵکم دیت لەسەر کێوێکا کۆببونەوەوە ئەبو بەکر هەڵسا و دۆڵچەیێ بێ یان دوو دۆڵچەی لە بیرێکا هەڵێنجا بە نەرم و نیانی خوا لێی خۆشبێ لە پاشان عومەر لێی وەرگرت و لە دەستی عومەر بوو بە سەتڵێکی گەورە کە بەقەد مەشکەیەکی گەورە ئاو بگرێ وابوو جا کەسم نەبینیوە وەك عومەر ئاوا بلیمەت و ئاوا بە هەڵپەوە هەڵمەت و دەست و برد

بێت ئیتر عومەر بە شێوەیەکی وا ئاوی زۆر کرد هەتا خەڵکەکە لە دەوری ئاوەکە کۆبوونەوە و تێر ئاو بوون وولاخەکانیان تێر ئاو کرد).

٤٨٠. عَنْ عِمْرَانَ بْنَ حُصَيْنٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) خَيْرُ أُمَّتِي قَرْنِي ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ إِنَّ بَعْدَكُمْ قَوْمًا يَشْهَدُونَ وَلَا يُسْتَشْهَدُونَ وَيَخُونُونَ وَلَا يُؤْتَمَنُونَ وَيَنْذُرُونَ وَلَا يَفُونَ وَيَظْهَرُ فِيهِمْ السِّمَنُ.

عیمرانی کوڕی حوصەین (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (چاکترین چەرخ و زەمانە چەرخی منە لە پاشان ئەوەی لە پاش ئەو دێن وە لەپاشان چینێ پەیدا دەبن شاهێدی دەدەن و شایانی شایەتی دان نین و ناپاکی دەکەن و جێگای ئەمین نین وە نەزر دەکەن و نایگەینەسەر وە قەڵەوی و پیاوی زلیان لێ پەیدا دەبێ).

٤٨١. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ عَلَيهِ الصَّلاة والسَلامْ لَا تَسُبُّوا أَصْحَابِي فَلَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا مَا بَلَغَ مُدَّ أَحَدِهِمْ وَلَا نَصِيفَهُ.

ئەبی سەعیدی خودری (رضي الله عنه) فەرموی پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (جوێن بە هاوەڵانم مەدەن ئەگەر یەکێك بەقەد کێوی ئوحد زێر ببەخشێ ناگات بە مشتێك و یان نیو مشتی ئەوان).

## باب حب الأنصار

٤٨٢.عَنْ عَدِيِّ بْنُ ثَابِتٍ قَالَ: سَمِعْتُ الْبَرَاءَ بن عازب رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقول الْأَنْصَارُ لَا يُحِبُّهُمْ إِلَّا مُؤْمِنٌ وَلَا يُبْغِضُهُمْ إِلَّا مُنَافِقٌ فَمَنْ أَحَبَّهُمْ أَحَبَّهُ اللَّهُ وَمَنْ أَبْغَضَهُمْ أَبْغَضَهُ اللَّهُ.

## (بەشی/ خۆشەویستی ئەنصارییەکان)

عەدی کوڕی سابت دەفەرموێ گوێم لە بەڕائی کوڕی عازیب بوو (رضي الله عنه) فەرموی گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەیفەرموو: (دەربارەی ئەنصارییەکان تەنها ئیماندار ئەوانی خۆش دەوێت وە منافیقانیش رقیان لێیان دەبێتەوە، وە کەسێ خۆشی بوێن و خواش ئەوی خۆش دەوێ وە کەسێ رقی لێیان ببێتەوە خواش رقی لێی دەبێتەوە).

## باب الحلف بالله

٤٨٣.عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ أَلَا مَنْ كَانَ حَالِفًا فَلَا يَحْلِفْ إِلَّا بِاللَّهِ، فَكَانَتْ قُرَيْشٌ تَحْلِفُ بِآبَائِهَا فَقَالَ عَلَيْهِ الصلاة والسَلام لَا تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ.

## (بەشی/ سوێند خواردن بە خوای گەورە)

عەبدوڵڵای کوڕی عومەری (رضي الله عنهما) لە پێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: (بزانن، کەسێ دەیەوێ سوێند بخوات با سوێند تەنها بە خوا بخوات، وە قورەیشییەکان سوێندیان بە باب و باپیریان دەخوارد). پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی سوێند بە باوکتان مەخۆن).

## باب في نية المرء

٤٨٤.عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ وَقَّاصٍ قَالَ سَمِعْتُ عُمَرَ بن الخَطاب رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّةِ فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى دُنْيَا يُصِيبُهَا أَوْ امْرَأَةٍ يَتَزَوَّجُهَا فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ وَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ فَهِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ صلى الله عليه وآله وسلم)).

## (بەشی/ دەربارەی نیاز و نیەتی مرۆڤ)

لە عەلقەمەی کوڕی وەقاص دەفەرموێ گوێم لە عومەری کوڕی خەتتاب بوو (رضي الله عنه) فەرمووی گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەیفەرموو: (کردەوە بە نیاز و نیەتە، وە کەسێ کۆچکردنەکەی بۆ دونیا و یان بۆ ژن خوازی بێ ئەوا کۆچکردنی بۆ ئەوەیە کە کۆچی کردوە بۆی، وە کەسێ کۆچ بکات بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی ئەوا کۆچکردنەکەی بۆ خواو پێغەمبەرەکەیە(ﷺ)).

## باب ثلاث لايعلمهن الاّ اللّه

٤٨٥.عَنْ أَنَس بن مالك رَضِي الله عَنْهُ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ سَلَامٍ بَلَغَهُ مَقْدَمُ النَّبِيِّ (ﷺ) الْمَدِينَةَ فَأَتَاهُ يَسْأَلُهُ عَنْ أَشْيَاءَ فَقَالَ إِنِّي سَائِلُكَ عَنْ ثَلَاثٍ لَا يَعْلَمُهُنَّ إِلَّا نَبِيٌّ مَا أَوَّلُ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ وَمَا أَوَّلُ طَعَامٍ يَأْكُلُهُ أَهْلُ الْجَنَّةِ وَمَا بَالُ الْوَلَدِ يَنْزِعُ إِلَى أَبِيهِ أَوْ إِلَى أُمِّهِ؟ قَالَ أَخْبَرَنِي بِهِ جِبْرِيلُ آنِفًا قَالَ ابْنُ سَلَامٍ ذَاكَ عَدُوُّ الْيَهُودِ مِنْ الْمَلَائِكَةِ قَالَ أَمَّا أَوَّلُ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ فَنَارٌ تَحْشُرُهُمْ مِنْ الْمَشْرِقِ إِلَى الْمَغْرِبِ، وَأَمَّا أَوَّلُ طَعَامٍ يَأْكُلُهُ أَهْلُ الْجَنَّةِ فَزِيَادَةُ كَبِدِ الْحُوتِ وَأَمَّا الْوَلَدُ فَإِذَا سَبَقَ مَاءُ الرَّجُلِ مَاءَ الْمَرْأَةِ نَزَعَ الْوَلَدَ، وَإِذَا سَبَقَ مَاءُ الْمَرْأَةِ مَاءَ الرَّجُلِ نَزَعَتْ الْوَلَدَ، قَالَ إبْن سَلام أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّكَ رَسُولُ اللَّهِ قَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ الْيَهُودَ قَوْمٌ بُهُتٌ فَاسْأَلْهُمْ عَنِّي قَبْلَ أَنْ يَعْلَمُوا بِإِسْلَامِي فَجَاءَتْ الْيَهُودُ فَقَالَ رَسُول اللهِ (ﷺ) أَيُّ رَجُلٍ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَلَامٍ

فِيكُمْ قَالُوا خَيْرُنَا وَابْنُ خَيْرِنَا وَأَفْضَلُنَا وَابْنُ أَفْضَلِنَا فَقَالَ رَسُول الله (ﷺ) أَرَأَيْتُمْ إِنْ أَسْلَمَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَلَامٍ قَالُوا أَعَاذَهُ اللَّهُ مِنْ ذَلِكَ فَأَعَادَ عَلَيْهِمْ فَقَالُوا مِثْلَ ذَلِكَ فَخَرَجَ إِلَيْهِمْ عَبْدُ اللَّهِ فَقَالَ أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ قَالُوا هذا شَرُّنَا وَابْنُ شَرِّنَا وَتَنَقَّصُوهُ قَالَ هَذَا كُنْتُ أَخَافُ يَا رَسُولَ اللَّهِ.

## (بەشی/ سێ شت هەن بەس خوا دەیانزانێ)

ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) فەرموی عەبدوڵلای کوڕی سەلام دەبیستێ کە پێغەمبەر تەشریفی هێناوە بۆ مەدینە و دێتە لای و عەرزی دەکات، من سێ شتت لێ دەپرسم هەر کەسێ پێغەمبەر نەبێ نایانزانێ: یەکەم نیشانەی گەورەی قیامەت چییە؟ وە یەکەم خۆراکی کە بەهەشتی دەیخوا لە بەهەشتا چییە؟ وە هۆی چییە کە منداڵ شێوەی لەباوکی دەچێ یان لە دایکی دەچێ و شێوەی دەچێتەوە سەر خاڵوانی؟

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (ئا ئێستا زۆر نییە کە جوبرائیل (علیه السلام) ئەم سێ شتەی پێ فەرمووم)

عەبدوڵلا فەرموی: جولەکە لەناو خۆیانا، لەناو هەموو فریشتەکانا جوبرائیل بە دوژمنی خۆیان دادەنێن. کەوا دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە دەفەرموێ: ﴿مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُۥ نَزَّلَهُۥ عَلَىٰ قَلْبِكَ﴾ ئینجا حەزرەت (ﷺ) فەرمووی: یەکەم نیشانەی گەورەی هاتنی قیامەت ئاگرێکە خەڵك لە خۆرهەڵاتەوە دەداتە پێش و دەیبانبات بۆ خۆرئاوا، یەکەم خۆراکی بەهەشتیەکانیش پارچە زیادەکەی گۆشتەکەی جگەری نەهەنگە، وەئاوی پیاویش ئەگەر وەپێش ئاوی ژن کەوت منداڵەکە دەکێشێتەوە سەر

خۆی، بەڵام ئەگەر پێچەوانە بوو ئاوی ژن وەپێش ئاوی پیاو کەوت ئەوا منداڵەکە دەکێشێتە سەر خۆی‌و خاڵوانی.

عەبدوڵڵا (رضي الله عنه) کاتێ ئەم وەڵامە راست و دروستەی لە پێغەمبەر بیست بڕوای پێکرد و ئیسلام بوو فەرموی: (شایەتی دەدەم کە تۆ پێغەمبەری راست و دروستی خودای، لەبەر ئەوە شایەتی دەدەم بێجگە لە یەزدانی پاك خوای بەهێزتر نییە، وەشایەتیش دەدەم کە تۆ پێغەمبەری رەوانەکراوی خودای، ئەی پێغەمبەری خودا! بێگومان جولەکە هۆزێکی بوختانکەر و درۆزن و هەڵاتبازن، لە پێش ئەوەدا کە بزانن من موسڵمان بووم پرسیاری حاڵی منیان لێ بکە، دەنا لە داخانا و لە ڕقانا بوختانم بۆ دەکەن. جا کاتێ جولەکەکان عەبدوڵڵا لە ژوورەوە بوو خۆی شاردبۆوە فەرموی عەبدوڵڵا چ جۆرە پیاوێکە لە ناوتانا ئەوانیش وتیان چاکترینی ئێمە و زاناترینی ئێمەیە و خۆی بەگزادە و کوڕی بەگزادەیە ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی باشە پێم بڵێن ئەگەر عەبدوڵڵا موسڵمان ببێ ئێوە دەڵێن چی گوتیان خوا ئەوە نەکا خوا پەنای بدا لەشتی وا ئینجا پێغەمبەر چەند جار ئەمەی دووبارە کردەوە ئەوانیش هەم دیسان وتەی خۆیان دوبارە کردەوە ئینجا عەبدوڵڵا بە لایانا تێپەڕی و هاتەژوورەوە وتی: (أشهد ان لا اله إلا الله وأشهد أن محمداً رسول الله) شایەتی هێنا و ئینجا وتی کەوابێ خراپترینی ئێمە و کوڕی خراپترینی ئێمەیە وە قسەی ناشیرینیان پێ ووت عەبدوڵڵا ووتی دەی لەم زمانە پیسە لێان دەترسام ئەی پێغەمبەری خوا.

## باب نفقة الرجل على أهلِه

٤٨٦. عَنْ أبي مَسْعُود الْبَدْرِيِّ عَنْ رسول الله (ﷺ) قَالَ نَفَقَةُ الرَّجُلِ عَلَى أَهْلِهِ صَدَقَةٌ.

### (بەخشینی ماڵ و سامانی مێرد بۆ ماڵ و منداڵەکەی)

ئەبی مەسعودی بەدری لە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (بەخشینی ماڵ و سامانی و مەسرەف کردنی پیاو بۆ خێزانەکەی بە خێر و صەدەقە حیسابە).

## باب الآيَتَيْن مِنْ آخر سورة البَقرةَ

٤٨٧. وَعَنْهُ رَضي الله عَنْهُ أنَّ النَّبيَّ (ﷺ) قال الْآيَتَانِ مِنْ آخِرِ الْبَقَرَةِ مَنْ قَرَأَهُمَا فِي لَيْلَةٍ كَفَتَاهُ.

### (بەشی/ دوو ئایەتی کۆتایی سورەتی (البقره))

ئەبی مەسعودی بەدری (رضي الله عنه) لە پێغەمبەر دەگێڕێتەوە (ﷺ) فەرموی: (دوو ئایەتی کۆتایی سورەتی (البقره) کەسێ بیخوێنی لە شەوا ئەوا بەسە بۆی لە شەری و خراپەکاری شەیتان بەدوور دەبێ).

## باب زواج الثَّيِّب

٤٨٨. عَنْ جَابِر بن عبد الله الأنصاري رَضي الله عَنْهُ قَال: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) هَلْ نَكَحْتَ يَا جَابِرُ قُلْتُ نَعَمْ قَالَ مَاذَا أَبِكْرًا أَمْ ثَيِّبًا قُلْتُ لَا بَلْ ثَيِّبًا قَالَ فَهَلَّا جَارِيَةً تُلَاعِبُكَ قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَبِي قُتِلَ يَوْمَ أُحُدٍ وَتَرَكَ تِسْعَ بَنَاتٍ كُنَّ لِي تِسْعَ أَخَوَاتٍ فَكَرِهْتُ أَنْ أَجْمَعَ إِلَيْهِنَّ جَارِيَةً خَرْقَاءَ مِثْلَهُنَّ وَلَكِنْ امْرَأَةً تَمْشُطُهُنَّ وَتَقُومُ عَلَيْهِنَّ قَالَ أَصَبْتَ.

### (بەشی/ مارەکردنی بێوەژن)

جابیری کوڕی عەبدوڵلای ئەنصاری (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموم: (ئەی جابیر ئافرەتت مارە کرد؟ منیش

ووتم بەڵێ فەرموی کچت مارە کردوە یان بێوەژن؟ ووتم بێوەژن فەرموی بۆ کچت مارە نەکرد؟ گاڵتە و گەمەت لەگەڵ بکات؟ ووتم ئەی پێغەمبەری خوا، باوکم لەجەنگی ئوحد شەهید بووە و تۆ کچی لەپاش بەجێ ما کە دەکاتە نۆ خۆشکم وە پێم ناخۆش بوو لە نێوان ئەم هەموو خوشکانە کچێکی وەکو ئەوان کۆبکەمەوە کە نەزان بێت وەکو ئەوان سەروکاری ماڵی نەزانێ و بەڵام کە بێوەژن بوو کە سەری خوشکەکانم شانە بکات و خزمەتیان بکات، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی راستت کرد و پێکات.

## باب بَركةُ النبي (ﷺ)

٤٨٩.وَعَنْهُ أيضاً قال: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ فَقُلْتُ: قَدْ عَلِمْتَ أَنَّ وَالِدِي اسْتُشْهِدَ يَوْمَ أُحُدٍ وَتَرَكَ دَيْنًا كَثِيرًا، وَإِنِّي أُحِبُّ أَنْ يَرَاكَ الْغُرَمَاءُ. فَقَالَ: ((اذْهَبْ فَبَيْدِرْ كُلَّ تَمْرٍ عَلَى نَاحِيَةٍ)). فَفَعَلْتُ ثُمَّ دَعَوْتُهُ فَلَمَّا نَظَرُوا إِلَيْهِ كَأَنَّهُمْ أُغْرُوا بِي تِلْكَ السَّاعَةَ فَلَمَّا رَأَى مَا يَصْنَعُونَ أَطَافَ حَوْلَ أَعْظَمِهَا بَيْدَرًا ثَلَاثَ مَرَّاتٍ ثُمَّ جَلَسَ عَلَيْهِ ثُمَّ قَالَ ادْعُ لَكَ أَصْحَابَكَ فَمَا زَالَ يَكِيلُ لَهُمْ حَتَّى أَدَّى اللَّهُ عَنْ وَالِدِي أَمَانَتَهُ وَأَنَا أَرْضَى أَنْ يُؤَدِّيَ أَمَانَةَ وَالِدِي وَلَا أَرْجِعَ إِلَى أَخَوَاتِي بِتَمْرَةٍ فَسَلَّمَ اللَّهُ الْبَيَادِرَ كُلَّهَا وَحَتَّى إِنِّي أَنْظُرُ إِلَى الْبَيْدَرِ الَّذِي كَانَ عَلَيْهِ النَّبِيُّ (ﷺ) كَأَنَّهَا لَمْ تَنْقُصْ تَمْرَةً وَاحِدَةً.

## (بەشی/ بەرەکەتی پێغەمبەر (ﷺ))

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رضي الله عنه) فەرموی هاتمە خزمەت پێغەمبەری خوا و پێم ووت تۆ دەزانێ وا باوکم لە جەنگی ئوحود شەهید بووە و قەرزێکی زۆری لەسەرە و وەمنیش پێم خۆشە خاوەن قەرزەکان بێن بۆ لات فەرموی برۆ بە ئەندازەی قەرزەکە کۆمەڵی خورما کۆبکەرەوە وە منیش

چووم وام کرد و له پاشان بانگی پێغەمبەرم کرد (ﷺ) و هاته لای خورماکه و دانیشت و دوعای بەرەکەتی بەسەردا خوێند، پاشان فەرموی خاوەن قەرزەکانت بانگ بکه و مافی خۆیانیان بدەرەوە بە تەواوی منیش قەرزەکانم دایەوە یەك کەس قەرزی لەسەر باوکم نەماوە وە نەمویست بۆ خوشکەکانم هیچ بمێنێ بەڵام زۆری لێ مایەوە هەروەکو دەستی لێ نەدرا بێ وابوو.

## باب غزوة ذات الرقاع وَعفو النبي علَيهِ الصلاة والسلام عن الباغي

٤٩٠. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله تعالى عَنْهُما عَنْ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((نُصِرْتُ بِالصَّبَا وَأُهْلِكَتْ عَادٌ بِالدَّبُورِ)).

## (بەشی/ جەنگی (ذات الرقاع) وە لیبوردەیی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ لە رێ لادەران)

عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (رضي الله عنه) لە پێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێ: (سەرکەوتم و سەرخرام بەسەر کافران لە جەنگی ئەحزاب بەبای رۆژهەڵاتەوەوە نەتەوەی عادیش بەبای رۆژئاوا لەناو چوون).

٤٩١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ يَقُولُ (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ أَعَزَّ جُنْدَهُ وَنَصَرَ عَبْدَهُ وَغَلَبَ الْأَحْزَابَ وَحْدَهُ فَلَا شَيْءَ بَعْدَهُ).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لە پێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە دەیفەرموو: (لا إله إلا الله وحْدهُ أعز جُندَهُ ونَصرَ عبْدَهُ وغَلَبَ الأحزاب وحْدهُ فلا شئ بعْدَهُ)

هەر خودا تەنیا و بێ هاوەڵە لەشکری خۆی لە ڕۆژی أحزاب سەرخست بەندەکەی خۆی کە موحەمەدە سەری خست وە لەشکری ئەحزابی بەزاند و شکاندی هیچ شتێ لە دوای ئەو نیە

٤٩٢. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّهُ غَزَا مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) قِبَلَ نَجْدٍ فَلَمَّا قَفَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) قَفَلَ مَعَهُ فَأَدْرَكَتْهُمْ الْقَائِلَةُ فِي وَادٍ كَثِيرِ الْعِضَاهِ فَنَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَتَفَرَّقَ النَّاسُ فِي الْعِضَاهِ يَسْتَظِلُّونَ بِالشَّجَرِ وَنَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) تَحْتَ سَمُرَةٍ فَعَلَّقَ بِهَا سَيْفَهُ قَالَ جَابِرٌ فَنِمْنَا نَوْمَةً ثُمَّ إِذَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)يَدْعُونَا فَجِئْنَاهُ فَإِذَا عِنْدَهُ أَعْرَابِيٌّ جَالِسٌ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِنَّ هَذَا اخْتَرَطَ سَيْفِي وَأَنَا نَائِمٌ فَاسْتَيْقَظْتُ وَهُوَ فِي يَدِهِ صَلْتًا فَقَالَ لِي مَنْ يَمْنَعُكَ مِنِّي قُلْتُ اللَّهُ فَهَا هُوَ جَالِسٌ ثُمَّ لَمْ يُعَاقِبْهُ النبي (ﷺ).

جابری کوڕی عەبدوڵلا (رضي الله عنهما) دەگێڕێتەوە لە غەزایەکدا لەخزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) بەرەو نەجد ڕۆیشتن بۆ غەزا لە قرچەی نیوەڕۆدا لەشوێنێکی درکاوی دابەزی بۆ پشودان و خەڵکەکەش بەناو شیوەکەدا بڵاوەیان کرد و چوونە سێبەری دارەکان نووستن، پێغەمبەریش لەبن دارێکا دابەزی و شمشێرەکەی بەدارێك هەڵواسی و خەوت کاتێ کە خەبەری بۆوە دەڕوانێ پیاوێ لەلایەتی، فەرمووی: ئەم پیاوە شمشێرەکەی منی هەڵکێشاو بەرووتی گرتبووی بەدەستیەوە دەیگووت کێ رزگارت دەکات لەدەستم؟ منیش وتم خودا، جا شمشێرەکەی خستەوە ناو کێلان و دانیشت ئیتر پێغەمبەریش تۆڵەی لەپیاوەکە نەسەندو هیچی لێ نەکرد.

## باب غزوة خَيْبَر وَفضل الحوْقلة

٤٩٣. عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: لَمَّا تَوَجَّهَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِه وَسَلَّمَ إِلَى خَيْبَر أَشْرَفَ النَّاسُ عَلَى وَادٍ فَرَفَعُوا أَصْوَاتَهُمْ بِالتَّكْبِيرِ اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) ارْبَعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ إِنَّكُمْ لَا تَدْعُونَ أَصَمَّ وَلَا غَائِبًا إِنَّكُمْ تَدْعُونَ سَمِيعًا قَرِيبًا وَهُوَ مَعَكُمْ وَأَنَا خَلْفَ دَابَّةِ النبي (ﷺ) فَسَمِعَنِي وَأَنَا أَقُولُ لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ فَقَالَ لِي يَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ قَيْسٍ قُلْتُ لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ أَلَا أَدُلُّكَ عَلَى كَلِمَةٍ مِنْ كَنْزٍ مِنْ كُنُوزِ الْجَنَّةِ قُلْتُ بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ فَدَاكَ أَبِي وَأُمِّي قَالَ لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ.

## (بەشی غەزای خەیبەر/ وە فەزڵی وشەی (لا حول ولا قوه الا بالله).

ئەبی موسای ئەشعەری (رضي الله عنه) فەرمووی: کە پێغەمبەر چوو بۆ فەتحی خەیبەر لەشکرەکە لەشیوەکەی خەیبەر بەرەو خوار بوونەوە بەو بۆنەیەوە دەستییان کرد بە (الله اکبر الله اکبر لا الـه الا الله) بەدەنگی بەرز، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: هێواش بن دەنگ بەرز مەکەن خۆ ئێوە بانگی کەڕولاڵ ناکەن یان بانگی کەسێ ناکەن کە غائیب و نادیار بێ ئێوە بانگی یەکێك دەکەن کە گوێی لێتانەو لێتان نزیکەو لەگەڵتان دایە و منیش لەوکاتەدا لەپشت ولاخەکەی پێغەمبەرەوە بووم پێغەمبەر گوێی لەمن بوو گووتم (لا حول ولا قوة الا بالله) فەرمووی ئەی عەبدوڵڵای کوڕی قەیس (ئەبو موسای ئەشعەری)! وتم وام لەخزمەتت ئەی پێغەمبەری خوا! فەرمووی با وشەیەکت پێ نیشان بدەم کە گەنجینەیەکە لەگەنجینەکانی بەهەشت گوتم بفەرموو ئەی پێغەمبەری خوا دایکم و باوکم بەقوربانت بێت، فەرمووی وشەی (لا حول ولا قوة الا بالله)یە.

## باب غزوة الفتح وحرمة مكة

٤٩٤. عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ الْعَدَوِيِّ رَضي الله عَنْهُ أَنَّهُ قَالَ لِعَمْرِو بْنِ سَعِيدٍ وَهُوَ يَبْعَثُ الْبُعُوثَ إِلَى مَكَّةَ: ائْذَنْ لِي أَيُّهَا الْأَمِيرُ أُحَدِّثْكَ قَوْلًا قَامَ بِهِ النَّبِيّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ الْغَدَ مِنْ يَوْمِ الْفَتْحِ سَمِعَتْهُ أُذُنَايَ وَوَعَاهُ قَلْبِي وَأَبْصَرَتْهُ عَيْنَايَ حِينَ تَكَلَّمَ بِهِ، إِنَّهُ حَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ ثُمَّ قَالَ: ((إِنَّ مَكَّةَ حَرَّمَهَا اللَّهُ وَلَمْ يُحَرِّمْهَا النَّاسُ، لَا يَحِلُّ لِامْرِئٍ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ أَنْ يَسْفِكَ بِهَا دَمًا وَلَا يَعْضُدَ بِهَا شَجَراً، فَإِنْ أَحَدٌ تَرَخَّصَ بِقِتَالِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فِيهَا فَقُولُوا لَهُ إِنَّ اللَّهَ أَذِنَ لِرَسُولِهِ وَلَمْ يَأْذَنْ لَكُمْ وَإِنَّمَا أَذِنَ لِي فِيهَا سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ وَقَدْ عَادَتْ حُرْمَتُهَا الْيَوْمَ كَحُرْمَتِهَا بِالْأَمْسِ وَلْيُبَلِّغْ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ)). فَقِيلَ لِأَبِي شُرَيْحٍ: مَاذا قَالَ لَكَ عَمْرو؟ قال: قَالَ عمرو: أَنَا أَعْلَمُ بِذَلِكَ مِنْكَ يَا أَبَا شُرَيْحٍ، إِنَّ الْحَرَمَ لَا يُعِيذُ عَاصِيًا وَلَا فَارًّا بِدَمٍ وَلَا فَارًّا بِخُرْبَةٍ وَلا يُنَفَّرُ صَيْدُهَا وَلا يُخْتَلى خَلاها وَلا تحِلُّ لُقطَتُها إلا لِمُنْشِد، فقالَ العباس بن عبد المطلب إلا الإذخِرَ يا رَسُول الله فَإِنَّهُ لابُدَّ مِنْهُ لِلْقَيْنِ والبُيُوت فَسكت ثُمَّ قالَ: ((إلاَّ الإذخِرَ فَإِنَّه حَلال)).

## (بەشی غەزای فەتحی مەککە و قەدەغەبوونی شکاندنی ڕێزی مەککە).

عەمری کوڕی سەعید خەریك بوو لەشكری دەنارد بۆسەر ئیبنوزوبەیر لە مەککە، ئەبو شورەیحی ئەل-عەدەوی (ڕەزای خوای لێ بێ) پێی فەرموو: ڕێگەم بدە ئەی میر! تا فەرموودەیەکت بۆ بگێڕمەوە کە لەپاش فەتحی مەککە بەدوو ڕۆژ، لەوتارا لەزاری پێغەمبەر (ﷺ) خۆیم بیست، بەهەردوو گوێی خۆم گوێم لێی بوو، وە بەدڵ دڵم لەلای بوو، وە بەچاوی خۆم سەیریم دەکرد، لەوکاتەدا کە حەزرەت (ﷺ) ئەم فەرموودەیەی دەفەرموو کە

سوپاس و ستایشی خودای کردو ئینجا فەرمووی: مەککە خودای گەورە خۆی کردوویەتی بەبەست و حەرەم و ئەم کارانەی تیادا حەڕام کردووە، وە خەڵك لەخۆیانەوە نەیان کردووە بەبەست و حەرەم و ئەو کارانەی تیادا قەدەغە بکەن! جا کەوا بوو درووست نییە بۆکەسێ کە باوەڕی بەخوداو بەڕۆژی دوایی ڕۆژ هەبێ کە خوێنی بەناهەق تیا بڕێژێ، یا دارو درەختی داپاچێ، وە ئەگەر دنیابوو کەسێ کوشتارەکەی ڕۆژی فەتحی مەککەی پێغەمبەری کرد بەبەهانە بۆئەوەی شەڕو شۆڕی تیا بەرپا بکا، ڕێگەی مەدەن و بیانووی ببڕن و پێی بڵێن: کەوا خوا ڕێگەی پێغەمبەری خۆی بۆئەوەدا بوو، بەڵام ڕێگەی ئێوەی بۆ ئەمە نەداوە، تەنانەت بۆمنیش لەو ڕۆژەدا بۆ ماوەیەکی کەم ڕێگەی دا، کە مەوداکەی لەبەیانەکییەوە بوو هەتا عەسر، بەڵام ئێستا وەك سەردەمی پێشوو مەککە قەدەغە بۆتەوەو بۆتەوە بەبەست (حەرەم، کوشت و بڕی تیا ناڕەوایە).

جا با ئەوەی کەئێستا لێرەیەو حازرەو بەدیارەوەیەو بەگوێی خۆی ئەم فەرمایشتانە لەخۆم دەبیستێ با رایان بگەیەنێ بەوکەسانەی کەئێستا لێرە نین!

جا گوترا بەئەبو شورەیح: ئەی وەڵامی عەمر چی بوو؟ فەرمووی: عەمریش گووتی: من ئەمە لەتۆ باشتر دەزانم ئەی ئەبو شورەیح! بەڵام بەست (حەرەم)ی مەککە پەنای پیاوی یاخی و پەنای پیاوی خوێنرێژی هەڵهاتوو هەروا پەنای کرێکاری دزیکاری راکردوو نادات!).

باش ئاگادارین تائێستا لەم دەمەدا شارێکی بەرێزو قەدەغەیە، کەوابوو نەدرکی پاکۆ دەدەرێ و، نەدارو درەختی دادەپاچرێ و نە کوشتارو شەڕو شۆڕی تیادا دەکرێ لەم حەلەوە هەتا قیامەت ئەم شتانەی تیا قەدەغەیە، وەنە نەچێری دەرەوێنرێتەوە، وەنە شتی داکەوتووی هەڵ دەگیرێتەوە،

مەگەر بۆکەسێ کە ناوو نیشانی هەڵبدا بۆئەوەی کەخاوەنەکەی پەیدا ببێ و بیباتەوە.

پیاوێکی قورەیشیش (کە عەبباسی مامەی پێغەمبەر بوو) گووتی: ئەی پێغەمبەری خودا! تەنیا گیای سوڕناتك (إذخر)ی لێ دەرچێ، چونکە ئەم گیایە بۆ سووتەمەنی ناومالّ و بۆ پەردووی سەردارەڕاو بۆ سەرگرتنی سەری گۆڕ بەکاری دێنن، حەزرەتیش (ﷺ) فەرمووی: (باشە تەنیا گیای سوڕناتکی لێ دەرچێ).

## باب بعث مَعاذ رضي الله عنه
## إلى اليمن ووصية الرسول (ﷺ)

٤٩٥. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) لِمُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ حِينَ بَعَثَهُ إِلَى الْيَمَنِ إِنَّكَ سَتَأْتِي قَوْمًا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ فَإِذَا جِئْتَهُمْ فَادْعُهُمْ إِلَى أَنْ يَشْهَدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ فَإِنْ هُمْ طَاعُوا لَكَ بِذَلِكَ فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللَّهَ قَدْ فَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ فَإِنْ هُمْ اطَاعُوا لَكَ بِذَلِكَ فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللَّهَ قَدْ فَرَضَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةً تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيَائِهِمْ فَتُرَدُّ عَلَى فُقَرَائِهِمْ فَإِنْ هُمْ طَاعُوا لَكَ بِذَلِكَ فَإِيَّاكَ وَكَرَائِمَ أَمْوَالِهِمْ وَاتَّقِ دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ فَإِنَّهُ لَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ اللَّهِ حِجَابٌ.

## (بەشی ناردنی موعاز (رضي الله عنه) بۆ یەمەن و ئامۆژگاری پێغەمبەر (ﷺ) بۆی)

عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (رضي الله عنه) دەفەرمووێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی بە موعاذی کوڕی جەبەل لەوکاتەی ناردی بۆ یەمەن و پێی فەرموو: تۆ دەگەی نەتەوەیەك لەخاوەن نامەکان (اهل الکتاب) ئەگەر پێیان گەیشتی

بانگیان بکە بۆئەوەی کە شایەتی بدەن کە تەنها یەك خوا هەیەو ناوی الله و هاوەڵی نییە، وە موحەمەدیش پێغەمبەری خوایەو وە ئەگەر گوێڕایەڵی تۆ بوون پێیان بڵێ کەوا خوای گەورە پێنج نوێژی فەرز کردوون لەسەرتان لەهەموو شەوو ڕۆژێکدا و دیسان ئەگەر گوێڕایەڵت بوون پێیان رابگەیەنە کەوا خوای گەورە زەکاتی لەسەر فەرز کردوون کەلە دەوڵەمەندان وەرگرن و بیدەن بە هەژاران وە ئەگەر گوێڕایەڵت بوون وە خۆت ئاگاداریە لە بردنی ماڵە چاکەکانی ئەوان و وە خۆت بپارێزە لەنزای ستەم لێکراوا چونکە لەنێوان ئەوو خوای پەروەردگار هیچ پەردەو حیجابەك نییە.

## باب النية في العمل مع العدو

٤٩٦. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) رَجَعَ مِنْ غَزْوَةِ تَبُوكَ فَدَنَا مِنْ الْمَدِينَةِ فَقَالَ إِنَّ بِالْمَدِينَةِ أَقْوَامًا مَا سِرْتُمْ مَسِيرًا وَلَا قَطَعْتُمْ وَادِيًا إِلَّا كَانُوا مَعَكُمْ قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ وَهُمْ بِالْمَدِينَةِ قَالَ وَهُمْ بِالْمَدِينَةِ حَبَسَهُمْ الْعُذْرُ.

## (بەشی/ نیازو نییەت لە ڕەفتار لەگەڵ دوژمندا)

ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) لەجەنگی تەبوك گەڕایەوە کە نزیك کەوتەوە لەشاری مەدینە فەرمووی: ئێستا لەمەدینە چەند کەسێ هەن، ئێوە لەجەنگا چەند شەو ڕۆیشتن و چەند شیو و دۆڵکتان بڕیوە ئەوا ئەوان لەگەڵ ئێوەن لەپاداشت و ئەجردا هاوبەشن، وە ئەوان کە لەمەدینە ماون لەبەر ئەوەیە بەهانەی شەرعییان هەبووە بۆیە نەهاتن لەگەڵتاندا بۆ جەنگ.

## باب ولاية المرأة

٤٩٧.عَنْ أَبِي بَكْرَةَ قَالَ لَقَدْ نَفَعَنِي اللَّهُ بِكَلِمَةٍ سَمِعْتُهَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) أَيَّامَ الْجَمَلِ بَعْدَ مَا كِدْتُ أَنْ أَلْحَقَ بِأَصْحَابِ الْجَمَلِ فَأُقَاتِلَ مَعَهُمْ قَالَ لَمَّا بَلَغَ النبي الله (ﷺ)أَنَّ أَهْلَ فَارِسَ قَدْ مَلَّكُوا عَلَيْهِمْ بِنْتَ كِسْرَى قَالَ لَنْ يُفْلِحَ قَوْمٌ وَلَّوْا أَمْرَهُمْ امْرَأَةً.

### (بەشی/ سەرداری بوونی ئافرەتان)

ئەبی بەكرە فەرمووی: بەهۆی وشەیەكەوە كەلـە زاری پێغەمبـەری خـوام (ﷺ) بیست سوودم پـێ گەیشت لـەكاتی روودانـی شـەڕی جەمـەل (حرب الجمل) چونكە دوودڵ بووم لـە بەشـداری كـردنم لـەم جەنگـە، خـەریك بـووم لەگەڵ خاتوو عائیشە بـڕۆم لـەدژی عـەلی و سـوپاكەی بجـەنگم ئـەو وشـەیە ئەوەبوو كە لەوكاتەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاگادار بوو كە خـەڵكی ئێـران كـچی كیـسرایان كـردە سـەرۆكی خۆیـان، پێغەمبـەر فـەرمووی: هـەر گـەلێ گەورەیی و سەرۆكییان بسپێرن بەئافرەتان سەركەوتوو نابن.

## باب قبور الأنبياء واليَهود

٤٩٨.عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) فِي مَرَضِهِ الَّذِي لَمْ يَقُمْ مِنْهُ لَعَنَ اللَّهُ الْيَهُودَ اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ قَالَتْ عَائِشَةُ لَوْلَا ذَلِكَ لَأُبْرِزَ قَبْرُهُ خَشِيَ أَنْ يُتَّخَذَ مَسْجِدًا.

### (بەشی/ گۆڕی پێغەمبەران و جوولەكە)

عائیشە خان (رضي الله عنها) فەرمووی: پێغەمبەر (ﷺ) لەو نەخۆشیەی كە كۆچی دوایی پێ كرد فەرمووی: نەفرینی خـوا لـە جوولەكـەكان كـەگۆڕی پێغەمبەرانییان دەكردە مزگەوت وە عائیشە فەرمووی: ئەگەر لەبەر ئەم شتە

ئەبوایە گۆڕی پێغەمبەر (ﷺ) لەزەوی بەرز دەبۆوە بێ پەردە دەبوو لەترسی ئەوەی نەکرێتە مزگەوت و لە جگە خوا داوای لێ بکرێ.

## باب حديث الشفاعة

٤٩٩.عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ يَجْتَمِعُ الْمُؤْمِنُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيَقُولُونَ لَوْ اسْتَشْفَعْنَا إِلَى رَبِّنَا فَيَأْتُونَ آدَمَ فَيَقُولُونَ أَنْتَ أَبُو النَّاسِ خَلَقَكَ اللَّهُ بِيَدِهِ وَأَسْجَدَ لَكَ مَلَائِكَتَهُ وَعَلَّمَكَ أَسْمَاءَ كُلِّ شَيْءٍ فَاشْفَعْ لَنَا عِنْدَ رَبِّكَ حَتَّى يُرِيحَنَا مِنْ مَكَانِنَا هَذَا فَيَقُولُ لَسْتُ هُنَاكُمْ وَيَذْكُرُ ذَنْبَهُ فَيَسْتَحِي ائْتُوا نُوحًا فَإِنَّهُ أَوَّلُ رَسُولٍ بَعَثَهُ اللَّهُ إِلَى أَهْلِ الْأَرْضِ فَيَأْتُونَهُ فَيَقُولُ لَسْتُ هُنَاكُمْ وَيَذْكُرُ سُؤَالَهُ رَبَّهُ مَا لَيْسَ لَهُ بِهِ عِلْمٌ فَيَسْتَحِي فَيَقُولُ ائْتُوا خَلِيلَ الرَّحْمَنِ فَيَأْتُونَهُ فَيَقُولُ لَسْتُ هُنَاكُمْ ائْتُوا مُوسَى عَبْدًا كَلَّمَهُ اللَّهُ وَأَعْطَاهُ التَّوْرَاةَ فَيَأْتُونَهُ فَيَقُولُ لَسْتُ هُنَاكُمْ وَيَذْكُرُ قَتْلَ النَّفْسِ بِغَيْرِ نَفْسٍ فَيَسْتَحِي مِنْ رَبِّهِ فَيَقُولُ ائْتُوا عِيسَى عَبْدَ اللَّهِ وَرَسُولَهُ وَكَلِمَةَ اللَّهِ وَرُوحَهُ فَيَقُولُ لَسْتُ هُنَاكُمْ ائْتُوا مُحَمَّدًا (ﷺ) عَبْدًا غَفَرَ اللَّهُ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ وَمَا تَأَخَّرَ فَيَأْتُونِي فَأَنْطَلِقُ حَتَّى أَسْتَأْذِنَ عَلَى رَبِّي فَيُؤْذَنَ لِي فَإِذَا رَأَيْتُ رَبِّي وَقَعْتُ سَاجِدًا فَيَدَعُنِي مَا شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ يُقَالُ ارْفَعْ رَأْسَكَ وَسَلْ تُعْطَهْ وَقُلْ يُسْمَعْ وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ فَأَرْفَعُ رَأْسِي فَأَحْمَدُهُ بِتَحْمِيدٍ يُعَلِّمُنِيهِ ثُمَّ أَشْفَعُ فَيَحُدُّ لِي حَدًّا فَأُدْخِلُهُمْ الْجَنَّةَ ثُمَّ أَعُودُ إِلَيْهِ فَإِذَا رَأَيْتُ رَبِّي مِثْلَهُ ثُمَّ أَشْفَعُ فَيَحُدُّ لِي حَدًّا فَأُدْخِلُهُمْ الْجَنَّةَ ثُمَّ أعود الثالثة ثُمَّ أَعُودُ الرَّابِعَةَ فَأَقُولُ مَا بَقِيَ فِي النَّارِ إِلَّا مَنْ حَبَسَهُ الْقُرْآنُ وَوَجَبَ عَلَيْهِ الْخُلُودُ، يَعْنِي قَوْلَ اللَّهِ تَعَالَى ﴿خَالِدِينَ فِيهَا﴾.

## (بەشی فەرموودەی تکافرکردن (الشفاعە))

**ئەنەس (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە دەفەرمووێ:**

بڕواداران لەرۆژی قیامەتدا کۆدەبنەوە دەڵێن بۆ تکاو پاڕانەوە دەچن بۆلای باوکە ئادەم وەدەڵێن تۆ باوکی هەموو خەڵکی و خوای گەورە بەدەستی قودرەتی خۆی درووستی کردووی وە فریشتەکانی والێکرد کە کڕنۆشت بۆ بەرن وە لەناوەکانی هەموو شتێك فێری کردووی هاتووین داوا کارین کە شەفاعەتمان بۆبکەی لەلای پەروەردگارت هەتا لەوجێگا ناخۆشەی تێیدا داین رزگارمان بێت کە ئەویش پێیان دەڵێت من شایانی ئەوکارە گەورە نیم وە باسی تاوانی خۆی دەکات و شەرم دایدەگرێ، بڕۆن بۆلای نوح چونکە ئەو یەکەم پێغەمبەر بوو خوای گەورە ناردوویەتی بۆ زەوی و خەڵکی زەوی، ئەوانیش دەچن بۆلای نوح ئەویش دەڵێ من شایانی ئەوبارە گرانە نیم ئەویش باسی ئەو پرسیارەی کرد کە لەخوای گەورەی کردو زانیاری پێ نەبوو دەربارەی ..... وە شەرم دەکەم لەپەروەردگارم بڕۆن بۆلای دۆستی خوا ئیبراهیم ئەویش پێیان دەڵێت من شایانی نیم بڕۆن بۆلای موسا کە بەندەیەکی گوفتاری لەگەڵ خوا کردووە وە تەوراتی پێ بەخشیوە ئەوانیش دەچن بۆلای موساو ئەویش باسی گوناهی خۆی دەکات و کەیەکێکی کوشتووە بەبێ ماف، شەرم لە پەروەردگار دەکات دەفەرمووێ بڕۆن بۆلای عیسای عەبدو بەندەو کەلیمەو روحی خوا ئەویش پێیان دەڵێت لێرە شایانی ئەم کارە نیم شەرم دەکات لەپەروەردگار بڕۆن بۆلای موحەمەد (ﷺ) کە بەندەیەکە خوا لەگوناهی پێشوو پاشی خۆش بووە ئەوانیش دێن بۆلای من و منیش دەڕۆم و داوای مۆڵەت و ئیزنی شەفاعەت دەکەم لەخوا و ئینجا بانگەوازێك دەکرێ کە ئەوکاتەی خوای گەورە دەبینم دەکەومە کڕنووش و

ئەوەندەی خوا حەزبکات نزاو پاڕانەوە دەکەم ئینجا پێم دەڵێن سەرت بەرزکەوە و داوا بکە پێت دەدرێت و بڵێ گوێمان لێتەو تکا بکەو تکات وەرگیراوە، ئینجا سەرم بەرز دەکەمەوەو سوپاسێکی خوا دەکەم کە فێری کردووم لەپاشان تکا دەکەم وە سنوورم بۆ دادەنێن بۆچەند کۆمەڵ تکا بکەم وە دەیان بەم بۆ بەهەشت و لەپاشان دەگەڕێمەوە و خوای خۆم بەوشێوە دیت و تکاو شەفاعەت بۆ کەسانێ دەکەم کەخوا مۆڵەتی داوم دیسان ئەم کۆمەڵە دەبەم بۆبەهەشت لەپاشان بۆ جاری سێیەم و بۆجاری چوارەم ئینجا دەڵێم کەس نەماوە لەئاگر تەنها ئەوەی قورئان بەندی کردون وە هەتایی بۆ واجب بوون کە فەرموودەی خوایە کە دەفەرمووێ هەتاهەتایی دەمێنێتەوە.

## باب أي الذنب أعظمْ

٥٠٠. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مَسعُود رَضي الله عَنْهُ قَال: سَأَلْتُ رَسُول الله (ﷺ)أيُّ الذَّنْبِ أَعْظَمُ عِنْدَ اللَّهِ؟ قَالَ: ((أَنْ تَجْعَلَ لِلَّهِ نِدًّا وَهُوَ خَلَقَكَ)) قُلْتُ: إِنَّ ذَلِكَ لَعَظِيمٌ، ثُمَّ أَيُّ؟ قَالَ: ((وَأَنْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ تَخَافُ أَنْ يَطْعَمَ مَعَكَ)). قُلْتُ: ثُمَّ أَيُّ؟ قَالَ: ((أَنْ تُزَانِيَ حَلِيلَةَ جَارِكَ)).

## (بەشی/ چ گوناهێك لەهەمووان گەورەترە)

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (رضي الله عنه) فەرمووی پرسیارم لەپێغەمبەری خوا کرد (ﷺ) چ تاوانێ لەهەموویان گەورەترە؟

فەرمووی: هاوەڵ و شەریك بۆ خوا بڕیار بدەی کە درووستی کردووی وە وتم ئەوە زۆر گەورەیە، لەپاشان چی تر؟ فەرمووی: ئەوەش کە منداڵی خۆت بەدەستی خۆت بکوژی لەترسی ئەوەی نەبادا خواردنت لەگەڵ بخوات، لەپاشان وتم چیتر، فەرمووی: داوێن پیسی لەگەڵ ئافرەتی دراوسێت بکەی.

## باب
## وقالوا إتخذ الله ولداً

٥٠١. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ قَالَ اللَّهُ تَعالى كَذَّبَنِي ابْنُ آدَمَ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ ذَلِكَ وَشَتَمَنِي وَلَمْ يَكُنْ لَهُ ذَلِكَ فَأَمَّا تَكْذِيبُهُ إِيَّايَ فَزَعَمَ أَنِّي لَا أَقْدِرُ أَنْ أُعِيدَهُ كَمَا كَانَ وَأَمَّا شَتْمُهُ إِيَّايَ فَقَوْلُهُ لِي وَلَدٌ فَسُبْحَانِي أَنْ أَتَّخِذَ صَاحِبَةً أَوْ وَلَدًا.

## بەشی
## (وَقَالُواْ اتَّخَذَ اللّهُ وَلَداً).

عەبدوللای کوڕی عەبباس (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە دەفەرمووێ خوای گەورە دەفەرمووێ: (نەوەی ئادەم بەدرۆم دەخەنەوە وە بۆیان نیە کە ئاوابکەن و جوێنم پێ دەدەن وە بۆیان نییە ئاوا بکەن، بەلام کە بەدرۆم دەخەنەوە دەڵێن گوایە من توانام نیە لەپاش مردن زیندوویان بکەمەوە وەکو ئێستا وە جوێن پێدانیشیان بۆمن ئەوەیە هاوەڵ و هاوسەرم بۆ بڕیار دەدەن کەمن پاك و دوورم لەم جۆرە بڕیارانەی بێ سەروبەر.

## باب دعوة كلها خير

٥٠٢. عَنْ أَنَسٍ رَضِي الله عَنْهُ قَال: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يقول: ((اللَّهُمَّ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ)).

## (بەشی/ نزاو پاڕانەوە هەمووی باشەو خێرە).

ئەنەس (رضي الله عنه) دەفەرمووێ: پێغەمبەر (ﷺ) زۆرجار ئەم نزایەی دەکرد و دەیفەرموو: (اللهم آتنا في الدنيا حسنةً وفي الآخرة حسنةً وقينا عذاب النار). واتە: ئەی خوایە پێمان ببەخشە لەدەنیادا چاکە وە لەدوارۆژیشدا چاکە وە لەسزای ئاگر دوورمان بخەرەوە.

## باب الذي يتعفف

٥٠٣. عَنْ أبي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قال: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((لَيْسَ الْمِسْكِينُ الَّذِي تَرُدُّهُ التَّمْرَةُ وَالتَّمْرَتَانِ وَلَا اللُّقْمَةُ وَلَا اللُّقْمَتَانِ إِنَّمَا الْمِسْكِينُ الَّذِي يَتَعَفَّفُ، وَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ يَعْنِي قَوْلَهُ ﴿لَا يَسْـَٔلُونَ ٱلنَّاسَ إِلْحَافًا﴾.

## (بەشی/ ئوکەسەی خۆپارێزی و پاکی بکات لە سواڵ کردن و دەرۆزە).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی هەژار ئەوکەسە نییە کە بەسەر خەڵکیدا دەگەڕێ ئەم دەرگاو ئەو دەرگا دەکات و لەوماڵ پاروێ و لەوماڵ دووپارو لەوێ دەنکە خورمایێ و لەوێ دوو دەنکە خورما وەردەگرێ و سواڵ دەکات، بەڵکو هەژار ئەوکەسەی کە نیەتی و شەرم دەکات داوا و سواڵ لەخەڵکی بکات و بەکەمی خۆی رازییە و خۆپارێزی دەکات لە دەرۆزەکردن وە ئەگەر حەزدەکەن ئەم ئایەتە بخوێننەوە ﴿لَا يَسْـَٔلُونَ ٱلنَّاسَ إِلْحَافًا﴾.واتە: ئەو هەژارانە داوا ناکەن لەخەڵکی بەزۆر شتی لێ بسەنن روگیریان بکەن ئەوانە نەفس بەرزن.

## باب اليمين على المدعى عليه

٥٠٤. عَنْ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ أَنَّ امْرَأَتَيْنِ كَانَتَا تَخْرِزَانِ فِي بَيْتٍ أَوْ فِي الْحُجْرَةِ فَخَرَجَتْ إِحْدَاهُمَا وَقَدْ أُنْفِذَ بِإِشْفًى فِي كَفِّهَا فَادَّعَتْ عَلَى الْأُخْرَى فَرُفِعَ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنها فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) لَوْ يُعْطَى النَّاسُ بِدَعْوَاهُمْ لَذَهَبَ دِمَاءُ قَوْمٍ وَأَمْوَالُهُمْ ذَكِّرُوهَا بِاللَّهِ وَاقْرَءُوا عَلَيْهَا ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَـٰنِهِمْ ثَمَنًا﴾ فَذَكَّرُوهَا فَاعْتَرَفَتْ فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْيَمِينُ عَلَى الْمُدَّعَى عَلَيْهِ.

## (بەشی/ سوێند خواردن بۆ داوالێکراو).

ئەبی مولەیکە فەرمووی: دووژن لەناوماڵێکا یان لەناو هۆدەیەکدا درێشەکاری دەکەن، یەکێکییان بریندار دەبێ و درێشەی دەچێتە ناو لەپی دەستی، داوای ئەوەبوو کە ژنەکەی تر وای لێ کردووە داواکەیان بردە لای عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (رضي الله عنه) فەرمووی پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: (ئەگەر ئەوخەڵکە هەرچی داوا بکەن پێیان بدرێ بەبێ پێنیشان دانی بەڵگە ئەوا دەبێ بەتێکەو لێکەو هەرکەسەو بۆخۆی و سەرەنجام گەلێ ماڵ و سامان کۆدەکەنەوەو گەلێ خوێنی خەڵکی بەفیڕۆ دەڕوات، فەرمووی ئامۆژگاری ژنە گومان لێکراوەکە بکەن و خوای بخەنەوە یاد وە ئەم ئایەتەی بۆ بخوێننەوە ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَـٰنِهِمْ ثَمَنًا﴾ واتە: کەسێ کە بەڵێن و پەیمان بەخودا دەدەن و سوێند دەخۆن و لەپاشان پەیمانەکە دەشکێنن و سوێندەکانیان نابەنەسەرو بەبەهای دونیا دەیگۆڕنەوە) فەرمووی کەوایان کرد ژنەکە پێی لێنا کە ئەو وای لێکردووە وە عەبدوڵلای کوڕی عەبباس فەرمووی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: لەکاتی داوا و داواکاریدا سوێند دەدرێ بە داوالێکراو.

# باب كتابه (ﷺ) إلى هرقل

٥٠٥. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ حَدَّثَنِي أَبُو سُفْيَانَ بْنُ حَرب مِنْ فِيهِ إِلَى فِيَّ قَالَ انْطَلَقْتُ فِي الْمُدَّةِ الَّتِي كَانَتْ بَيْنِي وَبَيْنَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ فَبَيْنَا أَنَا بِالشَّامِ إِذْ جِيءَ بِكِتَابٍ مِنْ النَّبِيِّ (ﷺ) إِلَى هِرَقْلَ قَالَ وَكَانَ دَحْيَةُ الْكَلْبِيُّ جَاءَ بِهِ فَدَفَعَهُ إِلَى عَظِيمِ بُصْرَى فَدَفَعَهُ عَظِيمُ بُصْرَى إِلَى هِرَقْلَ فَقَالَ هِرَقْلُ هَهُنَا أَحَدٌ مِنْ قَوْمِ هَذَا الرَّجُلِ الَّذِي يَزْعُمُ أَنَّهُ نَبِيٌّ فَقَالُوا نَعَمْ قَالَ (أبو سفيان) فَدُعِيتُ فِي نَفَرٍ مِنْ قُرَيْشٍ فَدَخَلْنَا عَلَى هِرَقْلَ فَأُجْلِسْنَا بَيْنَ يَدَيْهِ فَقَالَ أَيُّكُمْ أَقْرَبُ نَسَبًا مِنْ هَذَا الرَّجُلِ الَّذِي يَزْعُمُ أَنَّهُ نَبِيٌّ فَقُلْتُ أَنَا فَأَجْلَسُونِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَأَجْلَسُوا أَصْحَابِي خَلْفِي ثُمَّ دَعَا بِتَرْجُمَانِهِ فَقَالَ قُلْ لَهُمْ إِنِّي سَائِلٌ هَذَا عَنْ هَذَا الرَّجُلِ الَّذِي يَزْعُمُ أَنَّهُ نَبِيٌّ فَإِنْ كَذَبَنِي فَكَذِّبُوهُ قَالَ أَبُو سُفْيَانَ وَايْمُ اللَّهِ لَوْلَا أَنْ يُؤْثِرُوا عَلَيَّ الْكَذِبَ لَكَذَبْتُ ثُمَّ قَالَ لِتَرْجُمَانِهِ سَلْهُ كَيْفَ حَسَبُهُ فِيكُمْ قَالَ قُلْتُ هُوَ فِينَا ذُو حَسَبٍ قَالَ فَهَلْ كَانَ مِنْ آبَائِهِ مَلِكٌ قُلْتُ لَا قَالَ فَهَلْ كُنْتُمْ تَتَّهِمُونَهُ بِالْكَذِبِ قَبْلَ أَنْ يَقُولَ مَا قَالَ قُلْتُ لَا قَالَ أَيَتَّبِعُهُ أَشْرَافُ النَّاسِ أَمْ ضُعَفَاؤُهُمْ قُلت بَلْ ضُعَفَاؤُهُمْ قَالَ يَزِيدُونَ أَوْ يَنْقُصُونَ قُلْتُ لَا بَلْ يَزِيدُونَ قَالَ هَلْ يَرْتَدُّ أَحَدٌ مِنْهُمْ عَنْ دِينِهِ بَعْدَ أَنْ يَدْخُلَ فِيهِ سَخْطَةً لَهُ قُلْتُ لَا قَالَ فَهَلْ قَاتَلْتُمُوهُ قُلْتُ نَعَمْ قَالَ فَكَيْفَ كَانَ قِتَالُكُمْ إِيَّاهُ قُلْتُ تَكُونُ الْحَرْبُ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُ سِجَالًا يُصِيبُ مِنَّا وَنُصِيبُ مِنْهُ قَالَ فَهَلْ يَغْدِرُ قُلْتُ لَا وَنَحْنُ مِنْهُ فِي هَذِهِ ذمة لَا نَدْرِي مَا هُوَ صَانِعٌ فِيهَا قَالَ وَاللَّهِ مَا أَمْكَنَنِي مِنْ كَلِمَةٍ أُدْخِلُ فِيهَا شَيْئًا غَيْرَ هَذِهِ قَالَ فَهَلْ قَالَ هَذَا الْقَوْلَ أَحَدٌ قَبْلَهُ قُلْتُ لَا ثُمَّ قَالَ هرقل لِتُرْجُمَانِهِ قُلْ لَهُ إِنِّي سَأَلْتُكَ عَنْ حَسَبِهِ فَزَعَمْتَ أَنَّهُ فِيكُمْ ذُو حَسَبٍ وَكَذَلِكَ الرُّسُلُ تُبْعَثُ فِي أَحْسَابِ قَوْمِهَا وَسَأَلْتُكَ هَلْ كَانَ فِي آبَائِهِ مَلِكٌ فَزَعَمْتَ أَنْ لَا فَقُلْتُ لَوْ كَانَ مِنْ آبَائِهِ مَلِكٌ لَقُلْنا رَجُلٌ

يَطْلُبُ مُلْكَ آبَائِهِ وَسَأَلْتُكَ عَنْ أَتْبَاعِهِ أَضُعَفَاؤُهُمْ أَمْ أَشْرَافُهُمْ فَقُلْتَ بَلْ ضُعَفَاؤُهُمْ وَهُمْ أَتْبَاعُ الرُّسُلِ وَسَأَلْتُكَ هَلْ كُنْتُمْ تَتَّهِمُونَهُ بِالْكَذِبِ قَبْلَ أَنْ يَقُولَ مَا قَالَ فَزَعَمْتَ أَنْ لَا فَعَرَفْتُ أَنَّهُ لَمْ يَكُنْ لِيَدَعَ الْكَذِبَ عَلَى النَّاسِ ثُمَّ يَذْهَبَ فَيَكْذِبَ عَلَى اللَّهِ وَسَأَلْتُكَ هَلْ يَرْتَدُّ أَحَدٌ مِنْهُمْ عَنْ دِينِهِ بَعْدَ أَنْ يَدْخُلَ فِيهِ سَخْطَةً لَهُ فَزَعَمْتَ أَنْ لَا وَكَذَلِكَ الْإِيمَانُ إِذَا خَالَطَت بَشَاشَتَهُ الْقُلُوبَ وَسَأَلْتُكَ هَلْ يَزِيدُونَ أَمْ يَنْقُصُونَ فَزَعَمْتَ أَنَّهُمْ يُزِيدُونَ وَكَذَلِكَ الْإِيمَانُ حَتَّى يَتِمَّ وَسَأَلْتُكَ هَلْ قَاتَلْتُمُوهُ فَزَعَمْتَ أَنَّكُمْ قَاتَلْتُمُوهُ فَتَكُونُ الْحَرْبُ بَيْنَكُمْ سِجَالًا يَنَالُ مِنْكُمْ وَتَنَالُونَ مِنْهُ وَكَذَلِكَ الرُّسُلُ تُبْتَلَى ثُمَّ تَكُونُ لَهُمْ الْعَاقِبَةُ وَسَأَلْتُكَ هَلْ يَغْدِرُ فَزَعَمْتَ أَنَّهُ لَا يَغْدِرُ وَكَذَلِكَ الرُّسُلُ لَا تَغْدِرُ وَسَأَلْتُكَ هَلْ قَالَ أَحَدٌ هَذَا الْقَوْلَ قَبْلَهُ فَزَعَمْتَ أَنْ لَا فَقُلْنا لَوْ كَانَ قَالَ هَذَا الْقَوْلَ أَحَدٌ قَبْلَهُ قُلْتُ رَجُلٌ ائْتَمَّ بِقَوْلٍ قِيلَ قَبْلَهُ قَالَ ثُمَّ قَالَ بِمَ يَأْمُرُكُمْ قُلْتُ يَأْمُرُنَا بِالصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ وَالصِّلَةِ وَالْعَفَافِ قَالَ هرقل إِنْ يَكُ مَا تَقُولُ فِيهِ حَقًّا فَإِنَّهُ نَبِيٌّ وَقَدْ كُنْتُ أَعْلَمُ أَنَّهُ خَارِجٌ وَلَمْ أَكُ أَظُنُّهُ مِنْكُمْ وَلَوْ أَنِّي أَعْلَمُ أَنِّي أَخْلُصُ إِلَيْهِ لَأَحْبَبْتُ لِقَاءَهُ وَلَوْ كُنْتُ عِنْدَهُ لَغَسَلْتُ عَنْ قَدَمَيْهِ وَلَيَبْلُغَنَّ مُلْكُهُ مَا تَحْتَ قَدَمَيَّ هَاتَيْنِ قَالَ ثُمَّ دَعَا بِكِتَابِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَقَرَأَهُ فَإِذَا فِيهِ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ مِنْ مُحَمَّدٍ رَسُولِ اللَّهِ إِلَى هِرَقْلَ عَظِيمِ الرُّومِ سَلَامٌ عَلَى مَنْ اتَّبَعَ الْهُدَى أَمَّا بَعْدُ فَإِنِّي أَدْعُوكَ بِدِعَايَةِ الْإِسْلَامِ أَسْلِمْ تَسْلَمْ وَأَسْلِمْ يُؤْتِكَ اللَّهُ أَجْرَكَ مَرَّتَيْنِ فَإِنْ تَوَلَّيْتَ فَإِنَّ عَلَيْكَ إِثْمَ الْأَرِيسِيِّينَ وَ ﴿ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ كَلِمَةٖ سَوَآءِۭ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمۡ أَلَّا نَعۡبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشۡرِكَ بِهِۦ شَيۡـٔٗا وَلَا يَتَّخِذَ بَعۡضُنَا بَعۡضًا أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِۚ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَقُولُواْ ٱشۡهَدُواْ بِأَنَّا مُسۡلِمُونَ ﴾ (آل عمران: ٦٤ )فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ قِرَاءَةِ الْكِتَابِ ارْتَفَعَتْ

الْأَصْوَاتُ عِنْدَهُ وَكَثُرَ اللَّغَطُ وَأُمِرَ بِنَا فَأُخْرِجْنَا قَالَ أبو سُفيان فَقُلْتُ لِأَصْحَابِي حِينَ خَرَجْنَا لَقَدْ أَمِرَ أَمْرُ ابْنِ أَبِي كَبْشَةَ إِنَّهُ لَيَخَافُهُ مَلِكُ بَنِي الْأَصْفَرِ فَمَا زِلْتُ مُوقِنًا بِأَمْرِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ سَيَظْهَرُ حَتَّى أَدْخَلَ اللَّهُ عَلَيَّ الْإِسْلَامَ قَالَ الزُّهْرِيُّ فَدَعَا هِرَقْلُ عُظَمَاءَ الرُّومِ فَجَمَعَهُمْ فِي دَارٍ فَقَالَ يَا مَعْشَرَ الرُّومِ هَلْ لَكُمْ فِي الْفَلَاحِ وَالرَّشَدِ آخِرَ الْأَبَدِ وَأَنْ يَثْبُتَ لَكُمْ مُلْكُكُمْ قَالَ فَحَاصُوا حَيْصَةَ حُمُرِ الْوَحْشِ إِلَى الْأَبْوَابِ فَوَجَدُوهَا قَدْ غُلِّقَتْ فَقَالَ عَلَيَّ بِهِمْ فَدَعَا بِهِمْ فَقَالَ إِنِّي إِنَّمَا اخْتَبَرْتُ شِدَّتَكُمْ عَلَى دِينِكُمْ فَقَدْ رَأَيْتُ مِنْكُمْ الَّذِي أَحْبَبْتُ فَسَجَدُوا لَهُ وَرَضُوا عَنْهُ.

(**بەشی/ نامەی پێغەمبەری خوا بۆ هیرەقل پاشای رۆم**).

عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (رضي الله عنه) فەرمووی: ئەبو سوفیان بەزمانی خۆی بۆی گێڕامەوە گووتی: لەکاتی رێکەوتن (صولح)ی حودەیبییەدا کەلەنێوان من و پێغەمبەردا کرابوو، چووم بۆ شام لەوکاتەدا کەمن لەشام بووم، لەکۆتایی ساڵی شەشەمی کۆچیدا، دیحیەی کەلبی نامەیەکی هێنا لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) نووسرابوو بۆ قەیصەری رۆم کە هەرقلە، دیحیە کاغەزەکەی پێغەمبەر (ﷺ) دەداتە دەست سەرداری بوصرا، سەرداری بوصراش دەیداتە دەستی هیرەقل خۆی، جا کاتێ نامەکەی پێغەمبەری پێ دەگا، دەڵێ: ئادەی بگەڕێن بزانن لێرەدا کەسێ هەیە کە لەهۆزی ئەم پیاوە بێ کە ئەم کاغەزەی بۆمن نووسیوەو خۆی بەپێغەمبەر دەزانێ؟ دەڵێن: بەڵێ، ئەبو سوفیان گووتی: جامن و چەند کەسێکی تری قورەیشییان بانگ کرد، کە دەوری سی کەس دەبووین، بردینیان تا چووینە لای هیرقل لە قودس، لەبەر دەمیا دایان نیشاندین قەیسەر لەسەر تەختی پاشایی دانیشتبوو، تاجی لەسەرا بوو، گەورە گەورەی رۆم و پەتریق و قەشەو راهیبی

زۆری لەدەورا بوو، گووتی: کامتان بەخزمایەتی بەم پیاوە کەگوایە خۆی بە پێغەمبەر دەزانێ نزیکترە؟

گوتی گوتم: من، ئیتر منیان لەبەردەم خۆیدا دانیشان و هاوڕێکانمیان لەپشتمەوە دانیشان، ئینجا زمان زان (تەرجمان)ەکەی خۆی بانگ کردو گووتی: پێیان بڵێ ئەوا من لەم پیاوە پرسیار دەکەم و هەواڵی ئەو پیاوەی لێ دەپرسم کە دەڵێ من پێغەمبەرم جا ئەگەر ئەم لەو بارەیەوە بەدرۆ وەڵامی منی دایەوە ئێوە بەدرۆی بخەنەوە..

ئەبو سوفیان گووتی: بەخوا لەبەر ئەوە نەبوایە کە پێم شەرم بوو درۆم لێ دەرکەوێ،ئەگینا ئەو رۆژە درۆم دەکردو قەیسەرم چەواشە دەکرد لەبارەی هەواڵی پێغەمبەرەوە، چونکە ئەو سەردەمە من و حەزرەت هاوداوای یەکتری بووین، ئینجا هیرقەل بەزبانزانەکەی گوت: لێی بپرسە: بنچەو رەسەنی لەناوتانا چۆنە، خانەدانە یان نا؟ گوتم: تا بڵێیت خانەدان و وەجاخزادەیە، گوتی: ئایا لەناو باوو باپیریا پادشایان تیا هەڵکەوتووە؟ گوتم: نەخێر، گوتی: باشە ئەم پیاوە لەپێش ئەوەدا کەبڵێ من پێغەمبەرم درۆتان لێ دیوە؟ گوتم: نەء، گوتی باشە ئەوانەی کە پەیڕەوی دەکەن و دەچنە سەر ئاینی ئەو لەخانەدانەکانی خەڵکن یا لە لاوازەکانو و بێ نەواکانیانن؟ گوتم: نەء، هەر لە هەژارو لازەبوونەکانیان پەیڕەوی دەکەن، گوتی: بەرەبەرە زۆر دەبن یا کەم دەکەن؟ گوتم: نەخێر، بەڵکو رۆژ بەرۆژ زۆر دەبن، گوتی: باشە کەس هەیە لەوانەی کە دەچنە سەر ئەو ئایینە لەپاشا لێی بێزاربێ و پاشگەز ببێتەوەو وەرگەڕێ و وازی لێ بێنێ؟ گوتم: نەء، گوتی: ئەی شەڕو شۆڕو جەنگتان لەگەڵدا کردووە؟ گوتم: بەڵێ، گوتی: شەڕکردن و جەنگینتان لەگەڵیا چۆنە؟ گوتم: تائێستا جەنگ لەنێوانی ئێمەو ئەودا دووبەختی بووە، بەنۆرەو بەسەرە

بووە، جاریوا هەیە ئەو زاڵ دەبێ بەسەر ئێمەداو جاری واش هەیە ئێمە زاڵ دەبین بەسەر ئەودا، گوتی: باشە، ئەی پەیمان دەشکێنێ یان نا؟ گوتم: تائێستا نەیشکاندووە، بەڵام ئێستاکە پەیمانێکمان لەنێواندا هەیە، ڕێکەوتووین لەسەر شەڕنەکردن، بۆ ماوەیەکی ناویراو، جا نازانین دەیباتەسەر یا نا.

ئەبو سوفیان گوتی: بەخودا تەنیا ئەم وشەیە نەبێ مەودای تری نەدام، کە تێچێنێکی تێ چێنم و نەنگێ لە پێغەمبەر بکرم، گوتی: ئەی باشە کەسی تر لەپێش ئەمەوە قسەی وای کردووە لەناوتانا؟ گوتم: نەء، ئەنجا بەزوبانزانەکەی خۆیی گوت: پێی بڵێ: کەمن لێم پرسیت لەلایەنی بنەچەو ڕەسەنی ئەم پیاوەوە، تۆ وەڵامت دایەوە گوتت: کە هەتا بڵێی خانەدان و وەجاخزادەیە لەناوماناـ ئەوەیش ئاداب و نەریتی هەموو پێغەمبەرێ بووە، هەموویان وانە، هەموو کاتێ خوا کەسێکی خانەدان و وەجاخزادەی هەڵبژاردووەو کردوویەتی بە پێغەمبەرو ناردوویەتی بۆسەر هۆزەکەی خۆی، لێشم پرسیت کە ئایا باوو باپیری ئەم پیاوە شایان تیا بووە یانا، تۆ گوتت نەء، منیش لەدڵی خۆما گوتم: ئەگەر لەباوك و باپیریا پادشا ببوایە دەمگووت پیاوێکە داوای موڵك و دەوڵەتی باوك و باپیری دەکاتەوە، پرسیاریشم لێت کرد ئایا پەیڕەوانی ئەم پیاوە ڕەشە خەڵك و کۆمەڵەی مسکێنەکانن، یا ئاغاو بەگزادەکانن، ئەوەبوو تۆ گوتت لازەبوون و مسکێنەکان پەیڕەوی دەکەن، لەراستیدا هەمیشە زۆربەی پەیڕەوانی هەموو پێغەمبەرێ ئەوجۆرە کەسانەن.

لێشم پرسی ئایا لەپێش ئەوەدا کەبڵێ من پێغەمبەرم درۆتان لێ دیبوو، تۆ گوتت نەء، منیش گوتم: چۆن دەبێ لەگەڵ خەڵکا درۆ نەکا، بەڵام لەپاشا بچێ درۆ لەگەڵ خودا بکا، شتی وا نابێ، من لەتۆم پرسی ئایا کەسێ هەیە

لەشوێنکەوتوانی، کە بچێتەسەر دینەکەی و کە شارەزایی لێ پەیدا کرد وازی لێ بێنێ و بەدڵی نەبێ؟ تۆ گوتت نەء، لەراستیدا هەرکاتێ دڵ کە خۆشیی باوەڕو ئیمان بچێژێ و تام و چێژی لێ وەربگرێ ئیتر هەتا هەتایە ئەو فێنکی باوەڕە لەو دڵە ئارامە دەرناچێ و دەبن بەگوڵ و بولبول! من لەتۆم پرسی ئایا پەیڕەوانی ئەو لەزۆرترین یا لەکەمین؟ تۆ گوتت تادێ زۆرت دەبن! هەموو ئایین و بیروباوەڕێکی درووست ئاوایە، هەر لەزیادبوونە هەتا لەئەنجاما سەردەگرێ و تەواو دەبێ، من لەتۆم پرسی ئایا شەڕو شۆڕو جەنگتان لەگەڵدا کردووە، تۆ گوتت جەنگ و شەڕمان لەگەڵدا کردوەو تائێستا جەنگی نێوانمان دووبەختی بووە، جارێ ئەو دەیباتەوەو جارێ ئێمە دەیبەینەوە، لەراستیدا ئەمە رەوشتی هەموو پێغەمبەرێ بووە، لەسەرەتاوە تاقی دەکرێنەوەو دووچاری سەراسێ و ئێش و ئازار دەبن، بەڵام لەئەنجامدا ئەوان سەردەکەون، کە خۆرهەڵهات بەرەبەرە سوپای زۆرو ستەم و ناهەقی ئاودەکرێتە ژێری و گوڵوڵەی دەکەوێتە لێژی، من لەتۆم پرسی ئایا پەیمان دەشکێنێ یان نا؟ تۆ گوتت: خاوەن پەیمانەو پەیمان ناشکێنێ، ئەمەش شێوەو رەفتاری گشت پێغەمبەرانە، پێغەمبەران (سڵاوی خوایان لێ بێ) قەت پەیمان ناشکێنن و بەڵێن دەبەنەسەر، من لەتۆم پرسی ئایا کەسێکی تر لەپێش ئەمدا ئەم داوایەی ئەوی کردووە لەناوتاناو گوتوویەتی من پێغەمبەرم، تۆ گوتت نەء، منیش لەدڵی خۆما گوتم ئەگەر کەسێکی تر لەپێش ئەمدا ئەم قسەیەی بگووتایە دەمگوت: ئەم پیاوەش لاسایی ئەو قسە کۆنەیە دەکاتەوە!!

ئەبو سوفیان گووتی: ئەنجا هیرقەل گوتی: فەرمانتان بەچی پێ دەکاو دەڵێ چی بکەن و چی مەکەن؟ گوتم: پێمان دەڵێ: نوێژ بکەن، زەکات بدەن، خزم دۆست بن و بۆ خزم باش بن و مافی خزمایەتی بەجێ بێنن، دەست پاك

بن، داوێنپاك بن، دەمو دڵپاك بن، بەندەیی ساغ بەس بۆ خودای گەورە بکەن، هیچ شتێ نەکەین بەهاوەڵ بۆ خودا، واز لەو بت و خودا درۆییانە بهێنن کە باوك و باپیرمان لەکۆنا دەیانپەرستن.

هیرقەل گوتی: ئەمەی تۆ دەیڵێیت لەبارەی ئەو پیاوەوە ئەگەر راست و دروست بێ و ئاوابێ ئەوە پێغەمبەرە، من دەمزانی کە ئەم پێغەمبەرە بەزوویی پەیدا دەبێ و دێ، بەڵام نەمدەزانی کە لەئێوەیە ئەی کۆمەڵی عەرەب! بەش بەحاڵی خۆم ئەگەر بزانم قووتار دەبم و دەگەمەلای حەز دەکەم بچم بۆ خزمەتی، ئەگەر لەلای دەبووم قاچەکانیم دەشۆرد، بەخودا قەڵەمڕەو و دەستەڵاتی ئەو دەگاتە ئەم شوێن پایانەی منیش، وەخاکی بەیتولمەقدیس و هەموو وڵاتی شام و رۆم داگیر دەکا.

ئەبو سوفیان گوتی: لەپاشا داوای نامەکەی پێغەمبەری کردو خوێندییەوە، ناوەڕۆکەکەی ئەمە بوو، بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان، لە موحەممەدەوە کە بەندەی خودایە، کە پێغەمبەری خودایە، بۆلای هیرقەلی مەزنی رۆم، سڵاوو درووود لە پەیڕەوانی رێگەی راستی، سڵاو لەراستی خوازان! لەپاش ئەمە من داوات لێ دەکەم کە ئیسلام ببیت، ئیسلام ببە لەهەردوو جیهاندا سەلامەت دەبیت، ئیسلام ببە خودا لەباتی جارێ دووجار پاداشتت دەداتێ، چونکە هەموو خاوەن نامەیەکی نۆێی موسڵمان دوو پاداشتی بۆ هەیە، سەرەڕای ئەوەیش کەدەبێ بەمامۆستای نیشاندەری خێر بۆ هەموو دەست و پەیوەندەکەی خۆت و دەبی بەسەر مەشق بۆیان، ئەگەر سەرپێچیش دەکەی و گەردنکەچی ناکەی بۆ ئیسلام ئەوە بزانە کە هەم تۆباڵ و گوناهی خۆت و هەم تۆباڵ و گوناهی مسکێن و وەزیرەکانیش لەئەستۆی تۆیە چونکە ئەوان ژێردەستی تۆن و چاویان لەدەمی تۆیە.

هـەروەها داوات لـێ دەكـەم بـەهۆی ئـەم ئایەتەشـەوە كـە دەفـەرمووێ:

﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ كَلِمَةٖ سَوَآءِۭ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمۡ أَلَّا نَعۡبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشۡرِكَ بِهِۦ شَيۡـٔٗا وَلَا يَتَّخِذَ بَعۡضُنَا بَعۡضًا أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِۚ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَقُولُواْ ٱشۡهَدُواْ بِأَنَّا مُسۡلِمُونَ﴾ (آل عمران: ٦٤ ) واتـە: ئـەی ئـەهلی كیتـاب! ئەی خاوەن نامەكان! ئەی كۆمەڵێ كە خودا نامەی خۆی بەهۆی پێغەمبەرێ لەپێغەمبـەرەكانی خۆیـەوە بـۆ نـاردوون! وەرن بۆسـەر وەرگـرتنی تاقـە فەرموودەیێ، كەبۆ ئێمەو بۆئێوە یەكسانەو چون یەكـە بـەبێ جیاوازیی،كـە بریتییە لە نیازپـاكی و سـاخی لەگـەڵ خـودا وەئـەم مەبەسـتەش بـەم چـەن یاسایە دێتەجێ، یەكـەم عیبـادەت و پـەرسـتن و خوداپـەرسـتی بۆكەسـی تـر نەكەین بۆ خودای گەورە نەبێ، دووەم هاوەڵ و كـوڕو كـچ و بـاوك و دایـك و كەسووكاری بۆ بڕیار نەدەین، سێیەم لەناو خۆمانا یەكتری نەكەین بـەخوداو وەك خودا بیكەین بەخاوەن فەرمان و شت حەڵاڵ و حەرام بكا بۆمان، بـەبێ وەرگرتنی فەرمان لەخوداوە، جا ئەگەر ئەو خاوەن نامانە پشتییان لەم پەندو ئامۆژگاری و فەرمایشتە راست و درووستەو رووپێچی یان لەیەكتایی پەرستی كرد، ئەوا تۆ ئەی پێغەمبەر! هەم خۆت هەم پەیڕەوەكانت پێیان بڵێن: حەق دیارە ئاشكرایەو بەڵگە نەویستە، كەئێوە قـەبووڵی ناكـەن ئـەوا ئاگـادارین و بەشایەت بن ئێمە فەرمانبەرداری خوداین و موسڵمانین.

ئەبو سوفیان گوتی: كە هیرقەل لەخوێندنەوەی نامەكە بۆوە، لـەدەوری بوو بەزڵە زڵ و قاووقیژ، ئیتر دەستوور درا ئێمە كراینە دەرەوە، كەچووینە دەرەوە بەهاوڕێكانی خۆمم گوت: بەڕاستی خۆ كاری كوڕەكـەی ئەبوكەبـشە گەورە بوو، خۆ ئەوەتا شـای رۆمـیش لێـی دەترسـێ، (ئـەبو كەبـشە بـاوكی

شیری پێغەمبەرە، مێردی حەلیمەیە کە دایەنی حەزرەت بووە) ئیتر هەر لەوکاتەوە من دەمزانی کە کاروباری پێغەمبەر (ﷺ) سەردەکەوێ و گومانم لەوەدا نەبوو، تا ئەو رۆژەی خودا کردمی بە موسڵمان و چوومە سەر ئایینی ئیسلام.

(لێرەدا قسەی ئەبوسوفیان تەواو، زوهری (کە راوی فەرموودەکەیە) دەفەرمووێ: ئەمجا هیرەقل گەورە پیاوەکانی وڵاتی رۆم بانگ دەکاو لە کۆشکێکی خۆیا لە حیمس کۆیان دەکاتەوەو فەرمان دەکا دەرگاکانییان هەموو داخست، خۆی چووە جێیەکی بەرزو پێی گووتن: ئەی کۆمەڵەی رۆم! ئەگەر دەتانەوێ سەربەرزو سەرفرازبن هەتا هەتایە، وە موڵك و دەوڵەتیشتان بەردەوام بێ و بۆ بمێنێ وەرن زووکەن موسڵمان ببن، کە هیرەقل وای وت ئەوات هەموو وەك کەرەکێوی شڵەژان و بەرو دەرگاکان هەڵیان تیزان کە بچن هیرقەل بکوژن، کەچوون دەرگاکان گشت داخرا بوون، هیرقەل کەچاوی کەوت بە هەڵسەڵەمێنەوەکەیان و نائومێد بوو لەئیسلام بوونییان گووتی: بیانهێننەوە بۆلای خۆم، کە گەڕانەوە پێی گوتن: ئەوە من کەئەو قسەیەم بەئێوە گوت تاقیم کردنەوە، ویستم بزانم تاچ رادەیێ ئایینی خۆتان بەتوندی گرتووە، باش بوو هەڵوێستەکەتانم بەدڵ بوو، ئیتر ئەوانیش کوڕنووشی بەگەورە زانینییان بۆ بردو گلەییان لێی نەما.

## باب كتابه (ﷺ) الى كسرى

٥٠٦.عَنْ ابْنَ عَبَّاس رَضي الله عَنْهُما أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) بَعَثَ بِكِتَابِهِ إِلَى كِسْرَى مَعَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ حُذَافَةَ السَّهْمِيِّ وأَمَرَهُ أَنْ يَدْفَعَهُ إِلَى عَظِيمِ الْبَحْرَيْنِ فَدَفَعَهُ عَظِيمُ الْبَحْرَيْنِ، إِلَى كِسْرَى فَلَمَّا قَرَأَهُ مَزَّقَهُ فَحَسِبْتُ أَنَّ ابْنَ الْمُسَيَّبِ قَالَ فَدَعَا عَلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَنْ يُمَزَّقُوا كُلَّ مُمَزَّقٍ.

## (بەشی/ نامەناردنی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ كیسرای فارس)

عەبدوڵلای كوڕی عەبباس (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نامەی بە عەبدوڵلای كوڕی حوذافەی سوهەمی نارد وە فەرمانی پێكرد بیداتە دەست گەورەی بەحرەین وە ئەویش لەلای خۆیەوە بیداتە كیسرای پادشای فارس كە كیسراش نامەكەی پێغەمبەری خوای خوێندەوە پارچە پارچەی كرد، ئیبن موسەیب دەفەرمووێ: وا تێگەیشتم فەرمووی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوعای لێ كرد كە مولك و دەستەلاتی پارچەپارچە ببێت.

## باب إنّ الله لايَظلِم مثقالَ ذرةَ

٥٠٧.عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ أُنَاسًا فِي زَمَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ هَلْ نَرَى رَبَّنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ قَالَ نَعَمْ هَلْ تُضَارُّونَ فِي رُؤْيَةِ الشَّمْسِ بِالظَّهِيرَةِ ضَوْءٌ لَيْسَ فِيهَا سَحَابٌ قَالُوا لَا قَالَ وَهَلْ تُضَارُّونَ فِي رُؤْيَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ ضَوْءٌ لَيْسَ فِيهَا سَحَابٌ قَالُوا لَا قَالَ رَسولَ الله (ﷺ) مَا تُضَارُونَ فِي رُؤْيَةِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِلَّا كَمَا تُضَارُونَ فِي رُؤْيَةِ أَحَدِهِمَا إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ أَذَّنَ مُؤَذِّنٌ تَتْبَعُ كُلُّ أُمَّةٍ مَا كَانَتْ تَعْبُدُ فَلَا يَبْقَى مَنْ كَانَ يَعْبُدُ غَيْرَ اللَّهِ مِنْ الْأَصْنَامِ وَالْأَنْصَابِ إِلَّا يَتَسَاقَطُونَ فِي النَّارِ حَتَّى إِذَا لَمْ يَبْقَ إِلَّا مَنْ كَانَ يَعْبُدُ اللَّهَ بَرٌّ أَوْ فَاجِرٌ وَغُبَّرَاتُ أَهْلِ الْكِتَابِ فَيُدْعَى

الْيَهُودُ فَيُقَالُ لَهُمْ مَنْ كُنْتُمْ تَعْبُدُونَ قَالُوا كُنَّا نَعْبُدُ عزَيْراً ابْنَ اللَّهِ يُقَالُ لَهُمْ كَذَبْتُمْ مَا اتَّخَذَ اللَّهُ مِنْ صَاحِبَةٍ وَلَا وَلَدٍ فَمَاذَا تَبْغُونَ فَقَالُوا عَطِشْنَا رَبَّنَا فَاسْقِنَا فَيُشَارُ أَلَا لا تَرِدُونَ فَيُحْشَرُونَ إِلَى النَّارِ كَأَنَّهَا سَرَابٌ يَحْطِمُ بَعْضُهَا بَعْضًا فَيَتَسَاقَطُونَ فِي النَّارِ ثُمَّ يُدْعَى النَّصَارَى وَيُقَالُ لَهُمْ مَنْ كُنْتُمْ تَعْبُدُونَ قَالُوا كُنَّا نَعْبُدُ الْمَسِيحَ ابْنَ اللَّهِ فَيُقَالُ لَهُمْ كَذَبْتُمْ مَا اتَّخَذَ اللَّهُ مِنْ صَاحِبَةٍ وَلَا وَلَدٍ فَمَاذَا تَبْغُونَ فَكَذَلِكَ مِثْلَ الْأَوَّلِ حَتَّى إِذَا لَمْ يَبْقَ إِلَّا مَنْ كَانَ يَعْبُدُ اللَّهَ مِنْ بَرٍّ أَوْ فَاجِرٍ أَتَاهُمْ رَبُّ الْعَالَمِينَ فِي أَدْنَى صُورَةٍ مِنْ الَّتِي رَأَوْهُ فِيهَا فَيُقَالُ مَاذَا تَنْتَظِرُونَ؟ تَتْبَعُ كُلُّ أُمَّةٍ مَا كَانَتْ تَعْبُدُ قَالُوا فَارَقْنَا النَّاسَ فِي الدُّنْيَا عَلَى أَفْقَرِ مَا كُنَّا إِلَيْهِمْ وَلَمْ نُصَاحِبْهُمْ وَنَحْنُ نَنْتَظِرُ رَبَّنَا الَّذِي كُنَّا نَعْبُدُ فَيَقُولُ أَنَا رَبُّكُمْ فَيَقُولُونَ لَا نُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلَاثًا.

## (بەشی/ ئایەتی إِنَّ اللَّهَ لاَ يَظْلِمُ مِثْقَالَ)

ئەبو سەعیدی خودری (رضي الله عنه) فەرمووی: چەند کەسێ عەرزی پێغەمبەریان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا لەرۆژی لەقیامەتدا خودای خۆمان دەبینین؟ فەرمووی: بەڵێ دەیبینن، لەپاشدا فەرمووی: ئایا بەرۆژی نیوەڕۆ ئاسمان ساماڵ بێ و یەك دەنك هەوری پێوە نەبێ، لەدیتنی خۆردا هیچ ئەرکێ، زەحمەتێ، دەبینن، یاخود ئایا شەوی چواردەی مانگ کە ئاسمان سایەقەی ساف بێ هیچ هەوری نەبێ، بۆ چاوپێکەوتنی مانگ هیچ ئەرکێ دەکێشن؟ گوتیان نەخێر؟ ئەی پێغەمبەری خودا؟! فەرمووی: (دەی بەبێ ئەرك و کێشەو بەرە، وەك چۆن ئەم دووانە لەم دوو کاتەدا بەئاسانی و باشی دەبینن ئاوەهاش لەرۆژی دوارۆژدا بەچاوی سەر، بەخۆشی و بەئاسانی، خودای خۆتان دەبینن کە خودایەکی پیرۆز و گەورەیە، کاتێك کە قیامەت بوو، بانگکەرێ بانگەواز دەکات: هەموو میللەتێ لەجیهاندا چی پەرستووە با

شوێنی ئەوە بکەوێ، ئیتر ئەوانەی کە بت و ئەوجۆرە شتانەیان پەرستووەو غەیری خودایان پەرستووەو پەیکەری دارین و بەردینیان کردووە بە خوداو پەرستوویانە، هەموو دەکەونە ناو دۆزەخەوە، هەتا دەمێنێتەوە ئەوانەی کە خودایان پەرستووە، لەچاك و لەخراپ و لەپاشماوەی خاوەن نامەکان.

ئەوجا بانگی جوولەکە دەکرێ و پێیان دەگوترێت: ئێوە چیتان دەپەرست؟ دەڵێن: عوزەیری کوڕی خودامان دەپەرست، پێیان دەڵێن: درۆ دەکەن خودا نە هاوسەری بووەو نە منداڵ، دەی چیتان دەوێ؟ دەڵێن: خودایە تێنومانە ئاومان بدەرێ، بیخۆینەوە، پێیان دەفەرموون بچن بۆ ئەوێوە ئاو بخۆنەوە، جا بەرەو ئاگر خڕیان دەکەنەوەو دەیان تەپێننە ناوی، ئاگرەکە لەدوورەوە دەڵێی بەردە تراویلکەیە، لەبەر ئەوە لەوان وایە کە ئەوە ئاوە، بەڵام ئاو نییە، ئاگری سوورە، بڵێسەو نێڵەنێڵ و کڵپەکڵپی لەگەڵ خۆیدا شەڕ دەکات، ئیتر هەموویان دەکەونە ناوی.

ئەمجا بانگی فەلەکان دەکەن و پێیان دەڵێن: ئێوە چیتان دەپەرست؟ دەڵێن: مەسیحی کوڕی خودامان دەپەرست، پێیان دەفەرموون: درۆ دەکەن، خودا نەهاوسەری هەیەو نە منداڵ، وەك لەقورئاندا فەرموویەتی: ﴿وَأَنَّهُۥ تَعَٰلَىٰ جَدُّ رَبِّنَا مَا ٱتَّخَذَ صَٰحِبَةً وَلَا وَلَدًا﴾ سوورەتی جن ٣/٧٢، دەی چیتان دەوێ؟ دەڵێن: ئەی پەروەردگاری ئێمە! تینوومانە، ئاومان پێ بدە هەتا بیخۆینەوە، پێیان دەڵێن: بڕۆن بۆئەوێوە، لەوێ ئاو بخۆنەوە، ئەوجا مۆڵیان دەدەن، بەرەو دۆزەخ، ئاگرەکە لەلای ئەوانەوە کە تەماشای دەکەن دەڵێی بەردە خوێیە، چۆن بەردەخوێ لەسارادا، لەدوورەوە لەقرچەی گەرمادا، لەدەریای

ئاو دەكات، لەلای ئەوانەوە ئاگرەکە ئاوە، وەك شەپۆلە ئاوی زۆروا بوو، بلێسەکەی لە گەڵ کلپەی خۆیدا کۆڵەکە دەدا!!

جا ئەوانیش دیسان دەتەپێننە ناو ئاگر، هەتا تەنیا ئەوانە دەمێننەوە کە هەر خودای گەورەیان پەرستووە، بەچاك و خراپیانەوە، ئەوجا پەروەردگاری هەردوو جیهان (کە پاك و پیرۆزە و بێ خەوش و بێ گەردەو گەورەیە) لەسەر شێوەیێ دێ بۆلایان، کە نزیکترین شێوەیە، لەو شێوەی کە لەقورئانی پیرۆزو لەسەر زمانی موحەممەد بۆیان باسکراوە، پێیان دەفەرمووێ: ئەوە چاوەڕوانی چی دەکەن؟ ئەوەتانێ هەموو میللەتێ لەجیهاندا چی پەرستووە، ئێستا شوێنی ئەوە کەوتووە، جا دەڵێن: ئەی خودایە؟ خۆت ئاگات لێیە کە ئێمە لەجیهاندا لەبەر خاتری رەزای تۆ دەستمان لە کەسوکاری خۆمان و لەئازیزانی خۆمان و لە خەڵکەکانی تریش هەڵگرتبوو، وەو هاوڕێیەتیمان نەدەکردن لەو پێناوەدا، لەکاتێکدا کە زۆر کارمان پێییان هەبوو، کەوابوو فریامان کەوە لم سەخڵەتەیە رزگارمان بکە، خوداش دەفەرمووێ: من خودای ئێوەم، دەڵێن: پەنا دەگرین بەخودا لەتۆ، ئێمە هیچ هاوبەش پەیدا ناکەین بۆخودای خۆمان) (دووجار یان سێ جار ئەم گفتوگۆیە دووبارە دەکەنەوە).

## باب اثم كثير القول

٥٠٨.عَنْ أبي هُرَيرَة رَضي الله عَنْهُ قال: قال رسول الله ((كفى بالمرء إثما أن يحدث بكل ما سمع))

## (بەشی/ گوناهی زۆر لەقسەكردن)

ئـەبو هـورەيرە (رضـي الله عنـه) فـەرمووی: پێغەمبـەری خـودا (ﷺ) فـەرمووی بەسـە بـۆ مـرۆڤ لـە گونـاهو تـاوان كـە هەرچـی گـوێی لـێ بێـت بیگێڕێتەوەو باسی بكات.

## باب الحشر، وأول الكاسين في الموقف

٥٠٩.عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ خَطَبَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّكُمْ مَحْشُورُونَ إِلَى اللَّهِ تعالى حُفَاةً عُرَاةً غُرْلًا ثُمَّ قَرأ: ﴿كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ وَعْدًا عَلَيْنَآ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ﴾ الايات- ثُمَّ قَالَ أَلَا وَإِنَّ أَوَّلَ الْخَلَائِقِ يُكْسَى يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِبْرَاهِيمُ أَلَا وَإِنَّهُ يُجَاءُ بِرِجَالٍ مِنْ أُمَّتِي فَيُؤْخَذُ بِهِمْ ذَاتَ الشِّمَالِ فَأَقُولُ يَا رَبِّ أُصَيْحَابِي فَيُقَالُ إِنَّكَ لَا تَدْرِي مَا أَحْدَثُوا بَعْدَكَ فَأَقُولُ كَمَا قَالَ الْعَبْدُ الصَّالِحُ ﴿وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْ ۖ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِي كُنتَ أَنتَ الرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ ۚ وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ فَيُقَالُ إِنَّ هَؤُلَاءِ لَمْ يَزَالُوا مُرْتَدِّينَ عَلَى أَعْقَابِهِمْ مُنْذُ فَارَقْتَهُمْ.

## (بەشی/ حەشرو یەكەم كەسێ كە پۆشتە دەكرێ لەقیامەتدا)

عەبدوڵلای كوڕی عەبباس (رضي الله عنه) دەفەرمووێ: پێغەمبەری خـودا (ﷺ) وتاری دەدا فەرمووی: ئەی خەڵكینە ئێوە كۆ دەكرێنـەوە و حەشـر

دەكرێن بۆلای خوای گەورە بە سەركۆتی و بە رووتی و بە سوننەت نەكراوی و بەپێخاوسی لەپاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ وَعْدًا عَلَيْنَآ ۚ إِنَّا كُنَّا فَـٰعِلِينَ﴾.

واتە: (هەروەكو چۆن لەسەرەتاوە درووستمان كرد وەك ئەوسای خۆی لێدەكەینەوە جا ئەوە پەیمان و بەڵێنی ئێمەیە بێگومان ئێمە ئەو كارە ئەنجام دەدەین) لەپاشان یەكەمی ئەوەی خوا پۆشتەی دەكات، لەرۆژی قیامەت ئیبراهیم پێغەمبەر (علیه السلام) وە چەند خەڵكانێ لە ئوممەتی من دێن بەرەو لای چەپ دەیان بەن بۆ ئاگری دۆزەخ، منیش دەڵێم ئەی پەروەردگارم ئەوا هاوەڵ و ئۆممەتی منن، وە پێم دەڵێن تۆ نازانی ئەوانە لەپاش تۆ چیان داهێنایە جا منیش وەكو بەندەی صالح (عیسای كوڕی مەریەم) دەڵێم: ﴿وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْ ۖ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِى كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ ۚ﴾

واتە: من بەشایەد بووم بەسەریانەوە هەتا لەناویاندا بووم ئینجا كەمنت فڕاندو گیانت كێشام ئیتر ئەوە خۆت چاودێرو ئاگادار بوویت لێیان و هەرتۆش شایەنی بەسەر هەمووشتێكدا.

ئینجا دەڵێن ئەوانە لە هەڵگەڕاوەكانە لەوكاتەی تۆ لەناویان نەمای پشتیان هەڵكردو وازیان لەئایین هێنا.

## باب وعنده مفاتيح الغيب

٥١٠. عَنْ عبد الله بن عُمَر رَضي اللهُ عَن أنَّ رَسُولَ اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ قَالَ{مَفَاتِحُ الْغَيْبِ} خَمْسٌ ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِ ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌۢ بِأَىِّ أَرْضٍ تَمُوتُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌۢ ﴾ .

## (بەشی/ لەلای خوایە کلیلی شتە شاراوەکان)

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنهما) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (کلیلی شتە شاراوەکان (الغیب) پێنجن (راڤەی ئایەتەکە بەم جۆرەیە بەڕاستی هەرخوا خۆی زانیاری بەرپابوونی ڕۆژی قیامەت دەزانێت و بارانیش ئەو دەبارێنێت وە هیچ کەس نازنێت سبەی چی بەسەر دێت و چی دەست دەکەوێت لەبەرهەمی ماددی دونیای وە هیچ کەسیش نازانێ لەسەر چ زەویەك دەمرێ و کۆتایی بەژیانی دێت بەڕاستی خوا بەهەموو شتێك زانایەو ئاگادارە).

## باب قيام الساعة

٥١١. عَنْ أبي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ قَال: قَالَ رَسُولُ اللّهِ (ﷺ) لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا فَإِذَا رَآهَا النَّاسُ آمَنَ مَنْ عَلَيْهَا فَذَاكَ حِينَ لَا يَنْفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِنْ قَبْلُ.

## (بەشی/ هەڵسانی قیامەت)

ئـەبو هـورەیرە (رضـي الله عنـه) دەفـەرمووێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرمووی: (قیامەت هەڵناستێ هەتا خۆر لەخۆرئاوا هەڵدێت لەوکاتەدا کەخەڵك بینیان ئەوەی لەسەرزەوی بێت ئیمان و بڕوا دێنن ئەوجا لەوکاتەدا کە تۆبەو ئیمان و بڕوا سوودی نابێت ئەگەر لەپێش ئەو ڕۆژە ئیمان و بڕوای نەهێنابێ.

## باب

﴿ وَءَاخَرُونَ ٱعْتَرَفُوا۟ بِذُنُوبِهِمْ ﴾

٥١٢. عَنْ سَمُرَةَ بْنُ جُنْدَبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) لَنَا (أَتَانِي اللَّيْلَةَ آتِيَانِ فَابْتَعَثَانِي فَانْتَهَيْا إِلَى مَدِينَةٍ مَبْنِيَّةٍ بِلَبِنِ ذَهَبٍ وَلَبِنِ فِضَّةٍ فَتَلَقَّانَا رِجَالٌ شَطْرٌ مِنْ خَلْقِهِمْ كَأَحْسَنِ مَا أَنْتَ رَاءٍ وَشَطْرٌ كَأَقْبَحِ مَا أَنْتَ رَاءٍ قَالَ لَهُمْ اذْهَبُوا فَقَعُوا فِي ذَلِكَ النَّهْرِ فَوَقَعُوا فِيهِ ثُمَّ رَجَعُوا إِلَيْنَا قَدْ ذَهَبَ ذَلِكَ السُّوءُ عَنْهُمْ فَصَارُوا فِي أَحْسَنِ صُورَةٍ قَالَا لِي هَذِهِ جَنَّةُ عَدْنٍ وَهَاذَاكَ مَنْزِلُكَ قَالَا أَمَّا الْقَوْمُ الَّذِينَ كَانُوا شَطْرٌ مِنْهُمْ حَسَنٌ وَشَطْرٌ مِنْهُمْ قَبِيحٌ فَإِنَّهُمْ خَلَطُوا عَمَلًا صَالِحًا وَآخَرَ سَيِّئًا تَجَاوَزَ اللَّهُ عَنْهُمْ).

## بەشی/ ئایەتی

﴿ وَءَاخَرُونَ ٱعْتَرَفُوا۟ بِذُنُوبِهِمْ ﴾)

سەمورەی کوڕی جوندەب (رضي الله عنه) دەفەرمووێ: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (ئەم شەوە خەوێکم دیت لەخەوما چەند کەسێ هـاتن و بردمیان بۆ شارێك کە هەرخشتێکی لەزێڕو یەکێکی تری لەزیو بوون وە چەند پیاوێ گەیشتن بەئێمە و نیوەیان لە جـوانترین شـێوە درووسـت کرابـوون وە

نیوەی تریان لەسەر ناشیرین ترین شێوە درووست کرابوون وە پێیان وترا بڕۆن بۆلای ئەم روبارەو لەوێ خۆتان بشۆن کە گەڕانەوە ئەو ناشیرینیەیان لاچوو بوونە جوانترین شێوە وە هاوەڵەکانم پێیان وتم ئەمە بەهەشتی (عدنه) وە ئەویش شوێن و جێگای تۆیە، وە وتیان ئەوکەسانەی دیتت نیوەی لە شێوەی جوان درووست کراون و نیوەکەی تر لەشێوەی ناشیرین درووست کراون، ئەوانەش ئەوکەسانەن کە کردەوەی چاکەو خراپەیان وەکو یەکن و دوایی خوا لێیان دەبووریٚ و چاوپۆشیان لیٚ دەکات.

## باب صوم عاشورا ء

٥١٣. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضي الله عَنْهُما قَال: قَدِمَ النَّبِيُّ (ﷺ)الْمَدِينَةَ وَإِذا الْيَهُودُ تَصُومُ عَاشُورَاءَ فَقَالُوا هَذَا يَوْمٌ ظَهَرَ فِيهِ مُوسَى عَلَى فِرْعَوْنَ فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) لِأَصْحَابِهِ (أَنْتُمْ أَحَقُّ بِمُوسَى مِنْهُمْ فَصُومُوا).

## (بەشی/ رۆژووی عاشورا)

عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (رضي الله عنه) دەفەرمووێ: پێغەمبەر (ﷺ) تەشریفی هاتە شاری مەدینەو لەوێ جوولەکەکان رۆژی عاشورا (دەیەمی موحەڕەم) بە رۆژو دەبوون و دەیان وت ئەو رۆژەیە کە خوای گەورە موسای زاڵ کرد بەسەر فیرعەوندا وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی بەهاوەڵانی: ئێوە نزیکترن لەموسا لە جوولەکەکان وە بەرۆژووبن.

## باب

﴿وَكَذَٰلِكَ أَخۡذُ رَبِّكَ﴾

٥١٤. عَنْ أَبِي مُوسَى الاشعري رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِنَّ اللَّهَ لَيُمْلِي لِلظَّالِمِ حَتَّى إِذَا أَخَذَهُ لَمْ يُفْلِتْهُ قَالَ ثُمَّ قَرَأَ ﴿وَكَذَٰلِكَ أَخۡذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلۡقُرَىٰ وَهِيَ ظَٰلِمَةٌۚ إِنَّ أَخۡذَهُۥٓ أَلِيمٞ شَدِيدٌ﴾ .

## (بەشی/ ئایەتی

## ﴿وَكَذَٰلِكَ أَخۡذُ رَبِّكَ﴾)

ئەبی موسای ئەشعەری (رضي الله عنه) دەفەرمووێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (خوای گەورە مۆڵەت دەدات بە ستەمکاران هەتا کاتی دێت و دەیگرێ و ئەوکاتە لەدەست خوا دەرناچێ، فەرمووی لەپاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿وَكَذَٰلِكَ أَخۡذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلۡقُرَىٰ وَهِيَ ظَٰلِمَةٌۚ إِنَّ أَخۡذَهُۥٓ أَلِيمٞ شَدِيدٌ﴾. واتە: ئا ئەوەیە گرتنی خوا ئەگەر دانیشتووانی گوندێك بگرێ و تۆڵەیان بسەنێ کە ستەمکاربن بەڕاستی گرتن و تۆڵەی خوا بەئێش و ئازارە.

## باب

﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ﴾

٥١٥. عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَجُلًا أَصَابَ مِنْ امْرَأَةٍ قُبْلَةً فَأَتَى رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ فَأُنْزِلَتْ عَلَيْهِ ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفٗا مِّنَ ٱلَّيۡلِۚ إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ذَٰلِكَ ذِكۡرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ﴾ قَالَ الرَّجُلُ أَلِيَ هَذِهِ قَالَ النبي (ص) لِمَنْ عَمِلَ بِهَا مِنْ أُمَّتِي.

## (بەشی/ ئایەتی

## ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ ﴾)

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پیاوێ ماچێکی لەئافرەتێك کردو دوایی پەشیمان بوەوەو هاتەلای پێغەمبەرو بۆی گێڕایـەوە وە لەو کاتەدا ئەم ئایەتە هاتـە خـوارەوە بۆسـەر پێغەمبـەر (ﷺ)﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيْلِ إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴾ واتە: نوێژ بەچاکی ئـەنجام بـدە لەهـەردوو سـەری ڕۆژەوە کـە نوێژی نیوەڕۆو عەسرە وە لەسـێ کاتەکـەی شـەویش کـە نوێـژی مـەغریب و عیـشا و بەیانییـە نـزیکن لەیـەك وە بەراسـتی کـردەوە چـاکەکان کـردارە خراپەکان لادەبەن و گوناهەکان دەشۆنەوە ئەوە بیرخەرەوەیە بـۆ ئەوانـەی یادی خوابکەن).

پیاوەکە وتی ئەمە بۆمنە؟ پێغەمبەریش فەرمووی بۆهەموو ئەوکەسانەی ئەم کارە بکات لەئوممەتی منا.

## باب معادن العرب، وأكرمكُمْ أعلمكُمْ بدينه

٥١٦.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ سُئِلَ النَبيُ (ﷺ)أَيُّ النَّاسِ أَكْرَمُ قَالَ أَكْرَمُهُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاهُمْ قَالُوا لَيْسَ عَنْ هَذَا نَسْأَلُكَ، قَالَ (فَأَكْرَمُ النَّاسِ يُوسُفُ نَبِيُّ اللَّهِ ابْنُ نَبِيِّ اللَّهِ ابْنِ نَبِيِّ اللَّهِ ابْنِ نبي الله خَلِيلِ اللَّهِ قَالُوا لَيْسَ عَنْ هَذَا نَسْأَلُكَ) قَالَ فَعَنْ مَعَادِنِ الْعَرَبِ تَسْأَلُونِي قَالُوا نَعَمْ قَالَ فَخِيَارُكُمْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ خِيَارُكُمْ فِي الْإِسْلَامِ إِذَا فَقِهُوا.

## (بەشی/ گەنجینەو بنەچەی عەرەب، وە بەرێزترین کەستان زاناترینتانە بەدینەکەی)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پرسیار لەپێغەمبەر (ﷺ) کرا کێ لە خەڵکی بەرێزترە؟ فەرمووی: ئەوەی بەتەقواو لەخواترس بێت لەهەموو کەس بەرێزترە، وتیان ئێمە لەوە پرسیارت لێ ناکەین، فەرمووی بـەرێزترین خـەڵکی، یوسـفی کـوڕی پێغەمبـەری خـوا کـوڕی پێغەمبـەری خـوا کـوڕی پێغەمبەری خوا و خۆشەویستی خوا، وتیان دەربارەی ئـەوان پرسـیارت لـێ ناکەین، فەرمووی دەربارەی بنەچەو خانەدانی و گەنجینەی عەرەب پرسیارم لێ دەکەن وتیان بەڵێ فەرمووی چاکترین کەستان لەنەفامی چاکترین کەستان بێت لە ئیسلامەتی ئەگەر تێگەیشتنی هەبێ.

## باب

﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾.

٥١٧.عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ الْمُسْلِمُ إِذَا سُئِلَ فِي الْقَبْرِ يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ فَذَلِكَ قَوْلُهُ ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ ﴾

## (بەشی/ ئایەتی

﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾)

-بەرائی کوڕی عازیب (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کـە پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی: موسڵمان ئەگەر لەگۆڕدا پرسیاری لێ کرا دەڵێت: (شایەتی دەدەم کەخوا هیچ هاوەڵ و هاوبەشی نییە و موحەممەدیش پێغەمبـەری خوایـە، ئـا

ئەوەیە کەخوا دەفەرمووێ ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْآخِرَةِ ﴾ واتە: خوای گەورە ئەوانەی باوەڕیان پێ هێناوە پایەداریان دەکات لەسەر گوفتاری بەجێ و درووست لەژیانی دونیاو لەسەرە مەرگ و قیامەیشدا وە گوفتاریان ڕێك و پێك دەبێت و بەئیمانەوە دەمرن.

## باب دعاء شفاعته(ﷺ) بعد النداء

٥١٨.عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ النِّدَاءَ اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ وَالصَّلَاةِ الْقَائِمَةِ آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَهُ، حَلَّتْ لَهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ.

(بەشی/ داواکردنی شەفاعەت کردن، لەپێغەمبەر (ﷺ) لەپاش بانگداندا)

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رضي الله عنهما) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (کەسێ کەکاتی گوێی لە بانگ دەبێ و بڵێت (اللهم رب هذه الدعوة التامة والصلاة القائمة آت محمداً الوسيلة والفضيلة وابعثه مقاماً محموداً الذي وعدته).

خوایە ئەم بانگەوازی تەواوە ئەی پەروەردگارم لەم نوێژە دابەستراوە، ببەخشە بە موحەممەد پایەی هەرەبەرزی (وەسیلەو فەزیلە) وە بیبەرە ئەو پلەو بارەگای کەخۆت وەعدت پێ دایە رەوانەی ئەوێی بکە).

هەرکەسێ ئەم دوعایە بکات ئەوا شەفاعەت و تکاکردنی خۆم بۆی حەڵاڵ دەبێت.

## باب

﴿فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَزْنًا﴾

٥١٩. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ (إِنَّهُ لَيَأْتِي الرَّجُلُ الْعَظِيمُ السَّمِينُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لَا يَزِنُ عِنْدَ اللَّهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ)، وَقَالَ اقْرَءُوا ﴿فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَزْنًا﴾.

## (بەشی/ ئایەتی

﴿فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَزْنًا﴾)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوەکە دەفەرمووێ: (لەڕۆژی قیامەتدا پیاوی وا دێنن کە زۆر زەبەلاح و قەڵەوەو بەقەد باڵی پێشوولەیەك لەیەك لەلای خوا ڕێزو کێشی نییە وە فەرمووی ئەم ئایەتە بخوێننەوە ﴿فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَزْنًا﴾ واتە: بێ بڕوایان لەلای خوا لەڕۆژی قیامەت هیچ جۆرە بایەخ و نرخێکییان بۆ دانانرێت.

## باب

﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْحَسْرَةِ﴾

٥٢٠. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ النبيُ(ﷺ) يُؤْتَى بِالْمَوْتِ كَهَيْئَةِ كَبْشٍ أَمْلَحَ فَيُنَادِي مُنَادٍ يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ فَيَشْرَئِبُّونَ وَيَنْظُرُونَ فَيَقُولُ هَلْ تَعْرِفُونَ هَذَا فَيَقُولُونَ نَعَمْ هَذَا الْمَوْتُ، وَكُلُّهُمْ قَدْ رَآهُ ثُمَّ يُنَادِي يَا أَهْلَ النَّارِ فَيَشْرَئِبُّونَ وَيَنْظُرُونَ فَيَقُولُ هَلْ تَعْرِفُونَ هَذَا فَيَقُولُونَ نَعَمْ هَذَا الْمَوْتُ وَكُلُّهُمْ قَدْ رَآهُ فَيُذْبَحُ ثُمَّ يَقُولُ يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ خُلُودٌ فَلَا مَوْتَ وَيَا أَهْلَ النَّارِ خُلُودٌ فَلَا

مَوْتَ ثُمَّ قَرَأَ (ﷺ)﴿ وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْحَسْرَةِ إِذْ قُضِىَ ٱلْأَمْرُ وَهُمْ فِى غَفْلَةٍ ﴾ وَهَؤُلَاءِ فِي غَفْلَةٍ أَهْلُ الدُّنْيَا﴿ وَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾.

## (بەشی/ ئایەتی

## ﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْحَسْرَةِ ﴾ )

**ئـەبو سـەعیدی خـودری (رضـي الله عنـه) دەفـەرمووێ پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی: (لەرۆژی قیامەتدا مردن دێنن لەشێوەی بەرانێکی قەڵەو و سـپی و رەشدا ئەوجا جاڕ چی جاڕ دەدات بـەدەنگی بـەرز، ئـەی خـەڵکی بەهەشـت ئەوانیش گوێیان قوڵاغ دەبێت و دەنواڕن پێیان دەڵێن ئەمە دەناسن ئەوانیش دەڵێن بەڵێ ئەمە مردنە، وە هەموویان بەباش چاویان لێیـە لەپاشـان بـانگ دەکرێ ئەی خەڵکی دۆزەخ ئەوانیش گوێ قوڵاغ و تەماشـا دەکـەن و پێیـان دەڵێن دەزانن ئەمە چییە و دەیناسن؟ ئەوانیش دەڵێن بەڵێ ئەمە مردنـە وە هەرکەسیشیان لەجێگای خۆی تەماشای دەکات ئینجا بەرانەکە سەردەبڕن و پێیان دەڵێن ئەی خەڵکی بەهەشت خۆشی بۆ ئێوەو مردن نەماو هەتاهەتایێ لەخۆشـیدان، وە ئـەی خـەڵکی دۆزەخـیش هـەم بۆئێـوەش مـردن نـەماوە هەتاهەتایێ ئەمە شوێنتانە، لەپاشان پێغەمبەر ئەم ئایەتەی بۆ خوێندنەوە:**

﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْحَسْرَةِ إِذْ قُضِىَ ٱلْأَمْرُ وَهُمْ فِى غَفْلَةٍ وَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾.

**واتە: بیان ترسێنە لەرۆژی خەفەت و هەناسەساردی کە خودا دادپەروەری لەنێوانیان دەکات ئەوان لەدونیادا لەبێئاگایی و بێ بڕوایـی دابـوون و ئیمـان ناهێنن، وە ئەوانە لەبێ ئاگایی خەڵکی دونیان).**

## باب حديث الإفك

٥٢١. عَنْ عَائِشَةَ رَضِي الله عَنْها قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِذَا أَرَادَ يَخْرُجَ سَفَرًا أَقْرَعَ بَيْنَ أَزْوَاجِهِ فَأَيَّتُهُنَّ خَرَجَ سَهْمُهَا خَرَجَ بِهَا مَعَهُ، فَأَقْرَعَ بَيْنَنَا فِي غَزَاةٍ غَزَاهَا فَخَرَجَ سَهْمِي فَخَرَجْتُ مَعَهُ بَعْدَ مَا أُنْزِلَ الْحِجَابُ، فَأَنَا أُحْمَلُ فِي هَوْدَجٍ وَأُنْزَلُ فِيهِ فَسِرْنَا حَتَّى إِذَا فَرَغَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ غَزْوَتِهِ تِلْكَ وَقَفَلَ وَدَنَوْنَا مِنْ الْمَدِينَةِ آذَنَ لَيْلَةً بِالرَّحِيلِ فَقُمْتُ حِينَ آذَنُوا فَمَشَيْتُ حَتَّى جَاوَزْتُ الْجَيْشَ فَلَمَّا قَضَيْتُ شَأْنِي أَقْبَلْتُ إِلَى الرَّحْلِ فَلَمَسْتُ صَدْرِي فَإِذَا عِقْدٌ لِي مِنْ جَزْعِ أَظْفَارٍ قَدْ انْقَطَعَ فَرَجَعْتُ فَالْتَمَسْتُ عِقْدِي فَحَبَسَنِي ابْتِغَاؤُهُ فَأَقْبَلَ الَّذِينَ يُرَحِّلُونَ لِي فَاحْتَمَلُوا هَوْدَجِي فَرَحَلُوهُ عَلَى بَعِيرِي الَّذِي كُنْتُ أَرْكَبُ وَهُمْ يَحْسِبُونَ أَنِّي فِيهِ وَكَانَ النِّسَاءُ إِذْ ذَاكَ خِفَافًا لَمْ يَثْقُلْنَ وَلَمْ يَغْشَهُنَّ اللَّحْمُ وَإِنَّمَا يَأْكُلْنَ الْعُلْقَةَ مِنْ الطَّعَامِ فَلَمْ يَسْتَنْكِرْ الْقَوْمُ حِينَ رَفَعُوهُ ثِقَلَ الْهَوْدَجِ فَاحْتَمَلُوهُ وَكُنْتُ جَارِيَةً حَدِيثَةَ السِّنِّ فَبَعَثُوا الْجَمَلَ وَسَارُوا فَوَجَدْتُ عِقْدِي بَعْدَ مَا اسْتَمَرَّ الْجَيْشُ فَجِئْتُ مَنْزِلَهُمْ وَلَيْسَ فِيهِ أَحَدٌ فَأَمَمْتُ مَنْزِلِي الَّذِي كُنْتُ بِهِ فَظَنَنْتُ أَنَّهُمْ سَيَفْقِدُونَنِي فَيَرْجِعُونَ إِلَيَّ فَبَيْنَا أَنَا جَالِسَةٌ غَلَبَتْنِي عَيْنَايَ فَنِمْتُ وَكَانَ صَفْوَانُ بْنُ الْمُعَطَّلِ السُّلَمِيُّ ثُمَّ الذَّكْوَانِيُّ مِنْ وَرَاءِ الْجَيْشِ فَأَصْبَحَ عِنْدَ مَنْزِلِي فَرَأَى سَوَادَ إِنْسَانٍ نَائِمٍ فَأَتَانِي وَكَانَ يَرَانِي قَبْلَ الْحِجَابِ فَاسْتَيْقَظْتُ بِاسْتِرْجَاعِهِ حِينَ أَنَاخَ رَاحِلَتَهُ فَوَطِئَ يَدَهَا فَرَكِبْتُهَا فَانْطَلَقَ يَقُودُ بِي الرَّاحِلَةَ حَتَّى أَتَيْنَا الْجَيْشَ بَعْدَ مَا نَزَلُوا مُعَرِّسِينَ فِي نَحْرِ الظَّهِيرَةِ فَهَلَكَ مَنْ هَلَكَ وَكَانَ الَّذِي تَوَلَّى الْإِفْكَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيِّ ابْنُ سَلُولَ فَقَدِمْنَا الْمَدِينَةَ فَاشْتَكَيْتُ بِهَا شَهْرًا وَالنَّاسُ يُفِيضُونَ مِنْ قَوْلِ أَصْحَابِ الْإِفْكِ وَيَرِيبُنِي فِي وَجَعِي أَنِّي لَا أَرَى مِنْ النَّبِيِّ (ﷺ) اللُّطْفَ الَّذِي كُنْتُ أَرَى مِنْهُ حِينَ أَمْرَضُ إِنَّمَا يَدْخُلُ فَيُسَلِّمُ ثُمَّ يَقُولُ كَيْفَ

تيكُمْ لَا أَشْعُرُ بِشَيْءٍ مِنْ ذَلِكَ حَتَّى نَقَهْتُ، فَخَرَجْتُ أَنَا وَأُمُّ مِسْطَحٍ قِبَلَ الْمَنَاصِعِ مُتَبَرَّزُنَا لَا نَخْرُجُ إِلَّا لَيْلًا إِلَى لَيْلٍ وَذَلِكَ قَبْلَ أَنْ نَتَّخِذَ الْكُنُفَ قَرِيبًا مِنْ بُيُوتِنَا وَأَمْرُنَا أَمْرُ الْعَرَبِ الْأُوَلِ فِي الْبَرِّيَّةِ أَوْ فِي التَّنَزُّهِ فَأَقْبَلْتُ أَنَا وَأُمُّ مِسْطَحٍ بِنْتُ أَبِي رُهْمٍ نَمْشِي فَعَثَرَتْ فِي مِرْطِهَا فَقَالَتْ تَعِسَ مِسْطَحٌ فَقُلْتُ لَهَا بِئْسَ مَا قُلْتِ أَتَسُبِّينَ رَجُلًا شَهِدَ بَدْرًا فَقَالَتْ يَا هَنْتَاهْ أَلَمْ تَسْمَعِي مَا قَالُوا فَأَخْبَرَتْنِي بِقَوْلِ أَهْلِ الْإِفْكِ فَازْدَدْتُ مَرَضًا إِلى مَرَضِي فَلَمَّا رَجَعْتُ إِلَى مَنْزِلِي دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَسَلَّمَ فَقَالَ: (كَيْفَ تِيكُمْ) فَقُلْتُ ائْذَنْ لِي إِلَى أَبَوَيَّ، قَالَتْ وَأَنَا حِينَئِذٍ أُرِيدُ أَنْ أَسْتَيْقِنَ الْخَبَرَ مِنْ قِبَلِهِمَا فَأَذِنَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَأَتَيْتُ أَبَوَيَّ فَقُلْتُ لِأُمِّي مَا يَتَحَدَّثُ بِهِ النَّاسُ فَقَالَتْ يَا بُنَيَّةُ هَوِّنِي عَلَى نَفْسِكِ الشَّأْنَ، فَوَاللَّهِ لَقَلَّمَا كَانَتْ امْرَأَةٌ قَطُّ وَضِيئَةٌ عِنْدَ رَجُلٍ يُحِبُّهَا وَلَهَا ضَرَائِرُ إِلَّا أَكْثَرْنَ عَلَيْهَا فَقُلْتُ سُبْحَانَ اللَّهِ وَلَقَدْ تَحَدَّثُ النَّاسُ بِهَذَا قَالَتْ عائشة (رضي الله عنه) فَبِتُّ تِلْكَ اللَّيْلَةَ حَتَّى أَصْبَحْتُ لَا يَرْقَأُ لِي دَمْعٌ وَلَا أَكْتَحِلُ بِنَوْمٍ ثُمَّ أَصْبَحْتُ أبكي، فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ وَأُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ حِينَ اسْتَلْبَثَ الْوَحْيُ يَسْتَشِيرُهُمَا فِي فِرَاقِ أَهْلِهِ قالت: فَأَمَّا أُسَامَةُ فَأَشَارَ عَلَيْهِ (ﷺ)بِالَّذِي يَعْلَمُ من براءة أهله بالذي يعلم فِي نَفْسِهِ مِنْ الْوُدِّ لَهُمْ فَقَالَ أُسَامَةُ أَهْلُكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَلَا نَعْلَمُ وَاللَّهِ إِلَّا خَيْرًا وَأَمَّا عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ لَمْ يُضَيِّقْ اللَّهُ عَلَيْكَ وَالنِّسَاءُ سِوَاهَا كَثِيرٌ وَسَلْ الْجَارِيَةَ تَصْدُقْكَ فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَرِيرَةَ وقَالَ (ﷺ)يَا بَرِيرَةُ هَلْ رَأَيْتِ فِيهَا شَيْئًا يَرِيبُكِ فَقَالَتْ بَرِيرَةُ لَا وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ إِنْ رَأَيْتُ مِنْهَا أَمْرًا أَغْمِصُهُ عَلَيْهَا قَطُّ أَكْثَرَ مِنْ أَنَّهَا جَارِيَةٌ حَدِيثَةُ السِّنِّ تَنَامُ عَنْ الْعَجِينِ فَتَأْتِي الدَّاجِنُ فَتَأْكُلُهُ فَقَامَ النبي (ﷺ) مِنْ يَوْمِهِ فَاسْتَعْذَرَ مِنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُبَيٍّ ابْنِ سَلُولَ قالت النبيُ

(ﷺ) (مَنْ يَعْذُرُنِي مِنْ رَجُلٍ بَلَغَنِي أَذَاهُ فِي أَهْلِي فَوَاللَّهِ مَا عَلِمْتُ عَلَى أَهْلِي إِلَّا خَيْرًا وَقَدْ ذَكَرُوا رَجُلًا مَا عَلِمْتُ عَلَيْهِ إِلَّا خَيْرًا وَمَا كَانَ يَدْخُلُ عَلَى أَهْلِي إِلَّا مَعِي) فَقَامَ سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ الأنصاري فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنَا وَاللَّهِ أَعْذُرُكَ مِنْهُ إِنْ كَانَ مِنْ الْأَوْسِ ضَرَبْنَا عُنُقَهُ وَإِنْ كَانَ مِنْ إِخْوَانِنَا مِنْ الْخَزْرَجِ أَمَرْتَنَا فَفَعَلْنَا فِيهِ أَمْرَكَ قال سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ وَهُوَ سَيِّدُ الْخَزْرَجِ وَكَانَ قَبْلَ ذَلِكَ رَجُلًا صَالِحًا وَلَكِنْ احْتَمَلَتْهُ الْحَمِيَّةُ فَقَالَ كَذَبْتَ لَعَمْرُ اللَّهِ لَا تَقْتُلُهُ وَلَا تَقْدِرُ عَلَى ذَلِكَ فَقَامَ أُسَيْدُ بْنُ حُضَيْرٍ فَقَالَ كَذَبْتَ لَعَمْرُ اللَّهِ وَاللَّهِ لَنَقْتُلَنَّهُ فَإِنَّكَ مُنَافِقٌ تُجَادِلُ عَنْ الْمُنَافِقِينَ فَثَارَ الْحَيَّانِ الْأَوْسُ وَالْخَزْرَجُ حَتَّى هَمُّوا أم يقتتلوا وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى الْمِنْبَرِ فَنَزَلَ فَخَفَّضَهُمْ حَتَّى سَكَتُوا وَسَكَتَ عليه الصلاة والسلام وَبَكَيْتُ يَوْمِي لَا يَرْقَأُ لِي دَمْعٌ وَلَا أَكْتَحِلُ بِنَوْمٍ فَأَصْبَحَ عِنْدِي أَبَوَايَ وَقَدْ بَكَيْتُ لَيْلَتَيْنِ وَيَوْمًا حَتَّى أَظُنُّ أَنَّ الْبُكَاءَ فَالِقٌ كَبِدِي قَالَتْ فَبَيْنَا هُمَا جَالِسَانِ عِنْدِي وَأَنَا أَبْكِي إِذْ اسْتَأْذَنَتْ امْرَأَةٌ مِنْ الْأَنْصَارِ فَأَذِنْتُ لَهَا فَجَلَسَتْ تَبْكِي مَعِي فَبَيْنَا نَحْنُ كَذَلِكَ إِذْ دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وجَلَسَ وَلَمْ يَجْلِسْ عِنْدِي مِنْ يَوْمِ قِيلَ مَا قِيلَ قَبْلَهَا وَقَدْ مَكَثَ شَهْرًا لَا يُوحَى إِلَيْهِ فِي شَأْنِي شَيْءٌ قَالَتْ عائشة (رضي الله عنه) فَتَشَهَّدَ (ﷺ) ثُمَّ قَالَ يَا عَائِشَةُ فَإِنَّهُ بَلَغَنِي عَنْك كَذَا وَكَذَا فَإِنْ كُنْتِ بَرِيئَةً فَسَيُبَرِّئُكِ اللَّهُ وَإِنْ كُنْتِ أَلْمَمْتِ بِذَنْبٍ فَاسْتَغْفِرِي اللَّهَ وَتُوبِي إِلَيْهِ فَإِنَّ الْعَبْدَ إِذَا اعْتَرَفَ بِذَنْبِهِ ثُمَّ تَابَ تَابَ اللَّهُ عَلَيْهِ فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَقَالَتَهُ قَلَصَ دَمْعِي حَتَّى مَا أُحِسُّ مِنْهُ قَطْرَةً وَقُلْتُ لِأَبِي أَجِبْ عَنِّي رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ وَاللَّهِ مَا أَدْرِي مَا أَقُولُ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْتُ لِأُمِّي أَجِيبِي عَنِّي رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ)فِيمَا قَالَ قَالَتْ وَاللَّهِ مَا أَدْرِي مَا أَقُولُ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَتْ عائشة وَأَنَا

جَارِيَةٌ حَدِيثَةُ السِّنِّ لَا أَقْرَأُ كَثِيرًا مِنْ الْقُرْآنِ فَقُلْتُ إِنِّي وَاللَّهِ لَقَدْ عَلِمْتُ أَنَّكُمْ سَمِعْتُمْ مَا يَتَحَدَّثُ بِهِ النَّاسُ وَوَقَرَ فِي أَنْفُسِكُمْ وَصَدَّقْتُمْ بِهِ وَلَئِنْ قُلْتُ لَكُمْ إِنِّي بَرِيئَةٌ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنِّي لَبَرِيئَةٌ لَا تُصَدِّقُونِي بِذَلِكَ وَلَئِنْ اعْتَرَفْتُ لَكُمْ بِأَمْرٍ وَاللَّهُ يَعْلَمُ أَنِّي بَرِيئَةٌ لَتُصَدِّقُنِّي وَاللَّهِ مَا أَجِدُ لِي وَلَكُمْ مَثَلًا إِلَّا أَبَا يُوسُفَ إِذْ قَالَ {فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَاللَّهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَى مَا تَصِفُونَ} ثُمَّ تَحَوَّلْتُ عَلَى فِرَاشِي وَأَنَا أَرْجُو أَنْ يُبَرِّئَنِي اللَّهُ وَلَكِنْ وَاللَّهِ مَا ظَنَنْتُ أَنْ يُنْزِلَ فِي شَأْنِي وَحْيًا يتلى وَلَأَنَا أَحْقَرُ فِي نَفْسِي مِنْ أَنْ يُتَكَلَّمَ بِالْقُرْآنِ فِي أَمْرِي وَلَكِنِّي كُنْتُ أَرْجُو أَنْ يَرَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي النَّوْمِ رُؤْيَا يُبَرِّئُنِي اللَّهُ بها قالت عائشة (رضي الله عنه) فَوَاللَّهِ مَا رَامَ مَجْلِسَهُ وَلَا خَرَجَ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ الْبَيْتِ حَتَّى أُنْزِلَ عَلَيْهِ الْوَحْيُ فَأَخَذَهُ (ﷺ) مَا كَانَ يَأْخُذُهُ مِنْ الْبُرَحَاءِ حَتَّى إِنَّهُ لَيَتَحَدَّرُ مِنْهُ مِثْلُ الْجُمَانِ مِنْ الْعَرَقِ فِي يَوْمٍ شَاتٍ فَلَمَّا سُرِّيَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وَهُوَ يَضْحَكُ فَكَانَ أَوَّلَ كَلِمَةٍ تَكَلَّمَ بِهَا أَنْ قَالَ لِي يَا عَائِشَةُ احْمَدِي اللَّهَ فَقَدْ بَرَّأَكِ اللَّهُ فَقَالَتْ لِي أُمِّي قُومِي إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَقُلْتُ لَا وَاللَّهِ لَا أَقُومُ إِلَيْهِ وَلَا أَحْمَدُ إِلَّا اللَّهَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلۡإِفۡكِ عُصۡبَةٌ مِّنكُمۡ﴾ الْآيَاتِ فَلَمَّا أَنْزَلَ اللَّهُ عز وجل هَذَا فِي بَرَاءَتِي قَالَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ وَكَانَ يُنْفِقُ عَلَى مِسْطَحِ بْنِ أُثَاثَةَ لِقَرَابَتِهِ مِنْهُ وَاللَّهِ لَا أُنْفِقُ عَلَى مِسْطَحٍ شَيْئًا أَبَدًا بَعْدَ مَا قَالَ لِعَائِشَةَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى﴿ وَلَا يَأۡتَلِ أُوْلُواْ ٱلۡفَضۡلِ مِنكُمۡ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤۡتُوٓاْ أُوْلِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينَ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ وَلۡيَعۡفُواْ وَلۡيَصۡفَحُوٓاْۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٌ﴾ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ الصديق (رضي الله عنه) بَلَى

وَاللَّهِ إِنِّي لَأُحِبُّ أَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لِي فَرَجَعَ إِلَى مِسْطَحٍ الَّذِي كَانَ يُجْرِي عَلَيْهِ وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَسْأَلُ زَيْنَبَ بِنْتَ جَحْشٍ عَنْ أَمْرِي فَقَالَ يَا زَيْنَبُ مَا عَلِمْتِ مَا رَأَيْتِ فَقَالَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَحْمِي سَمْعِي وَبَصَرِي وَاللَّهِ مَا عَلِمْتُ عَلَيْهَا إِلَّا خَيْرًا قَالَتْ عائشة وَهِيَ الَّتِي كَانَتْ تُسَامِينِي فَعَصَمَهَا اللَّهُ بِالْوَرَعِ.

## (بەشی/ فەرموودەی بوختانەکە).

عائیشە خان (رضي الله عنها) دەفەرمووێ: پێغەمبەری خوا ئەگەر ویستبایە سەفەری بکردبا ئەوا قورعەو سەهمی بەسەر خێزانەکانی دەکرد وە سەهم و قورعەی کاممان دەرچووبوایە ئەوی لەگەڵ خۆی دەبرد وە سەهمی من دەرچوو، لەگەڵ پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەرچووم ئەمەش پاش ئەوەی فەرمان بە پۆشتەیی ئافرەتان درابوو. منیش لە کەژاوەکەمدا سوار دەکرام و دادەبەزێنرام، ئەوە بوو ڕۆیشتین تا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو غەزایەی لێ بووەوە و گەڕایەوە.

کەلە گەڕانەوەماندا لە مەدینە نزیك کەوتینەوە، شەوێك فەرمانیدا بکەوینە ڕێ، کە فەرمانی کەوتنە ڕێ درا، هەستام تا لە سوپاکە تێپەڕم کرد، کە کارم تەواو بوو هاتمەوە بۆلای بارخانەکەم هەستم کرد ملوانکەکەم کەلە بەردی (أظفار) درووست کرابوو پچڕاوە منیش بۆی گەڕام، بەو گەڕانەشم درەنگ کەوتم، جا ئەوانەی کە کەژاوەکەی منیان لە وشترەکە دەنا هاتن و کەژاوەکەمیان هەڵگرت و نایانە سەر ئەو وشترەی کە سواری دەبووم، وایان دەزانی لەناویدام، ئەو دەمە ژنان کێشیان سووك بوو، گۆشتیان نەگرتبوو قورس نەبوبوون، چونکە خواردنی کەمیان دەخوارد، لەبەر ئەوە سووکی کەژاوەکە بەلای پیاوەکانەوە سەیر نەبوو، کاتێ کە بەرزیان کردبووەوە

منیش کچۆڵەیەکی منداڵ بووم، وشترەکەیان هەڵساند و کەوتنە رێ، دوای ئەوەی کە سوپا کەوتە رێ منیش ملوانکەکەم دۆزیەوە و هاتمەوە بۆ جێگەکەیان، کەسی لێ نەمابوو، رووم لەو جێیە نا کە لێی بووم، پێم وابوو دەزانن بەجێ ماوم و بەدواما دەگەڕێنەوە، جا کاتێ لەو شوێنەمدا دانیشتبووم خەو زۆری بۆ هێنام و خەوتم.

ئەوەبوو صەفوانی کوڕی موعەطەڵی سولەمیی زەکوانیی لەدوای لەشکرەکەوە بوو لەئاخری شەودا کەوتبووە رێ، تا لەلای جێگەکەی مندا رۆژی لێ بوەوە، تارمایی مرۆڤێکی خەوتووی بەدی کردبوو، بەرەو رووم هات، کە بینیمی ناسیمی، چونکە پێش هاتنی ئایەتی حیجاب چاوی پێم دەکەوت، کەناسیمی بە (﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ﴾ ی ئەو بەخەبەرهاتم، خێرا بە بەرگەکەم دەموچاوم داپۆشی، دە بەخوا نە ئەو وشەیەك قسەی لەگەڵدا کردم و نەمنیش، ئەوەبوو وشترەکەی یەخداو دوو دەستی وشترەکەی نەوی کرد و منیش سواری وشترەکە بووم، جڵەوی وشترەکەی راکێشاو کەوتە رێ هەتا گەیشتینە لای سوپا دوای ئەوەی لەکاتی گەرمای نیوەڕۆدا باریان لێ خستبوو، ئیتر ئەوەبوو ئەوەی کە تیاچوو تیاچوو، عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلولیش بوو کە کاری سەرەکیی و گرنگی ئەو بوختانەی ئەنجامدا و گەورەی کرد.

هاتینەوە مەدینە کە گەیشتمەوە ماڵ مانگێك نەخۆش کەوتم و خەڵکیش وتەی ئەهلی ئیفکیان دووبارە دەکردەوەو منیش هەستم بەهیچێ لەوە نەدەکردو ئەوەش کە منی دەخستە گومانەوە لە نەخۆشیەکەمدا ئەوەبوو ئەو لوتفەم بە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) نەئەدی، کە جاران کاتێ نەخۆش

بوومایە ئەمدی هەر ئەوەندە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەهاتـە ژوورەوە لام و سەلامی دەکرد و پاشان دەیفەرموو نەخۆشەکەتان چۆنە؟ ئاگام لەو بوختانە نەبوو هەستم پێ نەدەکرد تا کـەمێ چـاك بوومـەوە، دەرچـووم لەگـەڵ ئـوم میسطەح بۆ (مناصع) جێی دەست بەئاو گەیاندنمان، کە تەنها بەشـەو بـۆی دەچووین، ئەمەش پێش ئەوەی لە ماڵەکانماندا ئاودەست دروست بکـەین، هەروەك عەرەبی پێشوو وابووین و لەوە بێزار بووین کـە لـەلای ماڵەکانمانـدا ئاودەست دروست بکەین.

من و ئوم میسطەح روومان لەماڵەوە ناو ئوم میسطەح پێـی لەبەرگەکـەی هەڵنەگووت کە لەبەریا بوو وتی: دەك ملی میسطەح بشکێ، منیش پـێم وت: شتێکی خراپت وت، ئایا جنێو بەپیاوێکی دەدەی کە ئامادەی بەدر بـوویێ؟ وتی ئەی فلانە! بۆ نەت بیستووە ئەو چیی وتووە؟ ئەوەبوو دەنگ و باسـی ئەهلی ئیفکی بۆ گێڕامەوە و ئەوەندەی تر نەخۆشیەکەم زیادی کرد.

کە گەڕامەوە ماڵەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەشریفی هاتەلام و سـەلامی کرد و پاشان فەرمووی: نەخۆشەکەتان چۆنە؟ منیش وتم ئیزنم ئەدەی سـەر لـە دایك و بـاوکم بـدەم؟ دەڵێـت ئەوکاتـە دەمویـست لای ئـەوان تـەحقیقی هەواڵەکە بکەم، ئەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئیزنـی دام و هاتمـە لایـان و بەدایکم وت: دایە گیان خەڵکی باسـی چـی دەکـەن؟ وتـی کـچی خـۆم! دان بەخۆتدا بگرە، دە بەخوا کەم وابووە ژنێکی جوان لای پیاوێك بێـت خۆشـی بوێ و هەوێی هەبن، قسەی زۆری لەبارەوە نەکەن.

وتم: سبحان الله! ئایا خەڵکی باس لە شتی وادەکەن؟ دەفـەرمووێت: ئـەو شەوە هەتا بەیانی هەر گریام بێ ئەوەی فرمێسکی چاوم وشك ببنـەوەو بـێ ئەوەش خەو بچێتە چاوم، هەتا رۆژم لێ بووەوە.

ئەوەبوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێك کە وەحی وەستا بوو بانگی کردە عەلی کوڕی ئەبو طالیب و ئوسامەی کوڕی زەید (خوایان لێ ڕازی بێت) تا لەبارەی جیابوونەوە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا ڕاوێژیان پێ بکات، جا ئوسامە چی لەبارەی پاکیی هاوسەریەوە دەیزانی و چی ڕێز و خۆشەویستی لەدڵیان بەرامبەری هەیبوو بۆ پێغەمبەری (ﷺ) ڕوون کردەوە و وتی: جگە لە چاکە هیچ پێ نازانین، بەڵام عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! خوا ژنی لێ قات نەکردووی، غەیری ئەو ژن زۆرن و گەر لە جاریەکەشی پرسیار بکەیت ڕاستیت پێ دەڵێ.

پێغەمبەری خواش (ﷺ) بەریرەی بانگ کرد و فەرمووی: ئەی بەریرە! ئایا تۆ هیچت بە عائیشەوە دیوە کە بکەویتە گومانەوە لێی؟ بەریرە وتی: بەو خوایەی کەتۆی بەحەق ناردووە، جگە لەوەی کە کچێکی منداڵەو خەوی لێ ئەکەوێ و بزنی ناو ماڵیش دێن هەویرەکەی دەخۆن، هیچ شتێکم نەدیوە کە بە عەیب لێی بگرم، ئیتر پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەستاو سەرکەوتە سەر مینبەر و داوای ئیزنی لە خەڵکەکە کرد بۆ سزادانی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول.

فەرمووی: موسڵمانان! دەرحەق بە پیاوێ کە ئەزیەت و ئازاری بەرامبەر بە ئەهلی بەیتم پێ گەییوەتەوە کێ عوزرم بۆ دێنێتەوە؟ دە بەخوا چاکە نەبێ هیچم بە هاوسەرمەوە نەدیوە و پیاوێکیشیان ناو بردوە چاکە نەبێ هیچم بەویشەوە نەدیوە، لەگەڵ خۆیشمدا نەبێ نەهاتۆتە ماڵمەوە.

سەعدی کوڕی موعاذی ئەنصاری هەستاو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من لەسەری عوزرت بۆ دێنمەوە، جا ئەگەر لە ئەوس بوو ئەوا لەملی دەدەم و گەر لەبرایانی خەزرەجیشمان بوو ئەوا فەرمانمان پێ دەکەت و فەرمانەکەت

جێ بەجێ دەکەین، خێرا سەعدی کوڕی عوبادە، کە سەرداری خەزرەج بوو، پێش ئەوە پیاوێکی صالح بوو، بەڵام لەو کاتەدا دەمارگیری رووی تێکرد و هەستاو بەسەعدی وت: سوێند بەخوا درۆت کرد، نایکوژیت و ناشتوانی بیکوژی.

ئەوەبوو ئوسەیدی کوڕی حوضەیر، کە ئامۆزای سەعدی کوڕی موعاذ بوو هەستاو بەسەعدی کوڕی عوبادەی وت: سوێند بەخوا درۆت کرد، تۆ مونافیقی و بەرگری لە مونافیقانیش دەکەی، ئەوس و خەزرەج هەردووکیان پەلاماری یەکتریان داو هەتا نیازی ئەوەشیان کرد کوشتاری یەکتر بکەن و پێغەمبەری خواش (ﷺ) لەسەر مینبەر وەستابوو هەر خەریکی هێمن کردنەوەیان بوو، هەتا بێ دەنگ بوون، ئەویش بێ دەنگ بوو.

ئەو رۆژە هەروا مامەوە، نە فرمێسکم وشك دەبونەوە، نە خەویش دەچووە چاوم، دایك و باوکیشم لەلام بوون، دوو شەو و رۆژێك هەر گریام بێ ئەوەی خەو بچێتە چاوم و فرمێسکم وشك ببنەوە، هەتا پێم وابوو گریان جەرگم لەت دەکات، جا لەکاتێکدا کە لەلام دانیشتبوون و منیش دەگریام، ئافرەتێکی ئەنصاری ئیزنی وەرگرت بێتە ژوورەوە لام، منیش ئیزنم دا، دانیشت و لەگەڵما دەستی بەگریان کرد.

جا ئێمە لەم حاڵەتەدا بووین پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەشریفی هاتە ژوورەوە لامان و سەلامی کرد و پاشان دانیشت و لەو کاتەوەکە ئەو قسە هەڵبەستراوە لەبارەی منەوە وترابوو لەلام دانەنیشتبوو، ئەوەبوو مانگێکی بەسەرداچوو لەبارەی منەوە وەحی بۆ نەدەهات.

کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دانیشت شایەتمانی هێنا و پاشان فەرمووی:

(عائیشه ئەوە و ئەوەم لەبارەی تۆوە پێگەیشتووە، جا ئەگەر تۆ پاك و بەریی بیت ئەوا خوا بەپاکت دەردەکات، خۆ ئەگەر گوناهێکیشت لەدەست دەرچووە، ئەوا داوای لێخۆشبوون لەخوا بکە و تەوبە بکە، چونکە ئەگەر بەندە دانی بەتاوانی خۆیدا ناو پاشان تەوبەی کرد، ئەوا خوا تەوبەی لێ وەردەگرێت).

که پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمایشتەکەی تەواو کرد فرمێسکم نیشتەوە، بە رادەیەك هەستم بە دڵۆپێکیش نەدەکرد، جا بە باوکمم وت: لەبارەی ئەوەوە کە فەرمووی لەجیاتی من وەڵامی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بدەرەوە، وتی: دە بەخوا نازانم چی بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بڵێم، ئینجا بە دایکمم وت: وەڵامی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بدەرەوە، وتی: نازانم چی بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بڵێم، منیش ئەوکاتە کچێکی منداڵ بووم و قورئانی زۆرم لەبەر نەبوو، وتی: بەخوا من زانیومە کە ئەو باسەتان بیستووە و چۆتە ناو دڵتانەوە و باوەڕتان پێ کردووە ئەگەر پێتان بڵێك کە من بێتاوانم (کە خوا چاك ئەزانێ بێتاوانم) ئەوا بەوە بڕوام پێ ناکەن، بەڵام گەر دان بە کارێکدا بنێم (کە خوا چاك دەزانێ من لێی بەریم) ئەوا بڕوام پێ ئەکەن.

دە بەخوا بۆ ئەمە هیچتان بۆ شك نابەم جگە لە فەرمایشتەکەی باوکی یوسف کە فەرمووی:﴿ فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَاللَّهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴾ یوسف/ ١٨.

پاشان پشتم تێ کردن و لەسەر نوێنەکەم راکشام، ئومێدیشم هەبوو بەخوای گەورە کە پاکێتی و بەرائەتم دەربخات، بەڵام سوێند بەخوا پێم وانەبوو وەحیی لەبارەی منەوە دابەزێت و خۆم لەوە بەکەمتر دەزانی قورئان

بخوێنرێت باس و خواسی منی تیا بێت بەڵام من بەتەمای ئەوە بووم پێغەمبەری خوا (ﷺ) خەونێك ببینێ و بەوە خوای گەورە من تەبریە بكات سوێند بەخوا هێشتا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو شوێنەی بەجێ نەهێشتبوو یەك كەسیش لەئەهلی ماڵەكە نەچووبوونە دەرەوە، وەحیی دابەزییە سەری و ئەو توندییەی تووش هات كە لەكاتی وەحیدا تووشی دەهات، كە لەرۆژی زستاندا بەوێنەی دوڕ عەرەقی لێ دەچۆڕێ، جا كە ئەو حاڵەتەی لەسەر لاچوو پێكەنیی، یەكەم وشەیەكیش كە فەرمووی ئەمەبوو (ئەی عائیشە سوپاسی خوابكە، چونكە خوا تەبریەی كردیت).

دایكم وتی (هەستە بچۆرە خزمەتی) وتم: (بەخوا ناچمە خزمەتی) و جگە لەخوا سوپاسی كەسی تر ناكەم، ئەوەبوو خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلۡإِفۡكِ عُصۡبَةٞ مِّنكُمۡ﴾ تا ئایەتی ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ﴾ (سوورەتی النور :٢٠).

كاتێكیش خوای گەورە ئەمەی بۆ بێ تاوانی من ناردە خوارەوە، ئەبوو بەكری صدیق، كە پێشتر پارەی دەبەخشی بە میسطەح كوڕی ئەثاثە بەبۆنەی خزمایەتی و هەژارییەوە، وتی: دەبەخوا ئیتر هەرگیز هیچ نابەخشم بە میسطەح دوای ئەوقسەیەی بەعائیشەی وتووە.

ئەوەبوو خوای گەورەش ئایەتی (٢٢)ی سوڕەتی (النور)ی ناردە خوارەوە ﴿وَلَا يَأۡتَلِ أُوْلُواْ ٱلۡفَضۡلِ مِنكُمۡ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤۡتُوٓاْ أُوْلِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينَ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ وَلۡيَعۡفُواْ وَلۡيَصۡفَحُوٓاْۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٌ﴾. خێرا ئەبوبەكریش وەڵامی پرسیارەكەی قورئانی دایەوە و

فەرمووی (بەڵێ بەخوا پێم خۆشە خوای گەورە لێم خۆش بێت) ئیتر وەك جاران پارەی بۆ میسطەح خەرج دەكردو و فەرمووی بەخوا هەرگیز لێی ناگرمەوە.

حەزرەتی عائیشە دەفەرمووێت:

ئەوەبوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەبارەی منەوە پرسیاری لە زەینەبی كچی جەحش كردبوو، فەرمووی چی دەزانیت، یان چیت دیوە؟ زەینەبیش فەرمووبووی: ئەی پێغەمبەری خوا! چاوو گوێی خۆم دەپارێزم، جگە لە چاكە هیچ نازانم، عائیشە دەفەرموێت: لەناو هاوسەرانی پێغەمبەری خودادا (ﷺ) تەنها ئەو لەبەر جوانیی و رێزی بەرامبەر كێی لەگەڵ دەكردم، ئەوەبوو بەبۆنەی وەرع و تەقوایەوە خوای گەورە پاراستی.

## باب محاجة موسى لآدم عليهما السلام

﴿فَلَا يُخۡرِجَنَّكُمَا مِنَ ٱلۡجَنَّةِ﴾

٥٢٢.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ حَاجَّ مُوسَى آدَمَ فَقَالَ لَهُ أَنْتَ الَّذِي أَخْرَجْتَ النَّاسَ مِنْ الْجَنَّةِ بِذَنْبِكَ وَأَشْقَيْتَهُمْ قَالَ آدَمُ يَا مُوسَى أَنْتَ الَّذِي اصْطَفَاكَ اللَّهُ بِرِسَالَتِهِ وَبِكَلَامِهِ أَتَلُومُنِي عَلَى أَمْرٍ كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَيَّ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَنِي أَوْ قَدَّرَهُ عَلَيَّ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَنِي قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى.

## (بەشی/ گفتوگۆی ئادەم و موسا پێغەمبەر علیهما السلام و ئایەتی ﴿فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ ٱلْجَنَّةِ﴾).

ئـەبو هـورەیرە (رضـي الله عنــه) لەپێغەمبــەر (ﷺ) دەگێڕێتــەوە و دەفەرمووێ: (موسا پێغەمبەر (علیه السلام) گفتوگۆی لەگەڵ ئادەم کردو پێی وت: تۆ ئەوکەسەی کە خەڵکت لەبەهەشت وەدەرنا بەهۆی ئەو تاوانەی کە کردوت بووی بەهۆی ماندووبوونی خەڵکی لەدونیا وە ئادەمیش (علیه السلام) فەرمووی: ئەی موسا تۆ ئەوکەسەی کە خوای گەورە هەڵی بژاردووی بەپێغەمبەرایەتی و وتەی خۆی لەگەڵ کردووی بۆ لۆمەو سەرزەنشتی من دەکەی کەشتێك کەخوای گەورە لەسەری داناوم پێش درووست کردنم، یان تەقدیری کردووە بۆم لەپێش درووست کردنم، ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی لەم گفتوگۆیە ئادەم بەسەر موسادا زاڵ بوو.

## باب

## ﴿وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَـٰرَىٰ﴾

٥٢٣.عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ قَالَ رَسُولَ الله (ﷺ) (يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَا آدَمُ فَيَقُولُ لَبَّيْكَ رَبَّنَا وَسَعْدَيْكَ فَيُنَادَى بِصَوْتٍ إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكَ أَنْ تُخْرِجَ مِنْ ذُرِّيَّتِكَ بَعْثًا إِلَى النَّارِ؟، قَالَ يَا رَبِّ وَمَا بَعْثُ النَّارِ؟ قَالَ مِنْ كُلِّ أَلْفٍ أُرَاهُ قَالَ تِسْعَمِائَةٍ وَتِسْعَةً وَتِسْعِينَ، فَحِينَئِذٍ تَضَعُ الْحَامِلُ حَمْلَهَا وَيَشِيبُ الْوَلِيدُ ﴿وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَـٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَـٰرَىٰ وَلَـٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٌ﴾ فَشَقَّ ذَلِكَ عَلَى النَّاسِ حَتَّى تَغَيَّرَتْ وُجُوهُهُمْ فَقَالَ النَّبِيُّ

(ﷺ) مِنْ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ تِسْعَمِائَةٍ وَتِسْعَةً وَتِسْعِينَ وَمِنْكُمْ وَاحِدٌ ثُمَّ أَنْتُمْ فِي النَّاسِ كَالشَّعْرَةِ السَّوْدَاءِ فِي جَنْبِ الثَّوْرِ الْأَبْيَضِ أَوْ كَالشَّعْرَةِ الْبَيْضَاءِ فِي جَنْبِ الثَّوْرِ الْأَسْوَدِ وَإِنِّي لَأَرْجُو أَنْ تَكُونُوا رُبُعَ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَكَبَّرْنَا ثُمَّ قَالَ ثُلُثَ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَكَبَّرْنَا ثُمَّ قَالَ شَطْرَ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَكَبَّرْنَا.

## (بەشی/ ئایەتی)

﴿وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَـٰرَىٰ ﴾).

ئەبی سەعیدی خودری (رضي الله عنه) فەرمووی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: خوای گەورەی لەرۆژی قیامەتدا بەباوکە ئادەم دەفەرمووێ ئەی ئادەم ئادەمیش دەفەرمووێ بفەرموو ئەی پەروەردگارم لەخزمەتت وەستاوم بانگەوازی بەدەنگی بەرز بانگی دەکات که خوای گەورەو فەرمانت پێدەکات بەشی دۆزەخ لەنەوەی خۆت جیابکەرەوە، بابڕۆن بۆناوی، ئادەمیش عەرزی دەکات و وە دەڵێت ئەی خوایە بەشی دۆزەخ لەنەوەی من چەند لەچەندە؟ دەفەرمووێ لەهەموو هەزار کەسێ نۆسەدو نەوەدو نۆی بەشی ئاگری دۆزەخە وە تاقە کەسێکی بەشی بەهەشتە، فەرمووی لەم کاتەیە کە هەموو ئاوس و دووگیانێك سکەکەی دادەنێ و منالیش پیردەبێ، وە خەڵکی دەبینی مەدهۆش و مەستن و مەدهۆش سەرخۆشی ئارەق نین بەڵکو شلەژاو و حەپەساوی سەختی ئەو رۆژەن بەڵکو سزای خوا بەقوەتە، جا موسڵمانەکان دەستیان کرد بەگریان دەمو چاویان تێك چوو ئەوجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی لە یەئجوج و مەئجوج نۆسەدو نەوەدو نۆ کەسیان بۆ دۆزەخ دەچن و لەئێوەش یەك کەس.

ئینجا فەرمووی ڕێژەی ئێوە لەچاو ئەو خەڵکەی تر وەك تاقە موویەکی ڕەش وایە لەپێستی گایەکی سپیدا یان تاڵە موویەکی سپی وایە لەپێستی گایەکی ڕەشدا ماوە من داواکارم ئێوە چارەیەکی خەڵکی بەهەشت بن وە هاوەڵان وتیان ئێمەش (الله اکبر)مان کرد لەپاشان فەرمووی: ببن بە سێیەکی خەڵکی بەهەشت دیسان (الله اکبر)مان کرد لە پاشان فەرمووی ببن بەنیوەی بەهەشت دیسان (الله اکبر)مان لێ کرد لەکەیف خۆشیاندا.

## بـــاب

## ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ ﴾

٥٢٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) كان يوماً بارز لِلنَّاسِ إذا آتاه رجلٌ يمشي فَقَالَ يا رسول الله مَا الْإِيمَانُ قَالَ الْإِيمَانُ أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِه وَرسله ولقاءئه وَتُؤْمِنَ بِالْبَعْثِ قَالَ يارسول الله مَا الْإِسْلَامُ؟ قَالَ الْإِسْلَامُ أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ وَلَا تُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَتُقِيمَ الصَّلَاةَ وَتُؤتى الزَّكَاةَ الْمَفْرُوضَةَ وَتَصُومَ رَمَضَانَ قَالَ يا رسول مَا الْإِحْسَانُ قَالَ الإحسان أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ قَالَ يا رسول الله مَتَى السَّاعَةُ؟ قَالَ مَا الْمَسْئُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ مِنْ السَّائِلِ ولكن ساحدثكَ عَنْ أَشْرَاطِهَا إِذَا وَلَدَتْ الْأَمَةُ رَبَتها فذلكَ من أشراطها، وإذا كانَ الْحُفاةُ العُرَاةُ رُؤُوس النّاس فَذلكَ من أشراطها، في خَمسٍ لاَ يَعْلَمُهُنَ إلاّ الله ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِ ﴾.

ثمَ انصرف الرجل فقال: (رُدّوهُ عليّ)، فأخذوا لِيَرُدُّهُ فلم يَروا شيئاً فقال عليه الصلاة والسلام لأصحابهِ: (هذا جبريل جاءَ لِيُعْلِمَ النّاس دينَهُم) .

## (بەشی/ ئایەتی

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ ﴾

ئـەبو هـورەیرە (رضـي الله عنـە) دەگێڕێتـەوە کـە پێغەمبـەر (ﷺ) ڕۆژێ لەناوماندا لەشوێنێکی بەرچاو دانیشت لەوکاتەدا پیاوێ هـات بـۆ خزمـەتی و گووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئیمان و باوەڕی چییە؟ ئەویش فەرمووی: ئیمان و بـاوەڕی بریتییـە لـە بڕوابـوون بـەخوا و فریـشتەکانی و پێغەمبـەرەکانی شادبوون بەدیداری خواو بڕوابوون بەڕۆژی دوایی، پیاوەکە وتی ئەی ئیسلام چییە؟ ئەویش فەرمووی: ئیسلامەتی ئەوەیە کە خوا بپەرستی وە هاوبەشـی بۆ بڕیار نەدەی و نوێژ بکـەیت و زەکـات بدەیت و بـەڕۆژووبوونی ڕەمـەزان ئینجا پیاوەکە وتـی ئـەی پێغەمبـەری خـوا چاکە چییە؟ فـەرمووی: چـاکە ئەوەیە کە خوا بپەرستی وەك ئەوە کە خوات دیبێ ئەگەر تۆش ئـەو نـەبینی ئەو تۆ دەبینێ، ئینجا وتی قیامەت کەی دێـت؟ فـەرمووی: مـن لـەتۆ باشـتر نازانم بەڵام نیشانەکانیت بۆ باس دەکەم، ئەوەتە منـاڵ بەچـاوی کارەکـەر و نۆکەر تەماشای دایك و باوکی دەکات، وە ئەگەر شوانی مـەڕو ڕەش و ڕووت بوون بەسەرداری خەڵکان و خاوەن موڵك و سامان ئەوانە نیـشانەکانی ڕۆژی دوایین و پێنج شت هەن کـە بـەس خـوا دەیزانـێ کـەس نـایزانی و شـاراوەن کـەخوا دەفـەرمووێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِ ﴾.

واتە: بەس خوا زانیاری هاتنی قیامەت لەلای ئەوەو زانینی باران و ئەوەی لەناو سکی وە چ لەناو ڕەحمی مێینە دایە خۆی دەزانێ و بەس وە لەپاشان پیاوەکـە هاتـە دەرەوەو ون بـوو پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: بـۆم بـانگ

بکەنەوە ئەوپیاوە کە هاوەڵان هاتنە دەرەوە نەیان دیت و ون بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی بەهاوەڵان ئەوە جوبریل بوو بۆیە هاتبو کە دینەکەی فێری خەڵکی بکات.

## باب

## ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم ﴾

٥٢٥.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ان رسول الله (ﷺ) قال اللَّهُ تَعَالَى أَعْدَدْتُ لِعِبَادِي الصَّالِحِينَ مَا لَا عَيْنٌ رَأَتْ وَلَا أُذُنٌ سَمِعَتْ وَلَا خَطَرَ عَلَى قَلْبِ بَشَرٍ ذُخْرًا بَلْهَ مَا أُطْلِعْتُمْ عَلَيْهِ ثُمَّ قَرَأَ ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾.

## (بەشی/ ئایەتی

## ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم ﴾)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنـه) دەگێڕێتـەوە کـە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویەتی: خوای گەورە دەفەرمووێ (بۆ بەندە چاکەکانم ئامادەم کـردوە شتێ کە نەچاو شتی وای بینیـوە وە نـەگوێ بیـستویەتی وەنـە بەخـەیاڵیش بەسەر دڵی کەس دانەهاتووە (کە بەهەشتە).

لەپاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾ واتە: نەفس نازانێ خوای گەورە چی بۆ شاردۆتەوە کـە چـاوەکانی پـێ روون دەبێتـەوە وە لەبەهەشـتدا وە پاداشـتێکە بـەهۆی کردەوە چاکەدا پێیان دەدرێت.

## باب

﴿ ٱلنَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ﴾

٥٢٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قال: قال رسول (ﷺ) مَا مِنْ مُؤْمِنٍ إِلَّا وَأَنَا أَوْلَى النَّاسِ بِهِ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ اقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ ﴿ ٱلنَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ﴾فَأَيُّمَا مُؤْمِنٍ تَرَكَ مَالًا فَلْيَرِثْهُ عَصَبَتُهُ مَنْ كَانُوا فَإِنْ تَرَكَ دَيْنًا أَوْ ضَيَاعًا فَلْيَأْتِنِي فَأَنَا مَوْلَاهُ.

## (بەشی/ ئایەتی

﴿ ٱلنَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ﴾)

**ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: من بۆ ئیمانداران لەهەمووکەس لەپێش ترم لەدونیاو دوارۆژدا ئەگەر حەزدەکەن ئەم ئایەتە بخوێننەوە ﴿ ٱلنَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ﴾واتە: پێغەمبەر بۆ ئیمانداران لەنەفسی خۆیان لەپێشترە وە هەر ئیمان داری مردو ماڵ و سامانی لەپاش بەجێ ما با خزم و کەسی میراتەکەی ببەن وەئەگەر قەرزی لەسەر بوو یان منالی وردی لەپاش بەجێ ماو سەرپەرشتیاری نەبوو بابێن بۆلام و بەخێوکەریان دەبم و قەرزیان بۆ دەدەمەوە.**

## باب

﴿ وَٱلشَّمۡسُ تَجۡرِي لِمُسۡتَقَرّٖ لَّهَاۚ ﴾

٥٢٧. عَنْ أَبِي ذَرّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ عليه الصلاة والسلام فِي الْمَسْجِدِ عِنْدَ غُرُوبِ الشَّمْسِ فَقَالَ يَا أَبَا ذَرّ أَتَدْرِي أَيْنَ تَغْرُبُ الشَّمْسُ؟ قُلْتُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: فَإِنَّهَا تَذْهَبُ حَتَّى تَسْجُدَ تَحْتَ الْعَرْشِ فَذَلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى﴿ وَٱلشَّمۡسُ تَجۡرِي لِمُسۡتَقَرّٖ لَّهَاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ﴾ وَقَدْ سَأَل أَبُو ذَر رَضي اللهُ عَنْهُ عَن الآية فَقَالَ عَلَيه الصَّلاةُ وَالسَّلام: ((وَمُسْتَقَرُّهَا تَحْتَ العَرشِ)).

## (بەشی/ ئایەتی

﴿ وَٱلشَّمۡسُ تَجۡرِي لِمُسۡتَقَرّٖ لَّهَاۚ ﴾)

**ئـەبی ذەر (رضـي الله عنـە) دەفـەرمووێ لـەکاتی رۆژئـاوابوون لەگـەڵ پێغەمبەری خوا لەمزگەوت بووین فەرمووی: ئەی ئەبو ذەر ئایا دەزانی ئـەم خۆرە لەکوێ ئاوا دەبێ؟ وتم خوا و پێغەمبەرەکەی دەزانن، فەرمووی: خـۆر دەڕوات تا بن عەرشی خواو لەوێ کڕنوش بۆ خوا دەبـات، لەبەرئەوەیـە خـوا دەفـەرمووێ ﴿ وَٱلشَّمۡسُ تَجۡرِي لِمُسۡتَقَرّٖ لَّهَاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ﴾ واتە: خۆر لەسەر ئەو یاسایەی خوا بۆی داناوە هاتوچۆ دەکات بـە ڕێـك و پێکی ئەوەش کاری خوای بالادەست و زانایە.**

**وە ئـەبو ذەر پرسـیاری ئـەو ئایەتـەی لەپێغەمبـەر (ﷺ) کـرد ئـەویش فەرمووی (شوێن و جێگای لەژێر عەرشی خوای میهرەبان دایە).**

## باب

﴿رَبِّ ٱغۡفِرۡ لِي وَهَبۡ لِي مُلۡكٗا ﴾

٥٢٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللهُ عَنْهُ قال: قالَ رَسُول الله (ﷺ) ((إِنَّ عِفْرِيتًا مِنْ الْجِنِّ تَفَلَّتَ عَلَيَّ الْبَارِحَةَ لِيَقْطَعَ عَلَيَّ الصَّلَاةَ فَأَمْكَنَنِي اللَّهُ مِنْهُ، وَأَرَدْتُ أَنْ أَرْبِطَهُ إِلَى سَارِيَةٍ مِنْ سَوَارِي الْمَسْجِدِ حَتَّى تُصْبِحُوا وَتَنْظُرُوا إِلَيْهِ كُلُّكُمْ، فَذَكَرْتُ قَوْلَ أَخِي سُلَيْمَانَ﴿رَبِّ ٱغۡفِرۡ لِي وَهَبۡ لِي مُلۡكٗا لَّا يَنۢبَغِي لِأَحَدٖ مِّنۢ بَعۡدِيٓ ﴾فَرَدَّهُ (ﷺ) خَاسِئًا.

## بەشی/ ئایەتی

﴿رَبِّ ٱغۡفِرۡ لِي وَهَبۡ لِي مُلۡكٗا ﴾

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) فەرمووی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: دوێنی شەو عیفریتەکی جنۆکە هاتەلام و ویستی نوێژم لێ تێك بدات خوای گەورەش زاڵی کردم بەسەریداو گرتم و ویستم بەکۆڵەکەی مزگەوت بیبەستمەوە هەتاکو بەیانی ئێوە هەمووتان تەماشای بکەن وە لەوکاتەدا وتەی برام حەزرەتی سولەیمانم هاتەوە یاد کە دەفەرمووێ ﴿رَبِّ ٱغۡفِرۡ لِي وَهَبۡ لِي مُلۡكٗا لَّا يَنۢبَغِي لِأَحَدٖ مِّنۢ بَعۡدِيٓ ﴾ کە خوا دەفەرمووێ سولەیمان فەرمووی خوایە موڵك و سامانێکم پێ ببەخشی کە لەپاش خۆم بەهیچ کەسێ نەدرێ.

پێغەمبەر فەرمووی لەبەر ئەم وتەیدا بەرەڵام کردو بەبێ نرخی رای کرد.

## باب

﴿ مَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ ﴾

٥٢٩.عَنْ أبي هُرَيْرَة رَضي اللهُ عَنْهُ قَال: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّه (ﷺ) يَقُولُ يَقْبِضُ اللّهُ الْأَرْضَ وَيَطْوِي السَّمَوَات بِيَمِينِه ثُمَّ يَقُولُ أنَا الْمَلِكُ أيْنَ مُلُوكُ الْأَرْضِ.

### (بەشی/ ئایەتی

﴿ مَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ ﴾

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) فەرمووی: خوای گەورە زەوی کۆ دەکاتەوەو ئاسمانەکان لول پێچ دەکات و بەلای راستی خۆیدا و لەپاشان دەفەرمووێ من پادشاو مەلیکم کوانی پاشاکانی زەوی؟

## باب

﴿ وَمَا يُهْلِكُنَا إِلَّا الدَّهْرُ ﴾

٥٣٠.وَعَنْهُ أيضاً أنَّ رَسُول اللّه (ﷺ) قَالَ: قال (اللّهُ عَزَّ وَجَلَّ يُؤْذِينِي ابْنُ آدَمَ يَسُبُّ الدَّهْرَ وَأنَا الدَّهْرُ بِيَدِي الْأمْرُ أُقَلِّبُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ).

### (بەشی/ ئایەتی

﴿ وَمَا يُهْلِكُنَا إِلَّا الدَّهْرُ ﴾

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: خوای گەورە دەفەرمووێ نەوەی ئادەم ئازارم دەدەن و جوێن بە سات و زەمانە دەدەن وە هەڵسوڕێنی شەو و رۆژ هەر منم و وە هەموکارەکانی من بەڕێوەی دەبەم.

## باب

﴿ وَتُقَطِّعُوٓاْ أَرۡحَامَكُمۡ ﴾

٥٣١.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَال: ((خَلَقَ اللَّهُ الْخَلْقَ فَلَمَّا فَرَغَ مِنْهُ قَامَتْ الرَّحِمُ فَأَخَذَتْ بِحَقْوِ الرَّحْمَنِ، فَقَالَ لَهَا مَهْ؟ قَالَتْ هَذَا مَقَامُ الْعَائِذِ بِكَ مِنْ الْقَطِيعَةِ قَالَ أَلَا تَرْضَيْنَ أَنْ أَصِلَ مَنْ وَصَلَكِ وَأَقْطَعَ مَنْ قَطَعَكِ، قَالَتْ بَلَى يَا رَبِّ. قَالَ: فَذَاكِ قَولِ أَبي هُرَيْرَة رَضي الله عَنْهُ اقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ ﴿ فَهَلۡ عَسَيۡتُمۡ إِن تَوَلَّيۡتُمۡ أَن تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَتُقَطِّعُوٓاْ أَرۡحَامَكُمۡ ﴾.

## (بەشی/ ئایەتی

﴿ وَتُقَطِّعُوٓاْ أَرۡحَامَكُمۡ ﴾

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرمووێ: خوای گەورە کە لەدروستکردنی دروستکراوانی خۆی بۆوە رەحم و خزمایەتی هەڵساو کەمەرەی خودای میهرەبانی گرت و گووتی دەستم دامێنت، خودا پێی فەرموو بۆ وادەکەی و داوات چییە؟ وتی: ئا لەم شوێنەدا کەمەرت دەگرم و پەنام بۆ هێناویت و سکاڵا دەکەم لەدەستی ئەوکەسانەی کەمافی من بەجێ ناهێڵن رشتەی پەیوەندی خزمایەتی دەپچڕن، خوداش فەرمووی ئەی رەحم و خزمایەتی ئایا رازی دەبی بەوەی کە هەرکەسێ پێ لەتۆ نەبڕێ و پەیوەستی هەبێ لەگەڵتاو خزم دۆست بێ منیش پێی لێ نەبڕم پەیوەندیم هەبێ لەگەڵیا وە هەرکەسێ پەیوەندی لەتۆ ببڕێ و پەیوەندی نەبێ منیش

پەیوەنــدی لــەو بــبڕم‌و ڕەحــم و بــەزەیی، وتــی بــەڵێ ڕازی دەبم ئــەی پەروەردگارم.

ئەبو هوڕەیرە (رضي الله عنه) فـەرمووی ئەگـەر حەزدەکـەن ئـەم ئایەتـە بخوێننەوە ﴿ فَهَلۡ عَسَيۡتُمۡ إِن تَوَلَّيۡتُمۡ أَن تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَتُقَطِّعُوٓاْ أَرۡحَامَكُمۡ ﴾ واتە: ئایا ئێوە بەتەمان ئەگەر لەغەزا پشت هەڵکەن و یاخود دەستەڵاتتان کەوتــە دەســت تــۆوی ئــاژاوەو فەســادو تــاوان لــەزەوی دابــچێنن و هەرچــی پەیوەندی خزمایەتیش هەیە بیپچڕێنن و لەناوی ببەن!

## باب

## ﴿إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا ﴾

٥٣٢.عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عن الآ ية التي فِي الْقُرْآنِ ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ﴾ قالَ فِي التوراة: يا أَيّها النبي إنا أرسلناك شاهداً ومبَشراً ونَذيراً وَحِرْزًا لِلْأُمِّيِّينَ أَنْتَ عَبْدِي وَرَسُولِي سَمَّيْتُكَ المتَوَكّلَ لَيْسَ بِفَظٍّ وَلَا غَلِيظٍ وَلَا صخَّابٍ فِي بالاسواق وَلَا يَدْفَعُ السيئة بالسيئةَ وَلَكِنْ يَعْفُو وَيَصفح وَلَنْ يَقْبِضَهُ اللَّهُ حَتَّى يُقِيمَ بِه الْمِلَّةَ الْعَوْجَاءَ بِأَنْ يَقُولُوا لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَيَفْتَحُ بِهِ أَعْيُنًا عُمْيًا وَآذَانًا صُمًّا وَقُلُوبًا غُلْفًا.

## (بەشی)

﴿إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا﴾

عەطای کوڕی یەسار لە عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاصی (رضـي الله عنه) دەگێڕێتەوە دەربارەی ئەو ئایەتەی لە قورئاندا هـاتووە ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا﴾ واتە: (ئێمە بەڕاستی تۆمـان ناردووە بەشاهیدو مزگێنیدەر و ترسێنەر بۆتان، دەفەرمووێ لە تەوراتیش وانووسراوە کە ترسێنەرە و تۆمان کردووە بە قەڵاو سەنگەر بۆ نەتەوەیەکی نەخوێندەوار کە گـەلی عـەرەبن وەتـۆ بەنـدەو پێغەمبـەرو نێـراوی مـنی خـۆم نـاوم نـاوی (المتوکل) پشت بەستوو، ئەو پێغەمبەرە دڵ رەق و بە دەعیەو فیز نییـە وە لەناو بازاڕ دەنگی بـەرز ناکاتـەوە بەسـەر خەڵکیـدا ناقیـژێنی وە بەرپـەرچـی خراپە بەخراپە ناداتەوە بەڵکو چاوپۆشی و عـەفوکارە، وە خـودا نایباتـەوە بۆلای خۆی هەتا ئەو میللەتـە لارو خـوارەی پـێ ڕاسـت نەکاتـەوە کـە وتـنی وشەی پیرۆزی شەهادەیە (لا اله الا الله)یە وە چاوی کە لەئاستی حەق کوێر بووە روون دەبێتەوە و گوێیان لە ئاستی حەق کەڕ بووە دەکرێنەوە وە دڵیان کە مۆری رەشی بەسەر داهاتووە بەکلیلی (لا اله الا الله) دەکرێتەوە.

## باب قول النار

﴿هَلۡ مِن مَّزِيدٖ﴾

٥٣٣.عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قال قال النَّبِيُّ (ﷺ) يُلْقَى فِي النَّارِ ﴿وَتَقُولُ هَلۡ مِن مَّزِيدٖ﴾ حَتَّى يَضَعَ قَدَمَهُ فَتَقُولُ قَطْ قَطْ.

## (بەشی/ وتنی ئاگری دۆزەخ (وشەی ئاگر)

﴿هَلۡ مِن مَّزِيدٖ﴾

ئەنەس (رضي الله عنه) لەپێغەمبەرەوە کە دەفەرمووێ (ﷺ) دۆزەخ هەر خەڵکی لێ دەهاون و پڕنابێ وە دەڵێ ئەگەر ماوە بابێ هەتا خوای گەورە پێی عیزەتی خۆی لەسەری دادەنێ ئەوکاتە دەڵێ ئیتر بەسە پڕبووم.

## باب محاجة الجنّة والنّار

٥٣٤.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ(ﷺ) تَحَاجَّتْ الْجَنَّةُ وَالنَّارُ فَقَالَتْ النَّارُ أُوثِرْتُ بِالْمُتَكَبِّرِينَ وَالْمُتَجَبِّرِينَ وَقَالَتْ الْجَنَّةُ مَا لِي لَا يَدْخُلُنِي إِلَّا ضُعَفَاءُ النَّاسِ وَسَقَطُهُمْ قَالَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى لِلْجَنَّةِ أَنْتِ رَحْمَتِي أَرْحَمُ بِكِ مَنْ أَشَاءُ مِنْ عِبَادِي) وَقَالَ (لِلنَّارِ إِنَّمَا أَنْتِ عَذَابِي أُعَذِّبُ بِكِ مَنْ أَشَاءُ مِنْ عِبَادِي) وَلِكُلِّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا مِلْؤُهَا فَأَمَّا النَّارُ فَلَا تَمْتَلِئُ حَتَّى يَضَعَ رِجْلَهُ فَتَقُولُ قَطْ قَطْ فَهُنَالِكَ تَمْتَلِئُ وَيُزْوَى بَعْضُهَا إِلَى بَعْضٍ وَلَا يَظْلِمُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ مِنْ خَلْقِهِ أَحَدًا وَأَمَّا الْجَنَّةُ فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يُنْشِئُ لَهَا خَلْقًا.

## (بەشی/ گفت و گۆی نێوان بەهەشت و دۆزەخ)

ئەبو هورەیرە(رضي الله عنه) فەرمووی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فـەرمووی (بەهەشت و دۆزەخ دەبـێ بـە دەمەقاڵـەیان، دۆزەخ دەڵـێ پیـاوانی گـەورەو خۆبەزلزان و ستەمکاران بۆمن تەرخان کراون وە بەهەشتیش دەڵێ خەڵکی بێ هێزو بـێ نـەواو هـەژاران بـۆمن تـەرخان کـراون، خـوای گـەورەش فـەرمووی بەبەهەشت تۆ رەحمەتی منی هەرکەسێ بمەوێ لەبەندەکانی خۆم رەحمی پێ دەکەم تـۆ دەکـەم بەشـوێنی رەحمـەت بـۆی وە بەدۆزەخیـشی فـەرموو تـۆ جێگای سزای منی وە بەڵێن بێ هەردووکتان پڕدەکەم هەرکەسـەو لەخـەڵکی خۆی بەڵام دۆزەخ پڕنابێ هەر قیڕەی دێت دەڵێ ئەگەر ماوە بابێ تاکو خوای گەورە پێی قودرەتی خۆی لەسەر دادەنێ و ئیتر دەڵـێ بەسـە پڕبـووم ئـیتر پڕدەبێ وە لەناو خۆیدا پەنگ دەخواتەوە، دیارە خوای گەورە ستەم لەکەس دروست کراوانی ناکات وە بەهەشتیش خوای گەورە خەڵکی تری بۆ درووست دەکات بۆ پڕبوونی.

## باب من حلف باللات والعزى

٥٣٥.وَعَنْهُ أيضاً قَال: قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآله وَسَلَّمَ: ((مَنْ حَلَفَ فَقَالَ فِي حَلفِه وَاللَّاتِ وَالْعُزَّى فَلْيَقُلْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَمَنْ قَالَ لِصَاحِبِه تَعَالَ أُقَامِرْكَ فَلْيَتَصَدَّقْ)).

## (بەشی/ کەسێ سوێند بە لات و عوزا بخوات)

ئـەبو هـورەیرە (رضـي الله عنـه) دەفـەرمووێ پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرمووی: کەسێ سوێند بخوات بە لات و عوزا بابڵێ (لا اله الا الله) وە کەسێ بەهاوەڵەکەی بڵێ وەرە با قومار بکەین با بەگوێی نەکات و خێـرو صـەدەقە بکات.

## باب إنشقاق القمر

٥٣٦. عَنْ عَبد الله بْنِ مَسْعُودٍ رَضي اللهُ عَنْهُ قَال: انْشَقَّ الْقَمَرُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فِرْقَتَيْنِ فِرْقَةً فَوْقَ الْجَبَلِ وَفِرْقَةً دُونَهُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) اشْهَدُوا.

## بەشی لەت بوونی مانگ

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (رضي الله عنه) فەرمووی مانگ لەت بوو لەزەمانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو بە دوو لەتەوە لەتێکی کەوتە سەر کێوەکەو لەتێکی تری کەوتە پشت کێوەکە، وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی بەشاهێدبن ببینن.

## باب

﴿ حُورٌ مَّقْصُورَٰتٌ فِى ٱلْخِيَامِ ﴾

٥٣٧. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ قَيْسٍ رَضي اللهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ إِنَّ فِي الْجَنَّةِ خَيْمَةً مِنْ لُؤْلُؤَةٍ مُجَوَّفَةٍ عَرْضُهَا سِتُّونَ مِيلًا فِي كُلِّ زَاوِيَةٍ مِنْهَا أَهْلٌ مَا يَرَوْنَ الْآخَرِينَ يَطُوفُ عَلَيْهِمْ الْمُؤْمِنُونَ وَجَنَّتَانِ مِنْ فِضَّةٍ آنِيَتُهُمَا وَمَا فِيهِمَا وَجَنَّتَانِ مِنْ كَذَا آنِيَتُهُمَا وَمَا فِيهِمَا وَمَا بَيْنَ الْقَوْمِ وَبَيْنَ أَنْ يَنْظُرُوا إِلَى رَبِّهِمْ إِلَّا رِدَاءُ الْكِبْرِ عَلَى وَجْهِهِ فِي جَنَّةِ عَدْنٍ.

## (بەشی/ ئایەتی

﴿ حُورٌ مَّقْصُورَٰتٌ فِى ٱلْخِيَامِ ﴾

عەبدڵڵای کوڕی قەیس (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (لەبەهەشتا چادر و خێمەی وا هەیە لە لۆلۆو مرواری دروست کراوە

و پانتایەکەی شەست میلە، لەهەموو گۆشەیەك لە گۆشەکانیدا خێزانێکی وا تیادایە کە هەمیشە چاویان بڕیوەتە هاوسەرەکانی خۆیان ئیتر پیاوە موسڵمانەکان بەئارەزووی خۆیان دەسووڕێنەوە وە دوو بەهەشت لەزێوی هەیە و قاپ و قاچاغەکانی لەزیوی وا تیاداوە دوو بەهەشتی تریش بە قاپ و قاچاغی زێڕی ئامادەکراوە وە لەنێوان ئەوان و دیتنی خوای گەورە ئەوەندە ماوە کەلەبەر تاری مەزنی و پەردەی گەورەیی و شکۆمەندی نەبێ کە بەخۆی داداوە ئەوا ئاواتەکەشیان دەهاتنەدی و بەچاوی خۆیان تەماشای خوا دەکەن لەبەهەشتێ کە ناوی عەدەنە.

## باب لعن الواشمات والمتفلجات

٥٣٨. عَنْ عَبْد اللّه بن مَسعُود رَضي اللهُ عَنْهُ قال: لَعَنَ اللّهُ تَعالى الْوَاشِمَات وَالْمُسْتَوْشِمَاتِ وَالْمُتَنَمِّصَاتِ وَالْمُتَفَلِّجَاتِ لِلْحُسْنِ الْمُغَيِّرَاتِ خَلْقَ اللّهِ، ولَعَنَ النَّبِيّ صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وآلِهِ وَسَلَّمَ الوَاصِلة، قالَ اللهُ تعالى: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟﴾.

## (بەشی/ نەفرەت لەخاڵ کوتان و ددان شاش کردن)

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (رضي الله عنه) دەفەرمووێ نەفرەت و لەعنەتی خوا لەئەو کەسانەی خاڵ دەکوتن و ئەوەی بۆی دەکوتێ وە ئەو ئافرەتەی دەموچاوی خۆی هەڵدەگرێ، لەو ئافرەتەکەی کە بەبڕیەندو زێڕ ددانی خۆی باریك و شاش دەکات بۆ جوانی چونکە ئەوانە بەم دەستکارییە نەخش و نیگاری خوا دەگۆڕن وە پێغەمبەری خواش (ﷺ) لەعنەت و نەفرینی لەو ژنەی کە قژی دەستکرد دەلکێنێ بە قژی خۆی لەسەر خۆی.

وە خوای گەورە دەفـەرمووێ ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمۡ عَنۡهُ فَٱنتَهُواْ﴾ واتە: ئەوەی پێغەمبـەری خـوا بـۆی هێنـاون وەری گـرن و ئـەوەی قەدەغەی لێ کردوون وازی لێ بهێنن.

## باب/ عُتُلّ زنیم

٥٣٩.عَنْ مَعْبَدِ بْنِ خَالِدٍ قَالَ سَمِعْتُ حَارِثَةَ بْنَ وَهْبٍ الْخُزَاعِيَّ قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِأَهْلِ الْجَنَّةِ كُلُّ ضَعِيفٍ مُتَضَعِّفٍ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّهِ لَأَبَرَّهُ أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِأَهْلِ النَّارِ كُلُّ عُتُلٍّ جَوَّاظٍ مُسْتَكْبِرٍ.

## (بەشی/ دڵ رەق و دڵ پیس)

مەعبدی کوڕی خالید دەفەرمووێ گوێم لە حاریثی کوڕی وەهبی خـوزاعی بوو فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بوو دەیفەرموو: ئایا ئاگادارتان بکەم لەخەڵکی بەهەشت کەوا کەسانێکن کە لاوازو بێ نمودو بێ فیزن ئەگەر سوێند بخۆن لەسەر خوا لەسەر شتێ ئەوا خوا سوێندیان دەباتـە سـەرو شـتەکەیان بۆدەکات، وە ئاگادارتان دەکەم لەخەڵکی دۆزەخ، هەموو کەسێ چارە قوڕس و دەعیەو زۆر خۆرو دەم پیس.

## باب/ مثل قارئ القرآن

٥٤٠. عَنْ عَائِشَةَ رَضِي الله عَنْها عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَال: ((مَثَلُ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ وَهُوَ حَافِظٌ لَهُ مَعَ السَّفَرَةِ الْكِرَامِ وَمَثَلُ الَّذِي يَقْرَأُ وَهُوَ يَتَعَاهَدُهُ وَهُوَ عَلَيْهِ شَدِيدٌ فَلَهُ أَجْرَانِ)).

## (بەشی/ نمونەی ئەوەی قورئان دەخوێنێ)

عائیشه خان (رضي الله عنها) دەفـەرمووێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: نمونەی ئەو قورئان خوێنەی کە بـەرەوانی قورئـانی لەبـەرەو کـردەوەی پـێ دەکات پلەو پایەی وەکـو پلـەی فریـشتانی خـوا وایـە و بـەڕێزە وە نمونـەی ئەوکەسەی قورئان دەخوێنێ و بەگران و قورس و بەزەحمەت لەبەری دەکات ئەوە دووقات ئەجرو پاداشتی بۆ هەیە.

## باب

## ﴿فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْيُسْرَىٰ﴾

٥٤١. عَنْ عَلِيٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ كُنَّا فِي جَنَازَةٍ فِي بَقِيعِ الْغَرْقَدِ فَأَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَقَعَدَ وَقَعَدْنَا حَوْلَهُ وَمَعَهُ مِخْصَرَةٌ فَنَكَّسَ فَجَعَلَ يَنْكُتُ بِمِخْصَرَتِهِ ثُمَّ قَالَ عليه الصلاة والسّلام (مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ وَمَا مِنْ نَفْسٍ مَنْفُوسَةٍ إِلَّا كُتِبَ مَكَانُهَا مِنْ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ وَإِلَّا قَدْ كُتِبَتْ شَقِيَّةً أَوْ سَعِيدَةً قَالَ رَجُلٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفَلَا نَتَّكِلُ عَلَى كِتَابِنَا وَنَدَعُ الْعَمَلَ فَمَنْ كَانَ مِنَّا مِنْ أَهْلِ السَّعَادَةِ فَسَيَصِيرُ إِلَى عَمَلِ أَهْلِ السَّعَادَةِ وَمَنْ كَانَ مِنَّا مِنْ أَهْلِ الشَّقَاءِ فَسَيَصِيرُ إِلَى عَمَلِ أَهْلِ الشَّقَاوَةِ قَالَ (ﷺ) أَمَّا أَهْلُ السَّعَادَةِ فَيُيَسَّرُونَ لِعَمَلِ أَهْلِ السَّعَادَةِ وَأَمَّا أَهْلُ الشَّقَاوَةِ فَيُيَسَّرُونَ لِعَمَلِ أَهْلِ الشَّقَاءِ ثُمَّ قَرَأَ ﴿فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٦﴾ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْيُسْرَىٰ﴾.

## بەشی/ ئایەتی

﴿فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْيُسْرَىٰ﴾

پێشەوا عەلی (رضي الله عنه) فەرمووی: لەگەڵ تەرمێك بووین، لەگۆڕستانی بەقیعول غەرقەد، پێغەمبەر (ﷺ) تەشریفی هات بۆلامان، پێغەمبەر (ﷺ) تەشریفی دانیشت، ئێمەش لەدەوری دانیشتین، حەزرەت دار دەستێکی بەدەستەوە بوو، سەری نەوی کردو مات بوو، خۆش خۆش داردەستەکەی دەخشاند لە عەرزەکە، وەك کەسێ پەرۆش شتێ بێ و بیر بکاتەوە، ئەوجا فەرمووی: (یەك بەیەکتان، یەك بەیەکی درووست کراونن، لەسەرەتاوە، لەئەزەلدا جێگەی هەم لە بەهەشت و هەم لە دۆزەخدا نووسراوە، هەروا نووسراوە کە بەدبەختە یا بەختەوەرە).

پیاوێکیش لەیاران فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! جا کەوایە بۆ بەو نووسراوەمان پشت نەبەستین و پشتی لێ نەدەینەوە ئیتر واز لە کارو کردەوەی چاکە بهێنین، ئێمە چی بکەین و چی نەکەین، بێ سوودە، چونکە جێگەمان لەبەهەشتا، لەدۆزەخدا لەپێشدا، لەئەزەلەوە دیاریکراوە، فەرمووی (ﷺ) ئێوە لەکاری چاکەسارد مەبنەوەو کارو کردەوەی خۆتان بکەن، قەدەر سرێکی خودایییە، چارەنووس رازێکی خودایییە، هۆش و ئەقڵی ئێوە دەرکی حیکمەت و دانایی ئەو نهێنییە ناکات، هەرکەسێ لەئەزەلدا لەزانستی خودادا بۆکوێ درووست کرابێ رێگەی ئەوێ دەگرێ، جا لەسەر ئەم بنیاتە بەختیار رێگەی چاکە دەگرێ و بەدکار رێگەی خراپە، بەم پێیە کاری باش نیشانەی بەهەشت و خراپ نیشانەی دۆزەخە).

ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) لەبۆ پشتیوانی ئەم مەسەلەیە، ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە دەفەرمووی: ﴿فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ ۝٥ وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ ۝٦ فَسَنُيَسِّرُهُۥ

﴿لِلْيُسْرَىٰ﴾. واته: جا هەرکەسێ ماڵی خۆی لەرێگەی خودادا بداو زەکات و سەرفیترە و بەشی هەژاران بدات و لەخوا بترسێ و کۆ لەگوناه و تاوان بکاتەوە پەلاماری ناموسی خەڵکی نەدات ئەوا ئێمەش دەیخەینە سەر رێگای چاکە و بەهەشتی بۆ ئاسان دەکەین.

## باب فضل آية الكرسي

٥٤٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَال: وَكَّلَنِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِحِفْظِ زَكَاةِ رَمَضَانَ فَأَتَانِي آتٍ فَجَعَلَ يَحْثُو مِنْ الطَّعَامِ فَأَخَذْتُهُ فَقُلْتُ لَأَرْفَعَنَّكَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَقَصَّ الْحَدِيثَ فَقَالَ ((إِذَا أَوَيْتَ إِلَى فِرَاشِكَ فَاقْرَأْ آيَةَ الْكُرْسِيِّ لَنْ يَزَالَ مَعَكَ مِنْ اللَّهِ حَافِظٌ وَلَا يَقْرَبُكَ شَيْطَانٌ حَتَّى تُصْبِحَ) وَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) صَدَقَكَ وَهُوَ كَذُوبٌ ذَاكَ شَيْطَانٌ.

## (بەشی/ فەزڵی ئایەتی کورسی)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) منی کردە وەکیلی خۆی بەپاراستنی ماڵی زەکات و سەرفیترەی رەمەزان شەوێ یەکێك هات مشتێکی لەخواردنەکە داو منیش دەستم گرت و پێم وت دەت بەم بۆلای پێغەمبەری خوا ئەویش زۆر پاڕایەوەو گووتی هەژارم و خاوەن ماڵ و منالم پێویستم پێی هەیە ئینجا پێی وتم ئەگەر چویتە سەر جێگای نووستن ئایەتی کورسی بخوێنەو هەتا بەیانی لەلایەن پەروەردگارەوە پارێزگاریت لێ دەکرێ و شەیتانیش نزیکت ناکەوێ هەتا بەیانی وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی راست دەکات بەڵام خۆی درۆزنە ئەوە شەیتان بوو.

## باب فضل ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ ، والمعوذات

٥٤٣.عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ):(أَيَعْجِزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَقْرَأَ ثُلُثَ الْقُرْآنِ فِي لَيْلَةٍ فَشَقَّ ذَلِكَ عَلَيْهِمْ وَقَالُوا أَيُّنَا يُطِيقُ ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَقَالَ عَلَيهِ الصلاة والسلام اللَّهُ الْوَاحِدُ الصَّمَدُ ثُلُثُ الْقُرْآنِ).

**ئەبو سەعیدی خودری (رضي الله عنه) دەفەرمووێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئایا کەستان دەتوانێ لەشەوێکدا سێیەکی قورئان بخوێنێ وە هاوەڵان زۆرییان زەحمەت بوو وتیان کاممان دەتوانین ئەوەبکەین ئەویش فەرمووی (سوورەتی قل هو الله احد) سێیەکی قورئانە.**

٥٤٤. عَنْ عَائِشَةَ رَضي اللهُ عَنْها أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ كُلَّ لَيْلَةٍ جَمَعَ كَفَّيْهِ ثُمَّ نَفَثَ فِيهِمَا فَقَرَأَ فِيهِمَا ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ﴾ ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾ ثُمَّ يَمْسَحُ بِهِمَا مَا اسْتَطَاعَ مِنْ جَسَدِهِ يَبْدَأُ بِهِمَا عَلَى رَأْسِهِ وَوَجْهِهِ وَمَا أَقْبَلَ مِنْ جَسَدِهِ يَفْعَلُ ذَلِكَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، وكان إذا اشتكى يقرأ على نَفسه بالمعوِّذات وَيَنْفُثُ فَلما اشتدَّ وَجَعُهُ كنت أقرأ عليهِ وَأمسح بيده رجاء بركتها .

**عائیشە (رضي الله عنە) دەفەرمووێ: کە پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ کە دەچووە سەر جێگای نووستن هەردوو دەستی کۆدەکردنەوەو فووی پیادەکردن و ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ﴾ ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾ تیایا دەخوێند و دەستی بەهەموو لەشیدا دێنا سێ جاران وە عائیشە دەفەرمووێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر نەخۆشیش بوایە ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾ وە ٱلْفَلَقِ ی دەخوێندو فووی پیادا دەکردو بەلەش و ئەو**

شوێنەی کە ئازاری هەبوایە وە لەوکاتەی نەی دەتوانی ئەمە بکات لەبەر زۆر ئازارە منیش ئەم سوورەتانەم دەخوێندو ئەویش فووی بەدەستی خۆی دادەکردو بەلەشی خۆی دادێنا.

## باب فضل القرآن

٥٤٥. عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَثَلُ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَالْأُتْرُجَّةِ طَعْمُهَا طَيِّبٌ وَرِيحُهَا طَيِّبٌ وَالَّذِي لَا يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَالتَّمْرَةِ طَعْمُهَا طَيِّبٌ وَلَا رِيحَ لَهَا، وَمَثَلُ الْفَاجِرِ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ الرَّيْحَانَةِ رِيحُهَا طَيِّبٌ وَطَعْمُهَا مُرٌّ، وَمَثَلُ الْفَاجِرِ الَّذِي لَا يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ الْحَنْظَلَةِ طَعْمُهَا مُرٌّ وَلَا رِيحَ لَهَا.

## (بەشی/ فەزڵی قورئان)

ئەبی موسای ئەشعەری (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە دەفەرمووێ: (نمونەی ئەوکەسەی قورئان دەخوێنێ وەکو لیمۆ وایە کەبۆنی خۆشە و تامی خۆشە و نمونەی ئەوکەسەی کە قورئان ناخوێنێ وەکو خورما وایەو بۆنی نیەو تامی شیرینە وە وێنەی دووڕووی قورئان خوێن وەکو رەیحانە وایە تامی تاڵەو بۆنی خۆشە وە نمونەی دوو ڕووی کە قورئان ناخوێنێ وەکو گوژارک وایەو هەم بۆنی نیەو تامی تاڵە).

## باب فضل من تَعلمَ القرآن

٥٤٦. عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ (رضي الله عنهُ) عن رسول الله (ﷺ) قالَ: (إِنَّ أَفْضَلَكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ).

## (بەشی/ فەزڵی کەسێ فێری قورئان بێت).

عوسمانی کوڕی عەففان (رضي الله عنـه) دەفـەرمووێ پێغەمبـەری خـودا (ﷺ) فەرمووی: چاکترینتان ئەوکەسەیە لەلای خودا کەخۆی فێری قورئـان خوێندن کردوەو خەڵکیش فێردەکات.

## باب إستذكار القرآن

٥٤٧.عَنْ عَبد الله بْنِ عُمَر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((فَإِنَّمَا مَثَلُ صَاحِبِ الْقُرْآنِ كَمَثَلِ صَاحِبِ الْإِبِلِ الْمُعَقَّلَةِ إِنْ عَاهَدَ عَلَيْهَا أَمْسَكَهَا وَإِنْ أَطْلَقَهَا ذَهَبَتْ)).

## (بەشی/ یادکردنەوەو بەبیرهێنانەوەی قورئان)

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە دەفەرمووێ: نمونەی قورئان خوێن و لەبەرکردن وەکو ئەو خاوەن وشترە وایە کە ئەگەر وشترەکە نەبەستێتەوە دەڕوات و بزر دەبێ وە ئەگەر بیبەستێتەوە ئەوە وشترەکەی ناڕوات و دەمێنێ.

٥٤٨.عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مَسعُود رَضِي اللهُ عَنْهُ قَال: قَالَ رَسول الله (ﷺ) ((بِئْسَ مَا لِأَحَدِهِمْ أَنْ يَقُولَ نَسِيتُ آيَةَ كَيْتَ وَكَيْتَ بَلْ نُسِّيَ وَاسْتَذْكِرُوا الْقُرْآنَ فَإِنَّهُ أَشَدُّ تَفَصِّيًا مِنْ صُدُورِ الرِّجَالِ مِنْ النَّعَمِ)).

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (رضي الله عنه) دەفـەرمووێ پێغەمبـەر (ﷺ) دەفەرمووێ: چەند خراپەو ناشیرینە بۆ مرۆڤ بڵێ من ئەو ئایەتەو فولانە ئایەتم لەبیر چوە بەڵکو بڵێت فولانە ئایەتم لەبیر خۆم بردۆتەوە وە دەوری قورئان و یادی بکەنەوە چونکە چۆن وشترو ماڵات ئەگەر نەی بەستنەوە چۆن بەڕەڵا و بزر دەبێت ئەویش زیاتر لەوە لەسینگی پیاوان دەچێتە دەر و دەڕوات.

## باب فيمن فخر بقراءة القرآن ولم يَعْمَل بِهِ

٥٤٩. عَنْ سُوَيْدِ بْنِ غَفَلَةَ قَالَ عَلِيٌّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (يَأْتِي فِي آخِرِ الزَّمَانِ قَوْمٌ حُدَثَاءُ الْأَسْنَانِ سُفَهَاءُ الْأَحْلَامِ يَقُولُونَ مِنْ خَيْرِ قَوْلِ الْبَرِيَّةِ يَمْرُقُونَ مِنْ الْإِسْلَامِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنْ الرَّمِيَّةِ لَا يُجَاوِزُ إِيمَانُهُمْ حَنَاجِرَهُمْ فَأَيْنَمَا لَقِيتُمُوهُمْ فَاقْتُلُوهُمْ، فَإِنَّ قَتْلَهُمْ أَجْرٌ لِمَنْ قَتَلَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ).

## (بەشی/ ئەو کەسە فیزو دەعیە بەخوێندنی قورئان لێبدا وە کردەوەی پێ نەکات)

سوەیدی کوڕی غەفلە دەفەرمووێ عەلی (رضي الله عنه) فـەرمووی گـوێم لەپێغەمبەری خوا بوو دەیفەرموو: (کۆمـەڵێ لـە ئۆمـەتی منـا پـەیـدا دەبـن بەتەمەن منداڵن و خەون و ئاواتی بـێ نرخیـان هەیـەو فەرمایـشتی پێغەمبـەر (ﷺ) لەبەر دەکەن و بەڵام لەئیسلام دەچـنە دەرەوە هـەروەکو چـۆن تـیر بەنێچیر دەکەوێت ئاوا لەدین دەردەچن، بیان کوژن چونکە لەکوشتنی ئەوان لەرۆژی قیامەت خێرو پاداشت هەیە.

## باب الترغيب في النكاح

٥٥٠. عَنْ أَنَس بْنَ مَالك رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قال: جَاءَ ثَلَاثَةُ رَهْطٍ إِلَى بُيُوتِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْأَلُونَ عَنْ عِبَادَةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمَّا أُخْبِرُوا كَأَنَّهُمْ تَقَالُّوهَا، فَقَالُوا وَأَيْنَ نَحْنُ مِنْ النَّبِيِّ (ﷺ)؟ قَدْ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ وَمَا تَأَخَّرَ، قَالَ: أَحَدُهُمْ أَمَّا أَنَا فَإِنِّي أُصَلِّي اللَّيْلَ أَبَدًا وَقَالَ آخَرُ أَنَا أَصُومُ الدَّهْرَ وَلَا أُفْطِرُ وَقَالَ آخَرُ أَنَا أَعْتَزِلُ النِّسَاءَ فَلَا أَتَزَوَّجُ أَبَدًا فَجَاءَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)فَقَالَ أَنْتُمْ الَّذِينَ قُلْتُمْ كَذَا وَكَذَا، أَمَا وَاللَّهِ إِنِّي لَأَخْشَاكُمْ لِلَّهِ وَأَتْقَاكُمْ لَهُ لَكِنِّي أَصُومُ وَأُفْطِرُ وَأُصَلِّي وَأَرْقُدُ وَأَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي.

### (بەشی/ برەودان و هاندان بۆ ژن خوازی و ژن هێنان)

ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەفەرمووێ: سێ کەس هاتنە لای ماڵەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پرسیاری شێوەی خواپەرستنی پێغەمبەری خوایان کرد کە پێیان راگەیاندرا وەك بڵێی بەکەمی بزانن لەلای خۆیان وابوو وە گوتیان ئێمە لەکوێ و پێغەمبەری خوا لەکوێ کە خوا لەگوناهی پێشوو و پاشووی خۆش بووە، بۆیە بڕیاریان دا کە یەکێکیان وتی من لەمەولا بە دواوە هەتا هەتایی هەموو شەوان ناخەوم و شەونوێژ دەکەم وە ئەوەی تریان وتی بڕیاربێ منیش هەتاهەتایی بەرۆژوو دەبم وە ئەوەی تریان وتی منیش بڕیاربێت ژن ناهێنم و خۆم دێڵمەوەو خەریکی خواپەرستی دەبم وە لەوکاتەدا پێغەمبەر پێیانی زانی و فەرمووی ئێوەن ئەم وتانەتان وتووە؟ سوێند بەخوا من لەهەمووتان بەتەقواو لەخواترس ترم وەمنیش شەو دەخەوم و شەونوێژیش دەکەم و رۆژێك بەرۆژوو دەبم و هەندێك رۆژیش دەشکێنم وە کەژن دەهێنم وەکەسێ کەلەسەر سوننەت و رێبازی من لابدا لەمن نییە.

## باب فيمن لَمْ يَستطيع الباءه

٥٥١. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مَسعُود قَال: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) شَبَابًا لَا نَجِدُ شَيْئًا فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ((يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ مَنْ اسْتَطَاعَ مِنْكُم الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ، فَإِنَّهُ أَغضُّ لِلْبَصَرِ وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ)).

## (بەشی/ کەسێ توانای ژن هێنانی نەبوو)

عەبدوڵلای کوڕی مەسعود دەفەرمووێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا بووین (ﷺ) وە توانای ژنهێنانمان نەبوو فەرمووی: ئەی گەلی گەنجان کەسێ توانای ژن هێنانی هەیە با ژن بهێنێ وە چونکە دەبێتە هۆی پاراستنی چاوو شەرمگاتان وەکەسێ توانای ژن هێنانی نەبوو بابە بەرۆژوو بێ ئەوە بۆئەو چاکترەو شیفابەخشە.

## باب تنكح المرأة لأربع خلال

٥٥٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عانّ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ ((تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لِأَرْبَعٍ لِمَالِهَا وَلِحَسَبِهَا وَجَمَالِهَا وَلِدِينِهَا فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ)).

## (بەشی/ ژن مارەکردن بۆ چوار سیفەت (شت))

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە دەفەرمووێ: ژن مارەدەکرێ بۆ چوارشت: بۆ ماڵ و سامان و بۆ بنەماڵەو خانەدانی وەیان بۆ جوانی وەیان بۆ دینداری، وەتۆش لەدینداری هەڵی بژێرە وە ئەگینا دەستت لەناو خۆڵ دەبێ (مایە پووچ دەبی).

## باب شؤم المرأة

٥٥٣.عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ مَا تَرَكْتُ فِتْنَةً أَضَرَّ عَلَى الرِّجَالِ مِنْ النِّسَاءِ.

### (بەشی/ بەدبەختی ئافرەت)

ئوسامەی کوڕی زەید (رضي الله عنه) لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە دەفەرمووێ: (لەپاش مردنی من هیچ ئاشوپ و فیتنـەکم لـەناو ئوممـەتی خۆمدا بەجێ نەهێشتووە کەوەك ئاشووبی و فیتنەی ژنان بۆ پیاوان).

## باب النهي عن خطبته على خطبة أخيه

٥٥٤.عَنْ أبي هُرَيْرَةَ رَضي الله عَنْهُ يَأْثُرُ عَنْ رَسُولِ الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((إِيَّاكُمْ وَالظَّنَّ فَإِنَّ الظَّنَّ أَكْذَبُ الْحَدِيثِ وَلَا تَجَسَّسُوا وَلَا تَحَسَّسُوا وَلَا تَبَاغَضُوا وَكُونُوا إِخْوَانًا وَلَا يَخْطُبُ الرَّجُلُ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ حَتَّى يَنْكِحَ أَوْ يَتْرُكَ.

### (بەشی/ نەهی کراوە لەژن خواستن لەسەر داخوازی براکەی)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) ریوایەت دەکات لەپێغەمبەری خـوا (ﷺ) کە دەفەرمووێ: (دووربن لە بەدگومانی و قسەی درۆیەوە جاسوسی کـردن و بەشوێنی عەیبی خەڵکیدا گەڕان و فیتنەبەری مەکەن لەگەڵ یەکتریدا وەك برا تەبابن وە درووست نیە کەسێ خوشـکی یـان کـچی خـۆی بیداتـە پیـاوێ وە پیاوێکی تریش بەشبڕی لێ بکات و بەسەر ئەوو خوشکی خۆی یان کچی خۆی پێشکەشی بەو پیاوە بکات هەتا ئەوپیاوە وازی لـێ دێنێ لەیەکـەمیان یـان مۆڵەتی دەدات بۆ دووەمیان بیداتێ.

٥٥٥. عَنْ عَبد الله بْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا كَانَ يَقُولُ: نَهَى رَسُول الله (ﷺ) أَنْ يَبِيعَ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ وَلَا يَخْطُبَ الرَّجُلُ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ حَتَّى يَتْرُكَ الْخَاطِبُ قَبْلَهُ أَوْ يَأْذَنَ لَهُ الْخَاطِبُ.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنه) دەیفەرموو پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەهی کردووە لەوەی سەوداو مامەڵە لەسەر کڕین و فرۆشتنی برای موسڵمان بکرێ وە هەروەها نەهی کراوە لەکاری خوازبێنی برای خۆتان تا خوازبێنی کەر واز دێنێ یان رێگەی پێ دەدات.

## باب الشروط في النكاحْ

٥٥٦. عَنْ عُقْبَةَ بن عامر عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((أَحَقُّ مَا أَوْفَيْتُمْ مِنْ الشُّرُوطِ أَنْ تُوفُوا بِهِ مَا اسْتَحْلَلْتُمْ بِهِ الْفُرُوجَ))

## (بەشی/ مەرجەکانی ژن خوازی)

عوقبەی کوڕی عامیر لەپێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کەدەفەرمووێ: لەپێشترین مەرج دەبێ بەجێ بگەیەنن ئەوەیە کە ئافرەتانی پێ حەلاڵ دەکەن بۆخۆتان.

٥٥٧. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تَسْأَلُ طَلَاقَ أُخْتِهَا لِتَسْتَفْرِغَ صَحْفَتَهَا فَإِنَّمَا لَهَا مَا قُدِّرَ لَهَا.

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) کە دەفەرمووێ: حەلاڵ نییە بۆ ئافرەتێ داوای تەلاقدانی خوشکی خۆی بکات بۆئەوەی خۆی جێگای ئەو بگرێتەوە، با شوو بەپیاوێکی تر بکات وەهەر ئەوەی بۆهەیە کە بۆی دانراوە.

## باب حق إجابة الوَلِيمة

٥٥٨.عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ)قَالَ إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ إِلَى الْوَلِيمَةِ فَلْيَأْتِهَا.

### (بەشی/ پێویست بوون لە چوون بۆ داوەتی ژن گواستنەوە)

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەگەر بانگکران بۆ داوەتی ژن گواستنەوە بڕۆن، وە ئگەر بێ فەرمانی خوای تێدابێت ئەوکاتە چوونی دروست نییە و حەڕامە).

٥٥٩.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضي الله عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ)قَالَ لَوْ دُعِيتُ إِلَى كُرَاعٍ لَأَجَبْتُ، وَلَوْ أُهْدِيَ إِلَيَّ ذِرَاعٌ لَقَبِلْتُ.

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرمووێ: ئەگەر بانگم بکەن بۆ داوەتی ژن گواستنەوە ئەگەر سەروپێی تێدا ئامادەکرابێ بۆی دەچم وەیان وەیاخود ئەگەر سەرو پێ بەدیاری بۆم بێنن وەری دەگرم.

## باب المداراة مع النساء

٥٦٠.وَعَنْهُ أيضاً عَنْ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ الْمَرْأَةُ كَالضِّلَعِ إِنْ أَقَمْتَهَا كَسَرْتَهَا وَإِنْ اسْتَمْتَعْتَ بِهَا اسْتَمْتَعْتَ بِهَا وَفِيهَا عِوَجٌ.

### (بەشی/ ژیان بەسەر بردن لەگەڵ ئافرەتدا)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە دەفەرمووێ: ئافرەت وەکو پەراسو وان ئەگەر راستیان کەنەوە دەشکێن چونکە پەراسوو خوارن وە ئەگەر بتەوێ لەگەڵیانبژی و رابوێری ئەوا دەبێ بەپێی سروشتییەکەی بەلاری و خواری رابوێری لەگەڵیدا.

## باب الوصايا بالنساء

٥٦١.وعَنْهُ أيضاً عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَال: ((مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلَا يُؤْذِ جَارَهُ وَاسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا فَإِنَّهُنَّ خُلِقْنَ مِنْ ضِلَعٍ وَإِنَّ أَعْوَجَ شَيْءٍ فِي الضِّلَعِ أَعْلَاهُ فَإِنْ ذَهَبْتَ تُقِيمُهُ كَسَرْتَهُ وَإِنْ تَرَكْتَهُ لَمْ يَزَلْ أَعْوَجَ فَاسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا)).

### (بەشی/ ئامۆژگاری کردنی ئافرەتان بەچاکە)

ئـەبو هـورەیرە (رضـي الله عنـه) لەپێغەمبـەر (ﷺ) دەگێڕێتـەوە کـە دەفەرمووێ: کەسێ ئیمان و بڕوای هەبێ بـەخواو بـەرۆژی دوایـی بـا ئـازاری دراوسێ نەدات، و ئامۆژگاری و وەسیەتی چـاك بکـات بـۆ ئافرەتـان چـونکە ئەوان لەپەراسوو دروست کراون وە لای هەرە خواری پەراسوی لای سەریەتی وە ئەگەر ویستت راستی کەیتەوە دەشکێت وە ئەگینا دەبێ بەخواری لەگەڵی رابوێری وە ئامۆژگاریتان دەکەم بەچاکە لەگەڵیاندا.

## باب صوم المرأة تطوعاً

٥٦٢. وَعَنْهُ أيضاً عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قال: لَا تَصُومُ الْمَرْأَةُ وَبَعْلُهَا شَاهِدٌ إِلَّا بِإِذْنِهِ.

### (بەشی/ رۆژوو سوننەتی ئافرەتان)

ئـەبو هـورەیرە (رضـي الله عنـه) لەپێغەمبـەر (ﷺ) دەگێڕێتـەوە کـە دەفەرمووێ: (نابێت ئافرەت بەرۆژوو بێت و رۆژووی سوننەت بـەبێ مۆڵـەتی مێردی.

## باب إذن المرأة في بيتْ زَوجِها

٥٦٣. وَعَنْهُ أيضاً أنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ لَا يَحِلُّ لِلْمَرْأَةِ أنْ تَصُومَ وَزَوْجُهَا شَاهِدٌ إِلَّا بِإِذْنِهِ وَلَا تَأْذَنَ فِي بَيْتِهِ إِلَّا بِإِذْنِهِ وَمَا أنْفَقَتْ مِنْ نَفَقَةٍ عَنْ غَيْرِ أمْرِهِ فَإِنَّهُ يُؤَدَّى إِلَيْهِ شَطْرُهُ.

**(بەشی/ نابێت کەس بێ مۆڵەتی مێرد بێتە لای ئافرەت)**

**ئەبو هورەیرە (رضي الله عنـه) دەفـەرمووێ پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: دروست نییە بۆ هیچ ئافرەتێ کە بەرۆژوو بێت مەگەر پیاوەکەی ئاگاداری بێت وە ئیزنی بدات وە نابێت کەسیش بێتە ماڵی لای ئافرەتەکەی بەبێ مۆڵەت و ئیزنی مێردەکەی نەبێت وە هەرکاتێ ئافرەت شتێ ببەخشێ یان خەرج بکات بۆکارێ جگە لە مۆڵەتی مێردی ئەوە ئەو بەخشینە نیوەی بۆ مێردەکەیەتی.**

## باب أهل الجنّة وأهل النار

٥٦٤. عَنْ أُسَامَةَ بن زيد عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ قُمْتُ عَلَى بَابِ الْجَنَّةِ فَكَانَ عَامَّةُ مَنْ دَخَلَهَا الْمَسَاكِينَ، وَأَصْحَابُ الْجَدِّ مَحْبُوسُونَ غَيْرَ أنَّ أصْحَابَ النَّارِ قَدْ أُمِرَ بِهِمْ إِلَى النَّارِ وَقُمْتُ عَلَى بَابِ النَّارِ فَإِذَا عَامَّةُ مَنْ دَخَلَهَا النِّسَاءُ.

**(بەشی/ خەڵکی بەهەشت و خەڵکی دۆزەخ)**

**ئوسامەی کوڕی زەید لەپێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە دەفەرمووێ: چوومە بەردەرگای بەهەشت سەیرم کرد زۆربەی بەهەشتییەکان لەهەژاران و بێ نەوایانن وە دەوڵەمەندەکانیش ڕاگیرابوون بۆ لێپرسینەوە وە ئەوانەی دۆزەخی بوون بەفەرمانی خوا برابوون بۆ دۆزەخ وەلەبەر دەرگای دۆزەخیش وەستام دیتم زۆربەی زۆری خەڵکی دۆزەخ ئافرەتان بوون.**

٥٦٥. قَالَ (ﷺ) إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ لَا يَخْسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِهِ فَإِذَا رَأَيْتُمْ ذَلِكَ فَاذْكُرُوا اللَّهَ قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ رَأَيْنَاكَ تَنَاوَلْتَ شَيْئًا فِي مَقَامِكَ ثُمَّ رَأَيْنَاكَ تَكَعْكَعْتَ فَقَالَ إِنِّي رَأَيْتُ الْجَنَّةَ فَتَنَاوَلْتُ مِنها عُنْقُودًا وَلَوْ أَخَذْتُهُ لَأَكَلْتُمْ مِنْهُ مَا بَقِيَتْ الدُّنْيَا وَأُرِيتُ النَّارَ فَلَمْ أَرَ كَالْيَوْمِ مَنظَرًا قَطُّ أوَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا النِّسَاءَ قَالُوا لم يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ يكْفُرِن قِيلَ يَكْفُرْنَ بِاللَّهِ قَالَ يَكْفُرْنَ الْعَشِيرَ وَيَكْفُرْنَ الْإِحْسَانَ لَوْ أَحْسَنْتَ إِلَى إِحْدَاهُنَّ الدَّهْرَ كُلَّهُ ثُمَّ رَأَتْ مِنْكَ شَيْئًا قَالَتْ مَا رَأَيْتُ مِنْكَ خَيْرًا قَطُّ.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی رۆژو مانگ دوو نیشانەن لەنیشانەکانی خوا، بۆ مردن و ژیانی هیچ کەسێکا ناگیرێن وە ئەگەر دیتتان رۆژو مانگ گیران ئەوە زۆر یادی خوابکەن و وتیان ئەی نێرراوی خوا (ﷺ) بینیمان لەشوێنی خۆت بەپێشو پاش گەڕایەوە؟ فەرمووی من بەهەشتم دیت ویستم هێشووە ترێیەك لێ بکەمەوە وەئەگەر بم هێنابا و بتان خواردبا ئەوا هەتا دونیا ماوە کۆتایی نایەت، وە ئاگری دۆزەخم دیت قەت لەم رۆژە شێوەی وا ناشیرینم نەدیوە وە بینیم زۆربەی هەرەزۆری خەڵکەکەی ئافرەتانن، وتیان بۆچی فەرمووی بەهۆی ئەوەی زۆر ناشوکری و چاکەی مێردیان لەبیر دەکەن وە ئەگەر چەندین ساڵ چاکە بکەی لەگەڵ هەر یەکێکیان وە لەپاشان خراپەیەکت لێ ببینێ پێت دەڵێت بەژیانم چاکەم لێ نەبینیوی.

## باب كراهِيةْ ضَرْب النِساء

٥٦٦. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَمْعَةَ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ لَا يَجْلِدُ أَحَدُكُمْ امْرَأَتَهُ جَلْدَ الْعَبْدِ ثُمَّ يُجَامِعُهَا فِي آخِرِ الْيَوْمِ.

### (بەشی/ کەراهەتی هەیە لێدان لەئافرەت).

عەبدوڵڵای کوڕی زەمعە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (با کەستان لەئافرەتی خۆی نەدات و وەکو چۆن لەبەندەو نۆکەری دەدات وە لەپاشان لەکۆتایی ڕۆژا لەگەڵیشی جووت بێت و کۆببێتەوە.

## باب الغيرة

٥٦٧. عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ يَا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ مَا أَحَدٌ أَغْيَرَ مِنْ اللَّهِ أَنْ يَرَى عَبْدَهُ أَوْ أَمَتَهُ يَزْنِي يَا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلًا وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيرًا.

### (بەشی/ غیرەت)

عائیشە (رضي الله عنها) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئەی ئوممەتی موحەممەد کەسێ نیە لەخوا بەغیرەتتر بێت لەوکەسەی کە ببینێ غولامەکەی یان کەنیزەکی داوێن پیسی بکات، وە ئەی ئوممەتی موحەممەد ئەگەر ئەوەی من دەیزانم ئێوەش بیزانن کەم پێدەکەنن و زۆر دەگرییێن.

## باب إسْتِئْذان المرأة لِزوجِها

٥٦٨. عَنْ عَبْد الله بن عُمَر رَضي اللهُ عَنْهُما عَنْ رَسُولِ الله صَلّى اللهُ تَعالى عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قال: ((إِذَا اسْتَأْذَنَتْ امْرَأَةُ أَحَدِكُمْ إِلَى الْمَسْجِدِ فَلَا يَمْنَعْهَا)).

## (بەشی/ ئیزن دانی ئافرەت لەچوونی بۆ مزگەوت)

عەبدوللای کوڕی عومەر (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر ئافرەتی یەکێکتان داوای مۆڵەتی چوونی بۆ مزگەوت کرد ئێوەش رێگری لیّ مەکەن).

## باب نَعْت المرأة لَزوجِها

٥٦٩. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ قَالَ رَسول اللهِ (ﷺ) لَا تُبَاشِرُ الْمَرْأَةُ الْمَرْأَةَ فَتَنْعَتَهَا لِزَوْجِهَا كَأَنَّهُ يَنْظُرُ إِلَيْهَا

## (بەشی/ گێڕانەوەی ژن جوانی و سیفەتی ژنی بیّگانە بۆ مێردی)

عەبدوللای کوڕی مەسعود (رضي الله عنه) فەرمووی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (نابیّ ژن سەرنجی ژنێکی تر بداو لەپاشان وردو درشت باسی لەش و لاری ئەو ژنە بۆ مێردی بکات بەشێوەیەکی وا کە وەك مێردەکەی بەچاوی خۆی دیتبی وابیّ).

## لایطرق الغائب أهله ليلاً

٥٧٠.عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ إِذَا دَخَلْتَ لَيْلًا فَلَا تَدْخُلْ عَلَى أَهْلِكَ حَتَّى تَسْتَحِدَّ الْمُغِيبَةُ وَتَمْتَشِطَ الشَّعِثَةُ)). قَالَ جابر قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((فَعَلَيْكَ بِالْكَيْسِ الْكَيْسِ)).

## (بەشی/ نابێت پیاو کە گەڕایەوە لەسەفەر بەشەو بەبێ ئاگادارکردنەوەی ئافرەتی بچێتە ماڵەوە)

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رضي الله عنهما) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (کاتێ لەسەفەر دەگەڕێنەوە ئەگەر بەشەو گەیشتنە جێ وابکەن لەپێشدا ئاگاداریان بکەنەوە هەتا ژن سەری خۆی شانە بکات و خۆی پاك و خاوێن بکات لەپێشوازی مێردی دابێت).

وە جابیر فەرمووی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئافرەتی عاقڵ و ژیر بێنن).

**٥٧١.وَعَنْهُ أيضاً قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)إِذَا أَطَالَ أَحَدُكُمْ الْغَيْبَةَ فَلَا يَطْرُقْ أَهْلَهُ لَيْلًا.**

جابیر (رضـي الله عنـه) دەفـەرمووێ پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: ئەگـەر کەسێکتان سەفەری درێژەی کێشا لەبەر هەرهۆیەك بێت لـەخێزانی دابـڕا بـا بەشەو لەناکاو خۆی نەکا بەماڵا.

## باب كافِل اليَتيم

**٥٧٢. عَنْ سَهْل الساعدي قال: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ أَنَا وَكَافِلُ الْيَتِيمِ فِي الْجَنَّةِ هَكَذَا وَأَشَارَ بِالسَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى وَفَرَّجَ بَيْنَهُمَا شَيْئًا.**

## (بەشی/ سەرپەرشتی هەتیوان)

سەهلی ساعیدی دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: من و ئەوکەسەی سەرپەرشتیکەری هەتیوان دەکات لەبەهەشتا ئا ئاواین بەپەنجەی شایەتی و ناوەڕاستی لەیەك نزیك کردنەوە وەکەمێك نێوانی هەبوو.

## باب المتَوَفِي عنها زوجها

٥٧٣. عَنْ زَيْنَب بنت أبي سلمة قالت: دَخَلْتُ عَلَى زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ حِينَ تُوُفِّيَ أَخُوهَا فَدَعَتْ بِطِيبٍ فَمَسَّتْ مِنْهُ ثُمَّ قَالَتْ أَمَا وَاللَّهِ مَا لِي بِالطِّيبِ مِنْ حَاجَةٍ غَيْرَ أَنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ)يَقُولُ عَلَى الْمِنْبَرِ: (لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ أَنْ تُحِدَّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلَاثِ لَيَالٍ إِلَّا عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا).

## (بەشی/ ئافرەتی مێرد مردوو)

زەینـەبی کـچی ئـەبی سـەلەمە دەفـەرمووێ چـوومە لای زەینـەبی کـچی جەحش کە برای کۆچی دوایـی کردبـوو کـە داوای بـۆنی گـولاوی کردبـوو وە هەنـدێکی بـۆن لەلەشـی خـۆی داو لەپاشـان وتـی مـن پێویـستم بـەخۆ بۆنخۆشکردن نییە بەڵام لەبەرئـەوەی گـوێم لەپێغەمبـەری خـوا بـوو لەسـەر مینبەر وتاری دەداو دەیفەرموو نابێت بـۆ کـە ئیمـان و بـڕوای بـەخواو ڕۆژی دوایی هەبێت تازیە و پرسە دانێ بۆ کەسێ مردوو لەسێ شەوان زیاتر، تەنها بۆ مێردی خۆی دەبێ چوار مانگ و دە ڕۆژ تازییەو پرسە بکات.

## باب النفَقات

٥٧٤.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ (قَالَ اللَّهُ تعالى أَنْفِقْ يَا ابْنَ آدَمَ أُنْفِقْ عَلَيْكَ).

## (بەشی/ ژیوارو نەفەقە)

ئەبو هورەیرە دەفەرمووێ (رضي الله عنه) پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی خوای گەورە دەفەرمووێ: (ئەی نەوەی ئادەم ماڵ ببەخشە بەچەندان قات پێت دەبەخشینەوە).

٥٧٥.عَنْ أَبِي مَنصور الْأَنْصَارِيِّ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (إِذَا أَنْفَقَ الْمُسْلِمُ نَفَقَةً عَلَى أَهْلِهِ وَهُوَ يَحْتَسِبُهَا كَانَتْ لَهُ صَدَقَةً).

لەئەبی مەنصوری ئەنصاری لەپێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: ئەگەر موسڵمان ماڵی خۆی ببەخشێ بۆ بەخێوکردنی ماڵ و منداڵی و خێزانی وە لەبەر رەزای خوا بێت ئەوە بەخێرو صەدەقە بۆی حیسابە.

٥٧٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضي اللهُ عَنْهُ قَال: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((السَّاعِي عَلَى الْأَرْمَلَةِ وَالْمِسْكِينِ كَالْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ تعالى أَوْ الْقَائِمِ اللَّيْلَ الصَّائِمِ النَّهَارَ)).

ئەبو هورەیرە (رضـي الله عنـه) دەفـەرمووێ پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی ئەوەی تێ بکۆشێ بۆ سەرپەرشتی کردنی ژنی بێ مێردو بێوەژن و هـەژاران وەکو خەبات کەرێ وایە کەلە جیهاد دابـێ لـەرێگای خـوداو بـەرۆژ بـە رۆژوو وەبەشەو شەونوێژ بکات.

٥٧٧. عَنْ عُمَر بن الخطاب رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ يَبِيعُ نَخْلَ بَنِي النَّضِيرِ وَيَحْبِسُ لِأَهْلِهِ قُوتَ سَنَتِهِمْ

عومەری کوڕی خەطاب (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) لەبەری باخەکانی بەنی نەزیری دەفرۆشت هەموو ساڵێ بەشی نانی ساڵی خێزانەکەی لێ ئەداو.

٥٧٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ خَيْرُ الصَّدَقَةِ مَا كَانَ عَنْ ظَهْرِ غِنًى وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ.

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (چاکترین خێـرو صـەدەقە ئەوەیـە تـۆ لەسـەر لێـواری دەوڵەمەنـدی دابـی و پێویستت پێی نەبێ وە لەخزمە هەژارو بێ نەواکانت دەست پێبکە).

## باب من العمل الصالح

٥٧٩. عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ أَطْعِمُوا الْجَائِعَ وَعُودُوا الْمَرِيضَ وَفُكُّوا الْعَانِيَ.

## (بەشی/ لە کردەوەی چاکەکان)

ئەبو موسای ئەشعەری (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: برسییەکان تێر خواردن بکەن و سەردانی نەخۆشان بکەن، وە دیل و کۆیلەکان ئازاد بکەن.

## باب التسمية على الطعام

٥٨٠.عَنْ عُمَرَ بْنَ أَبِي سَلَمَةَ قال: كُنْتُ غُلَامًا فِي حَجْرِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وَكَانَتْ يَدِي تَطِيشُ فِي الصَّحْفَةِ فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَا غُلَامُ سَمِّ اللَّهَ وَكُلْ بِيَمِينِكَ وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ فَمَا زَالَتْ تِلْكَ طِعْمَتِي بَعْدُ.

## (بەشی/ ناوی خوا هێنان لەسەر خواردن)

لە عومەری کوڕی ئەبی سەلەمە دەفەرمووێ: من منداڵ بووم لەکۆش پێغەمبەری خوا بووم وە کەنانم دەخوارد دەستم دەگێڕا بەناو قاپی خواردندا بەئارەزووی خۆم، جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ئەی رۆڵە کە خواردن دەخۆی لەسەرەتاوە ناوی خوا بهێنەو بەدەستی راست بخۆ وە لەبەردەمی خۆت بخۆ، عومەر فەرمووی ئیتر لەوساتەوە بەم شێوەیە خواردن دەخۆم.

## باب التيَمن على الأكل

٥٨١.عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يُحِبُّ التَّيَمُّنَ مَا اسْتَطَاعَ فِي طُهُورِهِ وَتَنَعُّلِهِ وَتَرَجُّلِهِ.

### (بەشی/ خواردن بەدەستی راست)

عائیشە خان (رضي الله عنها) دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) عادەتی وابوو لای راستەی پێ خۆش بوو لە دەستپێکردن لە دەستنوێژ و پێڵاو لەپێکردن وە لەسەر شانەکردندا.

## باب البَرَكة في الطَعام

٥٨٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) (طَعَامُ الِاثْنَيْنِ كَافِي الثَّلَاثَةِ وَطَعَامُ الثَّلَاثَةِ كَافِي الْأَرْبَعَةِ).

### (بەشی/ بەرەکەتی خواردن)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) فەرمووی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی خواردنی دووکەس بەشی سێ کەس دەکات وە خواردنی سێ کەس بەشی چوارکەس دەکات.

٥٨٣. وَعَنْهُ أَنَّ رَجُلًا كَانَ يَأْكُلُ أَكْلًا كَثِيرًا فَأَسْلَمَ فَكَانَ يَأْكُلُ أَكْلًا قَلِيلًا فَذُكِرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ إِنَّ الْمُؤْمِنَ يَأْكُلُ فِي مِعًى وَاحِدٍ وَالْكَافِرَ يَأْكُلُ فِي سَبْعَةِ أَمْعَاءٍ.

ئەبو هورەیرە دەفەرمووێ (رضي الله عنه) پیاوێ زۆرخۆر بوو کە موسڵمان بوو کەمی دەخوارد ئەم باسەیان بۆ پێغەمبەر گێڕایەوە ئەویش فەرمووی بڕوادار بەقەد یەك گەدە خواردن دەخوات، وەبێ بڕواش بەقەد حەوت کەس و حەوت گەدە خواردن دەخوا.

## باب الجلوُس على المائِدةَ

٥٨٤.عَنْ نَافِعٍ مَولى إبن عُمَر قَال: كَانَ ابْنُ عُمَرَ لَا يَأْكُلُ حَتَّى يُؤْتَى بِمِسْكِينٍ يَأْكُلُ مَعَهُ، فَأَدْخَلْتُ رَجُلًا يَأْكُلُ مَعَهُ فَأَكَلَ كَثِيرًا فَقَالَ يَا نَافِعُ لَا تُدْخِلْ هَذَا عَلَيَّ، سَمِعْتُ رَسُول الله (ﷺ) سَلَّمَ يَقُولُ الْمُؤْمِنُ يَأْكُلُ فِي مِعًى وَاحِدٍ وَالْكَافِرُ يَأْكُلُ فِي سَبْعَةِ أَمْعَاءٍ.

## (بەشی/ دانیشتن لەسەر (خوان) سفرەی خواردن)

نافیع غولامی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەفەرمووێ عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنه) عادەتی وابوو خواردنی نەدەخوارد هەتا هەژارێ لەگەڵی نەبا، جا هەژارێکم برد بۆلای کە نانی لەگەڵ بخوات بەڵام هەژارەکە زۆرخۆر بوو، فەرمووی ئەی نافیع جارێکی تر ئەمە مەهێنە بۆلام گوێم لەپێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەیفەرموو موسڵمان کەم خۆرە لەچاو کافرو بێ بڕوادا بەقەد یەك گەدە خواردن دەخوات بەڵام بێ بڕواو کافر بەقەد حەوت گەدە دەخوات.

٥٨٥.عَنْ أبي جحيفَة السوائي قال: سَمِعْتُ رَسول الله يقول: ((إنّي لا آكلُ مُتَّكِئًا)).

ئەبی جەحیفەی سوائی دەفەرمووێ گوێم لەپێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) فەرمووی: من بە پاڵدانەوە خواردن ناخۆم.

## باب ما عابَ (ﷺ) طَعامَهُ

٥٨٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللهُ عَنْهُ أَنَّهُ قَالَ: مَا عَابَ النَّبِيُّ (ﷺ) طَعَامًا قَطُّ إِنْ اشْتَهَاهُ أَكَلَهُ وَإِنْ كَرِهَهُ تَرَكَهُ.

## (بەشی/ پەیدانەکردنی عەیب و تەنگی لەخواردندا)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەری خـوا (ﷺ) قـەت عەیبی نەگرتووە لەخواردن، ئەگەر حەزی بکردبا دەی خوارد ئەگینا وازی لێ دەهێنا.

## باب الأكل في إناء مفضض

٥٨٧. عَنْ حذيفة رَضيَ اللهُ عَنْهُ قال: سَمعْتُ رَسُول الله (ﷺ) يَقُولُ لَا تَلْبَسُوا الْحَرِيرَ وَلَا الدِّيبَاجَ وَلَا تَشْرَبُوا فِي آنِيَةِ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَلَا تَأْكُلُوا فِي صِحَافِهَا فَإِنَّهَا لَهُمْ فِي الدُّنْيَا وَلَنَا فِي الْآخِرَةِ.

## (بەشی/ خواردن لەقاپی زێڕو زیوی سواغ دراو)

حوذەیفە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەیفەرموو ئاوریشم و دیباج لەبەر مەکەن وەلە قـاپ و ئامـانی زێـڕو زیویـشا شت مەخۆن وە نەشت بخۆنەوە چونکە ئەمانە لەدونیادا بۆ بێ بڕوایانن وەلە قیامەتیشا بۆ ئێمەیە.

## باب بَركَة النخلة

٥٨٨. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَال: بَيْنَا نَحْنُ عِنْدَ النَّبِيِّ عَلَيْهِ الصَّلاةُ والسَّلام جُلُوسٌ إِذَا أُتِيَ بِجُمَّارِ نَخْلَةٍ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((إِنَّ مِنْ الشَّجَرِ لَمَا بَرَكَتُهُ كَبَرَكَةِ الْمُسْلِمِ))، ثُمَّ قَالَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((هِيَ النَّخْلَةُ)).

## (بەشی/ بەرەکەتی خورما)

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (رضي الله عنه) دەفەرمووێ: لەخزمەتی پێغەمبەری خوا بووین (ﷺ) دانیشتبوین بارێك خورمایان هێنا بۆ خزمەتی پێغەمبەر ئەویش فەرمووی لەناو داران دارێك هەیە پیت و بەرەکەتی وەکو موسڵمانە، لەپاشان فەرمووی ئەوە دارخورمایە.

## باب العَجوةَ

٥٨٩. عَنْ سعد بن أبي وقاص رَضيَ اللهُ عَنْهُ قَال: قال رَسُولُ اللّه (ﷺ) مَنْ تَصَبَّحَ كُلَّ يَوْمٍ سَبْعَ تَمَرَاتٍ عَجْوَةً لَمْ يَضُرَّهُ فِي ذَلِكَ الْيَوْمِ سُمٌّ وَلَا سِحْرٌ.

## (بەشی/ خورمای عەجوە)

سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص (رضي الله عنه) دەفەرمووێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: هەرکەسێ بەیانییان لەخورینی (پێش خواردن) حەوت دەنکە خورمای عەجوە بخوات ئیتر ئەورۆژە هەتا ئێوارە نە ژەهرو نەجادوو (سیحر) کاری لێ ناکات و زیانی بۆ نابێت.

## باب أكل الثُوم والبَصَلْ

٥٩٠.عَنْ جَابِرِ بْنَ عَبْدِ اللّهِ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمَا زَعَمَ أَنَّ النَّبِيِّ (ﷺ)قَالَ: ( مَنْ أَكَلَ ثُومًا أَوْ بَصَلًا فَلْيَعْتَزِلْنَا أَوْ لِيَعْتَزِلْ مَسْجِدَنَا).

## (بەشی/ خواردنی سیرو پیاز)

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رضي الله عنه)دەفەرمووێ وا تێدەگەم کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (کەسێ سیر یان پیازی خوارد با دوورکەوێتەوە لێمان، یان دوورکەوێتەوە لەمزگەتەکانمان {لەبەر بۆنی ناخۆش}.

## باب لَعْق الأصابع ومصها

٥٩١.عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضيَ اللهُ عَنْهُما أنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ فَلَا يَمْسَحْ يَدَهُ حَتَّى يَلْعَقَهَا أَوْ يُلْعِقَهَ.

## (بەشی/ لێستنەوەی پەنجە لەپاش خواردن بەزمان)

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (رضي الله عنه) دەفەرمووێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئەگەر یەکێکتان خۆراکی خوارد با دەستی نەسڕێ هەتا دەیلێسێتەوە یان یەکێکی تر دەیلێسێتەوە بۆی.

## باب ما يَقول بعدَ الطَعام

٥٩٢.عَنْ أَبِي أُمَامَةَ رَضيَ اللهُ عَنْهُ أنَّ النَّبِيَّ (ﷺ)كَانَ إِذَا رَفَعَ مَائِدَتَهُ قَالَ: (الْحَمْدُ لله حَمداً كثيراً طَيباً مُباركاً فِيهِ غَيرَ مَكْفِي ولاَ مُوَدَّع وَلا مُسْتَغْنَي عنْهُ رَبُّنا). وقالَ مرةَ: (الحَمْدُ للهِ الذّي كَفَانا وَأَرْوانا غَيرَ مَكفي ولاَ مكفور)..

## (بەشی/ چی دەڵێی پاش خۆراك خواردن)

ئەبی ئومامە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ: کە سفرەی (خوان)ی پێغەمبەر (ﷺ) هەڵدەگیراو لەپاشان دەی فەرموو: (الحمد لله حمداً كثيراً طيباً مباركاً فيه غير مكفي ولا مُودع ولا مستغنى عنه ربنا) وە لەریوایەتی تردا هاتووە کە (الحمد لله الذي كفاناً وارواناً غير مكفي ولا مكفور).

واتە: سوپاسی زۆر بۆ خوای پاك و پیرۆز نەکەس جێگای ئەو دەگرێتەوە وەنەکەسیش وازی لێ دەهێنرێ و نەئەو زاتەش پشت گوێ دەخرێ وەکەس نییە لەخوا بێ نیازبێ ئەو خودای ئێمەیە.

وه واتەی ریوایەتی دووەم: سوپاس و ستایش بۆ خودا کە هەرخۆی بەس بەشمان دەکاو هەرخۆی تێراومان دەکا نەکەس دەتوانێ جێگەی ئەو بگرێتەوە وەنەکەس رادەی دەکەوێ کە ناسوپاسی ئەو زاتە بکات.

## باب العقيقة

٥٩٣.عَنْ سَلْمَان بْنُ عَامِرِ الضَّبِّيُّ رَضيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (ﷺ) (يَقُولُ مَعَ الْغُلَامِ عَقِيقَةٌ فَأَهْرِيقُوا عَنْهُ دَمًا وَأَمِيطُوا عَنْهُ الْأَذَى).

## (بەشی/ هۆزەبانە-گوێژەبانە)

لە سەلمانی کوڕی عامیری زەبیی (رضـي الله عنـه) دەفـەرموێ گـوێم لـە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەیفەرموو: هۆزەبانە بـۆ کـوڕ دەکرێ، کەواتـە خوێنی بۆ برێژن ئاژەڵی بۆ سەربڕن پیس و پۆخڵ و ئازاری لێ دوورکەنەوە.

## باب ما أنْهَرَ الدّم

٥٩٤. قَالَ عَلَيهِ الصَّلاةُ والسَّلام: ((مَا أَنْهَرَ الدَّمَ وَذُكِرَ اسْمُ اللّٰهِ فَكُلْ لَيْسَ السِّنَّ وَالظُّفُرَ)).

## (بەشی/ خوێن رشتن و سەربڕین)

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەگەر ئاژەڵ سەر براو خوێنی لـێ رژاو نـاوی خوای لەسەرهات ئەوا بیخۆن تەنها ددان و نینۆك ناخورێ.

## باب ذبيحة المرأة والأمة

٥٩٥.عَنْ نَافِعٍ مَولى إبن عُمَر عَنْ رَجُلٍ مِنْ بَنِي سَلِمَةَ أَخْبَرَ عَبْدَ اللَّه أَنَّ جَارِيَةً لِكَعْبِ بْنِ مَالِكٍ تَرْعَى غَنَمًا لَهُ بِالْجُبَيْلِ الَّذِي بِالسُّوقِ وَهُوَ بِسَلْعٍ فَأُصِيبَتْ شَاةٌ فَكَسَرَتْ حَجَرًا فَذَبَحَتْهَا بِهِ فَذَكَرُوا لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَمَرَهُمْ بِأَكْلِهَا.

### (بەشی/ سەربڕینی ئاژەڵ لەلایەن ئافرەت و کەنیزەك)

لـەنافیعی نۆکـەری عەبـدوڵلای کـوڕی عومـەر لـەپیاوێ لەبـەنی سـەلەمە دەگێڕێتەوە کە عەبدوڵلا دەفەرمووێ کەنیزەیەکی کەعبی کوڕی مالیك هەندێ ئاژەڵی دەلەوەڕاند لەناوچەی جوبەیل لەنزیك بازاڕی سـەلع مـەڕێکیان پێکـا ئەویش بەردێکی کرد بەدوو لەتەوەو مەڕەکەی بەم دووبەردە سەربڕی، وە بۆ پێغەمبەریان گێڕایەوە ئەویش فەرمانی کرد بەخواردنی.

## باب ذبيحة الأعراب ونحوهم

٥٩٦. عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا أَنَّ قَوْمًا قَالُوا لِلنَّبِيِّ (ﷺ)إِنَّ قَوْمًا يَأْتُونَا بِاللَّحْمِ لَا نَدْرِي أَذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ أَمْ لَا فَقَالَ (ﷺ)سَمُّوا عَلَيْهِ أَنْتُمْ وَكُلُوهُ قَالَتْ عائشة: وَكَانُوا حَدِيثِي عَهْدٍ بِالْكُفْرِ.

### (بەشی/ سەربڕینی ئاژەڵ لەلایەن عەرەبی دەشتەکی و هاوشێوەیان)

عائیشە خان (رضي الله عنها) دەگێڕێتەوە کە چەند کەسێ بەپێغەمبەریان وت (ﷺ) کۆمەڵێ هاتوون بۆلامان و گۆشتێکیان هێناوە نـازانین ئایـا نـاوی خوای لێ هاتووە لەکاتی سەربڕینی یان نا، پێغەمبەری خوا فەرمووی: نـاوی خوای لـێ بێـنن و بیخـۆن، عائیـشە فـەرمووی ئـەم کۆمەڵـە تـازە موسـڵمان بوبوون.

## باب ما يكره من المثلة والمصبورة

٥٩٧. عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّهُ دَخَلَ عَلَى يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ وَغُلَامٌ مِنْ بَنِي يَحْيَى رَابِطٌ دَجَاجَةً يَرْمِيهَا فَمَشَى إِلَيْهَا ابْنُ عُمَرَ حَتَّى حَلَّهَا ثُمَّ أَقْبَلَ بِهَا وَالْغُلَامِ مَعَهُ فَقَالَ ازْجُرُوا غُلَامَكُمْ عَنْ أَنْ يَصْبِرَ هَذَا الطَّيْرَ لِلْقَتْلِ فَإِنِّي سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) نَهَى أَنْ تُصْبَرَ بَهِيمَةٌ أَوْ غَيْرُهَا لِلْقَتْلِ.

**(بەشی/ کەراهەتی دانانی گیانەوەر بۆ نیشانە تێگرتن)**

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنهما) چووەلای یەحیای کوڕی سەعیدو منداڵێکی بەنی یەحیا کە مریشکێکییان پەلبەست کردبوو بۆ نیشانە تێگرتن لەوکاتەدا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر پێیەکانی کردەوەو بەرەڵای کردو لەپاشان لەگەڵ منداڵەکان چوو بۆلای سەعیدی کوڕی یەحیاو پێی وت ئەم منالانە تەمبێ بکە باڵندە بەند دەکەن و بەردی تێدەگرن وە دەیکوژن چونکە گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) نەهی کردووە لەوەی باڵندە بەند بکرێت و شتی تێ بگرێ بۆ نیشانە وەیان بۆ کوشتنی.

## باب ما يؤكل من لحوم الأضاحي

٥٩٨. عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) مَنْ ضَحَّى مِنْكُمْ فَلَا يُصْبِحَنَّ بَعْدَ ثَالِثَةٍ فِي بَيْتِهِ مِنْهُ شَيْءٌ فَلَمَّا كَانَ الْعَامُ الْمُقْبِلُ قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ نَفْعَلُ كَمَا فَعَلْنَا فِي العام الْمَاضِي قَالَ (ﷺ) كُلُوا وَأَطْعِمُوا وَادَّخِرُوا فَإِنَّ ذَلِكَ الْعَامَ كَانَ بِالنَّاسِ جَهْدٌ فَأَرَدْتُ أَنْ تُعِينُوا فِيهَا.

## (بەشی/ چ دەخوریَ لەگۆشتی قوربانی)

سەلەمەی ئەکوەع دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: کەسێ قوربانی کرد لەئێوە بابیکا بەلاّم نابێ لەپاش سێ شەو گۆشتی ئەو قوربانییەی لەماڵەکەی بمێنێ، جا لەساڵی ئایندەدا وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئەم ساڵیش وەکو پارساڵیش بکەینەوە؟ فەرمووی نەخێر هەم خۆشتان لێی بخۆن و هەم بەشی خەڵکی تریشی لێ بدەن وە هەم هەڵی بگرن، بۆیە پار وامگوت چونکە ساڵی پار نەهات و گرانی بوو خەڵکی حاڵیان پەرێشان بوو ویستم ئێوە یاریدەی یەکتر بدەن.

## باب شرب الخمر

٥٩٩.عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ مَنْ شَرِبَ الْخَمْرَ فِي الدُّنْيَا ثُمَّ لَمْ يَتُبْ مِنْهَا حُرِمَهَا فِي الْآخِرَةِ.

## (بەشی/ خواردنەوەی عارەق (مەی))

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (رضي الله عنهما) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: کەسێ عارەق (مەی) بخواتەوە لەدونیادا لەپاشان تۆبەی لەسەر نەکات لەرۆژی دوایی خواردنەوەی پاکی لەسەر حەرام دەبێت.

## باب من يستحل الخمر

٦٠٠.عَنْ أَبِي عَامِرٍ أَوْ أَبِي مَالِكٍ الْأَشْعَرِيِّ أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: لَيَكُونَنَّ مِنْ أُمَّتِي أَقْوَامٌ يَسْتَحِلُّونَ الْحِرَ وَالْحَرِيرَ وَالْخَمْرَ وَالْمَعَازِفَ.

## (بەشی/ کەسێ مەی حەڵاڵ بکات)

لەئەبی عامیر یان ئەبی مالیکی ئەشعەری کە گوێی لەپێغەمبەر بوو (ﷺ) فـەرمووی: کۆمـەڵێ لەئۆمـەتی مـن پەیـدا دەبـن کـە داوێـن پیـسی و زینـاو بەکارهێنانی ئاوریشم و ئارەق و ئامێری مۆسیقا حەڵاڵ دەکەن.

## باب شرب اللبن،
## وبيان نهر النيل والفرات

٦٠١.عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِك رَضِي الله عَنْهُ قَال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ ((رُفِعْتُ إِلَى السِّدْرَةِ فَإِذَا أَرْبَعَةُ أَنْهَارٍ نَهَرَانِ ظَاهِرَانِ وَنَهَرَانِ بَاطِنَانِ، فَأَمَّا الظَّاهِرَانِ فالنِّيلُ وَالْفُرَاتُ وَأَمَّا الْبَاطِنَانِ فَنَهَرَانِ فِي الْجَنَّةِ فَأُتِيتُ بِثَلَاثَةِ أَقْدَاحٍ قَدَحٌ فِيهِ لَبَنٌ وَقَدَحٌ فِيهِ عَسَلٌ وقَدَحٌ فِيهِ خَمْرٌ فَأَخَذْتُ الَّذِي فِيهِ اللَّبَنُ فَشَرِبْتُ فَقِيلَ لِي أَصَبْتَ الْفِطْرَةَ أَنْتَ وَأُمَّتُكَ.

## (بەشی/ خواردنەوەی شیر و
## باسکردنـی رووباری نیل و فورات)

ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: بەرزکرامەوە بۆ سیدرة ئەلمونتەها) لەشەوی میعراجا چوار رووبارم دیت کە دوانیان سەرچاوەی دیارن و دوانی تریان سەرچاوەی دیارنەبوون، وە ئەو دوو رووبارانەی کە سەرچاوەی دیاربوون کە روباری نیل و فوراتە وە دوو رووبارەکەی کە سەرچاوەیان بـزرن و دیـارنین لەبەهەشـتدا وەسـێ پـەرداخ خواردنەوەیان بۆ هێناوم کە شـیرو هـەنگوین و مـەی، بـوون وە شـیرەکەیانم هەڵبژارد و خواردمەوە و پێم وترا تۆو ئوممەتەکەت فیترەتتان هەڵبژارد.

## باب الشرب قائما

٦٠٢. عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ مَيْسَرَةَ عَنْ النَّزَّالِ قَالَ أَتَى عَلِيٌّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فَشَرِبَ قَائِمًا فَقَالَ إِنَّ نَاسًا يَكْرَهُ أَحَدُهُمْ أَنْ يَشْرَبَ وَهُوَ قَائِمٌ وَإِنِّي رَأَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ)فَعَلَ كَمَا رَأَيْتُمُونِي فَعَلْتُ.

## (بەشی/ خواردنەوەی بەپێوە)

عەبدولمەلیکی کوڕی مەیسەرە لەنەزال کە دەفەرمووێ ئاویان بۆ عەلی هێنا ئەویش بەراوەستاوی ئاوەکەی خواردەوە فەرمووی هەندێك کەس حەزناکەن بەراوەستاوی ئاوبخۆنەوە بەڵام من بەچاوی خۆم پێغەمبەری خوام بینیوە وەکو من بەپیچوە ئاوی خواردەوە.

## باب التَنَفُس في الإناء

٦٠٣. عَنْ أَبِي قَتَادَةَ بن الحارث رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِذَا شَرِبَ أَحَدُكُمْ فَلَا يَتَنَفَّسْ فِي الْإِنَاءِ وَإِذَا بَالَ أَحَدُكُمْ فَلَا يَمْسَحْ ذَكَرَهُ بِيَمِينِهِ وَإِذَا تَمَسَّحَ أَحَدُكُمْ فَلَا يَتَمَسَّحْ بِيَمِينِهِ.

## (بەشی/ هەناسەدان لەناو قاپی ئاوخواردنەوە)

ئەبی قەتادەی کوڕی حاریث دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەگەر یەکێکتان خواردنەوەی خواردەوە با هەناسەی تێ نەخات وەئەگەر یەکێکتان میزی کردو تارەتی کرد با چۆکی خۆی بەدەستی راستی نەگرێت وە ئەگەر تارەتی کرد بابەدەستی راستی تارەت نەکات.

## باب آنية الفضة

٦٠٤.عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ الَّذِي يَشْرَبُ فِي إِنَاءِ الْفِضَّةِ إِنَّمَا يُجَرْجِرُ فِي بَطْنِهِ نَارَ جَهَنَّمَ.

**(بەشی/ قاپ و ئامانی زیوو)**

**لە ئوم سەلەمەی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەوکەسەی لەقاپی زیوو شت دەخواتەوە ئەوا لە دۆزەخدا ئاگری سورکراوەی دەخرێتە ناوسکی بەقلپەقلپ.**

## باب شرب البركة

٦٠٥.عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: قَدْ رَأَيْتُنِي مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) وَقَدْ حَضَرَتْ الْعَصْرُ وَلَيْسَ مَعَنَا مَاءٌ غَيْرَ فَضْلَةٍ فَجُعِلَ فِي إِنَاءٍ فَأُتِيَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِهِ فَأَدْخَلَ يَدَهُ فِيهِ وَفَرَّجَ أَصَابِعَهُ ثُمَّ قَالَ حَيَّ عَلَى أَهْلِ الْوُضُوءِ الْبَرَكَةُ مِنْ اللَّهِ فَلَقَدْ رَأَيْتُ الْمَاءَ يَتَفَجَّرُ مِنْ بَيْنِ أَصَابِعِهِ فَتَوَضَّأَ النَّاسُ وَشَرِبُوا فَجَعَلْتُ لَا آلُوا مَا جَعَلْتُ فِي بَطْنِي مِنْهُ فَعَلِمْتُ أَنَّهُ بَرَكَةٌ قال سالم بن الجعد قُلْتُ لِجَابِرٍ كَمْ كُنْتُمْ يَوْمَئِذٍ قَالَ أَلْفًا وَأَرْبَعَ مِائَةٍ.

**(بەشی/ بەرەکەتی خواردنەوە)**

**جابیری کوڕی عەبدوڵلا دەفەرمووی لەگەڵ پێغەمبەری خوا بووین (ﷺ) لەسەفەرێکدا کاتی نوێژی عەسر هاتە بەرەوەە ئاومان چەنگ نەکەوت تەنها کەمێك نەبێت کەلە ناو قاپێکدابوو ئەویشیان بۆلای هێناو پەنجەکانی پیرۆزی خستە ناوی و پەنجەکانی لێك جیاکردنەوەو فەرمووی: ئەوکەسەی دەست نوێژی نیە بابێت دەست نوێژ بشوات بەچاوی خۆم بینیم ئاو لەنێوان پەنجکانی پێغەمبەردا هەڵدەقوڵاو خەڵکەکە هەمووی دەستنوێژیان شۆرد وە**

لێیـان خـواردەوەو وەمنـیش ئەوەنـدەم لـێ خـواردەوە تـا تێـر ئـاوبووم لەبەرەکەتی ئەوئاوە وە زانیم کە بەرەکەتێکە خـوا بـۆی نـاردووین، ئینجا سالمی کوڕی ئەبی جەعد فەرمووی وتم بـەجابیر ئێـوە لـەورۆژەدا ژمارەتـان چەند بوو فەرمووی هەزارو چوارسەد کەس بووین.

## باب كفارة المرض

٦٠٦. عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا زَوْجَ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((مَا مِنْ مُصِيبَةٍ تُصِيبُ الْمُسْلِمَ إِلَّا كَفَّرَ اللَّهُ بِهَا عَنْهُ حَتَّى الشَّوْكَةِ يُشَاكُهَا)).

## (بەشی/ کەفارەتی نەخۆش)

عائیشە خانی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرمووی: هەر بەلایێ یان شەکەتیێ بەرەو موسڵمانان بێت و ئەوا دەبێتە کەفارەت و سڕینەوەی گوناهەکان هەتا ئەگەر دڕکێك بوو کە بەپێی هەڵچەقیێ.

٦٠٧. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي الله عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ)قَال: ((مَا يُصِيبُ الْمُسْلِمَ مِنْ نَصَبٍ وَلَا وَصَبٍ وَلَا هَمّ وَلَا حُزْنٍ وَلَا أذَى وَلَا غَمّ حَتَّى الشَّوْكَةِ يُشَاكُهَا إِلَّا كَفَّرَ اللَّهُ بِهَا مِنْ خَطَايَاهُ))

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: هەر بەلایێ و یان نەخۆشییەك یان خەم و خەفەت یان ئێش و ئازارێك كە تووشی موسڵمان دەبێ خودا دەیانکات بە کەفارەتی گوناهەکانی ئەو موسڵمانە هەتا ئەگەر دڕکێك پیادا بچێتە لەشیەوە.

٦٠٨. عَنْ كَعْب بن مالك عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((مَثَلُ الْمُؤْمِنِ كَالْخَامَةِ مِنْ الزَّرْعِ تُفَيِّئُهَا الرِّيحُ مَرَّةً وَتَعْدِلُهَا مَرَّةً وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ كَالْأَرْزَةِ لَا تَزَالُ حَتَّى يَكُونَ انْجِعَافُهَا مَرَّةً وَاحِدَةً))

کەعبی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) کەدەفەرمووێ: نمونەی ئیماندار وەکو قەرسیلی سەوز و نەرم و نۆڵ وایە هەروەك چۆن بەدەم باوە هەڵدەکاو دەجوڵێتەوە بەولاو ئەولادا بەڵام ناتوانێ هەڵیکەنێ لەزەویدا.

وە موسڵمانیش ئەوها دەردو بەڵا ئەولاو ئەولای پێ دەکات بەڵام خۆگرەو سەرکەوتوو دەبێ وەنمونەی مونافیق و دوو ڕوو وەکو داری گاژ وایە قەدی و بنی ڕاست دەوەستێ بەڵام ئەگەر بایەکی بەهێز لێیدا یەکسەر لەرەگ و ریشەوە دەردێت و تەفرو تونا دەبێت.

٦٠٩. وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)مَنْ يُرِدْ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُصِبْ مِنْهُ

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: کەسێ خوا خواستی خێری هەبێ پێی تووشی ئێش و ئازارو دەردی دەکات.

٦١٠.وَعَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مَسعُود رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قال: أَتَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ)فِي مَرَضِهِ وَهُوَ يُوعَكُ وَعْكًا شَدِيدًا، وَقُلْتُ: إِنَّكَ لَتُوعَكُ وَعْكًا، قُلْتُ إِنَّ ذَاكَ بِأَنَّ لَكَ أَجْرَيْنِ، قَالَ صلى الله عليه وآلِه وسلم: ((أَجَلْ مَا مِنْ مُسْلِمٍ يُصِيبُهُ أَذًى إِلَّا حَاتَّ اللَّهُ عَنْهُ خَطَايَاهُ كَمَا تَحَاتُّ وَرَقُ الشَّجَرِ.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (رضي الله عنه) دەفەرمووێ هاتم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەنەخۆشی دابوو تایەکی گرانی لێ هاتبوو، پێم وت ئەی پێغەمبەری خوا تایەکی گران و سەختت لێیە؟ فەرمووی: بەڵێ وایە من کە تا دەگرم بەقەد دووکەس لەئێوە تا دەمگرێ، وە وتم دیارە لەبەر ئەوەیە

کەتۆ دووقات پاداشت وەردەگری لەلای خوا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بەڵێ وەهەر موسڵمانێ هەر ئێش و ئازارێکی بێتە رێ خوای گەورە بەهۆی ئەوەوە گوناهەکانی هەڵدەوەرێنێ هەروەك گەڵای درەخت چۆن هەڵدەوەرێ ئەوها پاك دەبێتەوە لە گوناهەکان.

## باب فضل من ذهب بَصَرهُ

٦١١.عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ إِنَّ اللَّهَ تعالى قَالَ إِذَا ابْتَلَيْتُ عَبْدِي بِحَبِيبَتَيْهِ فَصَبَرَ عَوَّضْتُهُ مِنْهُمَا الْجَنَّةَ.

### (بەشی/ فەزڵی کەسێ چاوەکانی لەدەست بدات)

ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەفەرمووێ گوێم لەپێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) فەرمووی: خوای گەورە دەفەرمووێ: (ئەگەر بەندەکەی خۆم تاقی کردەوەو بە لەدەستدانی هەردوو خۆشەویستی یەکانی (کە چاوەکانیەتی) ئەویش سەبرو ئارامی و رازی بوونی لەسەر دەربڕی وە منیش لەباتی ئەو بۆی دەبژێرمەوە بەبەهەشت).

## باب عيادة المريض

٦١٢. عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ ابْنَةً لِلنَّبِيِّ (ﷺ)أَرْسَلَتْ إِلَيْهِ وَهُوَ مَعَ رَسُولَ الله (ﷺ)وَسَعْدٌ وَأُبَيٌّ نَحْسِبُ أَنَّ ابْنَتِي قَدْ حُضِرَتْ فَاشْهَدْنَا فَأَرْسَلَ إِلَيْهَا السَّلَامَ وَيَقُولُ إِنَّ لِلَّهِ مَا أَخَذَ وَمَا أَعْطَى وَكُلُّ شَيْءٍ عِنْدَهُ مُسَمًّى فَلْتَحْتَسِبْ وَلْتَصْبِرْ فَأَرْسَلَتْ تُقْسِمُ عَلَيْهِ فَقَامَ رَسُولَ الله (ﷺ)وَقُمْنَا فَرُفِعَ الصَّبِيُّ فِي حَجْرِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَنَفْسُهُ تَقَعْقَعُ فَفَاضَتْ

عَيْنَا النَّبِي (ﷺ)فَقَالَ سَعْدٌ مَا هَذَا يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ هَذِهِ رَحْمَةٌ وَضَعَهَا اللَّهُ؟ فِي قُلُوبِ مَنْ شَاءَ مِنْ عِبَادِهِ وَلَا يَرْحَمُ اللَّهُ مِنْ عِبَادِهِ إِلَّا الرُّحَمَاءَ.

## (بەشی/ سەردانی منالّ لەکاتی نەخۆشیدا)

ئوسامەی کوڕی زەید (رضي الله عنـه) دەگێڕێتـەوە کـە کـچی پێغەمبـەر (ﷺ) ئەوی نارد بەدوای باوکیـا کـەوا کـچەکەم خـەریکی گیانـە گیانەلایـەو دەمـرێ کـە تەشـریفی بـێ بـۆ لامـان کـە سـەعدو ئوبـەی لەگـەڵی دابـوون پێغەمبەریش لەبەرامبەردا سلاوی بۆ نارد و فەرمووی ئەوەی خودا بەبەندەی دەبەخشێ وەئەوەی دەیباتەوە هەرهی خۆیەتی وەهـەموو شـتێکیش لـەلای خودا ماوەیەکی دیاریکراوی هەیەو بـا سـەبرو ئـارام بگـرێ و داوای پاداشـت لەخوا بکات، بەلام دیسان کچەکەی ناردیـەوە بەشـوێنیدا و سـوێندی خـوارد کـەدەبێ تەشـریفی بهـێنێ بـۆلای پێغەمبـەریش (ﷺ) هەڵـساو وەئێمـەش هەڵساین و کە منالّەکەیان هێنا بۆلای پێغەمبەر لەباوەشی گرت و منالّەکـە گیانی دەدا هەناسەی سواربوبوو جا فرمێـسك بەچـاوەکانی پێغەمبـەر هاتـە خوارەوە، سەعدی کوڕی عوبادە وتی ئەی پێغەمبەری خوا ئەم گریانە چییە؟ فەرمووی ئەمە سۆزو رەحمەتە خودا دەیخاتە دڵی بەندەکانی خۆیەوە کەخوا حەزی لێ بێت وە خوای گەورەش تەنیا رەحم بەوانە دەکـات کـە بـەرەحم و بەزەیین و میهرەبانن.

## باب تمني المريض الموتْ ودعائه

٦١٣. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) لَا يَتَمَنَّيَنَّ أَحَدُكُمْ الْمَوْتَ مِنْ ضُرٍّ أَصَابَهُ فَإِنْ كَانَ لَا بُدَّ فَاعِلًا فَلْيَقُلْ اللَّهُمَّ أَحْيِنِي مَا كَانَتْ الْحَيَاةُ خَيْرًا لِي.

## (بەشی/ خۆزگە خواستنی نەخۆش لەمردن لەمرن و دوعاکردن بۆی)

ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: با کەستان تەمەنناو خۆزگە نەخوازێ بەمردن بەهۆی ئەو دەردە سەری و نەخۆشییەی کە تووشی هاتووە، ئەگەر هەرچارەی نەما بابڵێ خوایەگیان بمژێنە ئەگەر ژیانم چاکترە بۆم.

٦١٤.عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ لَنْ يُدْخِلَ أَحَدًا عَمَلُهُ الْجَنَّةَ قَالُوا وَلَا أَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ(ﷺ) لَا وَلَا أَنَا إِلَّا أَنْ يَتَغَمَّدَنِي اللَّهُ بِفَضْلٍ وَرَحْمَةٍ فَسَدِّدُوا وَقَارِبُوا وَلَا يَتَمَنَّيَنَّ أَحَدُكُمْ الْمَوْتَ إِمَّا مُحْسِنًا فَلَعَلَّهُ أَنْ يَزْدَادَ خَيْرًا وَإِمَّا مُسِيئًا فَلَعَلَّهُ أَنْ يَسْتَعْتِبَ.

ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ گوێم لە پێغەمبەری خوا بـوو (ﷺ) دەیفەرموو: (کەستان بەکردەوەی چاکەی خۆی ناچـێتە بەهەشـتەوە وتیان تۆش ئەی نێرراوی خوا؟ فەرمووی: نەخێر منیش مەگەر بەڕەحمەت و فەزڵی خوانەبێت، جا کەواتە هەر لەئێستاوە ملی ڕێگای ڕاست بگرن و درێغی مەکەن و مزگێنی وەرگرن وە باکەستان مردن بەئاوات نەخوازێ ئەگەر ئەوەی چاکە باشتر ببێ وە ئەوەی گوناهبارە سا بەڵکو خوای گەورە مۆڵەتی بدات و تەوبە بکات و پەشیمان ببێتەوە.

٦١٥.عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ إِذَا أَتَى مَرِيضًا أَوْ أُتِيَ بِهِ قَالَ: ((أَذْهِبْ الْبَاسَ رَبَّ النَّاسِ اشْفِ وَأَنْتَ الشَّافِي لَا شِفَاءَ إِلَّا شِفَاؤُكَ شِفَاءً لَا يُغَادِرُ سَقَمًا)).

عائیشەخان (رضي الله عنها) دەگێڕێتەوە کەپێغەمبەری خوا (ﷺ) نەخۆشێکیان هێنابا لای یان بچوایە لای نەخۆش دەیفەرموو: (اذهب البأس رب الناس اشف انت الشافي لاشفاء الا شفاؤك شفاءً لايقادر سقماً).

واتە: ئەی پەروەردگاری هەموو خەڵکی ئەی لابەری ئێش ئازار شیفادەری خۆش و پاکی بکەرەوە شیفا بەخشی بەڕاستی هەرخۆت بێجگە لەتۆ شیفا دەر نییە شیفا یەکی تەواوی وا کە هیچ دەردێ ناهێڵێ.

## باب أنزل الله للداءِ الشفاء

٦١٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ رَسُول الله (ﷺ) قَالَ ((مَا أَنْزَلَ اللَّهُ دَاءً إِلَّا أَنْزَلَ لَهُ شِفَاءً)).

## (بەشی/ ناردنی دەرمان لەلایەن خواوە بۆ چاك بوونەوە)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) دەفەرمووێ: خودا هەر دەردێکی ناردبێ چارەسەریشی بۆ ناردووە.

٦١٧. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ الله تعالى عَنْهُما عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ : (الشِّفَاءُ فِي ثَلَاثَةٍ فِي شَرْطَةِ مِحْجَمٍ أَوْ شَرْبَةِ عَسَلٍ أَوْ كَيَّةٍ بِنَارٍ، وَأَنْهَى أُمَّتِي عَنْ الْكَيِّ).

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە دەفەرمووێ: شیفا و چاك بوونەوە لەسێ شتان دایە کەئەوانیش کەلەشاخ

گرتن و وه لەشەربەت خواردنەوەی هەنگوین و وه لەداخ کردن بەئاگر وەمن نەهیم کرد لە ئوممەتم بەداخکردن بەئاگر.

٦١٨. عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا أَنَّهَا كَانَتْ تَأْمُرُ بِالتَّلْبِينِ لِلْمَرِيضِ وَلِلْمَحْزُونِ عَلَى الْهَالِكِ، وَتَقول: هوَ البَغيضُ النَّافعُ والَّذي نفسُ مُحَمَّدٍ بيَدِه إنَّها لتَغْسلُ باطن أحَدكم كَمَا يغسلُ أحدكم عن وجه بالماء، وَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: ((إِنَّ التَّلْبِينَةَ تُجِمُّ فُؤَادَ الْمَرِيضِ وَتَذْهَبُ بَعْض الْحُزْنِ)).

عائیشە (رضي الله عنها) فەرمانی دەکرد کە مەحەللەبی بدەن بەنەخۆش بەخەمباریێ کەکەسێکی دەمریێ وە دەیگوت نەخۆش پێی ناخۆشە بەلام بەسوودە بۆی وە فەرمووی سوێندم بەوەی گیانی موحەممەدی بەدەستە ئەمە ناوسکی هەریەکێکتان پاك دەشوات و هەروەکو یەکێکتان دەموچاوی خۆی بەئاو بشوات وایە، وەمن گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەیفەرمووی: پەلۆلە بەری دڵی نەخۆش دەگریێ و ناوسکی دەحەوێنێتەوە و خەم و خەفەتیش هەندیێ سووك دەكات.

## باب الحمى والطّاعون والعين والرّقية

٦١٩. عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ ((الْحُمَّى مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ فَأَطْفِئُوهَا بِالْمَاءِ)).

## (بەشی/ تاو تاعون و چاوپیسی و نوشتەکردن)

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (رضي الله عنهما) لەپێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە دەفەرمووێ: (تا لەبڵێسەی ئاگری دۆزەخە دەی بیکوژێننەوە بەئاو).

٦٢٠. عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) قَالَ إِذَا سَمِعْتُمْ بِالطَّاعُونِ بِأَرْضٍ فَلَا تَدْخُلُوهَا وَإِذَا وَقَعَ بِأَرْضٍ وَأَنْتُمْ بِهَا فَلَا تَخْرُجُوا مِنْهَا.

ئوسامەی کوڕی زەید (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە دەفەرمووێ: ئەگەر گوێتان لە بڵاوبوونەوەی نەخۆشی تاعون بوو لەشارێکدا ئەوا بۆی مەچن {نەبادا تووشی بن} وە ئەگەر لەشاری ئێوەش بڵاوبۆوە لێی دەرمەچن {نەبادا خەڵکی تر تووشی بێت}.

٦٢١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ رَسولِ اللهِ (ﷺ) قَالَ: ((الْعَيْنُ حَقٌّ، وَنَهَى عَنْ الْوَشْمِ)).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە دەفەرمووێ: چاووزارو چاوپیسی راستە و هەیە، وەنەهی کردووە کوتانی دەموچاو.

٦٢٢. عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها قَالَتْ: كَانَ رَسولُ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ فِي الرُّقْيَةِ للمريض: ((بِاسمِ اللهِ تُرْبَةُ أَرْضِنَا وَرِيقَةُ بَعْضِنَا، يُشْفَى سَقِيمُنَا بِإِذْنِ رَبِّنَا)).

عائیشە (رضي الله عنها) دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) عادەتی وابوو ئەگەر دوعای بۆ نەخۆشێك بکردبایە دەیفەرموو: (بسم الله تربة ارضنا وريقة بعضنا يشفى سقيمنا باذن ربنا).

واتە: بەناوی خوا ئەم خاکی زەوی خۆمانە و لەگەڵ تەڕایی دەمی موسڵمانی خۆمانە بەفەرمانی پەروەردگارمان دەبێ بەچارەسەری بۆ نەخۆشمان).

٦٢٣. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدريِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّ رَهْطًا مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) انْطَلَقُوا فِي سَفْرَةٍ سَافَرُوهَا حَتَّى نَزَلُوا بِحَيٍّ مِنْ أَحْيَاءِ الْعَرَبِ

فَاسْتَضَافُوهُمْ فَأَبَوْا أَنْ يُضَيِّفُوهُمْ فَلُدِغَ سَيِّدُ ذَلِكَ الْحَيِّ فَسَعَوْا لَهُ بِكُلِّ شَيْءٍ لَا يَنْفَعُهُ شَيْءٌ فَقَالَ بَعْضُهُمْ لَوْ أَتَيْتُمْ هَؤُلَاءِ الرَّهْطَ الَّذِينَ قَدْ نَزَلُوا بِكُمْ لَعَلَّهُ أَنْ يَكُونَ عِنْدَ بَعْضِهِمْ شَيْءٌ فَأَتَوْهُمْ فَقَالُوا يَا أَيُّهَا الرَّهْطُ إِنَّ سَيِّدَنَا لُدِغَ فَسَعَيْنَا لَهُ بِكُلِّ شَيْءٍ لَا يَنْفَعُهُ شَيْءٌ فَهَلْ عِنْدَ أَحَدٍ مِنْكُمْ شَيْءٌ فَقَالَ بَعْضُهُمْ نَعَمْ وَاللَّهِ إِنِّي لَرَاقٍ وَلَكِنْ وَاللَّهِ لَقَدْ اسْتَضَفْنَاكُمْ فَلَمْ تُضَيِّفُونَا فَمَا أَنَا بِرَاقٍ لَكُمْ حَتَّى تَجْعَلُوا لَنَا جُعْلًا فَصَالَحُوهُمْ عَلَى قَطِيعٍ مِنْ الْغَنَمِ فَانْطَلَقَ فَجَعَلَ يَتْفُلُ وَيَقْرَأُ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ حَتَّى لَكَأَنَّمَا نُشِطَ مِنْ عِقَالٍ فَانْطَلَقَ يَمْشِي مَا بِهِ قَلَبَةٌ قَالَ فَأَوْفَوْهُمْ جُعْلَهُمْ الَّذِي صَالَحُوهُمْ عَلَيْهِ فَقَالَ بَعْضُهُمْ اقْسِمُوا فَقَالَ الَّذِي رَقَى لَا تَفْعَلُوا حَتَّى نَأْتِيَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَنَذْكُرَ لَهُ الَّذِي كَانَ فَنَنْظُرَ مَا يَأْمُرُنَا فَقَدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَذَكَرُوا لَهُ فَقَالَ وَمَا يُدْرِيكَ أَنَّهَا رُقْيَةٌ أَصَبْتُمْ اقْسِمُوا وَاضْرِبُوا لِي مَعَكُمْ بِسَهْمٍ.

ئەبو سەعید (ﷺ) دەفەرمووێ: كۆمەڵێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆیشتن بۆ گەشتێك، لەئاوایی یەك لە ئاوابییەكانی عەرەب دابەزین و داوایان لێ كردن میوانداریمان لێ بكەن، ئەوانیش ملیان نەداو میوانداریان لێ نەكردن، لەوكاتەدا گەورەكەیان مارێك (یان شتێكی تر) پێوەیدا، هەرچی هەوڵێكیان لەگەڵدا سوودی نەبوو چاك نەبوەوە، وتییان: بچن بۆلای ئەوانە لەوێدا دابەزیون بەڵكو شتێكییان لابێت، هاتن بۆلایان و وتیان: جەماعەت ئێمە گەورەكەمان مار پێوەی داوە، هەموو شتێكمان لەگەڵدا بەكارهێنا سوودی بۆی نەبوو ئایا كەس لەئێوە شتێكی لا نییە؟ یەكێكییان وتی بەڕێ وەڵا من نوشتە دەكەم، سوێند بەخوا ئێمە داوامان لێ كردن میوانداریمان لێ بكەن ئێوە میوانداریتان لێ نەكردین، منیش نوشتەتان بۆ ناكەم تا بڕیار

ئەدەن شتێکمان بدەنێ سەرەنجام لەسەر چەند سەر مەڕێك ڕێکەوتن، دەست بەجێ ئەو هاوەڵە چوو دەستی کرد بە خوێندنی سووڕەتی (الحمد لله رب العالمین) و فوی کرد بەسەریا، کابرا وەك بڵێی بەند بێ و دەست و پێی بکەنەوە هەستاو دەستی کردە ڕۆیشتن.

پێی وتن لەسەر چی ڕێ کەوتوون بیان دەنێ، پاشان وتیان دابەشی بکەن، ئەوەی نوشتەکەی کردبوو فەرمووی: دەست کاری مەکەن تا دەچینە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) و ئەوەی ڕووی داوە بۆی دەگێڕینەوە بزانین چیمان پێ دەڵێت؟ هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و بۆیان باس کرد، فەرمووی: (جا تۆ چوزانیت سوڕەتی فاتیحە نوشتەیە؟) پاشان فەرمووی: (ئیشێکی چاکتان کردووە دابەشی بکەن و بەشێکیش بۆ من دابنێن لەگەڵ خۆتاندا) پاشان پێغەمبەر دەستی کرد بەپێکەنین.

## باب الكهانة والعدوى وشرب السم

٦٢٤. عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) نَاسٌ عَنْ الْكُهَّانِ فَقَالَ عليهِ الصلاة والسلام لَيْسَ بِشَيْءٍ فَقَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهُمْ يُحَدِّثُونَا أَحْيَانًا بِشَيْءٍ فَيَكُونُ حَقًّا فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) تِلْكَ الْكَلِمَةُ مِنْ الْحَقِّ يَحفظهَا مِنْ الْجِنِّيِّ فَيَقُرُّهَا فِي أُذُنِ وَلِيِّهِ فَيَخْلِطُونَ مَعَهَا مِائَةَ كَذْبَةٍ.

## (بەشی/ فاڵچی و تەنینەوە خواردنەوەی ژەهر)

عائیشە خان (رضي الله عنها) دەفەرمووێ خەڵکانێ پرسیاریان لەپێغەمبەری خوا کرد (ﷺ) دەربارەی فاڵچی و ئەوانەی بانگەوازی زانینی شتی پەنهانی دەکەن فەرمووی وتەی وان هیچی لەسەر ڕاستی نییە، ئەوانیش وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئەوانە باسی شتێ دەکەن و دوایی ڕاست

دەردەچێت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ئەوانە چەند وشەیەکن لەراستی کاهینەکان وەری دەگرن لەجنۆکەو کە دەخەنە گوێی فاڵچی و کاهینەکان ئەوانیش لەگەڵ سەد درۆ تێکەڵی دەکەن.

٦٢٥. عَنْ أبي هُرَيْرَةَ رَضيَ اللهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ لَا تُورِدُوا الْمُمْرِضَ عَلَى الْمُصِحِّ.

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: نەخۆشەکان با لەساغەکان جیابکرێنەوە نەبادا ساغەکانیش نەخۆش بکەون و بیگرنەوە.

٦٢٦. وَعَنْهُ أيضاً عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((مَنْ تَرَدَّى مِنْ جَبَلٍ فَقَتَلَ نَفْسَهُ فَهُوَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ يَتَرَدَّى فِيهِا خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أبَدًا، وَمَنْ تَحَسَّى سُمًّا فَقَتَلَ نَفْسَهُ فَسُمُّهُ فِي يَدِهِ يَتَحَسَّاهُ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أبَدًا، وَمَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِحَدِيدَةٍ فَحَدِيدَتُهُ فِي يَدِهِ يَجَأُ بِهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أبَدًا.

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە دەفەرمووێ: کەسێ لەسەر شاخێکەوە خۆی فڕێداتە خوارەوە خۆی بکوژێ ئەوا لەناو ئاگری دۆزەخیش فڕێدەدرێتە خوارەوە هەتاهەتایی بەئێجگاری تیایدا دەمێنێتەوە، وەکەسێ ژەهر بخوات و خۆی پێ بکوژێ ئەوا لەرۆژی دوایی ژەهرەکەی بەدەستەو دەیخوات و لەناو ئاگری دۆزەخ دایە هەتاهەتایی بەئێجگاری دەمێنێتەوە وەکەسێ خۆی بەپارچە ئاسنێ یان چەقۆیێ بکوژێ ئەوا چەقۆیەکەی یان ئاسنەکەی لەگەڵیدایەو خۆی پێ پارچە دەکات و بۆ هەتاهەتایی لەئاگری دۆزەخ دایە.

## باب اللباس والازار والخيلاء

٦٢٧. قالَ اللَّه تَعالَى: ﴿ قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِىٓ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِۦ ﴾ وَقَالَ رَسُول اللهِ (ﷺ) كُلُوا وَاشْرَبُوا وَتَصَدَّقُوا فِي غَيْرِ إِسْرَافٍ وَلَا مَخِيلَةٍ وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ كُلْ مَا شِئْتَ وَالْبَسْ مَا شِئْتَ مَا أَخْطَأَتْكَ اثْنَتَانِ سَرَفٌ أَوْ مَخِيلَةٌ.

## (بەشی/ جل و بەرگ و جی و پۆشاك خشاندن بەزەویدا)

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِىٓ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِۦ ﴾ واتە: پێیان بڵێ کێ حەرامی کردوە بۆتان لەجوانی و پۆشاکێ کە خوا بۆی رەخساندوون وە لەزەوی بۆی دەرهێناون بۆ بەندەکانی.

وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بخۆن و بخۆنەوەو خێرو صەدەقەی پێ بکەن جگە لە زیادەڕۆیی و بێ فیزی و دعیەیی، چۆنێ پێت خۆشە بیخۆو لەبەریکە مادام دروستەو حەلاڵە بەلام دووشت تیدا حەرامن ئەوانیش زیادەڕۆیی و فیزو دەعیەبە جل و پۆشاك کردن.

٦٢٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ عَلَيهِ الصَّلاةُ وَالسَّلام قَال: ((مَا أَسْفَلَ مِنْ الْكَعْبَيْنِ مِنْ الْإِزَارِ فَفِي النَّارِ))

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە دەفەرمووێ: هەر جلو بەرگێ لەخوار گۆزینگ بێ و بۆ دەعیە و فیزە وە بخشێ بەزەویدا ئەوە بۆ ئاگری دۆزەخە.

٦٢٩. وَعَنْهُ أَيضاً رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَال: قالَ النَّبِيُّ (ﷺ) أَوْ قَالَ أَبُو الْقَاسِمِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ((بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي فِي حُلَّةٍ تُعْجِبُهُ نَفْسُهُ مُرَجِّلٌ جُمَّتَهُ إِذْ خَسَفَ اللَّهُ بِهِ فَهُوَ يَتَجَلْجَلُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ)).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) فەرمووی پێغەمبەر (ﷺ) فـەرمووی یـان ئەبولقاسم فەرمووی پیاوێ جلوبەرگی ئەوەندە درێژبوو بەزەویدا دەیخشاند بۆ دەعیەو فیزەوەو خۆ بەگەورە زانین قژی کۆکردبۆوە سەرسەری لەوکاتەدا خـوا تۆڵـەی لـێ سـەندەوە بـەناخی زەویـدا بـردی وە هـەتا ئێـستاش لەجوڵانەوەیدا لەرۆیشتن بۆناخی زەوی تاکو رۆژی قیامەت.

٦٣٠. عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها قَالَتْ: اسْتَيْقَظَ رَسُول الله (ﷺ) مِنْ اللَّيْلِ وَهُوَ يَقُولُ: ((لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، مَاذَا أُنزِلَ اللَّيْلَةَ مِنْ الْفِتْنَةِ، مَاذَا أُنْزِلَ مِنْ الْخَزَائِنِ؟ مَنْ يُوقِظُ صَوَاحِبَ الْحُجُرَاتِ كَمْ مِنْ كَاسِيَةٍ فِي الدُّنْيَا عَارِيَةٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)).

قال اللهُ تعالى: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيۡنَ أُمَتِّعۡكُنَّ وَأُسَرِّحۡكُنَّ سَرَاحٗا جَمِيلٗا ﴿٢٨﴾ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلۡمُحۡسِنَٰتِ مِنكُنَّ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴾

ئوم سەلەمە (رضي الله عنها) دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) شـەوێ لەخەو هەڵساو دەیفەرموو: (لا اله الا الله هیچ خوایەك نییە جگە لە الله نەبێت ئەم شەو چـەندان لـە فیتنـە دابـەزی بـۆزەوی و چـەندان لـە خەزینـەی خـوا دابەزین، کێ هەیە بچێ ئافرەتانی خۆم بەئاگا بهێنێ وە زۆر کەسێ لە دونیا پۆشتەو بەجلوبەرگن بەڵام لە دوارۆژو قیامەتدا بێ بەرگن و رووتن.

خـوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيۡنَ أُمَتِّعۡكُنَّ وَأُسَرِّحۡكُنَّ سَرَاحٗا جَمِيلٗا ﴿٢٨﴾ وَإِن كُنتُنَّ

﴿تُرِدْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلْـَٔاخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَـٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ احزاب ٢٨-٢٩

واته: ئەی پێغەمبەر بەهاوسەرانت بڵێ ئەگەر ئێوە تەنها ژیانی دنیاو رازاوەییەکانتان دەوێت وەرن با هەندێك شتوومەك و پارەو سامانتان پێ ببەخشم لەوەودواش بەجوانترین شێوە دەست بەردارتان دەبم، خۆ ئەگەر ئێوە خواو پێغەمبەرەکەی و پاداشتی رۆژی قیامەتتان دەوێت ئەوە دڵنیابن کەخوا بۆچاکە کارانتان پاداشتی زۆر گەورەیەو بێ ئەندازەی ئامادە کردووە (تەفسیری ئاسان-ل٤٢١).

## باب الجلوس على الحصير

٦٣١. عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ يَحْتَجِرُ حَصِيرًا بِاللَّيْلِ فَيُصَلِّي وَيَبْسُطُهُ بِالنَّهَارِ فَيَجْلِسُ عَلَيْهِ فَجَعَلَ النَّاسُ يَثُوبُونَ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَيُصَلُّونَ بِصَلَاتِهِ حَتَّى كَثُرُوا فَأَقْبَلَ فَقَالَ يَا أَيُّهَا النَّاسُ خُذُوا مِنْ الْأَعْمَالِ مَا تُطِيقُونَ فَإِنَّ اللَّهَ لَا يَمَلُّ حَتَّى تَمَلُّوا وَإِنَّ أَحَبَّ الْأَعْمَالِ إِلَى اللَّهِ مَا دَامَ وَإِنْ قَلَّ.

## (بەشی/ دانیشتن لەسەر حەسیر)

عائیشە (رضي الله عنها) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پارچە حەسیرێکی بۆخۆی وەکو حوجرەیەك لێکردبوو بۆ خۆی بەشەو جیای کردبۆوە لەخەڵکی بۆ شەونوێژو وە بەرۆژیش لەسەری دادەنیشتن وە خەڵکیش دەهاتن نوێژیان وەکو نوێژی ئەو زۆر دەکرد وەئینجا رووی لەخەڵکەکە کردو فەرمووی ئەی خەڵکینە لەکردەوە ئەوەندی پێتان دەکرێ

ئەوەندە بکەن، وە خوای گەورە وەڕەز نابێت لێتان تاکو ئێوە لێی وەڕزدەبن وە خۆشەویستترین کردەوە لەلای ئەو ئەوکردەوەیە کە بەردەوام بێت با کەمیش بێت.

## باب المتشبهون بالنساء

٦٣٢. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) الْمُتَشَبِّهِينَ مِنْ الرِّجَالِ بِالنِّسَاءِ وَالْمُتَشَبِّهَاتِ مِنْ النِّسَاءِ بِالرِّجَالِ.

## (بەشی/ خۆ چواندن بەئافرەتان)

عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەعنەتی کردووە لەو پیاوەی خۆیان دەچوێنن و جل و پۆشاکی ئافرەتان بەکاردێنن وە لەو ئافرەتەی خۆیان دەچوێنن بەپیاوان.

## باب قص الشارب

٦٣٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قال: سَمِعْتُ رَسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: ((الْفِطْرَةُ خَمْسٌ الْخِتَانُ وَالِاسْتِحْدَادُ وَقَصُّ الشَّارِبِ وَتَقْلِيمُ الْأَظْفَارِ وَنَتْفُ الْآبَاطِ)).

## (بەشی/ کورت کردنی سمێڵ)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ گوێم لە پێغەمبەری خوابوو دەیفەرموو (ﷺ) پێنج شت لە رەوشتی پێغەمبەرانە کە ئەوانیش (خەتەنە) خۆ سونەت کردن، وە تاشین و لابردنی موی پێشەوەی شەرمگای ئادەمی، وە کورت کردنەوەی سمێڵ، وە نینۆك کردن، و لابردنی موی بن باخەڵ

٦٣٤. عَنْ عَبد الله بْنِ عُمَرَ رَضيَ اللهُ عَنهُما عَنْ رَسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعلى آله وَسَلَّمَ قَالَ: (خَالِفُوا الْمُشْرِكِينَ وَفِّرُوا اللِّحَى وَأَحْفُوا الشَّوَارِبَ) وكَانَ ابْنُ عُمَرَ إِذَا حَجَّ أَوْ اعْتَمَرَ قَبَضَ عَلَى لِحْيَتِهِ فَمَا فَضَلَ أَخَذَهُ.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرمووێ: بەپێچەوانەی هاوەڵ دانەران (المشركين) ببن و ریشتان بهێڵنەوەو سمێڵتان کورت بکەنەوە.

وە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ئەگەر حەج یان عومرەی بکردبا دەستی بە ریشی دەگرت و ئەوەندەی لەبن دەستی زیاد بوایە دەی تاشی .

٦٣٥. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى لَا يَصْبُغُونَ فَخَالِفُوهُمْ.

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرمووێ: جوولەکەکان و گاورەکان بۆیەی سەرو ریشیان ناکەن بۆیە ئێوەش پێچەوانەی ئەوانبن.

## باب صفات رسول الله (ﷺ)

٦٣٦. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ لَيْسَ بِالطَّوِيلِ الْبَائِنِ وَلَا بِالْقَصِيرِ وَلَيْسَ بِالْأَبْيَضِ الْأَمْهَقِ وَلَيْسَ بِالْآدَمِ وَلَيْسَ بِالْجَعْدِ الْقَطَطِ وَلَا بِالسَّبْطِ بَعَثَهُ اللَّهُ عَلَى رَأْسِ أَرْبَعِينَ سَنَةً فَأَقَامَ بِمَكَّةَ عَشْرَ سِنِينَ وَبِالْمَدِينَةِ عَشْرَ سِنِينَ وَتَوَفَّاهُ اللَّهُ عَلَى رَأْسِ سِتِّينَ سَنَةً وَلَيْسَ فِي رَأْسِهِ وَلِحْيَتِهِ عِشْرُونَ شَعَرَةً بَيْضَاءَ.

## (بەشی/ شێوەو سیفەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ))

ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) پیاوێکی دەستە.پیاوی مام ناوەندی بوو نە زۆر درێژو نەزۆر کورت بوو رەنگی

سپی و سۆر بوو بەلام سپی بیّ رادەی بێتام نا، گەنم رەنگی و سەوزیش نـا، قژی سەری نە لولێکی گرژ بوو نە خاوێکی تەواو کاتیّ وەحی بۆهات تەمەنی چل سالی بوو دەسالیش لە مەککە مایەوە لەوماوەیەدا وەحی بۆ دەهات لـە مەدینەش دە سالی مایەوە وەکاتیّ کەگیانی پـاکی سـپارد تەمـەنی شەسـت سالّ بوو هەمووی بیست مووی سپی لەسەرو ریشی دانەبوو.

## باب الإمتشاط

٦٣٧. عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ أَنَّ رَجُلًا اطَّلَعَ مِنْ جُحْرٍ فِي دَارِ النَّبِيِّ (ﷺ)وَالنَّبِيُّ (ﷺ)يَحُكُّ رَأْسَهُ بِالْمِدْرَى فَقَالَ عَلَيهِ الصلاة والسلام لَوْ عَلِمْتُ أَنَّكَ تَنْظُرُ لَطَعَنْتُ بِهَا فِي عَيْنِكَ إِنَّمَا جُعِلَ الْإِذْنُ مِنْ قِبَلِ الْأَبْصَارِ.

## (بەشی/ شانەکردنی سەر)

سەهل کوڕی سەعد دەگێرێتەوە کە پیاویّ لەکونی دەرگا تەماشای مـالی پێغەمبەری کرد (ﷺ) وە پێغەمبەریش سەری خۆی بەشانە شـانە دەکـرد، وە پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی ئەگەر بمزانیبایە تۆ تەماشای مالی ئێمەت دەکرد ئەوا ئەم شانەم دەکرد بەناو چاوتدا، خوای گەورە لەبەرچاوو مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی داناوە.

## باب عَذاب المصورين ونقض الصور

٦٣٨. عَنْ عَبْدَ اللّٰهِ بن مسعود رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَال: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ إِنَّ أَشَدَّ النَّاسِ عَذَابًا عِنْدَ اللّٰهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ الْمُصَوِّرُونَ.

## (بەشی/ سزای وێنەگران و لابردنی وێنە لەماڵاندا)

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (رضي الله عنه) دەفەرمووێ گوێم لە پێغەمبەری خوابوو دەیفەرموو: توندترین سزای خەڵکی لەلایەن خواوە لەرۆژی قیامەت بۆ وێنەگرانە.

٦٣٩. عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهَا أَنَّ النَّبِيَّ عَلَيْهِ الصَّلَاةُ والسَّلام لَمْ يَكُنْ يَتْرُكُ فِي بَيْتِهِ شَيْئًا فِيهِ تَصَالِيبُ إِلَّا نَقَضَهُ

عائیشە (رضي الله عنها) لەپێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە لەماڵەوە هەر وێنەیەکی بدیبایە لەسەر هەرشوێنێك کێشرابا لای دەبردو دەی شکاند.

٦٤٠. عَنْ النَّضْرَ بْنَ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كُنْتُ جالساً عِنْدَ ابْنِ عَبَّاسٍ وَهُمْ يَسْأَلُونَهُ وَلَا يَذْكُرُ رَسول الله (ﷺ) حَتَّى سُئِلَ فَقَالَ: سَمِعْتُ مُحَمَّدًا (ﷺ) يَقُولُ: مَنْ صَوَّرَ صُورَةً فِي الدُّنْيَا كُلِّفَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَنْ يَنْفُخَ فِيهَا الرُّوحَ وَلَيْسَ بِنَافِخٍ.

لە نەظری کوڕی ئەنەس کوڕی مالیك دەفەرمووێ دانیشتبووم لەلای عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس پرسیاریان لێ کرد وە هەر پرسیارێکیان لێ بکردبایە بەڵگەی بەفەرموودەی پێغەمبەری خواوە دەهێنایەوە، فەرمووی لە موحەمەد بوو (ﷺ) دەیفەرموو: هەرکەسێ وێنەیەك بکێشێ لەدونیادا لەرۆژی قیامەتدا داوای لێ دەکرێت گیانی بکات بەبەریدا وە ناتوانێ گیانی بکات بەبەریدا.

## باب من أحق بحسن الصحبة

٦٤١.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَال: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَنْ أَحَقُّ بِحُسْنِ صَحَابَتِي؟ قَالَ: ((أُمُّكَ، قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: أُمُّكَ، قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: أُمُّكَ، قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: أَبُوكَ)).

## (بەشی/ كێ شایانترە بەچاكەكردن لەگەڵی بكرێ)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پیاوێ هاتە لای پیغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: كێ شایانترە و لەپێشترە كە چاكەی لەگەڵدا بكەم؟ ئەویش فەرمووی: دایكت، پیاوەكەش وتی ئەی لەپاش ئەو؟ فەرمووی: دایكت، ئەویش دیسان وتی: ئەی لەپاش ئەو فەرمووی: دایكت دیسان كابرا وتی ئەی لەپاش ئەو؟ فەرمووی: ئینجا باوكت.

## باب الجهاد بإذن الوالدين

٦٤٢. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ الله عَنْهُما قَالَ: قَالَ رَجُلٌ لِلنَّبِيِّ (ﷺ) أُجَاهِدُ؟ قَالَ: ((لَكَ أَبَوَانِ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ عَلَيهِ الصَّلاةُ وَالسَّلام: فَفِيهِمَا فَجَاهِدْ.

## (بەشی/ جیهادو تێكۆشان بەمۆڵەتی دایك و باوك)

عەبدوڵلای كوڕی عەمر (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پیاوێ وتی بەپێغەمبەری خوا (ﷺ) دەمەوێ جیهاد بكەم ئەویش فەرمووی: ئایا باوك و دایكت ماون؟ وتی بەڵێ، فەرمووی: (علیه السلام) بڕۆ دڵیان رابگرەو ئەوە بۆتۆ جیهادو تێكۆشانە.

## باب لايسب الرجل والديه

٦٤٣. وعَنْهُ قَال: قالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِنَّ مِنْ أَكْبَرِ الْكَبَائِرِ أَنْ يَلْعَنَ الرَّجُلُ وَالِدَيْهِ قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَكَيْفَ يَلْعَنُ الرَّجُلُ وَالِدَيْهِ قَالَ يَسُبُّ الرَّجُلُ أَبَا الرَّجُلِ فَيَسُبُّ أَبَاهُ وَيَسُبُّ أُمَّهُ.

### (بەشی/ نابێت کەسێك جوێن بەدایك و باوکی بدات)

لەعەبدوڵلای کوڕی عەمر (رضي الله عنـه) دەفـەرمووێ پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرمووی: لە گەورەترین گوناهە گەورەکان ئەوەیە کەسێ نـەفرەت و لەعنەت لەدایك و باوکی خۆی بکات، ئینجا هاوەڵان وتیان ئـەی پێغەمبـەری خوا چۆن پیـاو لەعنـەت لـەدایك و بـاوکی خـۆی دەکـات؟ فـەرمووی جـوێن بەباوکی کەسێك دەدەی ئەویش جوێن بەباوکت دەداتەوە یان بەدایکت.

## باب صلة المرأة امها

٦٤٤.عَنْ أَسْمَاءَ بنت أبي بكر رَضي الله عَنْها قَالَتْ: قَدِمَتْ أُمِّي وَهِيَ مُشْرِكَةٌ فِي عَهْدِ قُرَيْشٍ وَمُدَّتِهِمْ إِذْ عَاهَدُوا النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَعَ أبيها فَاسْتَفْتَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) فَقُلْتُ إِنَّ أُمِّي قَدِمَتْ وَهِيَ رَاغِبَةٌ أَفَأَصِلُهَا قَالَ عليهِ الصلاة والسلام نَعَمْ صِلِي أُمَّكِ.

### (بەشی/ هامۆشۆی ئافرەت بۆ دایکی)

ئەسمائی کچی ئەبوبەکر (رضي الله عنهما) دەفەرمووێ دایکم هاتە سەردانم کافرو هاوەڵدانەر بـوو لـەزەمانی قورەیـشیدا کـە پـەیمانی لەگـەڵ پێغەمبـەر بەستبوو لەگەڵ باوکیدا، وە منیش پرسیارم لەپێغەمبەر (ﷺ) کرد وتم دایکم هـاتووە بـۆ سـەردانم وە ئایـا خزمـەتی بکـەم؟ پێغەمبـەری خـواش (ﷺ) فەرمووی: بەڵێ سەردان و مێوانداری بکەو خزمەتی بکە.

## باب إثم قاطِع الرَحم ورحمةُ الوالد، والتَراحمْ

٦٤٥. عَن جبير بن مطعم أنَّه سمع رَسُول الله (ﷺ) يَقُولُ لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ قَاطِعٌ.

## (بەشی/ تاوانی کەسێ کە سەردانی خزم و خۆیشی ببڕێ و بەزەیی و رەحمەتی باوك)

جوبەیری کوڕی موطعیم گوێی لەپێغەمبەر بوو (ﷺ) دەیفەرموو ناچێتە بەهەشت ئەوکەسەی رشتەی خزمایەتی بپچڕێنێ.

٦٤٦. عَنْ الْأَعْمَشِ، وَرَفعه الْحَسَنِ وَفِطْرٍ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: لَيْسَ الْوَاصِلُ بِالْمُكَافِئِ وَلَكِنْ الْوَاصِلُ الَّذِي إِذَا قُطِعَتْ رَحِمُهُ وَصَلَهَا.

ئەعمەش دەگێڕێتەوە لە حەسەن ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە دەفەرمووێ: ئەوکەسە پێی ناگوترێ خزم دۆست کە ئەگەر سەردانی کردی تۆش سەردانی بکەیت واتە سەر بەسەر بەڵکو خزمایەتی ئەوەیە کە خزمی هاتوچۆی نەکات ئەویش نەی پچڕێنێ.

٦٤٧. عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) حَدَّثَتْهُ قَالَتْ: (جَاءَتْنِي امْرَأَةٌ مَعَهَا ابْنَتَانِ تَسْأَلُنِي فَلَمْ تَجِدْ عِنْدِي غَيْرَ تَمْرَةٍ فَأَعْطَيْتُهَا فَقَسَمَتْهَا بَيْنَ ابْنَتَيْهَا ثُمَّ قَامَتْ فَخَرَجَتْ فَدَخَلَ النَّبِيُّ (ﷺ)فَحَدَّثْتُهُ فَقَالَ مَنْ يَلِي مِنْ هَذِهِ الْبَنَاتِ شَيْئًا فَأَحْسَنَ إِلَيْهِنَّ كُنَّ لَهُ سِتْرًا مِنْ النَّارِ).

عائیشە (رضي الله عنها) دەفەرمووێ ئافرەتێ هاتەلام و دووکچی لەگەڵدابوو داوای خواردنی لێ کردم منیش تەنها یەك دەنکە خورمام پێ بوو دام بەئافرەتەکە ئەویش کردی بەدوو لەتەوە دابەشی کرد بەسەر هەردوو کچیدا لەپاشان ڕۆیشتن، و پێغەمبەری خواش هاتە ماڵەوەو بۆم گێڕایەوە ئەویش فەرمووی: هەرکەسێ چەند کچێکی هەبووە بەجوانترین شێوە

پەروەردەیان بکات و بەخێویان بکات بۆی دەبن بەپەردە لەنێوان ئەوان و ئاگری دۆزەخدا.

٦٤٨. عن عائشة (رضي الله عنها) قالت: جاء أعرابي إلى النبي صلى الله عليه وآله وسلم: تُقّبلونَ الصِّبيانَ فَما تُقَبّلُهُمْ، فَقالَ النبي عليه الصلاة والسلام: (أَوْملِكُ لَكَ أنْ نَزَعَ الله مِنْ قَلْبِكَ الرّحمَةَ).

عائیشە (رضي الله عنها) دەفەرمووێت عارەبێکی دەشتەکی هاتەلای پێغەمبەر (ﷺ) وتی ئایا ئێوە منالّتان ماچ دەکەن؟ ئێمە واناکەین، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: جا منیش دەستەڵاتی چیم هەبێ کە خوای گەورە رەحم و بەزەیی لەدڵی تۆدا سڕیوەتەوە.

٦٤٩. عَنْ أبي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّهُ قَال: قَبَّلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)الْحَسَنَ بْنَ عَلِيّ وَعِنْدَهُ الْأَقْرَعُ بْنُ حَابِسٍ التَّمِيمِيُّ جَالِسًا فَقَالَ الْأَقْرَعُ إِنَّ لِي عَشَرَةً مِنْ الْوَلَدِ مَا قَبَّلْتُ مِنْهُمْ أَحَدًا فَنَظَرَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) ثُمَّ قَالَ مَنْ لَا يَرْحَمُ لَا يُرْحَمُ.

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) حەسەنی کوڕی عەلی ماچ کردو ئەقرەعی کوڕی حابیس لەلای دانیشتبوو وتی: من دە منالّم هەبوو هەتا ئێستا یەکێکیانم ماچ نەکردووە ئینجا پێغەمبەری خواش (ﷺ) بۆی روانی و فەرمووی: کەسێ بەزەیی بەخەڵکیدا نێتەوە خواش بەزەیی بەودا نایەتەوە.

٦٥٠.وَعَنْهُ أيضاً قال سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ جَعَلَ اللَّهُ الرَّحْمَةَ مِائَةَ جُزْءٍ فَأَمْسَكَ تعالى عِنْدَهُ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ جُزْءًا وَأَنْزَلَ فِي الْأَرْضِ جُزْءًا وَاحِدًا فَمِنْ ذَلِكَ الْجُزْءِ يَتَرَاحَمُ الْخَلْقُ حَتَّى تَرْفَعَ الْفَرَسُ حَافِرَهَا عَنْ وَلَدِهَا خَشْيَةَ أَنْ تُصِيبَهُ.

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنە) دەفەرمووێ گوێم لە پێغەمبەری خوابوو دەیفەرموو: خوای گەورە رەحمەت و سۆزی خۆی دابەش کردووە بۆ سەد بەش نۆهەدو نۆ بەشی لەلای خۆی داناوە و یەك بەشی دابەزاندووە بۆ زەوی وە هەر لەو بەشەیە کە خەڵکی رەحم و بەزەیی لەنێوانیاندا هەیە و هەتا وڵاخ سمی خۆی دەپارێزێ نەبادا بەر بەچکەکەی بکەوێ ئەویش هەر لەو بەشەی کەخوای گەورە لەسەر زەوی داناوە.

٦٥١.عَنْ عَامِر الشَّعبي عَن النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُم قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) تَرَى الْمُؤْمِنِينَ فِي تَرَاحُمِهِمْ وَتَوَادِّهِمْ وَتَعَاطُفِهِمْ كَمَثَلِ الْجَسَدِ إِذَا اشْتَكَى عُضْوًا تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ جَسَدِهِ بِالسَّهَرِ وَالْحُمَّى.

عامیری شەعبی لە نوعمانی کوڕی بەشیر (رضي الله عنهم) دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: نموونەی بڕوادار لەنێوان خۆیاندا وەك برا تەبابن و دۆستی یەکتربن وەك یەك لاشە وابن لەلاشەی ئادەمیدا ئەگەر ئەندامێك هاتە ژان و هەموو ئەندامەکانی تر تووشی تاو ژان دەبن.

## باب إثم منْ لايأمنْ جارَهُ بِوائقة، والوصاية بِالجار

٦٥٢. عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ الخزاعي رَضيَ الله عَنْهُ أَنَّ رَسُول الله (ﷺ) قَال: ((وَاللَّهِ لَا يُؤْمِنُ، وَاللَّهِ لَا يُؤْمِنُ، وَاللَّهِ لَا يُؤْمِنُ، قِيلَ: وَمَنْ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ الَّذِي لَا يَأْمَنُ جَارُهُ بَوَائِقَهُ.

## (بەشی/ تاوانی کەسێ دراوسێیەکەی لێی ئەمین نەبێ و ئامۆژگاری بەچاکەکردن لەگەڵ دراوسێدا)

ئەبی شورەیحی خوزاعی (رضي الله عنە) لەپێغەمبەری خوا (رضي الله عنە) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (سوێندم بەخوا بڕوایی تەواو نابێت،

سوێندم بەخوا بڕوایی تەواو نابێت، سوێندم بەخوا بڕوایی تەواو نابێت، وتیان کێیە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ئەوکەسەی دراوسێی لێی ئەمین نەبێت.

٦٥٣. عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا أَنَّ رَسُول الله (ﷺ) قَالَ: ((مَا زَالَ يُوصِينِي جِبْرِيلُ بِالْجَارِ حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ سَيُوَرِّثُهُ)).

عائیشە (رضي الله عنها) لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) کە فەرموویەتی: جوبرائیل ئەوەندەو ئەوەندە ئامۆژگاری کردم دەربارەی دراوسێ هەتا وام زانی دراوسێ میرات و کەلەپور لەدراوسێی دەگرێ.

٦٥٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ الله عَنْهُ قَال: قَالَ رَسُولُ اللّه (ﷺ) مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلَا يُؤْذِ جَارَهُ وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَصْمُتْ.

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: کەسێ بڕوای هەبێ بەخواو ڕۆژی دوایی با دراوسێی ئازار نەدات وە کەسێ بڕوای هەبێ بەخواو ڕۆژی دوایی با ڕێزی میوانی بگرێ وەکەسێ بڕوای هەبێ بەخواو ڕۆژی دوایی با وتەی خێرو چاك بکات ئەگینا با بێدەنگ بێت.

## باب كلّ مَعروف صَدقةٌ، وطيب الكلام

٦٥٥. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا إِنّ رَسولَ الله (ﷺ) قَالَ كُلُّ مَعْرُوفٍ صَدَقَةٌ.

### (بەشی/ هەموو چاکەیەك خێرە و قسەی جوان و باش)

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (رضي الله عنه) لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگێڕێتەوە دەفەرمووێ: هەر شتێ لەکردەوەی چاك کەلە تەرازووی خوا پەسەند بێت بەچاکە و خێر حیسابە.

٦٥٦. عَنْ أبي هُرَيْرَةَ رَضيَ اللهُ عَنْهُ قال: سَمعتُ رَسُول الله (ﷺ) الْكَلِمَةُ الطَّيِّبَةُ صَدَقَةٌ.

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەیفەرموو: قسەی خۆش و جوان صەدەقە و خێرە.

## باب الرفق في الأمر كله

٦٥٧. عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: دَخَلَ رَهْطٌ مِنْ الْيَهُودِ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالُوا السَّامُ عَلَيْكُمْ قَالَتْ عَائِشَةُ فَفَهِمْتُهَا فَقُلْتُ وَعَلَيْكُمْ السَّامُ وَاللَّعْنَةُ قَالَتْ فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ)مَهْلًا يَا عَائِشَةُ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الرِّفْقَ فِي الْأَمْرِ كُلِّه فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَوَلَمْ تَسْمَعْ مَا قَالُوا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) قَدْ قُلْتُ وَعَلَيْكُمْ.

### (بەشی/ نەرمو نیانی لەهەموو کارو بارێکدا)

عائیشە (رضي الله عنها) دەفەرمووێ کۆمەڵێ لە جولەکە هاتنە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەجیاتی سڵاو کردن و وتیان (السام عليكم) واتە:

مردنتان لەسەربێ، عائیشە خانیش تێگەیشت لەم وتانەی ئەوان و فەرمووی: مردن و لەعنەتی خواتان لەسەربێت.

عائیشە خان دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا فەرمووی: نەرم و نیانبە ئەی عائیشە خوای گەورە نەرم و نیانی پێ خۆشە لەهەموو کاروبارێکدا، منیش وتم ئەی نێرراوی خوا گوێت لێ نەبوو چییان وت؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: من وەڵامم دانەوە و پێم گوتن لەسەر ئێوەش بێت.

## باب الشَفاعة الحَسَنة

٦٥٨. عَنْ أَبِي مُوسَى الأشعري (رضي الله عنهُ) عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ كَانَ إِذَا أَتَاهُ السَّائِلُ أَوْ صَاحِبُ الْحَاجَةِ قَالَ اشْفَعُوا فَلْتُؤْجَرُوا وَلْيَقْضِ اللَّهُ عَلَى لِسَانِ رَسُولِهِ مَا شَاءَ.

## (بەشی/ تکاکردنی (الشفاعە) چاکە)

ئەبی موسای ئەشعەری (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر ریوایەت دەکات کەخاوەن پێویستییەك یان سوڵکەرێك هاتە خزمەتی و ئەویش فەرمووی تکای بۆ بکەن و ئەجرو پاداشت وەردەگرن و خوای گەورە لەسەرزاری پێغەمبەرەکەتان دادوەری دەبێت.

## باب ما كانَ (ﷺ) فاحِشاً

٦٥٩. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ لَمْ يَكُنْ النَّبِيُّ (ﷺ)سَبَّابًا وَلَا فَحَّاشًا وَلَا لَعَّانًا كَانَ يَقُولُ لِأَحَدِنَا عِنْدَ الْمَعْتِبَةِ مَا لَهُ تَرِبَ جَبِينُهُ.

## (بەشی/ پێغەمبەری خوا دەم پیس نەبووە)

ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) جوێن دەرو هەرزەگۆو دەم پیس و نەفرینکەر نەبووە، کاتێ گلەیی لەیەکێك بکردبایە پێی دەفەرموو ئەوە چییەتی بۆچی وادەکەن لوتی بەقوڕا بچێ.

٦٦٠. عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها أَنَّ رَجُلًا اسْتَأْذَنَ عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَلَمَّا رَآهُ قَالَ بِئْسَ أَخُو الْعَشِيرَةِ وَبِئْسَ ابْنُ الْعَشِيرَةِ فَلَمَّا جَلَسَ تَطَلَّقَ النَّبِيُّ (ﷺ) فِي وَجْهِهِ وَانْبَسَطَ إِلَيْهِ فَلَمَّا انْطَلَقَ الرَّجُلُ قَالَتْ عَائِشَةُ يَا رَسُولَ اللَّهِ حِينَ رَأَيْتَ الرَّجُلَ قُلْتَ لَهُ كَذَا وَكَذَا ثُمَّ تَطَلَّقْتَ فِي وَجْهِهِ وَانْبَسَطْتَ إِلَيْهِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَا عَائِشَةُ مَتَى عَهِدْتِنِي فَحَّاشًا إِنَّ شَرَّ النَّاسِ عِنْدَ اللَّهِ مَنْزِلَةً مَنْ تَرَكَهُ النَّاسُ اتِّقَاءَ شَرِّهِ.

عائیشە خان (رضي الله عنها) دەگێڕێتەوە کە پیاوێ داوای ئیزنی لەپێغەمبەر (ﷺ) کردو هاتە ژوورەوە، کاتێ چاوی پێ کەوت و فەرمووی کابرایەکی زۆر خراپەو کوڕی پیاوێکی زۆر بەدو خراپە، کە دانیشت پێغەمبەری خوا رووی خۆش بوو گەشایەوە، عائیشەخان دەفەرمووێ ئەی پێغەمبەر لەوکاتەدا کە پیاوەکە هات وات وت دوایی رووت خۆشبوو پێی گەشایەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەی عائیشە من نابێ دەم پیس و جوێن دەریم، وە خراپترین کەس ئەوکەسەیە کە خەڵك لەترسی بەدگۆی و بەدزمانی خۆیانی لێ لادەدەن یان خۆیانی لێ دەپارێزن.

## باب حسن الخلق والسخاء

٦٦١. عَنْ أَنَسٍ بن مالك رَضيَ الله عَنْهُ قَال: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ أَحْسَنَ النَّاسِ وَأَجْوَدَ النَّاسِ وَأَشْجَعَ النَّاسِ وَلَقَدْ فَزِعَ أَهْلُ الْمَدِينَةِ ذَاتَ لَيْلَةٍ فَانْطَلَقَ النَّاسُ قِبَلَ الصَّوْتِ فَاسْتَقْبَلَهُمْ النَّبِيُّ (ﷺ) قَدْ سَبَقَ النَّاسَ إِلَى الصَّوْتِ وَهُوَ يَقُولُ لَنْ تُرَاعُوا، وَهُوَ عَلَى فَرَسٍ لِأَبِي طَلْحَةَ عُرْيٍ مَا عَلَيْهِ سَرْجٌ فِي عُنُقِهِ سَيْفٌ فَقَالَ لَقَدْ وَجَدْتُهُ بَحْرًا أَوْ إِنَّهُ لَبَحْرٌ.

## (بەشی/ خوڕەوشت جوانی و سەخی بوون)

ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەهەمووکەس خوڕەوشت جوان و سەخی تر بوو و ئازاتر بوو، شەوێکییان خەڵکی مەدینە لەگەڵ دەنگێك ترسان و بەرەو لای دەنگەکە چوون لەڕێگادا گەیشتن بەپێغەمبەری خوا (ﷺ) کە دەگەڕایەوە لەشوێنەکەو پێش ئەوان دەرچووبوو وە فەرمووی مەترسن هیچ نەبووە، بڕۆنەوە خۆی لەسەر ئەسپێکدا کە زین کرابوو لەملیدا وە شیری پێوەکرابوو فەرمووی ئەم وڵاخەم لەئاوی رووبار تیژڕەو نەرم ترە.

٦٦٢. عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ رَضيَ اللهُ عَنْهُ قَال قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ تَعالى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ((يَتَقَارَبُ الزَّمَانُ وَيَنْقُصُ الْعَمَلُ وَيُلْقَى الشُّحُّ وَيَكْثُرُ الْهَرْجُ قَالُوا وَمَا الْهَرْجُ قَالَ الْقَتْلُ)).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: کات و زەمان نزیك دەبێتەوە وە کردەوەی چاکە کەم دەبێت و قسەی پڕوپووچ و رژدی و چروکی زۆردەبێت وە هەرەج زۆر دەبێت، وتیان هەرەج چییە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: هەرەج کوشتنە و بڕینە ئەوەندە زۆر دەبێ.

## باب الحب في الله والسباب واللعن

٦٦٣. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُول الله (ﷺ)لَا يَجِدُ أَحَدٌ حَلَاوَةَ الْإِيمَانِ حَتَّى يُحِبَّ الْمَرْءَ لَا يُحِبُّهُ إِلَّا لِلَّهِ وَحَتَّى أَنْ يُقْذَفَ فِي النَّارِ أَحَبُّ إِلَيْهِ مِنْ أَنْ يَرْجِعَ إِلَى الْكُفْرِ بَعْدَ إِذْ أَنْقَذَهُ اللَّهُ وَحَتَّى يَكُونَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا.

## (بەشی/خۆشەویستی لەبەر خوا، جوێن دان و لەعنەت کردن)

**ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: کەس تام و چێژی ئیمان و بڕوای نەکردووە تا ئەوکەسەی خۆشت دەوێ لەبەر خوا بێت وە هەتا ئەگەر چۆن پێت ناخۆشە بتخەنە ناو ئاگر ئەوها پێت ناخۆش بێ کە پاشگەزبیتەوەو ببیتە کافرو بێ بڕوا لەپاش ئەوەی خوا هیدایەتی داوی وە هەتا خواو پێغەمبەرەکەی لەهەمووکەس زیاتر خۆشت دەوێ.**

٦٦٤. عَنْ أَبِي ذَرٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ لَا يَرْمِي رَجُلٌ رَجُلًا بِالْفُسُوقِ وَلَا يَرْمِيهِ بِالْكُفْرِ إِلَّا ارْتَدَّتْ عَلَيْهِ إِنْ لَمْ يَكُنْ صَاحِبُهُ كَذَلِكَ.

**ئەبی ذەر (رضي الله عنه) گوێی لە پێغەمبەربوو (ﷺ) فەرموویەتی: ئەوکەسەی بەبرای خۆی بڵێ ئەی فاسیق یان بێ دین یان تۆمەتی بەدکاری، ئەگەر ئەو تۆمەتەی کەخراوەتەسەری مستەحەقی بێت ئەوا باشە ئەگینا بۆ سەرسەری ئەو دادەدرێتەوە.**

٦٦٥. عَنْ أَبِي قِلَابَةَ أَنَّ ثَابِتَ بْنَ الضَّحَّاكِ وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ الشَّجَرَةِ الرضوان حَدَّثَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: (مَنْ حَلَفَ عَلَى مِلَّةٍ غَيْرِ الْإِسْلَامِ فَهُوَ كَمَا

قَالَ وَلَيْسَ عَلَى ابْنِ آدَمَ نَذْرٌ فِيمَا لَا يَمْلِكُ وَمَنْ لَعَنَ مُؤْمِنًا فَهُوَ كَقَتْلِهِ وَمَنْ قَذَفَ مُؤْمِنًا بِكُفْرٍ فَهُوَ كَقَتْلِهِ.

لەئەبی قەلابە کەئەویش لەسابیتی کوڕی زوحاك کەیەکێکە لەهاوەڵانی پەیمانی ریضوان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی {کەسێ سوێند بخوات لەسەر ئایینێ جگە لە ئایینی ئیسلام ئەوە چۆنی گوتوە ئاوا دەبێت، وەلەسەر ئادەمی نییە ئەو نەزرەی کە دەیکات کەلەتوانایدا نەبێت.وەکەسێ لەعنەت لەبرواداری بکات وەکو کوشتن وایە وەکەسێ بوختان بەموسڵمانێ بکات وەکو کوشتن وایە}.

## باب النَميمة، وذي الوَجهين

٦٦٦. عَنْ حُذَيْفَةَ رَضِي اللهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُول الله (ﷺ) يَقُولُ: (لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ قَتَّاتٌ).

## بەشی نەمیمە کردنو دوو روویی

حوزەیفە (رضي الله عنه) لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) کە دەفەرمووێ: ناچێتە بەهەشت ئەوەی دوو زمان بێت.

٦٦٧. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) تَجِدُ مِنْ شَرِّ النَّاسِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عِنْدَ اللَّهِ ذَا الْوَجْهَيْنِ الَّذِي يَأْتِي هَؤُلَاءِ بِوَجْهٍ وَهَؤُلَاءِ بِوَجْهٍ).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: خراپترین خەڵکی لەرۆژی قیامەت لەلای خوا ئەوکەسەیەکە دووڕوویی هەبێ و دێتـەلای ئەو پیاوە بەروویەك و دێتەلای ئەوی تر بەڕوویەکی ترەوە بۆ تێکدانی نێوانی خەڵکی.

## باب تَسَتْرُ المؤمن على نَفسِهِ، والهَجر فوق ثلاث

٦٦٨. وَعَنْهُ أيضاً قال: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (ﷺ) يَقُولُ ((كُلُّ أُمَّتِي مُعَافًى إِلَّا الْمُجَاهِرِينَ وَإِنَّ مِنْ الْمَجَانَةِ أَنْ يَعْمَلَ الرَّجُلُ بِاللَّيْلِ عَمَلًا ثُمَّ يُصْبِحَ وَقَدْ سَتَرَهُ اللّٰهُ فَيَقُولَ يَا فُلَانُ قَدْ عَمِلْتُ الْبَارِحَةَ كَذَا وَكَذَا، وَقَدْ بَاتَ يَسْتُرُهُ رَبُّهُ وَيُصْبِحُ يَكْشِفُ سِتْرَ اللّٰهِ عَنْهُ)).

## (بەشی/ داپۆشینی عەیبی خۆت وە قەسەبڕین زیاتر لەسێ ڕۆژ)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەیفەرموو: هەموو ئوممەتی من چاوپۆشی لێ دەکرێن و عەفو دەکرێن تەنها ئەوانەی سیڕی خۆیان هەڵدەماڵێن وە ئەوانەی بێ موبالاتن لەقسەو کردار وە ئەوانەش وەکو پیاوێك بەشەو کرداری خراپ ئەنجام دەدات و خوای گەورە بۆی پۆشیوەو بەیانی ئاشکرای دەکات بۆخەڵکی کە ئەوکاتانەی کە کردوویەتی.

٦٦٩. عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيِّ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (ﷺ) قَالَ لَا يَحِلُّ لِرَجُلٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلَاثِ لَيَالٍ يَلْتَقِيَانِ فَيُعْرِضُ هَذَا وَيُعْرِضُ هَذَا وَخَيْرُهُمَا الَّذِي يَبْدَأُ بِالسَّلَامِ.

ئەبی ئەیوبی ئەنصاری (رضي الله عنه) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێ: دروست نییە بۆ یەکێك قسە دابڕێ لەگەڵ براکەی خۆی لەسێ شەوان زیاتر بەیەك دەگەن ئەویان پشت دەکات و ئەوی تریشیان پشت لەوی تریان دەکات وە چاکترینیان ئەوکەسەیە کەبە سڵاوکردن دەست بە پەیوەندی دەکاتەوە لەگەڵیدا.

## باب الكذب والغضب لأمر الله والحذر من الغضب

٦٧٠. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مَسعُود رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ إِنَّ الصِّدْقَ يَهْدِي إِلَى الْبِرِّ وَإِنَّ الْبِرَّ يَهْدِي إِلَى الْجَنَّةِ وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَصْدُقُ حَتَّى يكتب عند الله يَكُونَ صِدِّيقًا وَإِنَّ الْكَذِبَ يَهْدِي إِلَى الْفُجُورِ وَإِنَّ الْفُجُورَ يَهْدِي إِلَى النَّارِ وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَكْذِبُ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللَّهِ كَذَّابًا.

قال الله تعالى: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴾

## (بەشی/ درۆ، توڕەبوون بۆ خوا، خۆپاریزی لە توڕەبوون)

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (رضي الله عنه) لەپێغەمبەرەوە کە دەفەرمووێ: راستگۆیی رێنیشاندەرە بۆ چاکە وە چاکەش رێنیشاندەرە بۆ بەهەشت وە پیاو هەر راستگۆ دەبێت بەردەوام هەتا لەلای خوا بەڕاست گۆ ناو دەبرێت، وە درۆش رێگای خراپە دەگرێ و خراپەش رێگای دۆزەخ دەگرێ و وە پیاو هەر درۆ دەکات تا وای لێ دێت لەلای خوا بەدرۆزن لەقەڵەم دەدرێت.

خوای گەورە دەفەرمووێ ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴾ واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە لەخوا بترسن و تەقوا بکەن و لەگەڵ راستگۆیان بن.

٦٧١. عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُب رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَال: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): ((رَأَيْتُ رَجُلَيْنِ أَتَيَانِي قَالَ الَّذِي رَأَيْتَهُ يُشَقُّ شِدْقُهُ فَكَذَّابٌ يَكْذِبُ بِالْكَذْبَةِ تُحْمَلُ عَنْهُ حَتَّى تَبْلُغَ الْآفَاقَ فَيُصْنَعُ بِهِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ)).

سەمورەی کوڕی جوندوب (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: لەخەوما دیتم دوو پیاو هاتن بۆلام و منیان برد بۆ شوێنێك

فەرمووی ئەوەی دیتم ئەوەبوو پیاوێ لێوییان دەبڕێ وە دوایی وەك خۆی لێدەهاتەوە دیسان دەیان بڕیەوە، ئەوکەسەش درۆزن بوو کە درۆیەکی دەکرد ئەوەندە گەورەبوو کە دەگەیشت بەئاسمانەوە واتە خەڵکی هەموو دەیانزانی ئەمە سزای ئەوکەسە بوو کە وای لیَ دەکرا تاکو رۆژی دوایی.

٦٧٢. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن عُمَر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَال: بَيْنَا النَّبِيّ عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام يُصَلِّي رَأَى فِي قِبْلَةِ الْمَسْجِدِ نُخَامَةً فَحَكَّهَا بِيَدِهِ فَتَغَيَّظَ ثُمَّ قَالَ ((إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا كَانَ فِي الصَّلَاةِ فَإِنَّ اللَّهَ حِيَالَ وَجْهِهِ فَلَا يَتَنَخَّمَنَّ حِيَالَ وَجْهِهِ فِي الصَّلَاةِ)).

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی دەکرد، لە قیبلەی مزگەوتا تفیَ یان بەڵغەمیَ بەدیوار یان بەزەوی مزگەوتەکەبو ئەویش بەدەستی لێی کردەوە وەبۆ خوا توڕەبوو لەپاشان فەرمووی ئەگەر کەسێکتان نوێژی کرد ئەوا خوای گەورە لەپێش ئەودایەو نابێت لەپێش خۆتاندا (پێش قیبلە) شتیَ لەتف و پیسایی فڕیَ بدەن

٦٧٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ لَيْسَ الشَّدِيدُ بِالصُّرَعَةِ إِنَّمَا الشَّدِيدُ الَّذِي يَمْلِكُ نَفْسَهُ عِنْدَ الْغَضَبِ.

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئازایەتی ئەوە نییە کەسیَ لەدەرەقەتی نێن لەزۆرانبازیدا بەڵکو ئازایەتی ئەوەیە کە لەکاتی توڕەییدا خۆی بگرێت و سنوور نەبەزێنیَ.

٦٧٤. وَعَنْهُ أيضاً أَنَّ رَجُلًا قَالَ لِرَسُول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ أَوْصِنِي، قَالَ: لَا تَغْضَبْ فَرَدَّدَ مِرَارًا قَالَ لَا تَغْضَبْ.

دیسان لە ئەبوهورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ کە پیاوێ وتی بەپێغەمبەری خوا (ﷺ) ئامۆژگاریم بکە ئەویش فەرمووی: تورە مەبە ئەویش چەند جارێك دووبارەی کردەوە هەم دیسان فەرمووی تورە مەبە.

## باب الحياء، والإنبساط بين النّاس ومداراتهم

٦٧٥. عَنْ عِمْرَان بْنَ حُصَيْن رَضيَ اللهُ عَنْهُ قَال: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) الْحَيَاءُ لَا يَأْتِي إِلَّا بِخَيْرٍ.

## (بەشی/ شەرم و حەیا، راخستنی باڵی بەزەیی بۆخەڵکی).

عیمرانی کوڕی حوصەین (رضي الله عنه) دەفەرمووێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: شەرم و حەیا هەر خێر دێنێ و بەس.

٦٧٦. عَنْ أبي مَسْعُود قَال: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) إِنَّ مِمَّا أَدْرَكَ النَّاسُ مِنْ كَلَامِ النُّبُوَّةِ الْأُولَى: إِذَا لَمْ تَسْتَحِ فَاصْنَعْ مَا شِئْتَ.

ئەبی مەسعود دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەو فەرمایشتە جوانەی کە خەڵکان لە پێغەمبەرانی پێشوو بۆیان ماوەتەوە ئەوەیە کە ئەگەر شەرم ناکەی چی دەکەی بیکە.

٦٧٧. عَنْ عَبد الله بْن مَسْعُودٍ رَضيَ الله عَنْهُ قال: خَالِطِ النَّاسَ وَدِينَكَ لَا تَكْلِمَنَّهُ.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (رضي الله عنه) دەفەرمووێ: تێکەڵاوی خەڵکی ببەو ئامۆژگاریان بکە بەڵام دینت نەدڕێنی.

٦٧٨. عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ رَضيَ اللهُ عَنْهُ قال: إِنَّا لَنَكْشِرُ فِي وُجُوهِ أَقْوَامٍ وَإِنَّ قُلُوبَنَا لَتَلْعَنُهُمْ.

ئەبو دەرداء (رضي الله عنه) دەفەرمووێ: ئێمە لەگەڵ خەڵكان دەم بەپێكەنین بووین بەڵام لەدڵەوە رقمان لەهەندێ كەس دەبۆوەو نەفرەتمان لێ دەكرد.

## باب لايَلدِغُ المؤمِنْ، وما قيلَ في الشعر

٦٧٩. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ رَسُول الله (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ لَا يُلْدَغُ الْمُؤْمِنُ مِنْ جُحْرٍ وَاحِدٍ مَرَّتَيْنِ.

## (بەشی/ ئیماندار پێوەی نادرێت، وە چ دەربارەی شیعر گوتراوە)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) كە دەفەرمووێ: بڕوادار لە كونێكەوە دووجار پێوەی نادرێت.

٦٨٠. عَنْ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَال: إِنَّ مِنْ الشِّعْرِ حِكْمَةً.

لە ئوبەی كوڕی كەعب لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) كە دەفەرمووێ: هۆنراوە (شیعر) هەندێكی حیكمەت و دانایی تیایە.

٦٨١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَال: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ أَصْدَقُ كَلِمَةٍ قَالَهَا الشَّاعِرُ كَلِمَةُ لَبِيدٍ: الا كل شيء ماخلا الله باطل.

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: راستترین گوتەی لەبیدی شاعیر ئەو وتەیە كەدەڵێ ئەوەی

ألاَ كل شيءٍ ما خلاَ الله باطِل واتة: ئەوەی جگە لە خوا مایە پوچ و بەتاڵە

٦٨٢. وَعَنْهُ أيضاً يذكر رَسُول يقول: ((إِنَّ أخاً لَكُمْ لاَ يَقُولُ الرَّفَثَ)). يعني أبا هُرَيْرَة عَبْد الله بن رَوَاحَةَ (حين) قال يمدح النَّبي عَلَيهِ الصَّلاةُ وَالسَّلام:

وفينا رسولُ الله يَتْلوا كتابَهُ إذا انْشَقَّ مَعْرُوفٌ مِنَ الفَجْرِ سَاطِعُ

أرَانَا الهُدَى بَعْدَ العَمَى فقلوبُنا بِهِ مُوقِنَاتٌ أنَّ ما قال وَاقِعُ

يَبِيتُ يُجَافِي جَنْبَهُ عَنْ فراشهِ إذا اسْتَثْقَلَتْ بِالمُشْرِكِينَ المَضاجِعُ

جگه لەخوا بێت بەتاڵەو مایه پووچ.

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) باس دەكات دەگێڕێتەوە كـه پێغەمبـەری خوا (ﷺ) فەرمووی: برایەكتان هەیە كە قسەی ناڕێك و زمـان پـیس نییـە، واتە ئەبو هورەیرە دەفەرمووێ كە عەبدوڵلای كوڕی رەواحە بوو كە مـەدح و سەنای پێغەمبەری كردو فەرمووی: (وفينا رسول الله يتلوا كتابه اذا انشقت معـروف مـن الفجـر الـساطع) وە هــەتا دوای ســێ دێـڕە شـیعرەكە لەدەقــە عەرەبییەكە نووسراوە.

واتە: پێغەمبەری خوا لەناوماندا لەگەڵ شەبەقی بەیانیاندا قورئانمان بۆ دەخوێنێ، وە بەرنوێژمان بۆ دەكات رێگەی راستی پێ نیشان داین وە لەرێگەی چەوت رزگاری كردووین لەكوێرەوەری، ئێمە بەدڵ باوەڕمان هەیە كە هەرچی ئەو پێغەمبەرە دەفەرمووێ راست و درووستە و رەوایە، جا كاتێ لەگەرمەی خەودان ئەو زاتە لەوكاتەدا لەشەودان پاڵ دەكەون ئەو لەباتی خەولێكەوتن سەرگەرمی شەونوێژو خواپەرستی یە.

٦٨٣. عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ تَعالى عَنْهُمَا عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ لَأَنْ يَمْتَلِئَ جَوْفُ أَحَدِكُمْ قَيْحًا خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَمْتَلِئَ شِعْرًا

عەبـدوڵلای كـوڕی عومــەر (رضــي الله عنــه) لەپێغەمبــەر (ﷺ) كـە دەفەرمووێ: ئەگەر لەناو سكی هەریەكێكتان پراو پركێم و زوخاو بێت باشترە لەوەی كە پڕی بكات لە شیعرو هۆنراوە.

## باب علامة حب الله تعالى

٦٨٤. عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بن مَسعُود رَضيَ الله عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ الْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ.

## (بەشی/ نیشانەی خۆشەویستی خوای گەورە)

عەبـدوڵلای کـوڕی مەسـعود (رضـي الله عنـه) لەپێغەمبـەر (ﷺ) کـە دەفەرمووێ مرۆڤ کێی خۆش بوێ لەگەڵ ئەودایە لەدوا ڕۆژ.

## باب العطاس والتثاؤب، وتسليم القَليلْ على الكَثير

٦٨٥. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ سَمِعت رَسول الله (ﷺ) يَقول إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْعُطَاسَ وَيَكْرَهُ التَّثَاؤُبَ فَإِذَا عَطَسَ أَحَدكمْ فَحَمِدَ اللَّهَ فَحَقٌّ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ سَمِعَهُ أَنْ يُشَمِّتَهُ وَأَمَّا التَّثَاؤُبُ فَإِنَّمَا هُوَ مِنْ الشَّيْطَانِ فَلْيَرُدَّهُ مَا اسْتَطَاعَ فَإِذَا قَالَ هَا ضَحِكَ مِنْهُ الشَّيْطَانُ.

## (بەشی/ پژمین و باوێشك هاتن و سلاوکردنی خەڵکی کەم لەزۆران)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ گوێم لە پێغەمبەری خوابوو (ﷺ) فەرمووی: خوا پژمینی پێ خۆشەو باوێشکی پێ ناخۆشە وە ئەگەر کەسێ لەئێوە پژمینی هات بابڵێ الحمد لله واتە سوپاس بۆ خوا وە لەسەر هەر موسڵمانێ کە گوێی لێ بوو بڵێ خوا رەحمەت پێ بکات وە ئەگەر باوێشکی هات ئەوە لەلایەن شەیتانەوەیە با هەتا پێی دەکرێ دەمی خۆی نەکاتەوە، چونکە ئەگەر وتی (ئا ئا) لەوکاتەدا شەیتان پێی پێدەکەنێ.

٦٨٦. وَعَنْهُ أيضاً قال: قالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((يُسَلِّمُ الصَّغِيرُ عَلَى الْكَبِيرِ وَالْمَارُّ عَلَى الْقَاعِدِ وَالْقَلِيلُ عَلَى الْكَثِيرِ وَفِي رواية: والراكب على الماشي)).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بچووکان سلاو لەگەورەکان بکەن وە ئەوەی دەڕوا سلاو لە دانیشتوو دەکات و وە ئەوانەی کەمن سلاو لەزۆران دەکەن، وە لە ریوایەتی تردا هاتووە: ئەوەی سوارە سلاو لە رێبواران دەکات.

## باب زنا الجوارح، والسلام على العاصي

٦٨٧. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ الله عَنْهُما قَالَ: مَا رَأَيْتُ شَيْئًا أَشْبَهَ بِاللَّمَمِ مِمَّا قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) : ((إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ عَلَى ابْنِ آدَمَ حَظَّهُ مِنْ الزِّنَا أَدْرَكَ ذَلِكَ لَا مَحَالَةَ فَزِنَا الْعَيْنِ النَّظَرُ وَزِنَا اللِّسَانِ الْمَنْطِقُ، وَالنَّفْسُ تَمَنَّى وَتَشْتَهِي وَالْفَرْجُ يُصَدِّقُ ذَلِكَ أَوْ يُكَذِّبُهُ.

## (بەشی/ زیناو داوێن پیسی ئەندامانی لەش و سەلاوکردن لە تاوانبار)

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (رضي الله عنه) دەفەرمووێ شتێکی وام نەبینیوە کەلە (لەمە) بکات وەك ئەمەی کە ئەبو هورەیرە لەپێغەمبەری دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: هەموو ئادەمی بەشی خۆی لەداوێن پیسی لەچارەی نووسراوە، وە داوێنپیسی چاو بریتییە لە نەزەرو تەماشاکردن وە داوێن پیسی زمان قسەکردنی نادروستە وە نەفس ئارەزووی ئەوەدەکات و دەروونیش ئاواتی بۆ دەخوازێ لەئەنجامدا دامەن و عەورەت بەکردەوە بەدی دەهێنێ یان رەتی دەکاتەوە.

٦٨٨. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنُ عَمْرٍ قال: ((لَا تُسَلِّمُوا عَلَى شَرَبَةِ الْخَمْرِ)).

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەفەرمووێ سلاو لە ئارەق خۆران مەکەن.

## باب قُومُوا لِسَيِدكُمْ، ولاَ يُقام الرجل من مجْلِسه

٦٨٩. عَنْ أَبِي سَعِيد الخُدري رَضيَ اللهُ عَشضنْهُ أَنَّ أَهْلَ قُرَيْظَةَ نَزَلُوا عَلَى حُكْمِ سَعْد ابن مُعَاذ فَأَرْسَلَ النَّبِيُّ (ﷺ) إِلَيْهِ فَجَاءَ فَقَالَ صلى الله عَلَيهِ وَآلهِ وَسلم: ((قُومُوا إِلَى سَيِّدِكُمْ أَوْ قَالَ خَيْرِكُمْ)).

## (بەشی/ هەڵسانەوە بۆ گەورەكانتان، وە كەسێ كەسێ هەڵنەوستێنێتەوە لە كۆڕو كۆبوونەوەدا)

ئەبی سەعیدی خودری (رضي الله عنه) دەفەرمووێ بەنو قورەیزە، كاتێ رازی بوون بەفەرمانی سەعدی كوڕی موعاذ، پێغەمبەری خواش (ﷺ) ناردی بەدوایاندا كەهاتە خزمەتی پێغەمبەری خواش فەرمووی بەخەڵكانی هەڵسنەوە بۆ گەورەكەتان یان فەرمووی بۆ چاكترین كەس لەئێوە.

٦٩٠. عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ لَا يُقِيمُ الرَّجُلُ الرَّجُلَ مِنْ مَجْلِسِهِ ثُمَّ يَجْلِسُ فِيهِ.

عەبدوڵڵای كوڕی عومەر (رضي الله عنـه) لەپێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: نابێـت كەسـێك لـەجێگای خـۆی هەڵـسێنێ و خـۆی لـەجێگای ئـەو دانیشێ.

## باب لايتَناجي إثنان دون الثالِث ولا تَترك النّار عند النَوم

٦٩١. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن عُمَر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ إِذَا كَانُوا ثَلَاثَةٌ فَلَا يَتَنَاجَى اثْنَانِ دُونَ الثَّالِثِ

## (بەشی/ نابێت دووکەس بەتەنیا قسەبکەن و واز سێیەم بێنن وە نابێت ئاگر بەجێ بهێڵن لەشەودا لەکاتی خەوتندا)

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنه) لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) کە دەفەرمووێ: ئەگەر سێ کەس بوون نابێت دوو کەستان بەجیاو بە چپەچپ قسە بکات واز لەئەوی تر بهێنێ.

٦٩٢. وَعَنْهُ أيضاً عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَال: لَا تَتْرُكُوا النَّارَ فِي بُيُوتِكُمْ حِينَ تَنَامُونَ.

لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنهما) لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) کە دەفەرمووێ: لەماڵەکانتان ئاگر بەجێ مەهێڵن لەشەودا لەکاتی نووستن.

## باب الدَعوات وسَيد الإستِغْفار وَفوائدهُ

٦٩٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّهُ قال: قالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) : لِكُلِّ نَبِيٍّ دَعْوَةٌ يَدْعُو بِهَا وَأُرِيدُ أَنْ أَخْتَبِئَ دَعْوَتِي شَفَاعَةً لِأُمَّتِي فِي الْآخِرَةِ.

## (بەشی/ نزاكان و گەورەو سەرداری لێخۆشبووان (الاستغفار) وە سوودەکانی).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: بۆ هەر پێغەمبەرێك نزایەکی هەبوو دوعای پێ دەکرد وەمنیش نزای خۆمم هەڵگرتووە بۆ قیامەت لەوێ تکای پێ دەکەم (شەفاعەت) بۆ ئۆممەتم لەرۆژی قیامەت.

٦٩٤. عَنْ شَدَّاد بْن أَوْس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ تَعالى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قال: ((سَيِّدُ الِاسْتِغْفَارِ أَنْ تَقُولَ اللَّهُمَّ أَنْتَ رَبِّي لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ خَلَقْتَنِي وَأَنَا عَبْدُكَ وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ أَبُوءُ

لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ وَأَبُوءُ لَكَ بِذَنْبِي فَاغْفِرْ لِي فَإِنَّهُ لَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ قَالَ (ﷺ) وَمَنْ قَالَهَا مِنْ النَّهَارِ مُوقِنًا بِهَا فَمَاتَ مِنْ يَوْمِهِ قَبْلَ أَنْ يُمْسِيَ فَهُوَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ وَمَنْ قَالَهَا مِنْ اللَّيْلِ وَهُوَ مُوقِنٌ بِهَا فَمَاتَ قَبْلَ أَنْ يُصْبِحَ فَهُوَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ)).

لەشەدادی کوڕی ئەوس (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرمووێ: سەروەری لێخۆشبوان ئەوەیە کە بەندە بەدڵ بڵێ: (اللَّهُمَّ أَنْتَ رَبِّي لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ خَلَقْتَنِي وَأَنَا عَبْدُكَ وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ أَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ وَأَبُوءُ لَكَ بِذَنْبِي فَاغْفِرْ لِي فَإِنَّهُ لَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ).

واتە: (خوایە هەر تۆ پەروەردگاری منی لەتۆ زیاتر خوای تر نییە من بەندەی تۆم تۆ منت لەنەبوون درووست کردووەو تا بتوانم پەیمان و بەڵێنی تۆ ناشکێنم کە نەمتوانی ئەوە لەدەستم نایێ، وە پەنا دەگرم بەتۆ لەشەڕ و خراپەی کردەوەی خۆم کە دەبێ بەمایەی سزاو تۆڵە بۆم منیش هەردەم چاکەو نیعمەتی تۆم لەبەرچاوە پێ لێدەنێم لەگوناهی خۆم کەواتە لێم خۆشبە هیچ کەس توانای ئەوەی نییە لەگوناهی بەندەکانی خۆشبێ جگە لەتۆ) وە پێغەمبەر فەرمووی: کەسێ ئەم نزایە بکات لەرۆژداو بڕوای پێی هەبێ پێش ئێوارە بمرێ ئەوا لەبەهەشتیەکانە وە کەسێ لەئێوارە بیخوێنێ وە لەپێش بەیانی بمرێ ئەوە لەخەڵکی بەهەشتە.

٦٩٥. قَالَ اللهُ تَعَالَى: ﴿ٱسْتَغْفِرُواْ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا وَيُمْدِدْكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّٰتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَٰرًا﴾.سوورەتی نوح.

واتە: بەردەوامبە لە وتنی ئێوەی لەداوای لێخۆشبوون لە پـەروەردگارتان بکەن چونکە بەڕاستی ئـەو زاتێکـی لێخۆشـبووە، وە بارانتـان بـە لێزمـە بـۆ دەبارێنێ وە ماڵ و سامانتان پێ دەبەخـشێ هـاوڕێ لەگـەڵ بـاخ و باخانـدا، روبارو چەم جۆگەتان بۆ بەدی دێنێ.

## باب إستِغفار النبي (ﷺ) والتَوبةَ وَدعاء التهجد

٦٩٦. عَنْ أبي هُرَيْرَةَ رَضيَ اللهُ عَنْهُ قال: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّه (ﷺ) يَقُولُ وَاللّهِ إِنِّي لَأَسْتَغْفِرُ اللّهَ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ فِي الْيَوْمِ أَكْثَرَ مِنْ سَبْعِينَ مَرَّةً

## (بەشی/ لێخۆشبوونی کردنی پێغەمبەرو تۆبەکردن و دوعای شەونوێژ)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو دەیفەرمووی: سوێندم بەخوا من رۆژێ زیاتر لە حەفتا جار داوای لێخۆشبوون لەخوا دەکەم.

٦٩٧. عَنْ عَبْدِ اللّهِ بْنُ مَسْعُودٍ رَضيَ اللهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَال: ((إِنَّ الْمُؤْمِنَ يَرَى ذُنُوبَهُ كَأَنَّهُ قَاعِدٌ تَحْتَ جَبَلٍ يَخَافُ أَنْ يَقَعَ عَلَيْهِ وَإِنَّ الْفَاجِرَ يَرَى ذُنُوبَهُ كَذُبَابٍ مَرَّ عَلَى أَنْفِهِ فَقَالَ بِهِ هَكَذَا)) فقَالَ أَبُو شِهَاب: بِيَدِهِ فَوْقَ أَنْفِهِ.

عەبدوڵلای کوڕی مەسعود (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) فـەرمووی: ئیماندار کە تەماشای گونـاهی خـۆی دەکـات وەکـو یـەکێك لـەژێر چـیایەکی گەورەدابێ بترسێ بەسەری دابکـەوێ، وە تاوانبـاریش گونـاهی خـۆی وەکـو ئەوەیە کە مێشولەیەك دەبینێ بەسەر لووتییەوەبێ بەدەست لای ببات.

ئەبو شەهاب فەرمووی کە دەستی لەسەر لووتی دابنێ وایە.

٦٩٨. عَنْ أَنَس بن مالك رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) : ((للَّهُ أَفْرَحُ بِتَوْبَةِ عَبْدِهِ مِنْ أَحَدِكُمْ سَقَطَ عَلَى بَعِيرِهِ وَقَدْ أَضَلَّهُ فِي أَرْضٍ فَلَاةٍ)).

ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەفەرمووێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: خوای گەورە ئەوەندە کەیف خۆشە زیاتر لەوبەندەی کە ئەسپێکی لێ ون دەبێ و نان و خۆراکی لەسەرپشتی ئەو ولآخەبێ و زۆر دەگەڕێ لەبیابان کە دەبێنێتەوە ئەوەندە کەیف خۆش دەبێ خواش ئەوەندە زیاتر کەیف خۆش بەتۆبەی بەندەکانی.

٦٩٩. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما قال: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ إِذَا قَامَ مِنْ اللَّيْلِ يَتَهَجَّدُ قَالَ: ((اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ نُورُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ وَلَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ قَيِّمُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ وَلَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ الْحَقُّ وَوَعْدُكَ حَقٌّ وَقَوْلُكَ حَقٌّ وَلِقَاؤُكَ حَقٌّ وَالْجَنَّةُ حَقٌّ وَالنَّارُ حَقٌّ وَالسَّاعَةُ حَقٌّ وَالنَّبِيُّونَ حَقٌّ وَمُحَمَّدٌ حَقٌّ اللَّهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ وَبِكَ آمَنْتُ وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ وَبِكَ خَاصَمْتُ وَإِلَيْكَ حَاكَمْتُ فَاغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ وَلَا إِلَهَ غَيْرُكَ.

لە عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (رضي الله عنهما) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) کە هەڵدەستا شەو بۆ شەونوێژ دەیفەرموو: ( ) واتە: خودایە سوپاس و ستایشی بۆتۆیە تۆ هەتا هەتایە سۆزو روناکی ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لەناویدایە، وە خودایە سوپاس بۆتۆ کە پایەداری و مایەی بوونی هەمووشتێکی، وەڕاگری ئاسمانەکان و زەوی ئەوەی لەناوی دایە وە سوپاس و ستایشی بۆتۆ حەقی و راستی بەڵێنت حەقە و راستە پەیمانت راستە وتەت راستە وە شادبوون بەدیداری تۆ حەقە فەرموودەت راستە بەهەشت راستە و

ئاگر راستەو حەقە وە قیامەت راستە و پێغەمبەران راستن وە موحەممەد راستە و حەقە و نێردراوی خودایە، خودایە خۆم سپارد بەتۆو باوەڕم هەیە بەتۆ پشت و پەنام هەرتۆی دالْدام هێناوە بەرتۆ بەپشتی تۆ دەچم بگژ ناحەقی خۆم وە مەحکەمەو دادی خۆم دێنمەلات تۆ دەکەم بە حەکەم لێم خۆشبە لەگوناهی لەپێش و دوام و هەروەها لەگوناهی نهێنی و ئاشکرام و پێشخستن و پاشخستن بەدەستی تۆیە خودای راست و رەوان هیچ خودای تر نیە جگە لەتۆ وەهیچ پەرستراوێك نییە جگە لەخۆت نەبێ.

## باب الدُعاء عِندَ الخلاء والدُعاء عند الكرب

٧٠٠. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) إِذَا دَخَلَ الْخَلَاءَ قَالَ اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ الْخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ.

## (بەشی/ نزاکانی چوونە سەرئاو، نزاکانی ناخۆشی)

ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) کە دەچووە سەرئاو دەیفەرموو: (خوایە پەنا دەگرم بەتۆ لەجنۆکەی نێرو مێ).

٧٠١. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَدْعُو عِنْدَ الْكَرْبِ يَقُولُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ الْعَظِيمُ الْحَلِيمُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ.

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (رضي الله عنهما) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) لەکاتی ناخۆشی ئەم نزایەی دەکرد (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ الْعَظِيمُ الْحَلِيمُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ) واتە: هیچ پەرستراوێك نییە جگە لە الله نەبێت و گەورەو نەرم و نیانە هیچ پەرستراوێك نییە تەنها خۆی نەبێت کە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و پەروەردگاری عەرشی گەورەیە.

## باب التعوذ من البخل، وطلب غفران الخطايا

٧٠٢.عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ يُعَلِّمُنَا هَؤُلَاءِ الْكَلِمَاتِ كَمَا تُعَلَّمُ الْكِتَابَةُ: ((اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ الْبُخْلِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ الْجُبْنِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ أَنْ نُرَدَّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُرِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الدُّنْيَا وَعَذَابِ الْقَبْرِ)).

## (بەشی/ خۆپەنادان لەچروکی و داوا لێخۆشبوون لە گوناهکردن)

لەسەعدی کوڕی ئەبی وەقاص لەباوکی دەگێڕێتەوە کە دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) چۆن فێری نووسینی دەکردین ئا ئەوها فێری ئەم وشانەی دەکردین (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ الْبُخْلِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ الْجُبْنِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ أَنْ نُرَدَّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُرِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الدُّنْيَا وَعَذَابِ الْقَبْرِ) خوایەگیان خۆم پەنا داوە بەتۆ لە چروکی و لە ترسنۆکی وەلە تەمەنی زۆر خراپ وە خۆ پەنا دەگرم بەتۆ لەفیتنەی دونیا و سزای ناو گۆڕ.

٧٠٣.عَنْ أَبِي مُوسَى عَبد الله بن قيس عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ كَانَ يَدْعُو بِهَذَا الدُّعَاءِ رَبِّ اغْفِرْ لِي خَطِيئَتِي وَجَهْلِي وَإِسْرَافِي فِي أَمْرِي كُلِّهِ وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي خَطَايَايَ وَعَمْدِي وَجَهْلِي وَهَزْلِي وَكُلُّ ذَلِكَ عِنْدِي اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ وَأَنْتَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ.

لەئەبی موسای عەبدوڵلای کوڕی قەیس کە پێغەمبەر (ﷺ) کەعادەتی وابوو ئەم دوعایەی زۆر دەکرد ( ) واتە: خوایە لەتاوانم خۆشبە لەنەزانی و نەفامیم و لەزیادە ڕەوی و لەکارەکانم هەمووی و لەوەی کەتۆ لەمن باشتر

دەزانی و خوایە تاوانم بپۆشە، بەعەمدی و ئەنقەست بن چ بـە نـەزانی بـن چ بەگاڵتەوە بن وە ئەم جۆرە تاوانانەشم هەموو هەن وە خوایە لەتاوانی لەپێش و لەپاشم و ئەمەی بەدزی و ئەوەی بەئاشکراو کردوومە تۆ پێش بەرەو پـاش بەرەی وەتۆ لەسەر هەمووشتێ دەستەڵاتن هەیە.

## باب فضل التسبيح وذكر الله

٧٠٤.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قال: قالَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ تعالى عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((مَنْ قَالَ سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ فِي يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ حُطَّتْ خَطَايَاهُ وَإِنْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ)).

## (بەشی/ فەزڵی تەسبیح و زیکری خودا)

ئـەبو هـورەیرە (رضـي الله عنـه) دەفـەرمووێ پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فـەرمووی: کەسـێ بڵـێ سـبحان الله وبحمـده، سـەد جـاران خـوا تـاوانی لـێ هەڵدەوەرێنێ ئەگەر بەقەد کەفی دەریاش بن، واتـە پـاك و پـیرۆزی بـۆ خـواو سوپاس و ستایش بۆی.

٧٠٥.وَعَنْهُ أيضاً عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ تَعالى عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قال كَلِمَتَانِ خَفِيفَتَانِ عَلَى اللِّسَانِ ثَقِيلَتَانِ فِي الْمِيزَانِ حَبِيبَتَانِ إِلَى الرَّحْمَنِ سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ.

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: دوو وشە هەن کەلە سەرزار سوکن و سادەن بەڵام لەتەرازوودا قورسن وە خۆشەویستن بۆلای ڕەحمان و خوای بەبەزەیی کە ئەوانیش دوو وشەی (سبحان الله وبحمده، سبحان الله العظیم) واتە: پاك و بێگەردی بۆ خواو سوپاس و ستایشی بۆ ئەو و پاك و بێگەردی بۆ خوای گەورە.

٧٠٦. عَنْ أَبِي مُوسَى عَبد الله الأشعري رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَال: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) مَثَلُ الَّذِي يَذْكُرُ رَبَّهُ وَالَّذِي لَا يَذْكُرُ رَبَّهُ مَثَلُ الْحَيِّ وَالْمَيِّتِ.

**ئەبی موسای عەبدوڵلای ئەشعەری (رضي الله عنه) فەرمووی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: نمونەی ئەوکەسەی کە زیکرو یادی خوا دەکات و ئەوەی نایکات وەکو نموونەی مردو و زیندوو وایە.**

٧٠٧. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ تعالى عَنْهُ قَال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((إِنَّ لِلَّهِ مَلَائِكَةً يَطُوفُونَ فِي الطُّرُقِ يَلْتَمِسُونَ أَهْلَ الذِّكْرِ فَإِذَا وَجَدُوا قَوْمًا يَذْكُرُونَ اللَّهَ عزوجل تَنَادَوْا هَلُمُّوا إِلَى حَاجَتِكُمْ قَالَ فَيَحُفُّونَهُمْ بِأَجْنِحَتِهِمْ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا فَيَسْأَلُهُمْ رَبُّهُمْ عزّ وجلَ وَهُوَ أَعْلَمُ بهم مِنْهُمْ مَا يَقُولُ عِبَادِي قَالُوا يَقُولُونَ يُسَبِّحُونَكَ وَيُكَبِّرُونَكَ وَيَحْمَدُونَكَ وَيُمَجِّدُونَكَ قَالَ فَيَقُولُ عزّ وجلَ هَلْ رَأَوْنِي قَالَ فَيَقُولُونَ لَا وَاللَّهِ مَا رَأَوْكَ قَالَ فَيَقُولُ تعالى وَكَيْفَ لَوْ رَأَوْنِي قَالَ يَقُولُونَ لَوْ رَأَوْكَ كَانُوا أَشَدَّ لَكَ عِبَادَةً وَأَشَدَّ لَكَ تَمْجِيدًا وَأَكْثَرَ لَكَ تَسْبِيحًا قَالَ يَقُولُ فَمَا يَسْأَلُونِي قَالوا يَسْأَلُونَكَ الْجَنَّةَ قَالَ يَقُولُ تعالى وَهَلْ رَأَوْهَا قَالَ يَقُولُونَ لَا وَاللَّهِ يَا رَبِّ مَا رَأَوْهَا قَالَ يَقُولُ فَكَيْفَ لَوْ أَنَّهُمْ رَأَوْهَا قَالَ يَقُولُونَ لَوْ أَنَّهُمْ رَأَوْهَا كَانُوا أَشَدَّ عَلَيْهَا حِرْصًا وَأَشَدَّ لَهَا طَلَبًا وَأَعْظَمَ فِيهَا رَغْبَةً قَالَ تعالى فَمِمَّ يَتَعَوَّذُونَ قَالَ يَقُولُونَ مِنْ النَّارِ قَالَ يَقُولُ تعالى وَهَلْ رَأَوْهَا قَالَ يَقُولُونَ لَا وَاللَّهِ مَا رَأَوْهَا قَالَ يَقُولُ تعالى فَكَيْفَ لَوْ رَأَوْهَا قَالَ يَقُولُونَ لَوْ رَأَوْهَا كَانُوا أَشَدَّ مِنْهَا فِرَارًا وَأَشَدَّ لَهَا مَخَافَةً قَالَ فَيَقُولُ تعالى فَأُشْهِدُكُمْ أَنِّي قَدْ غَفَرْتُ لَهُمْ قَالَ يَقُولُ مَلَكٌ مِنْ الْمَلَائِكَةِ فِيهِمْ فُلَانٌ لَيْسَ مِنْهُمْ إِنَّمَا جَاءَ لِحَاجَةٍ قَالَ تعالى هُمْ الْجُلَسَاءُ لَا يَشْقَى بِهِمْ جَلِيسُهُمْ.

ئـەبو هـوڕەیرە (رضـي الله عنـە) دەفـەرمووێ پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرمووی: خودای گەورە چەشنە فریشتەیەکی تایبەتی هەیە، ئیشیان ئەوەیە بەڕێ و بانا دەسوڕێنەوەو بەشوێن ئـەهلی زیکردا دەگـەڕێن، جـا هـەرکاتێ دییان کەوا کۆمەڵێ یادی خـودا دەکـەن و کـۆڕی زیکریـان دابەسـتووە، قـاو لەیـەکتری دەکـەن و بەیـەکتر دەڵـێن: وەرن بـەلای کـاری خۆتانـەوە، ئەمـە ئەوەیە کەئێوە بۆی دەگەڕێن، فەرمووی: ئیتر کەڵەکە دەکەن لـەدەورییان و هەتا ئاسمانی خوارو بەباڵ دەخولێنـەوە، بەدەوریانـدا، جـا پـەروەردگاریان لێیان دەپرسێ (هەرچەن خـۆی باشـتر حاڵەکـە دەزانـێ) دەفـەرمووێ: ئـەم بەندانەی من دەڵێن چی؟ فەرمووی فریشتەکان دەفـەرمووی: (سـبحان الله) دەکەن و تۆ بەپاك و پیرۆز و بێ خەوش دەزانن و (الله اکبر) دەکەن و خودای خۆیان بەگەورە دەگرن و (الحمد لله) دەکەن و سوپاسی تۆدەکەن و بەهەموو جۆرێ بەشان و شکۆی تردا هەڵدەدەن، جا دەفەرمووێ: ئایا ئەمانە منییان بینیوە؟ دەفەرموون: نەبەخوا نەتیان دیوە، جا دەفەرمووێ: ئەی ئەگـەر بم بینن چۆنە؟ فەرمووی دەفەرمووی: ئەگەر بتبینن باشتر بەندەییت دەکەن و باشتر سوپاس و ستایش و باسی گەورەییت دەکەن و پتر تەسبیحاتت دەکەن و زیاتر باسی بێ خەوشیت دەکەن، جا خودا دەفەرمووێ: ئـەی باشـە داوای چـیم لـێ دەکـەن؟ فـەرمووی دەفـەرمووی: داوای بەهەشـتت لـێ دەکـەن، دەفەرمووێ: ئایا دیویانە؟ فـەرمووی دەفـەرموون: نـەبخودا ئـەی خودایـە! نەیان دیوە، فەرمووی دەفەرمووێ: ئەی ئەگـەر ببیـنن چـۆنە؟ فـەرمووی–دروودی خوای لەسەربێ–دەفـەرموون: ئەگـەر ببیـنن باشـتر سـوور دەبـن، لەسەری و باشتر هەڵپەی بۆدەکەن و زیاتر حەزی لێ دەکـەن، دەفـەرمووێ: ئەی لەچی دەترسن و خۆیانی لێ دەپارێزن؟ فەرمووی دەفـەرموون: لـەئاگر

دەترسن و پەنا دەگرن بەخودا لێی، فەرمووی: دەفەرمووێ: ئایا ئاگریان دیوە فەرموو دەفەرمووێ: نە بەخودا نەیان دیوە دەفەرمووێ ئەی ئەگەر ببینن چۆنە فەرمووی: دەفەرموون: ئەگەر ببینن زیاتر لەدەستی هەڵدێن و باشتر کۆی لێ دەکەنەوە، فەرمووی: ئەوجا دەفەرمووێ: دە ئێوە بەشایەت بن ئەوا من لێیان خۆش بووم، جا فریشتەیێ لەفریشتەکان دەڵێ: کابرایەکیان لەناو دایە لەوان نییە، پیاوێکی خراپە، بۆ زیکری خودا نەهاتبوو؟ دەفەرمووێ: کۆمەڵێ کوڕی وا هاونیشینییان لەبەر خاتری ئەوان لەبەدبەختی رزگاری دەبێ و بەهۆی ئەوانەوە ئەویش خۆش بەخت دەبێ؟

## باب اسماء الله الحسنى والصحة والفراغ كن كانك غريب

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أيضاً عَنْ النَّبِيِّ صَلى اللهُ عَلَيه وَآلِه وَسلم قَال: ((لِلَّهِ له تِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ اسْمًا مِائَةٌ إِلَّا وَاحِدًا لَا يَحْفَظُهَا أَحَدٌ إِلَّا دَخَلَ الْجَنَّةَ وَهُوَ وَتْرٌ يُحِبُّ الْوَتْرَ)).

## (بەشی/ ناوە جوانەکانی خواو لەش ساغی و بێ کاری و لەدونیادا وەکو غەریب وایە)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: خوای گەورە نۆهەدو نۆ ناوی هەیە، سەد ناو یەك ناوی کەمە کەسێ لەبەری بکات و بیپارێزێ ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە وە تاکیشە و تاکی خۆش دەوێ.

٧٠٨. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَال: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) نِعْمَتَانِ مَغْبُونٌ فِيهِمَا كَثِيرٌ مِنْ النَّاسِ الصِّحَّةُ وَالْفَرَاغُ.

لەعەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (رضي الله عنهما) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (دوو نیعمەتی خوای گەورە هەن زۆر کەس تیادا دۆڕاون ئەوانیش لەش ساغی و بێ کارییە).

٧٠٩.قالَ اللهُ تَعالَى: ﴿أَنَّمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَزِينَةٌ وَتَفَاخُرٌۢ بَيْنَكُمْ وَتَكَاثُرٌ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَٰدِ ۖ كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ ٱلْكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَكُونُ حُطَٰمًا ۖ وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَغْفِرَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنٌ ۚ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلْغُرُورِ﴾. (سورة الحديد)

واتە: چاك بزانن ژیانی دونیا تەنها بریتییە لە یاری و گەمە و رازاندنەوەو خۆهەڵکێشان لەنێوان یەکتریدا، هەروەها زۆرکردنی سامان و ماڵ و منداڵ جا ئەوانە هەرهەمووی وەك بارانێکی بەپیت وایە کە ببێتە مایەی بەرهەمێکی زۆر جوتیاران سەرسام بکات لەوەودوا وشك بێتن و زەرد هەڵگەڕێت، پاشان وردو خاش بێت و بکەوێت وە لەقیامەتیشدا سزای زۆر سەخت بۆ دنیا پەرستان ئامادە کراوە وە لەولا ئەوە بۆ بڕواداران رەزامەندی و لێخۆشبوونی خوا، ژیانی دونیاش جگە لەوەی بریتییە لە رابواردنێکی کەم شتێکی ترنییە زۆر کەس پێی غەڕاو دەست خەڕۆ بووە.

٧١٠.عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا قَال: أَخَذَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ تَعالى عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ بِمَنْكِبِي فَقَالَ: ((كُنْ فِي الدُّنْيَا كَأَنَّكَ غَرِيبٌ أَوْ عَابِرُ سَبِيلٍ)) وكَانَ ابْنُ عُمَرَ ( ضي الله عنهما) يَقُولُ إِذَا أَمْسَيْتَ فَلَا تَنْتَظِرْ الصَّبَاحَ وَإِذَا أَصْبَحْتَ فَلَا تَنْتَظِرْ الْمَسَاءَ وَخُذْ مِنْ صِحَّتِكَ لِمَرَضِكَ وَمِنْ حَيَاتِكَ لِمَوْتِكَ.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنهما) دەفـەرمووێ پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) شانی منی گرت و فەرمووی: لەم جیهانەدا خۆ بەئاوارەو غەریب دانێ یان بەڕێبوارو داماو واتە ئەم دونیایە بـەماڵی خـۆتی هەتاهـەتایی مەزانـە وە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنه) دەیفەرموو ئەگەر ئێوارەت کردەوە چاوەڕوانی بەیانی مەکە وەئەگەر بەیانیت کردەوە چاوەڕوانی ئێوارە مەکە وە هەوڵبدە بۆ کاتی نەساغی و نەخۆشی و ژیانت بەهەل بزانە هەوڵ و کۆششی بۆ بدە بۆ پاش مردنت.

## باب طول الأمل، والعَمَل لِوجه الله تعالى، وفتنة المال

٧١١. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((يَكْبَرُ ابْنُ آدَمَ وَيَكْبَرُ مَعَهُ اثْنَانِ حُبُّ الْمَالِ وَطُولُ الْعُمُرِ)).

## (بەشی/ دووروو درێژی هیواو ئاوات و کردەوەکردن بۆخوا وە فیتنەی ماڵ و سامان)

ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: نەوەی ئادەمی گەورەدەبێت و دوو شتیش لەگەڵیان گەورە دەبـن ئـەوانیش خۆشەویـستی مـاڵ و سـامان وە درێـژی تەمـەن و هیـواو ئـاوات بەدونیابوون.

٧١٢.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي الله عَنْهُ عَنْ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: (( يَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى مَا لِعَبْدِي الْمُؤْمِنِ عِنْدِي جَزَاءٌ إِذَا قَبَضْتُ صَفِيَّهُ مِنْ أَهْلِ الدُّنْيَا ثُمَّ احْتَسَبَهُ إِلَّا الْجَنَّةُ)).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: خوای گەورە دەفەرمووێ: کاتێ بەندەی موسڵمانی خۆم

خۆشەویستەکەی خۆیم لێ سەندەوە کە ماڵ و سامان و منداڵ و خۆشی بەشی ئەویش سەبرو ئارامی لەسەر گرت و سوپاسی خوای کرد ئەوە لەپاداشتی ئەوەدا بەهەشتی دەدەمێ.

٧١٣.عَنْ عِتْبَان بْنَ سَالِم الْأَنْصاريَّ قَال: غَدَا عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ لَنْ يُوَافِيَ عَبْدٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَقُولُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ يَبْتَغِي بِهِ وَجْهَ اللَّهِ إِلَّا حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ النَّارَ.

لەعیتبابی کوڕی سالیمی ئەنصاری دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەیانییەك هاتەلام و فەرمووی: هەریەندەیێ لەرۆژی قیامەتدا کەدێ بۆ دیوانی خوا کەلەم دونیا ئەم وشەی گوتبێ وە مەبەستی ڕەزامەندی خوابوویێ ئەوا مسۆگەر خوای گەورە ئاگری دۆزەخی لێ حەڕام دەکات کە وشەکەش (لا اله الا الله)یە.

٧١٤.عَنْ ابْن عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُول سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: ((لَوْ كَانَ لِابْنِ آدَمَ وَادِيَانِ مِنْ مَالٍ لَابْتَغَى ثَالِثًا وَلَا يَمْلَأُ جَوْفَ ابْنِ آدَمَ إِلَّا التُّرَابُ وَيَتُوبُ اللَّهُ عَلَى مَنْ تَابَ)).

له عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (رضي الله عنهما) دەفەرمووێ گوێم لەپێغەبەر بوو دەیفەرموو: ئەم ئادەمیزادە ئەوەندە چاو چنۆکەو چاو برسیەو بەتەماعە ئەگەر بەقەد دوو شیو ماڵ و سامان و زێڕی هەبێت حەزی لێیەتی ببێت بەسێ شیو ئیتر بەگڵ نەبێت چاوی پڕنابێت و خوای گەورەش تۆبە لەوکەسە وەردەگرێ کە پەشیمان بێتەوەو تۆبەی بکات.

٧١٥.قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ وَٱلْأَنْعَٰمِ

وَٱلْحَرْثِۗ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾ قَالَ عُمَرُ بن الخطّاب رَضي اللهُ عَنْهُ: اللّهُمَّ إِنَّا لَا نَسْتَطِيعُ إِلَّا أَنْ نَفْرَحَ بِمَا زَيَّنْتَهُ لَنَا. اللّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ أَنْ أُنْفِقَهُ فِي حَقِّهِ وقالَ تَعَالَى: ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَٰلَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ ﴿١٥﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ إِلَّا ٱلنَّارُۖ وَحَبِطَ مَا صَنَعُواْ فِيهَا وَبَٰطِلٌ مَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴾.

واته: بۆ خەڵكان رازاندراوەتەوە لەئارەزووی ئافرەت و بوونی نەوەی نێرینەو و خاوەنێتی ئاڵتون و زێڕو زیوی زۆرو زەبەندەو ئەسپی چاك و رەسەن و هۆیەكانی هاتووچۆو هەروەها مەڕومالات و زەوی كشتوكاڵ ئەوانە هەمووی نازو نیعمەتی ژیانی دونیان خواش بۆ چاكان شوێنی گەڕانەوەی رازاوو خۆش لای خۆی ئامادە كردووە كە بەهەشتە.

وە عومەری كوڕی خەطاب فەرمووی: خوایە ئێمە ناتوانین پێیان كەیف خۆش نەبین بەوەی خوا بۆ ئێمەی رازاندۆتەوە خوایە داوات لێ دەكەم كە ئەم ماڵ و سامانە لەماف و حەق خۆی سەرف بكەین.

وە خوای گەورەش دەفەرمووێ: ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَٰلَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ ﴿١٥﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ إِلَّا ٱلنَّارُۖ وَحَبِطَ مَا صَنَعُواْ فِيهَا وَبَٰطِلٌ مَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴾ (نحل).واته: هەركەسێك تەنها ژیانی دنیاو رازاوەیی و خۆش گوزەرانییەكەی بوێت ئەوە پاداشتی هەوڵ و كۆششی ئەوجۆرە كەسانە دەدەینەوە لەدونیادا ئەوانیش تێدا هیچییان لێ كەم ناكرێتەوە، ئا ئەوانە ئەوانەن كەلە رۆژی دواییدا جگە لەئاگری دۆزەخ هیچی تریان بۆنییەو ئەوەی كە كردیشی لەدونیادا پووچەڵ

بۆرەو بێ نرخە هەروەها ئەوكارو كردەوەی كە دەیان كرد بەتاڵ و پووچ و بۆشە.

٧١٦. عَنْ أبي ذر رَضي الله عَنْهُ أنَّه مَشى مع النَّبي صَلى اللهُ عَلَيهِ وآلهِ وَسلم سَاعَةً فقَالَ(ﷺ): ((إنَّ الْمُكْثِرِينَ هُمُ الْمُقِلُّونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إلَّا مَنْ أعْطَاهُ اللَّهُ خَيْرًا فَنَفَحَ فِيهِ يَمِينَهُ وَشِمَالَهُ وَبَيْنَ يَدَيْهِ وَوَرَاءَهُ وَعَمِلَ فِيهِ خَيْرًا)).

ئەبی ذەر (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە كە لەگەڵ پێغەمبەری خوا رۆیشتووە لەكاتێكدا وە فەرموویەتی (ﷺ): ئەوانەی لەدونیا ماڵ و سامانییان زۆرەو ماڵ سەرف ناكەن و رژدی دەكەن لە دوارۆژدا كەمترین پاداشت و مافیان پێ دەدرێت تەنها ئەوانەی خوا پێیداون لەچاكە كە ماڵ سەرف دەكەن و دەیبەخشن بەلای راست و چەپ و پێش و پاشییاندا.

## باب الغِنى غِنى النفس، وفَضل الفُقر وَحِفظ اللسان

٧١٧. عَنْ أبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ : ((لَيْسَ الْغِنَى عَنْ كَثْرَةِ الْعَرَضِ وَلَكِنَّ الْغِنَى غِنَى النَّفْسِ)).

## (بەشی/ دەوڵەمەندی دەوڵەمەندی دڵە و فەزڵی هەژاری و پاراستنی زمان)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە كە دفەرمووێ: دەوڵەمەندی ئەوە نییە كە ماڵ و سامانی زۆربێت بەڵكو دەوڵەمەندی ئەوەیە كە دڵی و نەفسی دەوڵەمەند بێت.

٧١٨. عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: مَرَّ رَجُلٌ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ لِرَجُلٍ عِنْدَهُ جَالِسٍ مَا رَأْيُكَ فِي هَذَا فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ أشْرَافِ النَّاسِ هَذَا وَاللَّهِ حَرِيٌّ إنْ خَطَبَ أنْ يُنْكَحَ وَإنْ شَفَعَ أنْ يُشَفَّعَ (وإنْ قَالَ أن يُسْمَع لِقَولِه) قَالَ

سهل :فَسَكَتَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) ثُمَّ مَرَّ رَجُلٌ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مَا رَأْيُكَ فِي هَذَا فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ هَذَا رَجُلٌ مِنْ فُقَرَاءِ الْمُسْلِمِينَ هَذَا حَرِيٌّ إِنْ خَطَبَ أَنْ لَا يُنْكَحَ وَإِنْ شَفَعَ أَنْ لَا يُشَفَّعَ وَإِنْ قَالَ أَنْ لَا يُسْمَعَ لِقَوْلِهِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((هَذَا خَيْرٌ مِنْ مِلْءِ الْأَرْضِ مِنْ مِثْلِ هذا)).

سەهلی کوڕی سەعد (رضي الله عنـه) دەگێڕێتـەوە پیـاوێکی دەوڵەمەنـد بەلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕەت بوو فەرمووی: بەپیاوێکی تر ئـەم پیـاوە چۆنە بەلاتانـەوە ئـەوانیش گوتیـان ئەمـە پیـاوێکی خانەدانـە بـەخوا ئەمـە شایستەی ئەوەیە ئەگـەر داوای ئـافرەت بکـات ئـافرەتی پـێ دەدرێ ئەگـەر تکایێ بکات تکای دەگیرێ ئەگەر قسەی بکات گوێی بۆ دەگیرێ پێغەمبەریش بێ دەنگ بوو لەپاشان پیاوێکی تر بەوێدا ڕەت بوو کە هەژارو داماو بوو جـا فەرمووی ئەم پیاوە چۆنە بەلاتانەوە؟ گوتییان ئەی پێغەمبـەری خـوا ئەمـە پیاوێکی هەژارانی موسڵمانانە ئەمە ئەگەر بچێ بۆ داخوازی ئافرەت ئافرەتی پێ نادرێ وە ئەگەر تکا بکات تکای ناگیرێ وە ئەگەر قسەش بکات گوێی بۆ ناگیرێ پێغەمبەریش فەرمووی: دەسا ئەمەیان باشترە لـەپڕ زەوی لەوێنـەی ئەویتریان قەدرو ڕێزی لەلای خوای گەورە بەدڵی پاکە بەماڵی زۆر نییە.

٧١٩.وَعَنْهُ أيضاً أَنَّ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ تَعالى عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((مَنْ يَضْمَنْ لِي مَا بَيْنَ لَحْيَيْهِ وَمَا بَيْنَ رِجْلَيْهِ أَضْمَنْ لَهُ الْجَنَّةَ)). قالَ اللهُ تَعَالَى:

﴿ مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ﴿١٨﴾ ﴾.

لەسـەهلی کـوڕی سـەعد (رضـي الله عنـه) کەپێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویەتی: کەسێ دەستەبەری (ضمان) بکات لەنێوان هەردوو لێوەکانی و وە لەنێوان پێیەکانی منیش دەستەبەری ئەودەکەم لەچوونی بۆ بەهەشت.

وە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ﴾ (سورة–ق) واتە: هەر وشەیێ لە زارتان بێتە دەرێ ئەوا لەلایەن کەسێکی چاودێرو نووسەرەوە تۆمار دەکرێت.

٧٢٠.وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضي الله عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِه وَسَلَّمَ قَال: ((إِنَّ الْعَبْدَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مِنْ رِضْوَانِ اللَّهِ لَا يُلْقِي لَهَا بَالًا يَرْفَعُهُ اللَّهُ بِهَا دَرَجَاتٍ وَإِنَّ الْعَبْدَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مِنْ سَخَطِ اللَّهِ لَا يُلْقِي لَهَا بَالًا يَهْوِي بِهَا فِي جَهَنَّمَ)).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: بەندە وا ڕێك دەکەوێ وتەیێ دەکا کە دەبێتە مایەی ڕازیبوونی خودا، ئەوەندەیش دڵی ناداتێ بەهۆی گوتنی ئەو قسەیەوە خودا ئەو بەندەیە چەندین پلە بەرز دەکاتەوە، وە ڕێ دەکەوێ بەندە وتەیێ دەکات کە بەلای خۆیەوە ئەوەندە دڵی ناداتێ و بچووکە بەڵام لەلای خواوە ئەوەندە گەورەیە و دەبێتە هۆی توڕەبوونی خودا لەئەنجامدا دەخرێتە ئاگری دۆزەخ.

## باب الخَوف من الله تعالى والإنتهاء عَنْ المَعاصي والجنّة قَريبةٌ

٧٢١.عَنْ حُذَيْفَةَبن اليمان رَضيَ اللهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ))انَ رَجُلٌ مِمَّنْ كَانَ قَبْلَكُمْ يُسِيءُ الظَّنَّ بِعَمَلِه فَقَالَ لِأَهْله إِذَا أَنَا مُتُّ فَخُذُونِي فَذَرُّونِي فِي الْبَحْرِ فِي يَوْمٍ صَائِفٍ فَفَعَلُوا بِهِ فَجَمَعَهُ اللهُ عزّ وجلَ ثُمَّ قَالَ مَا حَمَلَكَ عَلَى الَّذِي صَنَعْتَ قَالَ مَا حَمَلَنِي إِلَّا مَخَافَتُكَ فَغَفَرَ لَهُ)).

## (بەشی/ ترسان لەخوا وازهێنان لەتاوان، وە بەهەشت نزیکە)

لە حوذەیفەی کوڕی یەمان (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرمووێ: پیاوێ لەپێش ئێوەدا هەبوو گومانی خراپ بوو بە کردەوەکانی و بەکوڕەکانی وت ئەگەر مردم پارچە پارچەم بکەن و لەرۆژێکی رەشەبای گەرمدا بم خەنە ناو دەریاوە ئەوانیش ئاوایان کرد خوای گەورەش فەرمانی کرد کۆبکرێتەوە، وە پێی فەرموو چی وای پێ کردووی ئاوا فەرمان بکەی؟ ئەویش وتی لەبەر ترسی تۆ بوو ئاوام کرد بەخۆما خوای گەورەش لێی خۆش بوو.

٧٢٢. عَنْ أَبِي مُوسَى الأشعَرِي رَضيَ اللهُ عَنْهُ قَال: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) مَثَلِي وَمَثَلُ مَا بَعَثَنِي اللَّهُ بِهِ كَمَثَلِ رَجُلٍ أَتَى قَوْمًا فَقَالَ رَأَيْتُ الْجَيْشَ بِعَيْنَيَّ وَإِنِّي أَنَا النَّذِيرُ الْعُرْيَانُ فَالنَّجَا فالنَّجَاءَ فَأَطَاعَتْهُ طَائِفَةٌ فَأَدْلَجُوا عَلَى مَهْلِهِمْ فَنَجَوْا وَكَذَّبَتْهُ طَائِفَةٌ فَصَبَّحَهُمْ الْجَيْشُ فَاجْتَاحَهُمْ.

لەئەبی موسای ئەشعەری (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: نمونەی منو ئەو ئاینەی من کە خوا بۆی ناردووم وەك نمونەی پیاوێك وایە بچێتە ناو هۆزەکەی و بڵێ ئەی خزمینە من بەهەردوو چاوی خۆم لەشکرەکەی دوژمنم دی دەیویست داپارێتە سەرتان، ئەوا من وەك ترسێنەرێکی راست و دڵسۆز ئاگادارتان دەکەمەوە وە فریای خۆتان بکەون خۆتان رزگار بکەن جا تاقمێ لەم هۆزە بەگوێی بکەن و بەزووی دەرباز دەبن و تاقمی تر باوەڕ ناکەن و لەشوێنی خۆیان تا بەیانی بمێننەوە جا لەگەردی بەیانیدا لەشکرەکە بداتە سەریان و تەفرو تونایان بکات.

٧٢٣. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو رَضِيَ اللهُ عَنْهُ يَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ وَالْمُهَاجِرُ مَنْ هَجَرَ مَا نَهَى اللَّهُ عَنْهُ.

**لەعەبدوڵڵای کوڕی عەمر (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەری (ﷺ) فەرمووی: موسڵمان ئەوەیە موسڵمانان لەدەست و زمانی ئەمین و سەلامەت بن وە کۆچەریش ئەوەیە کە کۆچ بکات لەوشتەی خوا نەهی و قەدەغەی کردووە.**

٧٢٤. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مَسعُود رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَال: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ)الْجَنَّةُ أَقْرَبُ إِلَى أَحَدِكُمْ مِنْ شِرَاكِ نَعْلِهِ وَالنَّارُ مِثْلُ ذَلِكَ.

**عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بەهەشت بەهەریەکێکتان نزیکترە لە ئاوزێنەی کەوشەکانی وە ئاگریش بەهەمان شێوە.**

## باب لِيَنظر إلى منْ هُوَ أسفَل مِنهُ ومنْ همَّ بِحسنة أو سَيِئة

٧٢٥. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَال: ((إِذَا نَظَرَ أَحَدُكُمْ إِلَى مَنْ فُضِّلَ عَلَيْهِ فِي الْمَالِ وَالْخَلْقِ فَلْيَنْظُرْ إِلَى مَنْ هُوَ أَسْفَلَ مِنْهُ)).

## (بەشی/ با کەسێ تەماشای لەخۆی نزمتر بکات، وە کەسێ ویستی چاکە یان خراپە بکات)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) کە دەفەرمووێ: ئەگەر تەماشای کەسێکتان کرد کەلە ماڵ و سامان و شێوەو جوانیدا فەزڵ و باوی هەبوو بەسەر ئێوەوە با تەماشای لەخۆی خوارترو نزمتر بکات نەبادا خۆی بەمەغدور بزانێ.

٧٢٦. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) فِيمَا يَرْوِي عَنْ رَبِّهِ عَزَّ وَجَلَّ قَالَ: ((قَالَ إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ كَتَبَ الْحَسَنَاتِ وَالسَّيِّئَاتِ ثُمَّ بَيَّنَ ذَلِكَ فَمَنْ هَمَّ بِحَسَنَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا كَتَبَهَا اللَّهُ لَهُ عِنْدَهُ حَسَنَةً كَامِلَةً فَإِنْ هُوَ هَمَّ بِهَا فَعَمِلَهَا كَتَبَهَا اللَّهُ لَهُ عِنْدَهُ عَشْرَ حَسَنَاتٍ إِلَى سَبْعِ مِائَةِ ضِعْفٍ إِلَى أَضْعَافٍ كَثِيرَةٍ وَمَنْ هَمَّ بِسَيِّئَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا كَتَبَهَا اللَّهُ لَهُ عِنْدَهُ حَسَنَةً كَامِلَةً فَإِنْ هُوَ هَمَّ بِهَا فَعَمِلَهَا كَتَبَهَا اللَّهُ لَهُ سَيِّئَةً وَاحِدَةً.

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (رضي الله عنهما) لەپێغەمبەر (ﷺ) کەئەویش خوای گەورە دەگێڕێتەوەو ریوایەت دەکات کە دەفەرمووێ: (جل جلالە) خودا هەموو چاکەیەك و هەموو خراپەیەکی لە (لوح المحفوظ) نوسیوەو بەم شێوەیە روونی کردۆتەوە، بۆهەموو کەسێ، ئەگەر کەسێ ویستی چاکەیێ بکاو بۆی نەکرا، ئەوە خودا لەلای خۆی چاکەیەکی تەواوی بۆ دەنووسێ، وە ئەگەر کەسێ ویستی چاکەیێ بکاو لەهەمان کاتدا کردی ئەوە خودای سەرداروو سەروەر لەلای خۆی لە دە چاکەوە تا حەوت سەد چاکە تا ئەوەندەی خودا خۆی حەزدەکا چاکەی بۆ دەنووسێ، وە ئەگەر کەسێ ویستی خراپەیێ بکات بەڵام نەیکرد ئەوە خودا لەلای خۆی چاکەیەکی تەواوی بۆ دەنووسێ، وە ئەگەر ویستی خراپەیێ بکات و لەدواییدا ئەنجامیدا ئەوە خوای گەورە یەك خراپەی بۆ دەنووسێ.

## باب الرِياء والسُمعة والتَواضُع

٧٢٧. عَنْ سَلَمَةَ قَال: سَمِعْتُ جُنْدَبًا رَضِيَ اللهُ عَنْهُما قال سَمعتُ رَسُول الله (ﷺ) يقول: ((مَنْ سَمَّعَ سَمَّعَ اللَّهُ بِهِ وَمَنْ يُرَائِي يُرَائِي اللَّهُ بِهِ)).

### (بەشی/ ریاو ریابازی و ملکەچی)

سەلەمە دەفەرمووێ گوێم لە جوندوب بوو (رضـي الله عنـه) دەفـەرمووێ گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەیفـەرموو: کەسـێ بـۆ دونیـاو روالّـەت ریابازی هەرکارێ بکات خودا لەرۆژی قیامەتدا پـەردەی لـەروو هەڵدەماڵی و ریاکـەی ئاشـکرا دەکـات وە کەسـێ بـۆ نـاوو ناوبـانگ و شـۆرەت چـاکەو خواپەرستی بکات خودا لەجیهاندا دەیکاتە پەنـد عیـبرەت لەقیامەتیـشا بـێ پاداشت دەبێ.

٧٢٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((قَالَ اللهُ تعالى: مَنْ عَادَى لِي وَلِيًّا فَقَدْ آذَنْتُهُ بِالْحَرْبِ وَمَا تَقَرَّبَ إِلَيَّ عَبْدِي بِشَيْءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ مِمَّا افْتَرَضْتُ عَلَيْهِ وَمَا يَزَالُ عَبْدِي يَتَقَرَّبُ إِلَيَّ بِالنَّوَافِلِ حَتَّى أُحِبَّهُ فَإِذَا أَحْبَبْتُهُ كُنْتُ سَمْعَهُ الَّذِي يَسْمَعُ بِهِ وَبَصَرَهُ الَّذِي يُبْصِرُ بِهِ وَيَدَهُ الَّتِي يَبْطِشُ بِهَا وَرِجْلَهُ الَّتِي يَمْشِي بِهَا وَإِنْ سَأَلَنِي لَأُعْطِيَنَّهُ وَلَئِنْ اسْتَعَاذَنِي لَأُعِيذَنَّهُ)).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: خوای گەورە دەفەرمووێ: (کەسێ شەڕو دوژمنایەتی بکات لەگەڵ دۆستی من ئەوە دوژمنایەتی منی کردووە خۆم بۆ شەڕی ئەو ئامادە کردووە وە بەندەی من بەهیچ شتێکی باش و خۆشەویست وەك ئەوە خۆی لەمن نزیـك ناکاتـەوە کەوەك کردنی ئەوشتانەی فەرزو پێویستم کردووە لەسەری وە باشترین هۆش بۆ نزیکبوونەوە لەمن جێبەجێ کردنی فەرزەکانە وە بەرەبـەرە بەنـدەی مـن

بەكردنی سوننەتەكان خۆی لەمن نزیك دەكاتەوە خۆی دێنێتە پێشەوە هەتا خۆشەویست دەبێ لەلام جا كاتێ بەندە خۆشەویست بوو لەلام ئیتر من خۆم دەبم بەگوێ و چاوو دەست و پێیەكانی وە هەر بەدڵی من و زاری من نەبێ نەگوێ دەداتێ و نە تەماشای دەكا وەو نە دەستی بۆ دەباو وەنە بۆیدەڕوات وە ئەگەر پەنام بۆ بێنێ پەنای دەدەم وە ئەگەر داوام لێ بكات ئەوا دەیدەمێ.

## باب من أحَبَ لِقاءَ الله، وَسكرات المَوت، ويَقبِضَ الله الأرض

٧٢٩. عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ أَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ وَمَنْ كَرِهَ لِقَاءَ اللَّهِ كَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَهُ، قَالَتْ عَائِشَةُ (أَوْ بَعْضُ أَزْوَاجِهِ رضي الله عَنْهُنَ) إِنَّا لَنَكْرَهُ الْمَوْتَ قَالَ عليه الصلاة والسلام لَيْسَ ذَاكِ وَلَكِنَّ الْمُؤْمِنَ إِذَا حَضَرَهُ الْمَوْتُ بُشِّرَ بِرِضْوَانِ اللَّهِ وَكَرَامَتِهِ فَلَيْسَ شَيْءٌ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا أَمَامَهُ فَأَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ وَأَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ، وَإِنَّ الْكَافِرَ إِذَا حُضِرَ بُشِّرَ بِعَذَابِ اللَّهِ وَعُقُوبَتِهِ فَلَيْسَ شَيْءٌ أَكْرَهَ إِلَيْهِ مِمَّا أَمَامَهُ كَرِهَ لِقَاءَ اللَّهِ وَكَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَهُ)).

## (بەشی/ كەسێ بیەوێ بەدیداری خوا شادبێ، ناخۆشی گیانەڵاو خوا زەوی كۆ دەكاتەوە)

عوبادەی كوڕی صامیت (رضي الله عنه) لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) كەفەرموویەتی: كەسێ پێی خۆش بێ بەدیداری خوا شادبێ خواش دیداری ئەوی پێ خۆشە وە كەسێ دیداری خوای پێ ناخۆش بێ خواش دیداری ئەوی پێ ناخۆشە، عائیشە (رضي الله عنها) یان یەكێك لە خێزانەكانی پێغەمبەر

فەرمووی ئێمە مردنمان پێ ناخۆشە، پێغەمبەری خواش فەرمووی: مەبەست ئەوەنییە کەتۆ تێیگەیشتووی بەڵام ئیماندار لەسەرە مەرگدا فریشتە مژدەی رەزامەندی خوای دەدەنێ ئیتر ئەویش هیچی تری وەکو ئەوشتە لەدونیادا پێ خۆش نابێ وە حەز بە دیداری خوا دەکات خواش حەز لەدیداری ئەو دەکات وە کافریێ، برواش ئەگەر مردنی هات مژدەی ئازارو سزای خوای پێ دەدەن ئەویش هیچی تری وەك ئەورۆژە پێ ناخۆش نابێ وە حەز بە دیداری خوا ناکات و خواش حەز بە دیداری ئەو ناکات.

٧٣٠.عَنْ أَبِي قَتَادَةَ الْأَنْصَارِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّهُ كَانَ يُحَدِّثُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ مُرَّ عَلَيْهِ بِجِنَازَةٍ، فَقَالَ مُسْتَرِيحٌ وَمُسْتَرَاحٌ مِنْهُ. قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا الْمُسْتَرِيحُ وَالْمُسْتَرَاحُ مِنْهُ؟ قَال(ﷺ) : ((الْعَبْدُ الْمُؤْمِنُ يَسْتَرِيحُ مِنْ نَصَبِ الدُّنْيَا وَأَذَاهَا إِلَى رَحْمَةِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ وَالْعَبْدُ الْفَاجِرُ يَسْتَرِيحُ مِنْهُ الْعِبَادُ وَالْبِلَادُ وَالشَّجَرُ وَالدَّوَابُّ)).

ئەبی قەتادەی ئەنصاری (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە تەرمێك بەلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) رەتبوو فەرمووی: یان بۆخۆی ئیسراحەت و رزگاری بوو، یان خەڵك لەدەستیان ئیسراحەت و رزگاریان بوو، گوتیان چۆن چۆنی ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: (بەندەی ئیماندار کە دەمرێ بۆخۆی لەکێشە چەرمەسەری دونیا رزگاری دەبێت و دەحەسێتەوە بەڵام بەندەی تاوانبار کە دەمرێ بەهۆی مردنی ئەوەوە خەڵکان و وڵات و درەخت و زیندەوەر لەدەست زیانی ئەو رزگاری دەبێت.

٧٣١.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((يَقْبِضُ اللَّهُ الْأَرْضَ وَيَطْوِي السَّمَاءَ بِيَمِينِهِ ثُمَّ يَقُولُ جَلَّ وَعلا: أَنَا الْمَلِكُ أَيْنَ مُلُوكُ الْأَرْضِ)).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرمووێ: خوای گەورە زەوی کۆدەکاتەوە و ئاسمانەکانیش لول پێچ دەکات لای دەدات بەدەستی راستی قودرەتی خۆی لەپاشان خوای گەورە دەفەرمووێ من پادشام کوان پادشاکانی زەوی.

## باب يوم يَقُومُ النّاس، واتقوا النّار، والجنّة والنّار والحَوض

٧٣٢. وَعَنْهُ أيضاً رَضيَ اللهُ عَنْهُ قال: قالَ رَسُولَ اللّه (ﷺ) ((يَعْرَقُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يَذْهَبَ عَرَقُهُمْ فِي الْأَرْضِ سَبْعِينَ ذِرَاعًا وَيُلْجِمُهُمْ حَتَّى يَبْلُغَ آذَانَهُمْ)).

## (بەشی/ هەڵسانەوەی خەڵکان لەرۆژی قیامەت وە لەئاگر خۆتان بپارێزن وە بەهەشت و دۆزەخ و حەوزی کەوسەر)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: لەرۆژی قیامەتدا ئەوخەڵکە دەکەونە ناڕەحەتییەوە ئارەقە دەکەن و ئارەقەیان ئەوەندە زۆردەبێت هەتا حەفتا باڵ ئارەقەیان بە لەزەویدا دەڕوات هەتا دەگاتە لغاویان گەلێ جار دەگاتە بنا گوێیان.

٧٣٣. عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ رَضيَ اللهُ عَنْهُ قَال: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): ((اتَّقُوا النَّارَ ثُمَّ أَعْرَضَ وَأَشَاحَ ثُمَّ قَالَ اتَّقُوا النَّارَ ثُمَّ أَعْرَضَ وَأَشَاحَ ثَلَاثًا حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ يَنْظُرُ إِلَيْهَا ثُمَّ قَالَ اتَّقُوا النَّارَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَبِكَلِمَةٍ طَيِّبَةٍ)).

لە عەدی کوڕی حاتەم (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: خۆتان بپارێزن لەئاگر، لەپاشان پشتی کردو رووی وەرگێڕا وەك بڵێی لەئاگر نزیك بێ وە فەرمووی خۆتان بپارێزن لەئاگر وە لەپاشان رووی

وەرچەرخان و وەکو تەماشای بکات وابوو سێ جاران وامان زانی بەڕاستەقینەیە تەماشای ئاگر دەکات ئینجا فەرمووی: خۆتان بپارێزن لەئاگر بابە لەتە خورمایەکیش بێت وە ئەگەر کەسێ ئەوەشی دەست نەکەوت با بەوشەیەکی خۆشبێت.

٧٣٤.عَنْ ابْنِ عُمَر رَضِيَ اللهُ عَنْهُما قَال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِذَا صَارَ أَهْلُ الْجَنَّةِ إِلَى الْجَنَّةِ وَأَهْلُ النَّارِ إِلَى النَّارِ جِيءَ بِالْمَوْتِ حَتَّى يُجْعَلَ بَيْنَ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ ثُمَّ يُذْبَحُ ثُمَّ يُنَادِي مُنَادٍ يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ لَا مَوْتَ وَيَا أَهْلَ النَّارِ لَا مَوْتَ فَيَزْدَادُ أَهْلُ الْجَنَّةِ فَرَحًا إِلَى فَرَحِهِمْ وَيَزْدَادُ أَهْلُ النَّارِ حُزْنًا إِلَى حُزْنِهِمْ)).

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئەگەر خەڵکی بەهەشت بەرەو بەهەشت چوون و خەڵکی دۆزەخیش بەرەو ئاگر دۆزەخ چوون ئینجا مردن دێنن لەشێوەی بەرانێك و لەنێوان بەهەشت و دۆزەخ سەری دەبڕن و بانگ دەکرێ ئەی بەهەشتییەکان مردنتان لەسەر نەما، وە ئەی خەڵکی ئاگر ئێوەش مردنتان لەسەر نەما، وە لەوکاتە خەڵکی بەهەشت کەیف خۆش لەدوا کەیف خۆش دەبن وە خەڵکی دۆزەخیش خەمبارو خەفەتبار لەدوای خەفەتبار دەبن زیاتر.

٧٣٥. عَنْ أَبِي سَعِيد الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى يَقُولُ لِأَهْلِ الْجَنَّةِ يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ يَقُولُونَ لَبَّيْكَ رَبَّنَا وَسَعْدَيْكَ فَيَقُولُ جلَ وَعلاَ: هَلْ رَضِيتُمْ فَيَقُولُونَ وَمَا لَنَا لَا نَرْضَى وَقَدْ أَعْطَيْتَنَا مَا لَمْ تُعْطِ أَحَدًا مِنْ خَلْقِكَ فَيَقُولُ سُبحانه وتعالى أَنَا أُعْطِيكُمْ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ قَالُوا يَا رَبِّ وَأَيُّ شَيْءٍ أَفْضَلُ مِنْ ذَلِكَ فَيَقُولُ جلَ جلالهُ أُحِلُّ عَلَيْكُمْ رِضْوَانِي فَلَا أَسْخَطُ عَلَيْكُمْ بَعْدَهُ أَبَدًا)).

ئەبی سەعیدی خودری (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: خوای گەورە دەفەرمووێ بەبەهەشتییەکان ئەی خەڵکی بەهەشت ئەوانیش دەڵێن لەخزمەتت داین ئەی پەروەردگارمان ئەویش پێیان دەفەرمووێ ئایا لێم رازی بوون؟ ئەوانیش دەڵێن ئەی بۆ رازی نابین؟ کە بەش و بارەت داینێ بەکەس لە دروست کراوانت نەداوە ئەوجا خوای بالآدەست دەفەرمووێ من لەوە زیاتر دەتان دەمێ ئەوانیش دەڵێن چ شتێ لەوە زیاترە خوای بالآدەست دەفەرمووێ خۆشنوودو رەزای خۆمتان دەدەمێ لەوەوپاش لێتان توورە نابم.

٧٣٦. عَنْ عِمْرَانُ بْنُ حُصَيْنٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قال: قال رَسُول الله (ﷺ): ((يَخْرُجُ قَوْمٌ مِنْ النَّارِ بِشَفَاعَةِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَيَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ يُسَمَّوْنَ الْجَهَنَّمِيِّينَ)).

عیمرانی کوڕی حوصەین (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: کۆمەڵێ لە ئاگری دۆزەخ دێننە دەرەوە بەشەفاعەت و تکای موحەمەد (ﷺ) پێیان دەڵێن ئەوانە دۆزەخیەکانن.

٧٣٧. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَال: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَنْ أَسْعَدُ النَّاسِ بِشَفَاعَتِكَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ قَالَ : ((أَسْعَدُ النَّاسِ بِشَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ مَنْ قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ خَالِصًا مِنْ قِبَلِ نَفْسِهِ)).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ وتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کێ کەیف خۆشەو شەفاعەتی تۆ دەگرێتەوە لەڕۆژی قیامەت، فەرمووی کەسێ بڵێ (لا اله الا الله) بەدڵەوە بەئیخلاصەوە، کردەوەی پێ بکات.

٧٣٨. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مَسعُود رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قال: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((إِنِّي لَأَعْلَمُ آخِرَ أَهْلِ النَّارِ خُرُوجًا مِنْهَا وَآخِرَ أَهْلِ الْجَنَّةِ دُخُولًا رَجُلٌ يَخْرُجُ مِنْ النَّارِ حَبْوًا فَيَقُولُ اللَّهُ عزَ وجَلَ اذْهَبْ فَادْخُلْ الْجَنَّةَ فَيَأْتِيهَا فَيُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهَا مَلْأَى فَيَرْجِعُ فَيَقُولُ يَا رَبِّ وَجَدْتُهَا مَلْأَى فَيَقُولُ الله تعالى اذْهَبْ فَادْخُلْ الْجَنَّةَ فَيَأْتِيهَا فَيُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهَا مَلْأَى فَيَرْجِعُ فَيَقُولُ يَا رَبِّ وَجَدْتُهَا مَلْأَى فَيَقُولُ الله تعالى اذْهَبْ فَادْخُلْ الْجَنَّةَ فَإِنَّ لَكَ مِثْلَ الدُّنْيَا وَعَشَرَةَ أَمْثَالِهَا أَوْ إِنَّ لَكَ مِثْلَ عَشَرَةِ أَمْثَالِ الدُّنْيَا فَيَقُولُ تَسْخَرُ مِنِّي أَوْ تَضْحَكُ مِنِّي وَأَنْتَ الْمَلِكُ فَلَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) ضَحِكَ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ وَكَانَ يَقَال ذَلِكَ أَدْنَى أَهْلِ الْجَنَّةِ مَنْزِلَةً)).

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: ئەوکەسەی کە کۆتاکەسە لە ئاگری دۆزەخ دێتە دەرێ وە دواین کەسیشە دەچێتە بەهەشتەوە پیاوێکە بەگاگۆڵە دەڕوات لەئاگری دۆزەخ دێتە دەرێ، خوای گەورە پێی دەفەرمووێ بڕۆ بۆناو بەهەشت کە دەچێتە لێواری وا خەیاڵ دەکات کە پڕبووەو دەگەڕێتەوەو دەڵێ ئەی پەروەردگاری من بەهەشت پڕ بووەو جێگا نەماوە، خوای گەورە پێی دەفەرمووێ بڕۆ ناو بەهەشت دیسان دێتەوە لێواری بەهەشت و واتێدەگات و خەیاڵ دەکات کە پڕبووە و دەگەڕێتەوە دووبارە دەڵێ ئەی پەروەردگاری من پڕبووە خوای گەورە پێی دەفەرمووێ بڕۆ بۆ بەهەشت و بەقەد دونیا دەئەوەندەی تر لەگەڵی بێت بۆ تۆ، یان دەقات بەقەد دونیا بۆتۆ بێت، ئینجا پیاوەکە دەگەڕێتەوەو دەڵێ ئایا گەمە بەمن دەکەی پێم پێ دەکەنی تۆ پادشای منی، عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود دەفەرمووێ سەیری پێغەمبەری خوام کرد لەباشی

قسەی ئەو پیاوە پێدەکەنی و ددانی پێشەوەی بەدیارکەوت وە جاران دەیان وت ئەم پیاوە لەبەهەشتییەکاندا پلەو پایەی لەهەمووان کەمترە.

٧٣٩. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ مَسعُود رَضيَ اللهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: قال: ((أَنَا فَرَطُكُمْ عَلَى الْحَوْضِ)).

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە دەفەرمووێ: من پێشڕەوی ئێوەم لەسەر حەوزی کەوسەر.

٧٤٠. عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرٍو قال: قَالَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((حَوْضِي مَسِيرَةُ شَهْرٍ مَاؤُهُ أَبْيَضُ مِنْ اللَّبَنِ وَرِيحُهُ أَطْيَبُ مِنْ الْمِسْكِ وَكِيزَانُهُ كَنُجُومِ السَّمَاءِ مَنْ شَرِبَ مِنْهَا فَلَا يَظْمَأُ أَبَدًا)).

لەعەبدوڵڵای کوڕی عومر کە دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەندازەی حەوزی من (حەوزی کەوسەر) مانگەڕێیەك گەورەیە ئاوەکەی لەشیر سپیترە و بۆنی لەمیسك خۆشترەو پەرداغ و دۆڵکەی بەقەد ئەستێرەی ئاسمانەکانی تێدایە وەکەسێ لێی خواردەوە هەتاهەتایی تێنو نابێت.

## باب المَعصُوم من عصمه الله والإيمان وأفضَل الكَلام

٧٤١. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضيَ اللهُ عَنْهُ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: ((مَا اسْتُخْلِفَ خَلِيفَةٌ إِلَّا لَهُ بِطَانَتَانِ بِطَانَةٌ تَأْمُرُهُ بِالْخَيْرِ وَتَحُضُّهُ عَلَيْهِ وَبِطَانَةٌ تَأْمُرُهُ بِالشَّرِّ وَتَحُضُّهُ عَلَيْهِ وَالْمَعْصُومُ مَنْ عَصَمَ اللَّهُ)).

## (بەشی/ بێ تاوان ئەکەسەیە کەخوا بی پارێزێ، بڕوابوون، بەڕێزترین وشە)

ئەبی سەعیدی خودری (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) کەدەفەرمووێ: هەرکەسێك ببێ بەخەلیفەو جێنشینی خەڵکی ئەوا دوو تاقمی بۆ پەیدا دەبن، تاقمێکییان فەرمان بەچاکەی پێ دەکەن و هانی دەدەن بۆئەوە وە تاقمەکەی تریان فەرمانی خراپە و هاندانی بۆ دەدەن و وەبێ تاوان ئەوکەسەیە کەخوای گەورە بیپارێزێ لەستەم.

٧٤٢.عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنُ سَمُرَةَ، قَال: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((يَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ سَمُرَةَ لَا تَسْأَلْ الْإِمَارَةَ فَإِنَّكَ إِنْ أُوتِيتَهَا عَنْ مَسْأَلَةٍ وُكِلْتَ إِلَيْهَا وَإِنْ أُوتِيتَهَا مِنْ غَيْرِ مَسْأَلَةٍ أُعِنْتَ عَلَيْهَا وَإِذَا حَلَفْتَ عَلَى يَمِينٍ فَرَأَيْتَ غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا فَكَفِّرْ عَنْ يَمِينِكَ وَأْتِ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ. وقال تعالى: ﴿ وَلَا تَتَّخِذُوٓاْ أَيۡمَٰنَكُمۡ دَخَلَۢا بَيۡنَكُمۡ فَتَزِلَّ قَدَمُۢ بَعۡدَ ثُبُوتِهَا وَتَذُوقُواْ ٱلسُّوٓءَ بِمَا صَدَدتُّمۡ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۖ وَلَكُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴾ وقال تعالى: ﴿ وَلَا تَجۡعَلُواْ ٱللَّهَ عُرۡضَةٗ لِّأَيۡمَٰنِكُمۡ أَن تَبَرُّواْ وَتَتَّقُواْ وَتُصۡلِحُواْ بَيۡنَ ٱلنَّاسِۚ ﴾.

عەبدولڕەحمانی کوڕی سەموورە دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئەی عەبدولڕەحمانی کوڕی سەمورە داوای فەرمان ڕەوایی و ئەمیرایەتی مەکە چونکە ئەگەر لەسەر داواکردنی خۆت بەرپرسی و سەرکاری وەرگری لێت دەبێ بەبار بەسەرتەوە وە ئەگەر بەبێ ئەوەی خۆت هەوڵی بۆ بدەی بکرێی بەفەرمانڕەوا ئەوا خودا زاڵت دەکات بەسەریاندا وەئەگەر سوێندت خوارد

لەسەر شتێ لەپاشاندا زانیت جگە لەو.... باشترە ئەوە کەفارەتی سوێندەکە بدەو ئەوشتە بکە کە بەباشتری دەزانی.

وە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَلَا تَتَّخِذُوٓاْ أَيۡمَٰنَكُمۡ دَخَلَۢا بَيۡنَكُمۡ فَتَزِلَّ قَدَمُۢ بَعۡدَ ثُبُوتِهَا وَتَذُوقُواْ ٱلسُّوٓءَ بِمَا صَدَدتُّمۡ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۖ وَلَكُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ﴾.

واتە: نەکەن پەیمان و سوێندەکانتان بکەنە هۆی پیلان گێڕان و فێڵ و تەڵەکە لەنێوانتاندا تا پێ هەڵنەخلیسکێن دوای ئەوەی کە قایم وەستابوو تاڵاوی ناخۆش نەچێژن کاتێك بەهۆی ئەوکارەتانەوە بەربەست دەخەنە بەردەم رێبازی خوا (ئەگەر وابکەن) ئەوکاتە سزایەکی گەورەتان بۆ هەیە.

وە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَلَا تَجۡعَلُواْ ٱللَّهَ عُرۡضَةٗ لِّأَيۡمَٰنِكُمۡ أَن تَبَرُّواْ وَتَتَّقُواْ وَتُصۡلِحُواْ بَيۡنَ ٱلنَّاسِ﴾.

واتە: نەکەن سوێند خواردن بەخوا بکەنە کۆسپ لەبەرامبەر چاکەکاری و ئاینداری و رێکخستنی خەڵکیدا (واتە کەفارەتی سوێندەکانتان بدەن و لەچاکە و چاکەکاری درێغی مەکەن) چونکە خوا زۆر بیسەرو زانایە.

٧٤٣.قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((أَفْضَلُ الْكَلَامِ أَرْبَعٌ: سُبْحَانَ اللهِ، وَالْحَمْدُ للهِ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ)).

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بەرێزترین وتە چوارن کە (سُبْحَانَ اللهِ، وَالْحَمْدُ للهِ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ).

## باب النذر والطاعة، وضَرب شارب الخمر، وقَطعْ يد السَارِق، والديات

٧٤٤.عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قالَتْ: قالَ النَّبِيّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ : ((مَنْ نَذَرَ أَنْ يُطِيعَ اللَّهَ فَلْيُطِعْهُ وَمَنْ نَذَرَ أَنْ يَعْصِيَهُ فَلَا يَعْصِه)).

## (بەشی/ نەزرکردن و گوێڕایەڵی و لێدانی مەی خۆر و دەستی جزی بڕین و خوێندان (الدیه).

عائیشە خان (رضي الله عنها) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: کەسێ نەذری کرد گوێڕایەڵی خوا بکات با گوێڕایەڵی بێت، وە کەسێ نەذری کرد بێ فەرمانی خوا بکات بابێ فەرمانی خوا نەکات.

٧٤٥.عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((ضَرَبَ فِي الْخَمْرِ بِالْجَرِيدِ وَالنِّعَالِ. وَجَلَدَ أَبُو بَكْر الصديق رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَرْبَعِينَ)).

ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کرد ئارەق خۆریان دەهێنا بەپەلکە خورماو سۆل دارکاریان دەکرد (جەلدەیان لێدەدا)و لەپاشان لەکاتی خەلیفە ئەبوبەکردا ئەویش چل داری بۆ دانا کە چل جەلدەی لێ بدرێ.

٧٤٦. عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَال: ((تُقْطَعُ يَدُ السَّارِقِ فِي رُبُعِ دِينَارٍ)).

عائیشە خان (رضي الله عنها) پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: دزی دەستی دەبڕدرێت لەدزی شتێکا بەقەد چارەکە دیناری زێڕ بێ.

٧٤٧. عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((لَنْ يَزَالَ الْمُؤْمِنُ فِي فُسْحَةٍ مِنْ دِينِهِ مَا لَمْ يُصِبْ دَمًا حَرَامًا))، قالَ

اللهُ تَعالى: ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ ﴾ وقالَ تعالى أيضاً: ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾ يُضَٰعَفْ لَهُ ٱلْعَذَابُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِۦ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُو۟لَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾.

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: بڕوادار هەتا تووشی خوێن ڕشتنی ناڕەوا نەبێت هێشتا خێری و ئاینی پێوە دەمێنێ.

خوای گەورە دەفەرمووی: ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ ﴾ واتە: هەرکەسێ بەدەستی ئەنقەست بڕوادارێ بکوژێت ئەوە تۆڵەی ئەو کەسە دۆزەخە.

وە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾ يُضَٰعَفْ لَهُ ٱلْعَذَابُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِۦ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُو۟لَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ واتە: ئەوانەی هیچ جۆرە خوایەکی تر لەگەڵ خوادا ناپەرستن کەسیش ناکوژن کەخوا کوشتنی حەرام کردبێ مەگەر بەحەق و

ڕەوا، هەروەها زینا ناکەن و نزیکی ناکەون جائەوەی ئەوجۆرە کارە خراپانە ئەنجام بدات ئەوە تووشی سزاو ئازارو ریسوایی دێت، لەقیامەتیشدا ئازارو سزای بۆچەند قات بەرامبەر دەکرێت وە بەزەلیلی و خەجاڵەتی و شەرمەزارییەوە دەبێت ژیانی تێدا بەرێتە سەر، مەگەر ئەوکەسەی کە تەوبە بکات و باوەڕ بهێنێت و کاروکردەوەی چاکە ئەنجام بدات ئەوجۆرە کەسانە خوا کارو کردەوەی خراپەیان بۆ دەگۆڕێت بەچاکە وەخوا لێخۆشبوون و میهرەبانە.

٧٤٨. وَعَنْهُ أيضاً رَضيَ اللهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((مَنْ حَمَلَ عَلَيْنَا السِّلَاحَ فَلَيْسَ مِنَّا)).

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنهما) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: کەسێ چەك هەڵگرێ بۆسەر ئێمە (بۆ خوێن ڕشتنی موسڵمانان) ئەوە لەئێمە نییە.

٧٤٩.عَنْ الْأَحْنَفِ بْنِ قَيْسٍ قَالَ: ذَهَبْتُ لِأَنْصُرَ هَذَا الرَّجُلَ، فَلَقِيَنِي أَبُو بَكْرَةَ فَقَالَ: أَيْنَ تُرِيدُ؟ قُلْتُ: أَنْصُرُ هَذَا الرَّجُلَ، قَالَ: ارْجِعْ فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: ((إِذَا الْتَقَى الْمُسْلِمَانِ بِسَيْفَيْهِمَا فَالْقَاتِلُ وَالْمَقْتُولُ فِي النَّارِ)). قُلْتُ: قالَ أبو بَكرَة: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَذَا الْقَاتِلُ فَمَا بَالُ الْمَقْتُولِ؟ قَالَ : ((إِنَّهُ كَانَ حَرِيصًا عَلَى قَتْلِ صَاحِبِهِ)).

ئەحنەفی کوڕی قەیس دەفەرمووێ دەرچووم بۆ سەرخستنی ئەم پیاوە (عەلی کوڕی ئەبو طالیب) لەڕێگادا گەیشتم بە ئەبوبەکر وتی بۆکوێ دەچی وتم بۆسەرخستنی ئەم پیاوە دەچم فەرمووی بگەڕێوە چونکە من گوێم لەپێغەمبەری خوابوو دەیفەرموو ئەگەر دوو موسڵمان گەیشتن بەیەك بۆ شەڕکردن بەشمشێر ئەوە بکوژەکەو کوژراوەکە بۆ ئاگری دۆزەخن منیش وتم

ئەبو بەکرە وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوە بکوژەکە قەیناکە بەلاَم بۆ کوژراوەکە بۆناگرە فەرمووی چونکە هەوڵی دەدات بۆ کوشتنی براکەی.

## باب النفس بِالنَفس وَمنْ طَلبَ دم امرئ ومَنْ أخذَ حَقهُ

٧٥٠.عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مَسعُود رَضيَ اللهُ عَنْهُ قَال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((لَا يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَّا بِإِحْدَى ثَلَاثٍ النَّفْسُ بِالنَّفْسِ وَالثَّيِّبُ الزَّانِي وَالْمَارِقُ مِنْ الدِّينِ التَّارِكُ لِلْجَمَاعَةِ)).

.٧٥١

## (بەشی/ داواکردنی خوێنی کەسێك و وەکەسێ مافی خۆی وەرگرێ)

عەبدوڵلای کوڕی مەسعود (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: هەر موسڵمانێ شایەتی بدات کە خوا یەکەو هاوەڵی نییەو موحەمەدیش نێرراوی خوایە، ئەوا خوێنی حەڕام دەبێت ڕەوا نابێت، تەنها لەسێ کەسا نەبێت کە ئەوانیش: کە بەناڕەوا موسڵمانێ بکوژێ بێ هەق، وە ئەوەی کە زینا دەکات چ ژن بێت چ پیاو، وە ئەوەی لەئایینی خۆی وەرگەڕێ لەکۆمەڵی موسڵمانان تەبەڕا بێ.

٧٥٢. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضيَ اللهُ عَنْهُما أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((أَبْغَضُ النَّاسِ إِلَى اللَّهِ ثَلَاثَةٌ مُلْحِدٌ فِي الْحَرَمِ وَمُبْتَغٍ فِي الْإِسْلَامِ سُنَّةَ الْجَاهِلِيَّةِ وَمُطَّلِبُ دَمِ امْرِئٍ بِغَيْرِ حَقٍّ لِيُهَرِيقَ دَمَهُ)).

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (رضي الله عنهما) کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: لەهەموو ئەوکەسانەی کەخوا زۆر رقی لێیان دەبێتەوە ئەو سێ کەسانەن کە ئەوانیش: زەندیقێ لەناو حەرەمی مەککەدا ستەم بکات وەکەسێ لەئیسلامەتیدا سوننەتێك و رەوەشتێکی نەفامی درووست بکات وەکەسێ داوای خوێنی موسڵمانێ بکات و بی کوژێ بەناڕەوا.

٧٥٣. عَنْ أبي هُرَيْرَةَ رَضيَ اللهُ تَعالى عَنْهُ يَقول: انَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: ((نَحْنُ الْآخِرُونَ السَّابِقُونَ، وَبِإِسْنَادِهِ، قال: لَوْ اطَّلَعَ فِي بَيْتِكَ أَحَدٌ وَلَمْ تَأْذَنْ لَهُ وَحَذَفْتَهُ بِحَصَاةٍ فَفَقَأْتَ عَيْنَهُ مَا كَانَ عَلَيْكَ مِنْ جُنَاحٍ)).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ گوێی لە پێغەمبەری خوابوو (ﷺ) کە دەفەرمووێ: ئێمە دوایین و یەکەمینی ئوممەتانین، وە لەریوایەتێکی تردا هاتووە (کەسێ بەبێ رێگەدانی تۆ تەماشایی نێو ماڵت بکات و تۆ بەردێکی بە پەلەپیتکێت تێ گرتو چاوێکی کوێربوو گوناهت ناگات.

## باب القسامة، والمعدن الجَبار، وإثم منْ قتَلَ ذمِّياً

٧٥٤.عَنْ الْأَشْعَث بْنُ قَيْس قَال: قالَ النَّبِيُّ (ﷺ) ((شَاهِدَاكَ أَوْ يَمِينُهُ)).

## (بەشی/ دابەشکردن و کانزایی و تاوانی کەسێ دعییەك بکوژێ)

ئەشعەسی کوڕی قەیس دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەگەر داوات لەسەر یەکێك هەبوو یان دەبێ شاهیدی هەبێ یان دەبێ سوێند بخوات.

٧٥٥.عَنْ أبِي هُرَيْرَةَ رَضيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (ﷺ): ((قَالَ الْعَجْمَاءُ جَرْحُهَا جُبَارٌ وَالْبِئْرُ جُبَارٌ وَالْمَعْدِنُ جُبَارٌ وَفِي الرِّكَازِ الْخُمُسُ)).

ئەبو هوڕەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی: چوارپێ ئەگەر شتێ زامداریکەن بەبێ سوچی خاوەنەکانیان خوێنی نیە وە هەروەها برو کانیش ئەگەر شتێکیان تێ کەوت یان رما بەسەر شتێکدا خوێنی نییە، گەنجینەی کۆنی دۆزراوەکانیش پێنج یەکی هی زەکاتە.

٧٥٦. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((مَنْ قَتَلَ نَفْسًا مُعَاهَدًا لَمْ يَرِحْ رَائِحَةَ الْجَنَّةِ وَإِنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ أَرْبَعِينَ عَامًا)).

عەبدوڵلای کوڕی عومەر لەپێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: کەسێ موعاهیدێك بکوژێ بۆنی بەهەشت ناکات وەبۆنی بەهەشتیش لەدووری چل ساڵ ڕێگا دێت.

موعاهید: ئەوکەسەی کافرو بێبڕوا بێت لەژێر سێبەری ئیسلامدا بێت و پەیمانی لەگەڵ موسڵمانان ببەستێت.

## باب الإشراك بالله، ومنع الزكاة ويكره الإحتيال

٧٥٧. وَعَنْ عَبْدِ اللَّهِ أيضاً أَنَّهُ قَال: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا الْكَبَائِرُ قَالَ: ((الْإِشْرَاكُ بِاللَّهِ قَالَ ثُمَّ مَاذَا قَالَ ثُمَّ عُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ قَالَ ثُمَّ مَاذَا قَالَ الْيَمِينُ الْغَمُوسُ قُلْتُ وَمَا الْيَمِينُ الْغَمُوسُ (ﷺ) قَالَ الَّذِي يَقْتَطِعُ مَالَ امْرِئٍ مُسْلِمٍ هُوَ فِيهَا كَاذِبٌ)).

## (بەشی/ هەوڵ و بڕیاردان بۆخواو قەدەغەی زەکات دان و کەراهەتی، فێڵ و تەڵەکەو لەخشتەبردن)

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (رضي الله عنه) دەفەرمووێ عەرەبێکی دەشتەکی هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) وتی ئەی نێرراوی خوا تاوانە گەورەکان کامەن ئەویش فەرمووی: هاوەڵ دانان بۆ خودا، لەپاشان وتی لەپاشی چی

تر؟ فەرمووی: دڵی دایك و باوك ڕەنجاندن، فەرمووی ئەی لەپاشی ئەو چی تر؟ فەرمووی: سوێندی بەدرۆ خواردن، منیش ووتم سوێند بەدرۆ چییە؟ فەرمووی: سوێندێکە کە بخورێت بۆ گلدانەوەی ماڵ و سامانی موسڵمانێك وە بەدرۆو ناهەق بێت

٧٥٨. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((إِذَا مَا رَبُّ النَّعَمِ لَمْ يُعْطِ حَقَّهَا تُسَلَّطُ عَلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ تَخْبِطُ وَجْهَهُ بِأَخْفَافِهَا)).

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: خاوەنی وشتری زۆر ئەگەر مافی خوای لەسەر بێت کە زەکاتەو خێرو صەدەقەیە نەیدات لەڕۆژی قیامەت ئەو وشترە دێنن و بەپێیەکانی لەقەی لەدەموچاوی دەداتن.

٧٥٩. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((لَا يُمْنَعُ فَضْلُ الْمَاءِ لِيُمْنَعَ بِهِ فَضْلُ الْكَلَإِ)).

ئەبو هورەیرە (رضـي الله عنـه) لەپێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: ئـاوی زیادە قەدەغە مەکەن هەتا زیادە لەوەڕی پێ قەدەغەبکەن.

## باب في النكاح والهبة

٧٦٠. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَيضاً رَضِيَ اللهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((لَا تُنْكَحُ الْبِكْرُ حَتَّى تُسْتَأْذَنَ وَلَا الثَّيِّبُ حَتَّى تُسْتَأْمَرَ فَقِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ إِذْنُهَا قَالَ إِذَا سَكَتَتْ))، وَقَالَ بَعْضُ النَّاسِ إِنْ لَمْ تُسْتَأْذَنْ الْبِكْرُ وَلَمْ تَزَوَّجْ فَاحْتَالَ رَجُلٌ فَأَقَامَ شَاهِدَيْ زُورٍ أَنَّهُ تَزَوَّجَهَا بِرِضَاهَا فَأَثْبَتَ الْقَاضِي نِكَاحَهَا وَالزَّوْجُ يَعْلَمُ أَنَّ الشَّهَادَةَ بَاطِلَةٌ فَلَا بَأْسَ أَنْ يَطَأَهَا وَهُوَ تَزْوِيجٌ صَحِيحٌ))

## (بەشی/ ژن مارەکردن و بەخشین (پێشکەش کردن))

ئـەبو هـورەیرە (رضـي الله عنـە) لەپێغەمبـەر (ﷺ) دەگێڕێتـەوە کـە فەرموویەتی: کچ نادرێ بەشوو تا پرسو رای پێ نەکرێ وە بێوەژنیش نادرێ بەشوو هەتا بەڕاشکاوی رای وەرنەگیری، وترا پێغەمبەری خوا چۆن ئیزنیـان وەردەگـیرێ؟ فـەرمووی: ئەگـەر بـێ دەنـگ بـوو کـچە ئـەوە مانـای رازی بوونیەتی.

وە هەندێ لەزانایان (لەوانە ئەبو حەنیفە) دەفەرموون ئەگەر کچە بێ دەنگ بوو وە مێردی نەکردبوو کەسێکیش بەفێڵ دوو شایەتی بەدرۆی پەیدا کردو شایەتیاندا کەکچی خوازبێنی کردووە بەڕازی بوون وە قازی موسڵمانیش مارەکردنەکەی بەڕاست داناو قایمی کرد وە مێردی کچەش دەزانێ کە شایەتی دانەکە بۆی راست نەبوو درۆ بوو ئەوا دروستە و مارەکردنی دروست بووەو قەیناکا لەگەڵی کۆبێتەوە (ئەمە وتەی ئیمام ئەبو حەنیفەیە، فەرموودە نییە)..

٧٦١. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): ((الْعَائِدُ فِي هِبَتِهِ كَالْكَلْبِ يَعُودُ فِي قَيْئِهِ لَيْسَ لَنَا مَثَلُ السَّوْءِ)).

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (رضي الله عنهما) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فـەرمووی: ئـەوەی شـتێك ببەخـشێ و دوایـی پەشـیمان ببێتـەوەو لێـی وەرگرێتەوە ئەوە وەکو ئەوە وایـە سـەگ رشـانەوەی خـۆی قـوت بداتـەوەو بیخواتەوە نمونەی خراپترمان لەلانیە لەو خراپتر.

## باب رؤيا الصالحين، والرؤيا من الله تعالى، والمبشرات

٧٦٢. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((الرُّؤْيَا الْحَسَنَةُ مِنْ الرَّجُلِ الصَّالِحِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنْ النُّبُوَّةِ)).

## (بەشی/ خەونی پیاوچاکان، خەونی چاك لەلای خوا و مزگێنییەکان)

ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) فەرمووی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: خەونی باش لەلای پیاوی باش و صالح بەشێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی.

٧٦٣. عَنْ أَبِي قَتَادَةَ الأنصاري رَضِيَ اللهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قال: ((الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ مِنْ اللَّهِ وَالْحُلُمُ مِنْ الشَّيْطَانِ)).

لە ئەبی قەتادەی ئەنصاری (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرمووێ: خەونی باش لەلایەن خواوەیە وە خەونی خراپیش لەلایەن شەیتانەوەیە.

٧٦٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: ((لَمْ يَبْقَ مِنْ النُّبُوَّةِ إِلَّا الْمُبَشِّرَاتُ))، قَالَ يا رَسُول الله: وَمَا الْمُبَشِّرَاتُ؟ قَالَ ((الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ)).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەیفەرموو: لەبەشی پێغەمبەرایەتی تەنها موژدە بەخشەکان ماون، هاوەڵان وتیان موژدە بەخشەکان چین؟ فەرمووی: خەونی باشە.

## باب رؤية النبي (ﷺ)

٧٦٥. عَنْ أبي هُرَيْرَةَ أيضاً قَالَ سَمِعْتُ رَسُول الله (ﷺ) يَقُولُ: ((مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَسَيَرَانِي فِي الْيَقَظَةِ وَلَا يَتَمَثَّلُ الشَّيْطَانُ بِي)).

## (بەشی/ پێغەمبەر (ﷺ) دیتن لەخەونا)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) فەرمووی گوێم لەپێغەمبەر (ﷺ) بوو دەیفەرموو: هەرکەسێ لەخەو من ببینێ ئەوە بەچاوی سەرو حاڵی هۆشیاری من دەبینێ چونکە شەیتان ناچێتە سەر شێوەی من.

٧٦٦. عَنْ أبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُول: ((مَنْ رَآنِي فِي المنام رَأَى الْحَقَّ فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لَا يَتَكَوَّنُنِي)).

ئەبی سەعیدی خودری (رضي الله عنه) کەگوێی لە پێغەمبەری خوابوو (ﷺ) فەرمووی: کەسێ من لەخەوا ببینێ ئەوا راست و حەق منی بینیوە، چونکە شەیتان ناتوانێ بچێتە سەر شێوەی من.

٧٦٧. قالَ ابْنُ سِيرِين: قالَ أَبُو هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: سمعتُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يقول: ((إِذَا اقْتَرَبَ الزَّمَانُ لَمْ تَكَدْ تَكْذِبُ رُؤْيَا الْمُؤْمِنِ وَرُؤْيَا الْمُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنْ النُّبُوَّةِ. قَالَ مُحَمَّدٌ: وَأَنَا أَقُولُ هَذِه، قَالَ: وَكَانَ يُقَالُ: الرُّؤْيَا ثَلَاثٌ: حَدِيثُ النَّفْسِ وَتَخْوِيف الشَيطان وَبُشْرَى مِنْ اللَّهِ فَمَنْ رَأَى شَيْئًا يَكْرَهُ فَلَا يَقُصَّهُ عَلَى أحَدٍ وَلْيَقُمْ فَلْيُصَلِّ قَالَ: وَكَانَ يكْرَهُ الْغُلُّ فِي النَّوْمِ وَكَانَ يُعْجِبُهُمْ الْقَيْدُ وَيُقَالُ الْقَيْدُ ثَبَاتٌ فِي الدِّينِ)).

ئیبن سیرین دەفەرمووێ ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ گوێم لەپێغەمبەر (ﷺ) بوو دەیفەرموو: کاتێ کات و زەمان، شەوو رۆژ لەیەك نزیك بوون نزیکە خەونی ئیماندار هەڵەی تێدا نەبێت راست دەربچێ و خەونی ئیماندار بەشێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی، وە موحەمەد (ابن

سیرین) فەرمووی وە من ئەم وتە دەڵێم وە دەیفەرموو: خەون سێ بەشە یەکەمییان باس و خواسی دەروونی وە ترساندنی شەیتان وە ئەمەی تریان موژدەیە لەلایەن خواوە.

وە ئەگەر کەسێ خەونی دیت و خەونەکەی پێ ناخۆشە بابۆکەسی نەگێڕێتەوە، با هەڵسێ لەسەرجێگای خۆی نوێژ بکات، دەفەرمووێ پێی ناخۆش بوو دیتنی زنجیری لەمل، وە پابەندی پێ خۆش بوو چونکە دامەزراوە لەسەردین و بەندایەتی خوای تەنیا.

## باب منْ كَذَبَ في حلمه

٧٦٨. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((مَنْ تَحَلَّمَ بِحُلْمٍ لَمْ يَرَهُ كُلِّفَ أَنْ يَعْقِدَ بَيْنَ شَعِيرَتَيْنِ وَلَنْ يَفْعَلَ وَمَنْ اسْتَمَعَ إِلَى حَدِيثِ قَوْمٍ وَهُمْ لَهُ كَارِهُونَ أَوْ يَفِرُّونَ مِنْهُ صُبَّ فِي أُذُنِهِ الْآنُكُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَمَنْ صَوَّرَ صُورَةً عُذِّبَ وَكُلِّفَ أَنْ يَنْفُخَ فِيهَا وَلَيْسَ بِنَافِخٍ)).

## (بەشی/ کەسێ کە درۆبکات لەگەڵ خەونەکەی)

عەبدوڵلای کوڕی عەباس (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: کەسێ لەخۆیەوە خەونێك بەدرۆ هەڵبەستێ لەرۆژی قیامەت داوای لێ دەکرێ کەدوو دەنکە جۆی پێکەوە گرێ بدا وە هەرگیز ناتوانێ ئەوەی بکات، وە هەرکەسێ گوێ لەقسەی هۆزێ بگرێ کە ئەوان پێیان ناخۆش بێت کە ئەو گوێی لێیان گرتووە یا خۆیانی لێ دوور خاتەوە ئەوەی لەرۆژی قیامەتدا قورقوشمی تواوەی دەکرێتە ناو هەردوو گوێیانی وە

ئەوکەسەش کە وێنەیێ بکێشێ ئەوە ئازار دەدرێ وە بەزۆر داوای لێ دەکرێ کە گیان بکات بەبەریدا وە دیارە ئەوەشی بۆ ناکرێ.

٧٦٩. عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ تعالى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((مِنْ أَفْرَى الْفِرَى أَنْ يُرِيَ عَيْنَيْهِ مَا لَمْ تَرَه)).

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: لەهەموو درۆیان گەورەتر ئەو درۆیەیە کەکەسێ بڵێ لەخەوما ئەوەم دیوەو وە لەراستیشدا هیچی نەدیبێ.

## باب إذا رأى ما يكره وتعبير الرؤيا بعد صلاة الصبح

٧٧٠. عَنْ عَبْدِ رَبِّهِ بْنِ سَعِيدٍ قَال سَمِعْتُ أَبَا سَلَمَةَ يَقُول: لَقَدْ كُنْتُ أَرَى الرُّؤْيَا فَتُمْرِضُنِي حَتَّى سَمِعْتُ أَبَا قَتَادَةَ يَقُولُ: وَأَنَا كُنْتُ لَأَرَى الرُّؤْيَا تُمْرِضُنِي حَتَّى سَمِعْتُ رَسُول الله (ﷺ) يَقُولُ: ((الرُّؤْيَا الْحَسَنَةُ مِنْ اللَّهِ فَإِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ مَا يُحِبُّ فَلَا يُحَدِّثْ بِهِ إِلَّا مَنْ يُحِبُّ وَإِذَا رَأَى مَا يَكْرَهُ فَلْيَتَعَوَّذْ بِاللَّهِ مِنْ شَرِّ الشَّيْطَانِ وَلْيَتْفِلْ ثَلَاثًا وَلَا يُحَدِّثْ بِهَا أَحَدًا فَإِنَّهَا لَنْ تَضُرَّهُ)).

## (بەشی/ ئەوەی خەونێ ببینێ و پێی ناخۆش بێ، لێکدانەوەی خەون لەپاش نوێژی بەیانی)

لە عەبدورەبەی کوڕی سەعید دەفەرمووێ گوێم لە ئابا سەلمە بوو دەیفەرمووی: جاری وادەبوو خەونی وام دەدیت نەخۆش دەبووم هەتا گوێم لە ئەبو قەتادە دەبوو دەیفەرموو: منیش جاری وا دەبوو خەونم دەدیت بەهۆیەوە نەخۆش دەکەوتم هەتا گوێم لەپێغەمبەری خوابوو دەیفەرموو: خەونی باش لە خواوەیە جا ئەگەر یەکێکتان خەونێکی خۆشی دیت با نەیگێڕێتەوە بۆ خەڵکی بەڵکو بۆ خۆشەویستان نەبێت وەئەگەر خەوێکی

ناخۆشی دیت با داوای خۆپەنادان بکات لەخراپەی شەیتان و سێ جار تف لەلای چەپی فڕێ بدات و بۆکەسێ نەگێڕێتەوە، ئەوە زیانی بۆئەو نابێت.

٧٧١. عَنْ سَمُرَةَ بْنُ جُنْدَبٍ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مِمَّا يُكْثِرُ أَنْ يَقُولَ لأَصْحَابِهِ هَلْ رَأَى أَحَدٌ مِنْكُمْ مِنْ رُؤْيَا قَالَ فَيَقُصُّ عَلَيْهِ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَقُصَّ وَإِنَّهُ قَالَ لنا ذَاتَ غَدَاةٍ انه أَتَانِي اللَّيْلَةَ آتِيَانِ وَإِنَّهُمَا ابْتَعَثَانِي وَإِنَّهُمَا قَالاَ لِي: انْطَلِقْ وَإِنِّي انْطَلَقْتُ مَعَهُمَا وَإِنَّا أَتَيْنَا عَلَى رَجُلٍ مُضْطَجِعٍ وَإِذَا آخَرُ قَائِمٌ عَلَيْهِ بِصَخْرَةٍ وَإِذَا هُوَ يَهْوِي بِالصَّخْرَةِ لِرَأْسِهِ فَيَتَهَدْهَدُ الْحَجَرُ هٰهُنَا فَيَتْبَعُ الْحَجَرَ فَيَأْخُذُهُ فَلاَ يَرْجِعُ إِلَيْهِ حَتَّى يَصِحَّ رَأْسُهُ كَمَا كَانَ ثُمَّ يَعُودُ عَلَيْهِ فَيَفْعَلُ بِهِ مِثْلَ مَا فَعَلَ الْمَرَّةَ الأُولَى.

قَالَ صَلى اللهُ تَعالى عَلَيهِ وَآلِهِ وَسلم قُلْتُ لَهُمَا: سُبْحَانَ اللَّهِ مَا هَذَانِ؟ قَالَ: قَالاَ لِي: انْطَلِقْ انطَلِق.

قَالَ عَلَيهِ السَّلام: فَانْطَلَقْنَا فَأَتَيْنَا عَلَى رَجُلٍ مُسْتَلْقٍ لِقَفَاهُ وَإِذَا آخَرُ قَائِمٌ عَلَيْهِ بِكَلُّوبٍ مِنْ حَدِيدٍ وَإِذَا هُوَ يَأْتِي أَحَدَ شِقَّيْ وَجْهِهِ، فَيُشَرْشِرُ شِدْقَهُ إِلَى قَفَاهُ وَمَنْخِرَهُ إِلَى قَفَاهُ وَعَيْنَهُ إِلَى قَفَاهُ، قَالَ: وَرُبَّمَا قَالَ أَبُو رَجَاءٍ: فَيَشُقُّ، قَالَ: ثُمَّ يَتَحَوَّلُ إِلَى الْجَانِبِ الآخَرِ فَفعَلُ بِهِ مِثْلَ مَا فَعَلَ بِالْجَانِبِ الأَوَّلِ فَمَا يَفْرُغُ مِنْ ذَلِكَ الْجَانِبِ حَتَّى يَصِحَّ ذَلِكَ الْجَانِبُ كَمَا كَانَ ثُمَّ يَعُودُ عَلَيْهِ فَيَفْعَلُ مِثْلَ مَا فَعَلَ فِي الْمَرَّةَ الأُولَى.

قَالَ: قُلْتُ سُبْحَانَ اللَّهِ مَا هَذَانِ؟ قَالَ: قَالاَ لِي: انْطَلِقْ انطلقْ.

فَانْطَلَقْنَا فَأَتَيْنَا عَلَى مِثْلِ التَّنُّورِ فَأَحْسِبُ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ فَإِذَا فِيهِ لَغَطٌ وَأَصْوَاتٌ، قَالَ: فَاطَّلَعْنَا فِيهِ فَإِذَا فِيهِ رِجَالٌ وَنِسَاءٌ عُرَاةٌ وَإِذَ هُمْ يَأْتِيهِمْ لَهَبٌ مِنْ أَسْفَلَ مِنْهُمْ، فَإِذَا هُمْ أَتَاهُمْ ذَلِكَ اللَّهَبُ ضَوْضَوا.

قَالَ: – قُلْتُ لَهُمَا مَا هَؤُلاَءِ؟ قَالَ: قَالاَ لِي: انْطَلِقِ انْطَلِقْ.

قَالَ: فَانْطَلَقْنَا فَأَتَيْنَا عَلَى نَهرٍ حَسِبْتُ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ أَحْمَرَ مِثْلِ الدَّمِ وَإِذَا فِى النَّهَرِ رَجُلٌ سَابِحٌ يَسْبَحُ وَإِذَا عَلَى شَطِّ النَّهرِ رَجُلٌ قَدْ جَمَعَ عِنْدَهُ حِجَارَةً كَثِيرَةً وَإِذَا ذَلِكَ السَّابِحُ يَسْبَحُ مَا يَسْبَحُ ثُمَّ يَأْتِى ذَلِكَ الَّذِى قَدْ جَمَعَ عِنْدَهُ الْحِجَارَةَ فَيَفْغَرُ لَهُ فَاهُ فَيُلْقِمُهُ حَجَرًا فَيَنْطَلِقُ يَسْبَحُ ثُمَّ يَرْجِعُ إِلَيْهِ كُلَّمَا رَجَعَ إِلَيْهِ فَغَرَ لَهُ فَاهُ فَأَلْقَمَهُ حَجَرًا.

قَالَ: قُلْتُ لَهُمَا مَا هَذَانِ؟ قَالَ: قَالاَ لِى: انْطَلِقِ انْطَلِقْ.

قَالَ: فَانْطَلَقْنَا فَأَتَيْنَا عَلَى رَجُلٍ كَرِيهِ الْمَرْآةِ كَأَكْرَهِ مَا أَنْتَ رَاءٍ رَجُلاً مَرْآةً وَإِذَا عِنْدَهُ نَارٌ يَحُشُّهَا وَيَسْعَى حَوْلَهَا.

قَالَ: قُلْتُ لَهُمَا مَا هَذَا؟ قَالاَ: انْطَلِقِ انْطَلِقْ فَانْطَلَقْنَا فَأَتَيْنَا عَلَى رَوْضَةٍ مُعْتَمَّةٍ فِيهَا مِنْ كُلِّ نَوْرِ الرَّبِيعِ وَإِذَا بَيْنَ ظَهْرَىِ الرَّوْضَةِ رَجُلٌ طَوِيلٌ لاَ أَكَادُ أَرَى رَأْسَهُ طُولاً فِى السَّمَاءِ وَإِذَا حَوْلَ الرَّجُلِ مِنْ أَكْثَرِ وِلْدَانٍ رَأَيْتُهُمْ قَطُّ.

قَالَ: قُلْتُ لَهُمَا مَا هَذَا؟ مَا هَؤُلاَءِ؟ قَالَ: قَالاَ لِى: انْطَلِقِ انْطَلِقْ.

قَالَ: فَانْطَلَقْنَا فَانْتَهَيْنَا إِلَى رَوْضَةٍ عَظِيمَةٍ لَمْ أَرَ رَوْضَةً قَطُّ أَعْظَمَ مِنْهَا وَلاَ أَحْسَنَ؟

قَالَ: قَالاَ لِى: ارْقَ فِيهَا، قَالَ: فَانْتَهَيْنَا إِلَى مَدِينَةٍ مَبْنِيَّةٍ بِلَبِنِ ذَهَبٍ وَلَبِنِ فِضَّةٍ فَأَتَيْنَا بَابَ الْمَدِينَةِ فَاسْتَفْتَحْنَا فَفُتِحَ لَنَا فَدَخَلْنَا فَتَلَقَّانَا فِيهَا رِجَالٌ شَطْرٌ مِنْ خَلْقِهِمْ كَأَحْسَنِ مَا أَنْتَ رَاءٍ وَشَطْرٌ كَأَقْبَحِ مَا أَنْتَ رَاءٍ، قَالَ: قَالاَ لَهُمْ: اذْهَبُوا فَقَعُوا فِى ذَلِكَ النَّهرِ، قَالَ: وَإِذَا نَهَرٌ مُعْتَرِضٌ يَجْرِى كَأَنَّ مَاءَهُ الْمَحْضُ الْبَيَاضِ فَذَهَبُوا فَوَقَعُوا فِيهِ ثُمَّ رَجَعُوا إِلَيْنَا قَدْ ذَهَبَ ذَلِكَ السُّوءُ عَنْهُمْ فَصَارُوا فِى أَحْسَنِ صُورَةٍ، قَالَ: قَالاَ لِى: هَذِهِ جَنَّةُ عَدْنٍ وَهَذَاكَ مَنْزِلُكَ.

قَالَ: فَسَمَا بَصَرِى صُعُدًا فَإِذَا قَصْرٌ مِثْلُ الرَّبَابَةِ الْبَيْضَاءِ، قَالَ: – قَالاَ لي: هَذَاكَ مَنْزِلُكَ، قَالَ: قُلْتُ لَهُمَا بَارَكَ اللَّهُ فِيكُمَا ذَرَانِى فَأَدْخُلَهُ، قَالاَ: أَمَّا الآنَ فَلاَ وَأَنْتَ دَاخِلُهُ.

قَالَ: قُلْتُ لَهُمَا فَإِنِّى قَدْ رَأَيْتُ مُنْذُ اللَّيْلَةِ عَجَبًا فَمَا هَذَا الَّذِى رَأَيْتُ؟ قَالَ: قَالاَ لِى: أَمَا إِنَّا سَنُخْبِرُكَ، أَمَّا الرَّجُلُ الأَوَّلُ الَّذِى أَتَيْتَ عَلَيْهِ يُثْلَغُ رَأْسُهُ بِالْحَجَرِ فَإِنَّهُ الرَّجُلُ يَأْخُذُ الْقُرْآنَ فَيَرْفُضُهُ وَيَنَامُ عَنِ الصَّلاَةِ الْمَكْتُوبَةِ.

وَأَمَّا الرَّجُلُ الَّذِى أَتَيْتَ عَلَيْهِ تُشَرْشَرُ شِدْقُهُ إِلَى قَفَاهُ، وَمَنْخِرُهُ إِلَى قَفَاهُ وَعَيْنُهُ إِلَى قَفَاهُ فَإِنَّهُ الرَّجُلُ يَغْدُو مِنْ بَيْتِهِ فَيَكْذِبُ الْكَذْبَةَ تَبْلُغُ الآفَاقَ.

وَأَمَّا الرِّجَالُ وَالنِّسَاءُ الْعُرَاةُ الَّذِينَ فِى مِثْلِ بِنَاءِ التَّنُّورِ فَإِنَّهُمُ الزُّنَاةُ وَالزَّوَانِى.

وَأَمَّا الرَّجُلُ الَّذِى أَتَيْتَ عَلَيْهِ يَسْبَحُ فِى النَّهَرِ وَيُلْقَمُ الْحَجَرَ فَإِنَّهُ آكِلُ الرِّبَا.

وَأَمَّا الرَّجُلُ الْكَرِيهُ الْمَرْآةِ الَّذِى عِنْدَ النَّارِ يَحُشُّهَا وَيَسْعَى حَوْلَهَا فَإِنَّهُ مَالِكٌ خَازِنُ جَهَنَّمَ.

وَأَمَّا الرَّجُلُ الطَّوِيلُ الَّذِى فِى الرَّوْضَةِ فَإِنَّهُ إِبْرَاهِيمُ صَلَى اللهُ عَلَيهِ وآلِهِ وَسَلم وَأَمَّا الْوِلْدَانُ الَّذِينَ حَوْلَهُ فَكُلُّ مَوْلُودٍ مَاتَ عَلَى الْفِطْرَةِ.

قَالَ سمرةُ: فَقَالَ بَعْضُ الْمُسْلِمِينَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَأَوْلاَدُ الْمُشْرِكِينَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَى اللهُ عَلَيهِ وآلِهِ وَسَلم وَأَوْلاَدُ الْمُشْرِكِينَ، وَأَمَّا الْقَوْمُ الَّذِينَ كَانُوا شَطْرٌ مِنْهُمْ حَسَنًا وَشَطَرٌ مِنْهُمْ قَبِيحًا فَإِنَّهُمْ قَوْمٌ خَلَطُوا عَمَلاً صَالِحًا وَآخَرَ سَيِّئًا تَجَاوَزَ اللَّهُ عَنْهُمْ.

**سەمورەی کوڕی جوندوب (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا زۆر جاران دەیفەرموو بەهاوەڵانی ئایا کەس لەئێوە خەونی دیوە دەفەرمووێ هاوەڵانی خەونیان بۆ دەگێڕایەوە ئەویش بۆی لێك دەدانەوە وە ئەوەبوو بەیانیەك فەرمووی: من ئەم شەوە خەونێکم بینیوە کە دووکەس هاتن و**

منیان برده شوێنێك و بەلای كابرایەك كە لەسەر پشت راكشابوو پیاوێكیش بەردێكی گەورەی پێ بوو لەسەرسەری كابرا وەستابوو، ئینجا بەردەكەی دەكێشا بەسەری كابراكەدا، بەردەكە هەڵدەبەزییەوەو خلۆر دەبۆوە، پیاوەكەش دەچوو دەیهێنایەوە، تا دەهاتەوە سەری كابرا وەك خۆی ساڕێژ دەبۆوە، جا ئەویش دیسانەوە دەیكێشایەوە بەسەریدا، ئیتر هەروەها ئەمە كاری بوو، گوتم: سبحان الله ئەمە چییە؟ گوتییان جارێ بڕۆ.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ڕۆیشتن تاكو گەیشتین بەشوێنێك، لەوێ كە تەماشام كرد وا كابرایێ دانیشتووەو پیاوێكیش قولابێكی ئاسنینی بەدەستەوەیەو بەپێوە وەستاوە، خۆش خۆش قولابەكە دەخاتە لالغاوی كابراكە تا لەپشت سەریەوە دەردەچێ، ئەوجا ئەو لالغاوەكەی تریشی ئاوا لێ دەكرد، جا هەتا ئەم لای والێ دەكرد، ئەولاكەی تری چاك دەبۆوەو دەنوسایەوە بەیەكدا، ئەویش دیسانەوە وەك جاری پێشووی لێدەكردەوە! ئیتر هەر بەم دەستوورە، گوتم: سبحان الله ئەمە چییە؟ وتیان بابڕۆین جارێ بابڕۆین، جا ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە لای شتێ وەكو تەندوور وابوو، لەسەرەوە تەسك و لەبنەوە پان و دەڵپ بوو، تەماشام كرد، پیاوو ژنی رووتی زۆری تیادا بوو ئاگر لەژێریدا دەسووتاو بڵێسەی ئاگرەكە نێڵە نێڵی دەهات، جا كە تاوی دەسەند ئاوەكە دەكوولاو قوڵپەی دەكردو چەپۆكانی دەكردو زەلامەكانی ناوی وەك دەنكی دانوولەی سەر ئاگر، لەكاتی كوڵاندا و ژن و پیاوی رووتی تێدابوو ئاگر دای دەگرتن لەبنەوەیان بەدەم قوڵتەوە بەرز دەبوونەوە خەریك بوون هەڵبچن! بەڵام كڵپەی ئاگرەكە گورج كپ دەبۆوە، ئیتر ئەوانیش دەكەوتنە بنەكەی! ئیتر هەروەها ئەمە حاڵیان بوو، گوتم: ئەمە چییە؟ فەرموویان: جارێ بڕۆ، ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە سەر ڕووبارێكی

خوێن، کابرایێ لەناویدا بەپێوە راوەستابوو، پیاوێکیش لەسەر لێواری چۆمەکە بوو، بەردێکی زۆری لەبەردەستدا بوو، گشت جارێ کاتێ کابرای ناو چۆمە دەهات کە دەربچێ، کە دەگەیشتە لای ئەو بەردێکی دەکێشا بەناو دەمیداو تەسی پێ دەکردەوە بۆ شوێنی پێشووی، ئیتر هەموو جارێ تلێکی دەمالی بەدەمو قەپۆزیا و کابرا دەگەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی، گوتم: ئەمە چییە؟ وتیان: بابڕۆین با بڕۆین.

فەرمووی: رۆیشتین گەیشتین بەپیاوێکی ناشیرین شێوە وە ئاگرێکی گەورەی لەلابوو هەر ئاگرەکەی خۆش دەکرد فەرمووی منیش پێم وتن: ئەوە چییە؟ وتیان بابڕۆین، بابڕۆین، تا گەیشتین بەباخێکی سەوزی گەورەو لەهەموو رووناکی بەهار وە لەناو باخەکەشدا پیاوێکی بەژن و باڵا درێژی لێبوو کە باڵای ئەوەندە درێژ بوو سەری دیارنەبوو لەبەر درێژی وە لەولاو ئەولاشدا چەند منالێکی لە دەورەبوون منالی وا جوانم نەدیتوە..

فەرمووی: وتم ئەمە چییە؟ وتیان پێم: بابڕۆین، بابڕۆین، فەرمووی رۆیشتین تاکو گەیشتین بەباخێکی گەورە باخی وا جوان و گەورەم نەدیبوو، فەرمووی پێیان وتم سەرکەوە فەرمووی کە سەرکەوتووم بۆ شارێك یاخود کۆشکێك کە بناغەی خشتێکی لەزێڕ و خشتێکی تری لەزیو بوو هە تاکو گەیشتین بەدەرگای ئەو کۆشکە وە دەرگامان بۆ کرایەو کەچووینە ژوورەوە چەند پیاوێکم بینی نیوەی لاشەی زۆر جوان بوو وە نیوەکەی تری زۆر ناشیرین بوو فەرمووی: پێیان وترا بڕۆن بۆناو ئەو رووبارە کەلەوێ دیاربوو وە ئەوانیش چوون خۆیان شۆردو لەو رووبارەو ئیتر ئەو ناشیرینیەی لاشەیان جوان بۆوەو وەکو خۆی وە پێیان وتم ئەوە بەهەشتی عدنە وە ئەوکۆشکەش شوێن و جێگای تۆیە، فەرمووی: تەماشای بەرزم کردەوە دیتم کۆشکێکی تر

وەکو هەور سپی بوو، فەرمووی پێیان وتم: ئەوە جێگای تۆیەو منیش پێم وتن خوا بەرەکەت بخاتە ئێوە لێم گەڕێن بابچمە ناوی ئەوانیش وتیان ئێستا نابێت تۆ دوای دێیت بۆئێرە.

فەرمووی: پێم وتن من ئەم شەو ئەوهەموو شتە سەرسوڕهێنەرەم دیت چۆن بوون؟

فەرمووی: وتییان ئێمە ئێستا بۆت ڕون دەکەینەوە ئەو پیاوە کە سەری پان دەکرایەوە بەبەردە زلەکە ئەوە ئەوکەسەیە خوای گەورە فێری قورئانی کردووەو لەسایەی خوداوە فێری قورئان بووە، کەچی بە شەو دەخەوێ و دەوری ناکاتەوە، بەڕۆژیش ڕەفتاری پێ ناکات، وە دەخەوێ و نوێژی فەرزەکان دوا دەخات، وە ئەوپیاوەی کە دیتت لاڵغاوەیان هەڵدەدڕێ ئەوە ئەو درۆزنەیە کە درۆیێ هەڵدەبەستێ و لەدەمی ئەوەوە بەهەر چوارلادا بڵاودەبێتەوە، ئینجا ئەوە هەتا ڕۆژی قیامەت هەر وای لێدەکرێ، وە ئەو پیاوو ئافرەتانەی کە رووت بوون لەناو تەنورەکە دابوون و ئەوانە ئەو کەسانەبوون کە ئافرەت و پیاوی داوێن پیسی بوون وە ئەو پیاوەی لەناو ڕووباری خوێن دابوو کە بەردی تێ دەگیرا ئەوە ئەوکەسە ریباو (سوودخۆرە)..

وە ئەوپیاوەی کەشێوەی زۆر ناشیرین بوو ئاگری بەتێن دەکرد ئەوەماڵێکی خەزنەداری دۆزەخە، وە ئەو پیاوەی کە بەژن و باڵای درێژبوو لەناو باخەکەدابوو ئەوە حەزرەتی ئیبراهیم بوو وە مناڵەکانی لە دەوری بوون ئەوە هەموو مناڵانی پێش باڵغ بوون مردوون.

سەمورە راوی فەرموودەکە دەفەرمووێ: هەندێك لە موسڵمانان وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئایا مناڵانی موشریك و هاوەڵ دانەران لەکوێن پێغەمبەری

خوا فەرمووی ئەوانیش لەبەهەشتان، وە ئەو کۆمەڵە خەڵکەی کەنیوەی لاشەیان زۆرجوان بوو وەنیوەکەی تری زۆر ناشیرین بوو ئەوانە ئەوکەسانەن کە خێرو خراپەیان وەکو یەکەو خوای گەورە چاوپۆشییان لێ دەکات و لێیان خۆش دەبێ.

## باب طاعة السُلطان، وَمنْ حَمل علينا السِلاح

٧٧٢. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: مَنْ كَرِهَ مِنْ أَمِيرِهِ شَيْئًا فَلْيَصْبِرْ فَإِنَّهُ مَنْ خَرَجَ مِنْ السُّلْطَانِ شِبْرًا مَاتَ مِيتَةً جَاهِلِيَّةً، قالَ اللّهُ تَعَالَى: ﴿ وَٱتَّقُواْ فِتْنَةً لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمْ خَآصَّةً ﴾.

## (بەشی/ گوێڕایەڵی بۆ فەرمان ڕەوا، وەکەسێ چەك هەڵگرێ بۆ سەرئێمە)

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (رضي الله عنهما) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەگەر کەسێ شتێکی لەفەرمان ڕەواکەی بینی و پێی ناخۆش بوو با نەکات بەبەهانە بۆ تێکدانی کۆمەڵی موسڵمانان بەڵکو با ئارام بگرێ چونکە کەسێ یەك بست لەکۆمەڵەی موسڵمانان جیا بێتەوە وەبمرێ ئەوە بەمردنی نەزانێ (جاهیلی) دەمرێ.

وە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ وَٱتَّقُواْ فِتْنَةً لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمْ خَآصَّةً ﴾. واتە: خۆتان بپارێزن لە بەڵایەك کە تووشی ئەوانەتان نابێت کە تایبەتی کە ستەمیان کرد بەڵکو هەمووان دەگرێتەوە.

٧٧٣. عَنْ جُنَادَةَ بْنِ أَبِي أُمَيَّةَ قَالَ دَخَلْنَا عَلَى عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ وَهُوَ مَرِيضٌ قُلْنَا أَصْلَحَكَ اللّهُ حَدِّثْ بِحَدِيثٍ يَنْفَعُكَ اللّهُ بِهِ سَمِعْتَهُ مِنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ

دَعَانَا النَّبِيُّ (ﷺ) فَبَايَعْنَاهُ فَقَالَ فِيمَا أَخَذَ عَلَيْنَا أَنْ بَايَعَنَا عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ فِي مَنْشَطِنَا وَمَكْرَهِنَا وَعُسْرِنَا وَيُسْرِنَا وَأَثَرَةً عَلَيْنَا وَأَنْ لَا نُنَازِعَ الْأَمْرَ أَهْلَهُ إِلَّا أَنْ تَرَوْا كُفْرًا بَوَاحًا عِنْدَكُمْ مِنْ اللَّهِ فِيهِ بُرْهَانٌ.

جونادی کوڕی ئەبی ئومەییە دەفەرمووێ چووین بۆلای عوبادەی کوڕی صامیت کە نەخۆش بوو وتمان خوا شیفات بدات فەرموودەیەکمان بۆ باس بکە کە خوا سودی بۆ هێناوی کەلە پێغەمبەری خوات گوێ لێبوو فەرمووی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بانگی کردووین داوای پەیمانی لێ کردووین و ئێمەش پەیمانمان پێدا وە پێغەمبەر لەکاتی پەیمان وەرگرتندا فەرمووی: هەمیشە گوێڕایەڵ و فەرمانبەری خودا و پێغەمبەری خوابن و لەخۆشی و ناخۆشیدا وە لەکاتی ئاسوودەیی و تەنگانەدا تەنانەت ئەگەر فەرمان ڕەواکانمان نازی خەڵکی تریان بەسەر ئێمەدا وە لەفەرمانیان دەرنەچین و تەنها ئەگەر لەرێ دەرچوون وەیان کوفری ئاشکرایان لێ ببینن ئەوجا دەتوانن بێ فەرمانیان بکەن و بە زەبری شمشێر ڕاستیان بکەنەوە.

٧٧٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ تَعالى عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((لَا يُشِيرُ أَحَدُكُمْ عَلَى أَخِيهِ بِالسِّلَاحِ فَإِنَّهُ لَا يَدْرِي لَعَلَّ الشَّيْطَانَ يَنْزِعُ فِي يَدِهِ فَيَقَعُ فِي حُفْرَةٍ مِنْ النَّارِ)).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) کەدەفەرمووێ: ئەی موسڵمانان نەبەڕاست وەنە بەدرۆ با کەستان ڕووە چەکەکەی نەکاتە لای برای خۆی چونکە دوورنییە و ڕێی تێ دەچێ کەشەیتان هەڵەیەکی پێ بکات لەدەستی دەربچێ و براکەی پێ بکوژێ و خۆی ڕەهەندی ناو ئاگری دۆزەخ بکات.

## باب إذا أنزلَ الله بِقوم عذاباً
## ومَنْ إسترعى رَعية، واغتباط أهل القْبُور

٧٧٥. عَنْ ابْن عُمَر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِذَا أَنْزَلَ اللَّهُ بِقَوْمٍ عَذَابًا أَصَابَ الْعَذَابُ مَنْ كَانَ فِيهِمْ ثُمَّ بُعِثُوا عَلَى أَعْمَالِهِمْ)).

**(بەشی/ ئەگەر خوا سزایەك بنێرێ بۆ گەلێ وە کەسێ بوو بەسەرداری ژێر دەستەکەی وە خۆزگە خواستن بۆ گۆڕستان)**

**لەعەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: کاتێ خوا سزا دەنێرێ بۆسەر هۆزێ سزاکە تەڕو وشك پاك و پیس دەگرێتەوە بەڵام لەپاشان لەڕۆژی دوایی هەر کەسیان لەسەر نیازو نیەتی خۆیان زیندوو دەکرێنەوە.**

٧٧٦. عَنْ ابْن عُمَر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (( لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَمُرَّ الرَّجُلُ بِقَبْرِ الرَّجُلِ فَيَقُولُ يَا لَيْتَنِي مَكَانَهُ)).

**عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە دەفەرمووێ: قیامەت هەڵناستێ تاکو وای لێ دێت پیاو بەلای گۆڕستان رەت دەبێت و دەڵێت خۆزگە من لەوجێگایە بامایە.**

٧٧٧. عَنْ مَعْقِلَ بْنَ يَسَارٍ أَنَّه سمع النَّبِيّ (ﷺ) يَقول: ((مَا مِنْ وَالٍ يَلِي رَعِيَّةً مِنْ الْمُسْلِمِينَ فَيَمُوتُ وَهُوَ غَاشٌّ لَهُمْ إِلَّا حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ)).

**لە مەعقەلی کوڕی یەسار کە گوێی لەپێغەمبەر بوو (ﷺ) دەیفەرموو: هەرکەسێ ببێت بەسەرداری خەڵکان و خیانەت و دزیان لێ بکات ئەوە لەسەر ئەوحاڵە دەوام بکات خوا بەهەشتی لەسەر حەرام دەکات.**

٧٧٨. كَتَبَ أَبُو بَكْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ إِلَى ابْنِهِ وَكَانَ بِسِجِسْتَانَ بِأَنْ لَا تَقْضِيَ بَيْنَ اثْنَيْنِ وَأَنْتَ غَضْبَانُ فَإِنِّي سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ)يَقُولُ: ((لَا يَقْضِيَنَّ حَكَمٌ بَيْنَ اثْنَيْنِ وَهُوَ غَضْبَانُ)).

ئـەبو بـەكره (رضـي الله عنـه) نامـەی نـارد بـۆ كوڕەكـەی كەلەشـاری سەجستان بـوو، بۆئـەوەی كـە داد\وەری لـەنێوان دووكـەس نـەكات لـەكاتی توڕەبیدا چونكە من لەپێغەمبەری خوام بیستووە كە فەرموویەتی: با كەستان لەكاتی توڕەبووندا دادپرسی و دادوەری لەنێوان دووكەس نەكات.

## باب متى يَسْتوجِب الرجل القضاء والحكم بالعدل

٧٧٩. قَالَ الْحَسَنُ البَصري أخَذَ اللّهُ عَلَى الْحُكّامِ أنْ لاَ يَتَّبِعُوا الْهَوَى، وَلاَ يَخْشَوُا النَّاسَ وَلاَ يَشْتَرُوا بِآيَاتِي ثَمَنًا قَلِيلاً، ثُمَّ قَرَأَ ﴿ يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَٰكَ خَلِيفَةً فِى ٱلْأَرْضِ فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا نَسُوا۟ يَوْمَ ٱلْحِسَابِ ﴾ وَقَرَأَ ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَا ٱلتَّوْرَىٰةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ ۚ يَحْكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسْلَمُوا۟ لِلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ بِمَا ٱسْتُحْفِظُوا۟ مِن كِتَٰبِ ٱللَّهِ وَكَانُوا۟ عَلَيْهِ شُهَدَآءَ ۚ فَلَا تَخْشَوُا۟ ٱلنَّاسَ وَٱخْشَوْنِ وَلَا تَشْتَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِى ثَمَنًا قَلِيلًا ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴾.

## (بەشی/ ج كات پێویستە دادوەر دادپرسی بكات و عەدالەت بكات)

حەسەنی بەسرِی دەفەرمووێ خوای گەورە پـەیمانی لـە فـەرمان رەوایـان وەرگرتووە كە بەدوای ئارەزووی خۆیـان نەكـەون وە لەخـەڵكی نەترسـن وە ئایەت و نیشانەكانی من نەفرۆشن بەهەرزان لەپاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

﴿ يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَٰكَ خَلِيفَةً فِى ٱلْأَرْضِ فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا نَسُوا۟ يَوْمَ ٱلْحِسَابِ ﴾ واتە: ئەی داود بەڕاستی ئێمە تۆمان كردۆتە بەجێنشین لەم وڵاتەدا فەرمان رەوایی لەنێوان خەڵكدا لەسەر بنچینەی حەق و راستی ئـەنجام بـدە هەرگیز شوێنی ئارەزوو مەكەوە تا نەبێتە هۆی گومڕاكردن و لادانت لەڕێبازی خودا چونكە بێگومان ئەوانەی لەڕێبازی خودا لادەدەن سـزای بـەئێش و پـڕ لەئازار بۆیان ئامادەیە بەهۆی فەرامۆشكردنی رۆژی لێپرسینەوە (تەفـسیری ئاسان ل٤٥٤).

وە هـەروەها دەفـەرمووێ: ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَا ٱلتَّوْرَىٰةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ ۚ يَحْكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسْلَمُوا۟ لِلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ بِمَا ٱسْتُحْفِظُوا۟ مِن كِتَٰبِ ٱللَّهِ وَكَانُوا۟ عَلَيْهِ شُهَدَآءَ ۚ فَلَا تَخْشَوُا۟ ٱلنَّاسَ وَٱخْشَوْنِ وَلَا تَشْتَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِى ثَمَنًا قَلِيلًا ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴾. (سورەتی: المائدة).

راقەکەی: ئێمە ئەوانمان ناردە خوارەوە رێنمونی تیادابوو نورو رۆناکی بوو ئەو پێغەمبەرانەی کە هەمیشە ملکەچ و فەرمانبەردار بوون، حوکمی ئەوانەیان پێنەکرد کە ببونە جوولەکە هەروەها زانا پەروەردگار ناسەکانیان و زانا شەرع ناسەکانیشیان حوکمیان دەکرد بەوەی داوایان لێ کرابوو بیپارێزن کە ئەویش کتێبی خودایە کە تەوراتە هەروەها شایەتیش بوون لەسەری کەواتە ئەی زانایانی جوولەکە ئەی ئیمانداران لەخەڵکی مەترسن و بەڵکو تەنها لەمن بترسن ئایەت و فەرمانەکانی من بەنرخێکی کەم مەفرۆشن، جا ئەوەی حوکم بۆ دادوەری بەو بەرنامەیە نەکات کەخودا دایبەزاندۆتە خوارەوە ئائەوانە بێ باوەڕن (تەفسیری ئاسان ل١١٥).

## باب الثناء على السلطان

٧٨٠. قَالَ مُزَاحِمُ بْنُ زُفَرَ: قَالَ لَنَا عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ الأموي: خَمْسٌ إِذَا أَخْطَأَ الْقَاضِي مِنْهُنَّ خَصْلَةً كَانَتْ فِيهِ وَصْمَةٌ أَنْ يَكُونَ فَهِمًا حَلِيمًا عَفِيفًا صُلْبًا عَالِمًا سَؤُولًا عَنْ الْعِلْمِ.

## (بەشی/ مەدح کردنی فەرمانڕەوا)

مزاحم کوڕی زەفر دەفەرمووێ عومەری کوڕی عەبدولعەزیز پێمانی وت پێنج سیفەت هەن ئەگەر قازی و دادوەر لەیەکێکیانی بەهەڵە چوو ئەوا نیشانەو عەیبی خراپی لێ دیار دەکەوێ کە ئەوانیش: دەبێ قازی موسڵمان و نەرم و نیان و خۆپارێزبێت لە حەرام و بەهێز و زانا و تێگەیشتوو زۆر پرسیار بکات و بۆ فێربوونی زانست و زانیاری.

٧٨١. قَالَ أُنَاسٌ مِنْهُم عُرْوَةُ بن الزُّبير لإبْنِ عُمَرَ رَضيَ اللهُ عَنْهُما: إنَّا نَدْخُلُ عَلَى سُلْطَانِنَا فَنَقُولُ لَهُمْ خِلَافَ مَا نَتَكَلَّمُ إِذَا خَرَجْنَا مِنْ عِنْدِهِمْ قَالَ كُنَّا نَعُدُّهَا نِفَاقًا.

هەندێك لەخەڵكان دەفەرموون: لەوانە عوروەی کوڕی زوبەیرو عەبدوڵلای کوڕی عومەر (رضي الله عنهما) ئێمە کە دەچینەلای گەورەو فەرمان ڕەوایان ئەوقسەی کە لەگەڵیان دەکەین و کە دەڕۆینەوە دەرەوە بەجیاواز لەقسەی پێشوو دەڵێن ئێمە ئەو کردەوەیە بەنیفاق و دوڕوو حیسابمان دەکرد لەکاتی پێغەمبەردا.

## باب الإقتداء بسنته (ﷺ)، وتعليم النساء

٧٨٢. عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ رَضيَ اللهُ عَنْهُ قال: جَاءَتْ مَلَائِكَةٌ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) وَهُوَ نَائِمٌ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ إِنَّهُ نَائِمٌ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ إِنَّ الْعَيْنَ نَائِمَةٌ وَالْقَلْبَ يَقْظَانُ، فَقَالُوا: إِنَّ لِصَاحِبِكُمْ هَذَا مَثَلًا فَاضْرِبُوا لَهُ مَثَلًا، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: إِنَّهُ نَائِمٌ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: إِنَّ الْعَيْنَ نَائِمَةٌ وَالْقَلْبَ يَقْظَانُ فَقَالُوا مَثَلُهُ كَمَثَلِ رَجُلٍ بَنَى دَارًا وَجَعَلَ فِيهَا مَأْدُبَةً وَبَعَثَ دَاعِيًا فَمَنْ أَجَابَ الدَّاعِيَ دَخَلَ الدَّارَ وَأَكَلَ مِنْ الْمَأْدُبَةِ وَمَنْ لَمْ يُجِبْ الدَّاعِيَ لَمْ يَدْخُلْ الدَّارَ وَلَمْ يَأْكُلْ مِنْ الْمَأْدُبَةِ فَقَالُوا أَوِّلُوهَا لَهُ(ﷺ) يَفْقَهْهَا فَقَالَ بَعْضُهُمْ إِنَّهُ نَائِمٌ وَقَالَ بَعْضُهُمْ إِنَّ الْعَيْنَ نَائِمَةٌ وَالْقَلْبَ يَقْظَانُ فَقَالُوا فَالدَّارُ الْجَنَّةُ وَالدَّاعِي مُحَمَّدٌ (ﷺ) فَمَنْ أَطَاعَ مُحَمَّدًا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ وَمَنْ عَصَى مُحَمَّدًا (ﷺ) فَقَدْ عَصَى اللَّهَ وَمُحَمَّدٌ فَرْقٌ بَيْنَ النَّاسِ.

## (بەشی/ دەستگرتن بەسوننەتی پێغەمبەرو فێرکردنی ئافرەتان)

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (رضي الله عنـه) دەفـەرمووێ چـەند فریـشتەیەك هاتن بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و ئەویش لەخەودابوو، هەندێکیان دەڵێن: ئەمـە نوسـتووە، هەنـدێکی تریـشیان دەڵـێن: بەچـاو نوسـتووە بـەڵام بـەدڵ وریایە، چونکە پێغەمبەران دڵیان نانووێ، جا گوتیـان: ئـەم بـرادەرەی ئێـوە نمونـەو وێنەیـەکی هەیـە، ئـەو نمونـەو وێنەیـەی خـۆیی بـۆ روون بکەنـەوە، هەندێکیان گوتیانەوە: ئاخر خەوتووە، هەندێکی تریشیان گوتیانەوە: بەچاو نوستووە، بەڵام بەدڵ وریایە، ئینجا فەرموویان نمونەو وێنەی ئەم پیاوە وەك پیاوێ وایە کەوا خانوویێ درووست بکاو شاییەکی بـۆ بکـاو بانگکـەر بنێـرێ کەخەڵك خوڵك بکا بۆ سەرشایی، ئیتر ئەوەی بەدەنگی بانگکارەکەوە بـچێت دەچـێتە نـاو خانووەکـەوەو لـەنانی شـاییەکە دەخـوات، ئەوەشـی نەچـێ بەدەنگی بانگکەرەکەوە نەدەچێتە ناو خانووەکەوەو نە لەنانی شـاییەکەیش دەخوا.

ئینجا فریشتەکان فەرموویان: ئادەی ئەم مەسەل و سەرگوزشتە بۆ لێك بدەنەوە باباش تێی بگات، جادیسان هەندێکیان فەرموویان: ئاخر خەوتووە، وە هەندێکی تریشیان فەرموویان: چاو خەوتوە دڵ خەبەردارە! ئینجا فەرموویان: خانووەکە بەهەشتە، بانگکەرەکەش موحەمەدە -درودی خوای لێ بێ- ئیتر ئەوەی فەرمانی موحەمەد لەگوێ بگرێ لەراستیدا فەرمانی خودا لەگوێ دەگرێ، وەئەوەی لەموحەمەد یاخی بێ لەفەرمانی خودا دەردەچێ، وە موحەمەدیش جیاکەرەوەی نێوان خەڵکانە.

٧٨٣. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدرِي رَضيَ اللهُ عَنْهُ قال: جَاءَتْ امْرَأَةٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ ذَهَبَ الرِّجَالُ بِحَدِيثِكَ فَاجْعَلْ لَنَا مِنْ نَفْسِكَ يَوْمًا نَأْتِيكَ فِيهِ تُعَلِّمُنَا مِمَّا عَلَّمَكَ اللَّهُ فَقَالَ (ﷺ) اجْتَمِعْنَ فِي يَوْمِ كَذَا وَكَذَا فِي مَكَانِ كَذَا وَكَذَا فَاجْتَمَعْنَ فَأَتَاهُنَّ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَعَلَّمَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَهُ اللَّهُ ثُمَّ قَالَ مَا مِنْكُنَّ امْرَأَةٌ تُقَدِّمُ بَيْنَ يَدَيْهَا مِنْ وَلَدِهَا ثَلَاثَةً إِلَّا كَانَ لَهَا حِجَابًا مِنْ النَّارِ فَقَالَتْ امْرَأَةٌ مِنْهُنَّ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَوْ اثْنَيْنِ قَالَ أبو سعيد فَأَعَادَتْهَا مَرَّتَيْنِ ثُمَّ قَالَ (ﷺ) وَاثْنَيْنِ وَاثْنَيْنِ وَاثْنَيْنِ.

ئەبی سەعیدی خودری (رضي الله عنه) دەفـەرمووێ ئـافرەتێ هاتـە لای پێغەمبەر (ﷺ) وتی ئەی پێغەمبـەری خـوا لەبـەر پیـاوان لەخزمـەتی تـۆدا بەبەرئێمە ناكەوێ بۆ فێربوونی خزمەتی ئایین، ڕۆژێكمان بـۆ دانـێ و دیـاری بكە كە بێینـە لات بـۆ فێربـوون ئـەویش فـەرمووی لـە فولانـە ڕۆژ كۆببنـەوە لەفولانە شوێن ئیتر وایان كردو پێغەمبەر هاتـە ناویـان ئـەوەی خـوا ویستی لەسەر فێری عیلم و زانیـاری كـردن و ئامۆژگـاری كـردن لەپاشـان فـەرمووی هەركەسێ لەئێوە ئەگەر لەپێش خۆی سێ منالی جگەرگۆشەی بمرن و سەبرو ئارامی لەسەر بگرێ بۆی دەبن بە پەردەو قەلات و شووره لەئاگری دۆزەخدا، وە ئافرەتێك لەوان وتـی ئـەی پێغەمبـەری خـوا ئەگـەر دوو منـاڵ بـن (ئـەبو سەعید فەرمووی) ئەم ئافرەتە دووجار دووبارەی كردەوە لەپاشان پێغەمبەر فەرمووی: ئەگەر دووبن، دووبن، دووبن.

## باب لِتَتبعنَ سُنن مَنْ كان قبلكُمْ وإثم من دعا إلى ضلالة

٧٨٤. وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ أيضاً رَضيَ اللهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ ((لَتَتْبَعُنَّ سَنَنَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ شِبْرًا شِبْرًا وَذِرَاعًا بِذِرَاعٍ حَتَّى لَوْ دَخَلُوا جُحْرَ ضَبٍّ تَبِعْتُمُوهُمْ قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى؟ قَالَ ((فَمَنْ))؟!

**(بەشی/ بەدواکەوتنی شوێنەواری ئۆممەتەکانی پێش ئێوە، وە تاوانی کەسێ بانگەوازی گومڕایی بکات).**

ئەبی سەعیدی خودری (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە دەفەرمووێ: دوای ڕەوشت و ڕەفتاری نالەباری گەلەکانی پێش خۆتان دەکەون بست بەبست وە باڵ بەباڵ هەتا ئەگەر بچن بۆناو کونە بزن مژە ئێوە بەدوایان دەکەون، وتمان ئەی نێرراوی خودا ئەمانە جوولەکەو گاورن، فەرمووی ئەی لەوان زیاتر کێ هەیە.

٧٨٥. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مَسعُود رَضيَ اللهُ عَنْهُ قَال: قَالَ رَسُول الله (ﷺ) لَيْسَ مِنْ نَفْسٍ تُقْتَلُ ظُلْمًا إِلَّا كَانَ عَلَى ابْنِ آدَمَ الْأَوَّلِ كِفْلٌ مِنْهَا وَرُبَّمَا قَالَ سُفْيَانُ مِنْ دَمِهَا لِأَنَّهُ أَوَّلُ مَنْ سَنَّ الْقَتْلَ أَوَّلًا قال تَعَالَى: ﴿وَمِنْ أَوْزَارِ ٱلَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ الآية.

عەبدوڵلای کوڕی مەسعود (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: هەرکەسێ بەناڕەوا بکوژرێ ئەوا بەشی لەتاوانی خوێنەکەی دەکەوێتە ئەستۆی کوڕی باوکە ئادەم (عليه السلام) چونکە ئەو یەکەم کەس بوو کەخوێن ڕشتنی داهێنا، خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَمِنْ أَوْزَارِ ٱلَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ واتە: لەتاوانی ئەوانە ئەبن دەخرێتە سەری کەگومڕای کردوون و گومڕابوون بەبێ زانیاری.

## باب كراهة الإختلاف والله هوَ الرزاق

٧٨٦. عن جندب بن عَبد الله رَضيَ اللهُ عَنْهُ قال: قالَ رَسُول الله صَلَى اللهُ تَعالى عَلَيهِ وَآلِهِ وَسَلم: ((اقْرَؤوا القُرآنَ ما ائْتَلَفَتْ قُلُوبكُمْ فَإذا اخْتَلَفْتُم فَقُوموا عَنْهُ)).

## (بەشی/ کەراهەتی پەرتەوازەیی و دووبەرەکی و خوا رۆزی دەرە)

جوندوبی کوڕی عەبدوڵلا (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: قورئان بخوێنن کە دڵتان لەسەریەتی بەڵام کەبێ تاقەت بوون دوویەرەکی بوون هەڵسن و بەجێی بهێڵن.

٧٨٧. عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ رَضيَ اللهُ عَنْهُ قَال: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): ((مَا أَحَدٌ أَصْبَرُ عَلَى أَذًى سَمِعَهُ مِنْ اللَّهِ يَدَّعُونَ لَهُ الْوَلَدَ ثُمَّ يُعَافِيهِمْ ثُمَّ يَرْزُقُهُمْ))، قالَ اللهُ تَعالى: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلْقُوَّةِ ٱلْمَتِينُ ﴾.

لەئەبی موسای ئەشعەری (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: کەسێ لەخوا بەئارامترو بە صەبرتر نییە لەو ئازارەی خوا دەدەن کە بانگەوازی کوڕی بۆ بڕیار دەدەن و لەپاشان ساغ و سەلامەت و رزق و رۆزیان پێ دەدات.

وە خوا دەفەرمووێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلْقُوَّةِ ٱلْمَتِينُ ﴾ واتە: خوا خۆی رۆزی دەرە و خاوەن هێزو قوەتە.

## باب السؤال بأسمائه تعالى
## عند النوم ويُحَذركم الله نفسه

٧٨٨. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضيَ اللهُ عَنْهُما أَنَّ النَّبيَّ (ﷺ) كَانَ يَقُولُ: ((أَعُوذُ بِعِزَّتِكَ الَّذي لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ الَّذي لَا يَمُوتُ وَالْجِنُّ وَالْإِنْسُ يَمُوتُونَ)).

## (بەشی/ داواکردن بەناوەکانی خوا لەکاتی نووستن، وە ئایەتی ﴿وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَهُ﴾)

عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) کە هەمووجاران دەیفەرموو: ((أَعُوذُ بِعِزَّتِكَ الَّذي لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ الَّذي لَا يَمُوتُ وَالْجِنُّ وَالْإِنْسُ يَمُوتُونَ)). واتە: خۆم پەنا دەدەم بە باڵادەستی خوا کە هیچ خوایەك نییە جگە لەو نەبێت کەنامرێ وە جنۆکەو ئادەمی دەمرن.

٧٨٩. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضيَ اللهُ عَنْهُ عَنْ النَّبيِّ (ﷺ) قَالَ: ((إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمْ إِلى فِرَاشَهُ فَلْيَنْفُضْهُ بِصَنِفَةِ ثَوْبِهِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ وَلْيَقُلْ بِاسْمِكَ رَبِّ وَضَعْتُ جَنْبِي وَبِكَ أَرْفَعُهُ إِنْ أَمْسَكْتَ نَفْسِي فَاغْفِرْ لَهَا وَإِنْ أَرْسَلْتَهَا فَاحْفَظْهَا بِمَا تَحْفَظُ بِهِ عِبَادَكَ الصَّالِحِينَ)).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: ئەگەر یەکێکتان دەیەوێ بچێتەسەر جێگای نووستن بابەچمکی ناوەوەی یان هەرشتێکی تر نوێنەکەی بتەکێنێ سێ جاران لەپاشان ئەم نزایە بکات و بڵێ: ((بِاسْمِكَ رَبِّ وَضَعْتُ جَنْبِي وَبِكَ أَرْفَعُهُ إِنْ أَمْسَكْتَ نَفْسِي فَاغْفِرْ لَهَا وَإِنْ أَرْسَلْتَهَا فَاحْفَظْهَا بِمَا تَحْفَظُ بِهِ عِبَادَكَ الصَّالِحِينَ)).

واتە: بەناوی تۆ پەروەردگارم تەنیشتی خۆم لەسەر نوێنەکەم داناوە وە دەخەوم بەپشت و پەنای تۆ بەرزی دەکەمەوە وەهەڵدەستم لەخەو وەئەگەر گیانم دەکێشی لەم خەوەدا ئەوا بەڕەحمەتی خۆت ڕەحمی پێ بکە وە ئەگەر

لەم خەوە خەبەرم دەکەیتەوە ئەوا بیپارێزە هەروەکو بەندە چاکەکانت پێ پاراستووە.

٧٩٠.عَنْ حُذَيْفَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَال: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ قَالَ: ((اللَّهُمَّ بِاسْمِكَ أَحْيَا وَأَمُوتُ وَإِذَا أَصْبَحَ قَالَ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَا وَإِلَيْهِ النُّشُورُ)).

حوذەیفە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ دەچوو سەر جێگای نووستن دەیفەرموو: (اللهمَ باسمكَ أحيا واموت) خوایەگیان بەناوی تۆ دەمرم و زیندوو دەکرێمەوە وە کە بەیانی لەخەو هەڵدەستا دەیفەرموو (الحمد لله الذي احيانا بعدما اماتنا واليه النشور) واتە: سوپاس بۆئەوخوایەی کە زیندووی کردوینەتەوە لەپاش مردن وە گەڕانەوەمان بۆلای ئەوە.

٧٩١.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) ((يَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي وَأَنَا مَعَهُ إِذَا ذَكَرَنِي فَإِنْ ذَكَرَنِي فِي نَفْسِهِ ذَكَرْتُهُ فِي نَفْسِي وَإِنْ ذَكَرَنِي فِي مَلَإٍ ذَكَرْتُهُ فِي مَلَإٍ خَيْرٍ مِنْهُمْ وَإِنْ تَقَرَّبَ إِلَيَّ بِشِبْرٍ تَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ ذِرَاعًا وَإِنْ تَقَرَّبَ إِلَيَّ ذِرَاعًا تَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ بَاعًا وَإِنْ أَتَانِي يَمْشِي أَتَيْتُهُ هَرْوَلَةً)).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: خوای باڵادەست فەرموویەتی (من لەلای گومانی بەندەی خۆمم بەمن و من لەگەڵی دام کاتێ کە یادی من بکات و ئەگەر لەلای خۆی و لەدەروونی خۆی یادی من بکات منیش لەلای خۆم یادیدەکەم وە ئەگەر لەناو کۆمەڵێکا یادی من بکات منیش لەناو کۆمەڵێکا باشتر لەکۆمەڵی ئەو باسی دەکەم وە ئەگەر ئەو بەبست بێت بۆلام من بەباڵ بۆی دێم، وە ئەگەر بەباڵ بۆم بێت منیش بەغاردان و راکردن بۆی دێم.

## باب يد الله ملأى ولا شخص
## أغير من الله، ودعاء الكرب

٧٩٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((يَدُ اللَّهِ مَلْأَى لَا يَغِيضُهَا نَفَقَةٌ سَحَّاءُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ وَقَالَ: أَرَأَيْتُمْ مَا أَنْفَقَ مُنْذُ خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ؟ فَإِنَّهُ لَمْ يَغِضْ مَا فِي يَدِهِ، وَقَالَ: عَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ وَبِيَدِهِ الْأُخْرَى الْمِيزَانُ يَخْفِضُ وَيَرْفَعُ)).

## (بەشی/ دەستی قودرەتی خوا پڕە، وە کەسێ لەخوا بەغیرەتتر نییە، وە نزای خەم و خەفەت)

ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: دەستی قودرەتی خوا پڕە و کەم ناکات بەبەخشین و سەرفکردنی بەردەوام دەبەخشێ بەشەوو بەڕۆژ، وە فەرمووی ئایا نابینن چی سەرف کردووە لەبەخشین لەوکاتەی زەوی و ئاسمانەکانی دروست کردووە وە ئەوەی لەدەستی دایە کەم ناکات وە فەرمووی عەرش و بارەگای خوا لەسەر ئاوەو وەبەدەستی قودرەتی تری تەرازووی گرتووەو بەرزی دەکات و نزمی دەکاتەوە چۆنێ حەزبکات.

٧٩٣. عَنْ الْمُغِيرَةِ رَضِيَ اللهُ تعالى عَنْهُ قَالَ: قَالَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ لَوْ رَأَيْتُ رَجُلًا مَعَ امْرَأَتِي لَضَرَبْتُهُ بِالسَّيْفِ غَيْرَ مُصْفَحٍ فَبَلَغَ ذَلِكَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ)فَقَالَ: ((أَتَعْجَبُونَ مِنْ غَيْرَةِ سَعْدٍ وَاللَّهِ لَأَنَا أَغْيَرُ مِنْهُ وَاللَّهُ أَغْيَرُ مِنِّي وَمِنْ أَجْلِ غَيْرَةِ اللَّهِ حَرَّمَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَلَا أَحَدَ أَحَبُّ إِلَيْهِ الْعُذْرُ مِنْ اللَّهِ وَمِنْ أَجْلِ ذَلِكَ بَعَثَ الْمُبَشِّرِينَ وَالْمُنْذِرِينَ وَلَا أَحَدَ أَحَبُّ إِلَيْهِ الْمِدْحَةُ مِنْ اللَّهِ وَمِنْ أَجْلِ ذَلِكَ وَعَدَ اللَّهُ الْجَنَّةَ)).

له موغیره (رضي الله عنه) دەفەرمووێ سەعدی کوڕی عوبادە فەرمووی: ئەگەر پیاوێ ببینم لەگەڵ خێزانی خۆم بەم شیرە دەی کوژم نەك وەکو خۆی تەعدای لێ بکەمەوە وە ئەم وتە گەیشتەوە بەپێغەمبەری خوا، فەرمووی: سەرتان سوڕدەمێنێ لە غیرەتی و پیاوەتی سەعدی کوڕی عوبادە سوێندم بەخوا من لەو بەغیرەترم وەخواش لەمن بەغیرەتترە وە لەبەر ئەو غیرەتەی خوا داوێن پیسی قەدەغە کردووە چ بەئاشکرا بکرێ چ بە پەنهانی.

وە کە وەك خوا عوذرو خواهی پێ خۆش نییە هەر لەبەر ئەوەشە کەخودا پێغەمبەرانی ناردووە تا مژدەدەرو هەڕەشە بکەن وە کەس وەك خودا مەدح و پیاهەڵگوتنی پێ خۆش نییە هەر لەبەرئەوەشە کە مژدەو مزگێنی و وەعدەی داوە بە بەهەشت.

٧٩٤.عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما قال: كانَ النَّبي (ﷺ) كَانَ يَقُولُ عِنْدَ الْكَرْبِ: ((لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ الْعَظِيمُ الْحَلِيمُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَرَبُّ الْأَرْضِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ)).

عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ تووشی خەم و خەفەت و دڵتەنگی دەهات دەیفەرموو: ((لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ الْعَظِيمُ الْحَلِيمُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَرَبُّ الْأَرْضِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ.) واتە: هیچ خوا نییە جگە لە الله نەبێت گەورەو نەرم و نیانە هیچ خوا نییە جگە لە الله نەبێت پەروەردگاری عەرشی گەورەیەو هیچ خودایەك نییە جگە لە الله نەبێت پەروەردگاری ئاسمانەکان و پەروەردگاری زەوی و پەروەردگاری عەرشی بەڕێزە.

## باب تعرج الملائكة ورؤية الله
## يوم القيامة، ووجوه ناضرةَ

٧٩٥. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((يَتَعَاقَبُونَ فِيكُمْ مَلَائِكَةٌ بِاللَّيْلِ وَمَلَائِكَةٌ بِالنَّهَارِ وَيَجْتَمِعُونَ فِي صَلَاةِ الْعَصْرِ وَصَلَاةِ الْفَجْرِ ثُمَّ يَعْرُجُ الَّذِينَ بَاتُوا فِيكُمْ فَيَسْأَلُهُمْ وَهُوَ أَعْلَمُ بِهِمْ فيقول سبحانه كَيْفَ تَرَكْتُمْ عِبَادِي فَيَقُولُونَ تَرَكْنَاهُمْ وَهُمْ يُصَلُّونَ وَأَتَيْنَاهُمْ وَهُمْ يُصَلُّونَ)).

## (بەشی/ بەرزبوونەوەی فریشتەکان وە دیتنی خوا لەرۆژی قیامەت و دەمو چاوەکانی گەشاوەکان)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) کەدەفەرمووێ: چەند فریشتەیێ بەرۆژ و چەند فریشتەیێ بەشەو دادەبەزن بەدیارتانەوەن وە هەر دوولایان لەنوێژی بەیانیو نوێژی عەسر یەکتر دەگۆڕن، جا ئەوکاتەی فریشتەکانی بەشەو بەدیارتان بوون سەردەکەونەوە بۆلای خوای پەروەردگار و لێیان دەپرسێ (هەرچەندە خۆی باش دەزانێ) لەحاڵیان دەفەرمووێ: کەئێوە هاتنەوە لەلای ئەو بەندانەم چیان دەکردو خەریکی چی بوون، ئەوانیش دەڵێن چووین بۆلایان نوێژیان دەکرد وە کە گەڕاینەوەش بۆلای تۆ هەر خەریکی نوێژ بوون.

٧٩٦. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ فِي رؤية الله قَال: قُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ هَلْ نَرَى رَبَّنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ قَالَ: هَلْ تُضَارُونَ فِي رُؤْيَةِ الشَّمْسِ وَالْقَمَرِ إِذَا كَانَتْ صَحْوًا؟ قُلْنَا لَا قَالَ: فَإِنَّكُمْ لَا تُضَارُونَ فِي رُؤْيَةِ رَبِّكُمْ يَوْمَئِذٍ إِلَّا كَمَا تُضَارُونَ فِي رُؤْيَتِهِمَا، ثُمَّ قَالَ: يُنَادِي مُنَادٍ لِيَذْهَبْ كُلُّ قَوْمٍ إِلَى مَا كَانُوا يَعْبُدُونَ فَيَذْهَبُ أَصْحَابُ الصَّلِيبِ مَعَ صَلِيبِهِمْ وَأَصْحَابُ الْأَوْثَانِ مَعَ أَوْثَانِهِمْ وَأَصْحَابُ كُلِّ آلِهَةٍ مَعَ آلِهَتِهِمْ حَتَّى يَبْقَى مَنْ كَانَ يَعْبُدُ اللَّهَ عز وجل

مِنْ بَرّ أَوْ فَاجِرٍ مَا يَحْبِسُكُمْ وَقَدْ ذَهَبَ النَّاسُ؟ فَيَقُولُونَ فَارَقْنَاهُمْ وَنَحْنُ أَحْوَجُ مِنَّا إِلَيْهِ الْيَوْمَ وَإِنَّا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِي لِيَلْحَقْ كُلُّ قَوْمٍ بِمَا كَانُوا يَعْبُدُونَ وَإِنَّمَا نَنْتَظِرُ رَبَّنَا قَالَ فَيَأْتِيهِمْ الْجَبَّارُ فَيَقُولُ أَنَا رَبُّكُمْ فَيَقُولُونَ أَنْتَ رَبُّنَا فَلَا يُكَلِّمُهُ إِلَّا الْأَنْبِيَاءُ فَيَقُولُ هَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُ آيَةٌ تَعْرِفُونَهُ فَيَقُولُونَ السَّاقُ فَيَكْشِفُ تعالى عَنْ سَاقِهِ فَيَسْجُدُ لَهُ كُلُّ مُؤْمِنٍ وَيَبْقَى مَنْ كَانَ يَسْجُدُ لِلَّهِ رِيَاءً وَسُمْعَةً فَيَذْهَبُ كَيْمَا يَسْجُدَ فَيَعُودُ ظَهْرُهُ طَبَقًا وَاحِدًا ثُمَّ يُؤْتَى بِالْجَسْرِ فَيُجْعَلُ بَيْنَ ظَهْرَانَيْ جَهَنَّمَ قُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا الْجَسْرُ قَالَ(ﷺ) مَضْحَضَةٌ مَزِلَّةٌ عَلَيْهِ خَطَاطِيفُ وَكَلَالِيبُ وَحَسَكَةٌ مُفَلْطَحَةٌ لَهَا شَوْكَةٌ عُقَيْفَاءُ تَكُونُ بِنَجْدٍ يُقَالُ لَهَا السَّعْدَانُ الْمُؤْمِنُ عَلَيْهَا كَالطَّرْفِ وَكَالْبَرْقِ وَكَالرِّيحِ وَكَأَجَاوِيدِ الْخَيْلِ وَالرِّكَابِ فَنَاجٍ مُسَلَّمٌ وَنَاجٍ مَخْدُوشٌ وَمَكْدُوسٌ فِي نَارِ جَهَنَّمَ حَتَّى يَمُرَّ آخِرُهُمْ يُسْحَبُ سَحْبًا فَمَا أَنْتُمْ بِأَشَدَّ لِي مُنَاشَدَةً فِي الْحَقِّ قَدْ تَبَيَّنَ لَكُمْ مِنْ الْمُؤْمِنِ يَوْمَئِذٍ لِلْجَبَّارِ وَإِذَا رَأَوْا أَنَّهُمْ قَدْ نَجَوْا فِي إِخْوَانِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا إِخْوَانُنَا كَانُوا يُصَلُّونَ مَعَنَا وَيَصُومُونَ مَعَنَا وَيَعْمَلُونَ مَعَنَا فَيَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى اذْهَبُوا فَمَنْ وَجَدْتُمْ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالَ دِينَارٍ مِنْ إِيمَانٍ فَأَخْرِجُوهُ وَيُحَرِّمُ اللَّهُ صُوَرَهُمْ عَلَى النَّارِ فَيَأْتُونَهُمْ وَبَعْضُهُمْ قَدْ غَابَ فِي النَّارِ إِلَى قَدَمِهِ وَإِلَى أَنْصَافِ سَاقَيْهِ فَيُخْرِجُونَ مَنْ عَرَفُوا ثُمَّ يَعُودُونَ فَيَقُولُ الله تعالى اذْهَبُوا فَمَنْ وَجَدْتُمْ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالَ نِصْفِ دِينَارٍ فَأَخْرِجُوهُ فَيُخْرِجُونَ مَنْ عَرَفُوا ثُمَّ يَعُودُونَ فَيَقُولُ الله تعالى اذْهَبُوا فَمَنْ وَجَدْتُمْ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ مِنْ إِيمَانٍ فَأَخْرِجُوهُ فَيُخْرِجُونَ مَنْ عَرَفُوا قَالَ أَبُو سَعِيدٍ (رضي الله عنه) فَإِنْ لَمْ تُصَدِّقُونِي فَاقْرَءُوا ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ ۖ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَٰعِفْهَا ﴾ فَيَشْفَعُ النَّبِيُّونَ وَالْمَلَائِكَةُ وَالْمُؤْمِنُونَ فَيَقُولُ الْجَبَّارُ بَقِيَتْ

شَفَاعَتِي فَيَقْبِضُ قَبْضَةً مِنْ النَّارِ فَيُخْرِجُ أَقْوَامًا قَدْ امْتُحِشُوا فَيُلْقَوْنَ فِي نَهَرٍ بِأَفْوَاهِ الْجَنَّةِ يُقَالُ لَهُ مَاءُ الْحَيَاةِ فَيَنْبُتُونَ فِي حَافَتَيْهِ كَمَا تَنْبُتُ الْحِبَّةُ فِي حَمِيلِ السَّيْلِ قَدْ رَأَيْتُمُوهَا إِلَى جَانِبِ الصَّخْرَةِ وَإِلَى جَانِبِ الشَّجَرَةِ فَمَا كَانَ إِلَى الشَّمْسِ مِنْهَا كَانَ أَخْضَرَ وَمَا كَانَ مِنْهَا إِلَى الظِّلِّ كَانَ أَبْيَضَ فَيَخْرُجُونَ كَأَنَّهُمْ اللُّؤْلُؤُ فَيُجْعَلُ فِي رِقَابِهِمْ الْخَوَاتِيمُ فَيَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ فَيَقُولُ أَهْلُ الْجَنَّةِ هَؤُلَاءِ عُتَقَاءُ الرَّحْمَنِ أَدْخَلَهُمْ الْجَنَّةَ بِغَيْرِ عَمَلٍ عَمِلُوهُ وَلَا خَيْرٍ قَدَّمُوهُ فَيُقَالُ لَهُمْ لَكُمْ مَا رَأَيْتُمْ وَمِثْلَهُ مَعَهُ.

له ئەبی سەعیدی خودری (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە لە دەربارەی دیتنی خوا دەفەرمووێ: وتمان ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایا لەرۆژی قیامەت پەروەردگاری خۆمان دەبینین؟ فەرمووی ئایا هیچ گومانتان هەیە لەدیتنی رۆژو مانگ بەئاسمانەوە کاتێك کە هەورو تەمو مژی بەبەرەوە نەبێ؟ وتمان نەخێر، فەرمووی: دە بێ شك و گومان خودای خۆتان دەبینن لەوکاتەدا، هەروەکو بێ گومان و شك رۆژو مانگ دەبینن لەپاشان فەرمووی بانگ کەرێ بانگ دەکات با هەرکەسێ چی و کێی پەرستووە بچێ بۆلای ئەو ئیتر خاوەنی خاچ لەلای خاچ دەوەستن و بت پەرستیش لەلای بت دەوەستن و وەخاوەن هەر پەرستراوێ لەگەڵ گەلەکەی خۆی دەوەستێ و هەتا ئەوکەسانە دەمێنن کە تەنها خوایان پەرستووە لە گوناهکاران و پیاو چاکان ئینجا پێیان دەڵێن ئێوە لێرە بۆ وەستاون وا دەبینن خەڵکی هەر تاقمەو بەدوای یەکێك کەوتووە ئەوانیش دەڵێن ئێمە لەوان جیاوازین خۆت ئەی خودایە ئاگات لێیە کەئێمە لەجیهاندا لەبەر خاتری تۆ دەستمان لەکەس و کارو ئازیزی خۆمان و خەڵکانی تریش هەڵگرت، و وەئێمە گوێمان لەبانگەوازی بانگکەرێ بوو وتی با هەرکەسێ چی پەرستووە بابەدوای ئەو بکەوێ وە ئێمە

چاوەنواڕی پەروەردگاری خۆمانین، دەفەرمووێ ئینجا خوای باڵادەست دێت بۆ لایان دەفەرمووێ: من پەروەردگاری ئێوەم ئەوانیش دەڵێن تۆ خوا وە پەروەردگاری ئێمەی وە لەوکاتە تەنها پێغەمبەران قسە دەکەن پێیان دەفەرمووێ ئایا لەنێوان ئێوەو ئەودا هیچ نیشانەیەك هەیە کە بی ناسنەوە؟ ئەوانیش دەڵێن بەقاچی قودرەتی خۆی، ئینجا خوای گەورە قاچی قودرەتی خۆی پێیان پێشان دەدات ئیتر هەموو بڕواداریێ دەکەوتە کڕنوش بردن، تەنها ئەوانە دەمێنن کە کڕنوشیان بۆ خودا بۆ ریاو لەپێش چاوی خەڵکی بردووە کە دەچنە کڕنووش بردن لەلایەن خودا پشتیان ڕەق دەبێت و دەبن بەیەك پارچە تەختەو هەرچی هەوڵ دەدەن ناتوانن کڕنوش ببەن لەپاشان پردێك لەسەر پشتی دۆزەخ دادەنێن..

ئێمەش وتمان ئەی پێغەمبەری خوا ئەو پردە چۆنە؟ فەرمووی: پردێکی خزو خلیسکاوییەو چنگاڵ و قوڵاب و دڕکە ئاسنینی زۆری پێوەیە لەو جۆرە دڕکە زۆرە لەوڵاتی نەجد پێی دەڵێن (حوشترالوك) واتە (حوشتر خۆر) یان دڕکی سەعدان وە بڕواداران هەیانە بەسەریدا تێدەپەڕێ وەکو چاو قوچانێك وەیان هەیانە وەکو بروسکە و هەورەتریشقە تیێ دەپەڕن و هەیانە وەکو ماینی ڕەسەنی تیژڕەو وە هەیانە وەکو بای تیژڕەو وە هەیانە وەکو وشتری خۆشڕەو تێدەپەڕێ، جا هەیە بەساغ و سەلامەتی تێدەپەڕێ و قورتار دەبێ وە هەیانە زامدار دەبێ قورتار دەبێت وە هەیانە دەتەپێتە ناو دۆزەخ هەتاکو کۆتایی یان دێت بەسەریدا تێدەپەڕێ وە سوێندم بەخوا وەك چۆن ئێوە لەدونیادا بەکوڵ لەخودا دەپاڕێنەوە کە ڕووی ڕاستییان لەوکارە بۆ دەربخات ئەوانیش پڕ بەدڵ لەخوا دەپاڕێنەوە بڕواداران داوادەکەن کە خودا ڕەحم بەحاڵی ئەو برادەرانەیان بکات کەوان لەناو دۆزەخدا تکایان بۆدەکەن و باسی

چاکەکانیان دەکەن دەفەرمووێ: ئەی پەروەردگارمان ئەوانە لەگەڵ ئێمە نوێژیان دەکرد و لەگەڵ ئێمە بەڕۆژو دەبوون و کردەوەی چاکەیان دەکرد، خوای گەورە دەفەرمووێ: بڕۆن هەرکەسێکتان دیتەوە لەدۆزەخ بەقەد میسقاڵ زەرەیەك یان دینارێك لەئیمان و بڕوا لەدڵیان دابێ دەریان بهێنن لەئاگری دۆزەخ، ئەوانیش کە دەچن بۆ لایان بە دەموچاو دەیان ناسنەوە چونکە خوا حەرامی کردوە کەئاگر دەموچاویان بسووتێنێ وە دەچنە لایان وە دەبینن هەندێکیان نقومی ناو ئاگر بووە وە هەندێکییان هەیە هەتا نیوەی ئاگر گرتووین وە هەندێکییان هەتا هەردوو ئەژنۆی دەگرێ وە ئەوانەی دەیان ناسن دەریان دەهێنن و دەگەڕێنەوەی لای خواو خوای گەورە پێیان دەفەرمووێ: بڕۆن کەسێکتان دیت لەناو دڵی بەقەد میسقاڵێك نیو دیناری لەئیمان و بڕوای تێدابێت دەری بهێنن وە دەگەڕێتەوە بۆناو ئاگر ئەوانیش دەردێنن لەپاش دەچنەوە بۆلای پەروەردگاریان و خوای گەورە پێیان دەڵێت بڕۆن ئەوکەسانەش کەلەناو دڵیان بەقەد میسقاڵ زەرەیەك گەردیلە لەئیمان و بڕوا لەناو دڵیان ماوە دەریان بهێنن ئەوانیش دێننە دەرەوە لەئاگر.

ئەبو سەعیدی خودری (رضي الله عنه) دەفەرمووێ ئەگەر بڕوام پێ ناکەن ئەم ئایەتە بخوێنەوە: ﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَاعِفْهَا﴾ لەڕاستیدا خودا بەقەد میسقاڵە زەرەیی زۆرو ستەم لەکەس ناکات وە ئەگەر بەقەد ئەو سەنگە چاکەی هەبێت خودا بۆی دەکات بەچەند قات پاداشت پێ دەداتەوە.

وە پێغەمبەران و فریشتەکانی خواو بڕواداران شەفاعەت و تکا دەکەن وەخوا دەفەرمووێ مایەوە شەفاعەت و تکای خۆم بکەم کەلەهەموو کەسان بەرەحمترە جا بەخودا چنگی لە دانیشتوانی ناو دۆزەخ دەداو کۆمەڵێکی زۆر

زۆری لێ دێنێته دەرەوە کەلەناو دۆزەخ بوون بەکڵۆی خەڵوز ئەوجا هەڵیان دەداتە ناو رووبارێك لەنزیك بەهەشت پێی دەگوترێت ئاوی حەیات (ژیانەوە) ئینجا هەموو لاشەیان دەبوژێتەوەو هەروەك چۆن دەنکە دانەوێڵە لەناو ئاو سەوز دەبێتەوە ئەوانیش ئاوها زوویەزوو سەر دەردەهێنن و ئاوا بەبێ زیادو کەم، خۆ دیوتانە چۆزەرەی شینایی پاڵ پەردو دارکە لەسێبەر دایە چۆن رەنگ سپیەو بەڵام کەلەبەر خۆر دابێ رەنگی زەردباو و سەوز کەلەو بەشەوقە ئەوجا وەك مرواری لەسەدەف دێنە دەر سپی و ساف دەبن وە لەگەردەنیاندا نیشانەو جۆری یەکتاپەرستی لەسەرە کە دەچنە ناو بەهەشت خەڵکانی بەهەشت دەیان ناسنەوە دەڵێن ئەوانە ئازادکراوانی خودان خودای گەورە ئەوانەی بردۆتە بەهەشت بەبێ ئەوەی کە کردەوەیەکی باشیان کردبێ یان چاکەیەکیان هەبوبێ وە پێیان دەڵێن هەرچیتان بەرچاو کەوت بۆخۆتان وە هەندێ تریش لەگەڵی بۆ خۆتان بێت.

٧٩٧. عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا سَيُكَلِّمُهُ رَبُّهُ لَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ تُرْجُمَانٌ وَلَا حِجَابٌ يَحْجُبُهُ)).

عەدی کوڕی حاتەم (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی هەریەکێك لەئێوە خوای گەورە بەخودی خۆی گفت و گۆی لەگەڵ دەکات لەنێوان خۆی و ئێوە هیچ زمان زان و وەرگێڕەك نییە بەبێ پەردە گفتوگۆ دەکات.

٧٩٨. عَنْ مُعَاوِيَةَ بن أبي سفيان رَضِيَ اللهُ عَنْهُما قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ)يَقُولُ لَا يَزَالُ مِنْ أُمَّتِي أُمَّةٌ قَائِمَةٌ بِأَمْرِ اللهِ مَا يَضُرُّهُمْ مَنْ كَذَّبَهُمْ وَلَا مَنْ خَالَفَهُمْ حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللهِ وَهُمْ عَلَى ذَلِكَ.

له موعاويەی کوڕی ئەبی سوفیان (رضي الله عنه) دەفـەرمووێ گـوێم لـە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەیفەرموو: بەردەوام کۆمەڵێ لـە ئۆممـەتی مـن ئـەم دیـنی خوایـە بـەرێوە دەبـەن زیانیـان پـێ ناگـات ئەوانـەی بـەدرۆیان دەخەنەوە، ئەوانەی لەسەر رێگای ئەوان دابن هەتاکو قیامەت دادێت لەسـەر ئەم دینی خوایە دەمێننەوە.

## باب إنما قولنا لشئ، وكلام الرب عز وجل

٧٩٩. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: ((إِنَّ عَبْدًا أَصَابَ ذَنْبًا وَرُبَّمَا قَالَ أَذْنَبَ ذَنْبًا فَقَالَ رَبِّ أَذْنَبْتُ وَرُبَّمَا قَالَ أَصَبْتُ فَاغْفِرْ لِي فَقَالَ رَبُّهُ أَعَلِمَ عَبْدِي أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ وَيَأْخُذُ بِهِ غَفَرْتُ لِعَبْدِي ثُمَّ مَكَثَ مَا شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ أَصَابَ ذَنْبًا أَوْ أَذْنَبَ ذَنْبًا فَقَالَ رَبِّ أَذْنَبْتُ أَوْ أَصَبْتُ آخَرَ فَاغْفِرْهُ فَقَالَ أَعَلِمَ عَبْدِي أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ وَيَأْخُذُ بِهِ غَفَرْتُ لِعَبْدِي ثُمَّ مَكَثَ مَا شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ أَذْنَبَ ذَنْبًا وَرُبَّمَا قَالَ أَصَابَ ذَنْبًا قَالَ رَبِّ أَصَبْتُ أَوْ قَالَ أَذْنَبْتُ آخَرَ فَاغْفِرْهُ لِي فَقَالَ أَعَلِمَ عَبْدِي أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ وَيَأْخُذُ بِهِ غَفَرْتُ لِي لِعَبْدِي ثَلَاثًا فَلْيَعْمَلْ مَا شَاءَ)).

## (بەشی/ ئایەتی ﴿إِنَّمَا قَوْلُنَا لِشَيْءٍ﴾ وەتەی خوای گەورە)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) فەرمووی گوێم لە پێغەمبەری خوابوو (ﷺ) فەرمووی: بەندەیەك تاوانێکی کرد (راوی) دەڵێت وابزانم وتی تاوانێکی کرد وتی پەروەردگارم تاوانێکم کرد لێم خۆشبە، خوای گەورە فەرمووی ئایا بەندەی من دەزانێ پەروەردگارێکی هەیە لەتاوانی دەبوورێ؟ وا من لێی بورام لەپاش ناوێ کە خوا حەزیکات مات دەبێت بەندەکەوە لەپاشان تاوانێکی تر دەکات و دەڵێت پەروەردگارم گوناهێکم توش هاتووە یان کردومە لێم خۆشبە

خوای گەورە فەرمووی: بەندەم دەزانی کە پەروەردگارێکی وای هەیە کە هەم لێی ببورێ؟ یان تۆڵەی لێ بکاتەوە وا لەبەندەی خۆم خۆشبووم، لەپاش ماوەیەك مات دەبێت تا خوا حەزکات لەپاشان بەندە تاوانێکی تر دەکات و دەڵێ پەروەردگارم تاوانم کردووە لێم خۆشبە خواش دەفەرمووێ بەندەی من باش دەزانێ کەخودایەکی وای هەیە هەم لەسەر گوناه تۆڵە دەسێنێ یان لێی دەبورێ ئەوا لەبەندەی خۆم خۆش بووم چی حەزدەکات بابیکات.

٨٠٠. عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى الله تعالى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ((مَا مِنْكُمْ أَحَدٌ إِلَّا سَيُكَلِّمُهُ رَبُّهُ لَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ تُرْجُمَانٌ فَيَنْظُرُ أَيْمَنَ مِنْهُ فَلَا يَرَى إِلَّا مَا قَدَّمَ مِنْ عَمَلِهِ وَيَنْظُرُ أَشْأَمَ مِنْهُ فَلَا يَرَى إِلَّا مَا قَدَّمَ وَيَنْظُرُ بَيْنَ يَدَيْهِ فَلَا يَرَى إِلَّا النَّارَ تِلْقَاءَ وَجْهِهِ فَاتَّقُوا النَّارَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ)).

لە عەدی کوڕی حاتەم (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: هەریەکێك لەئێوە خوای گەورە بەخودی خۆی گفت و گۆی لەگەڵ دەکات لەنێوان ئەو و خودا هیچ زمان زاناو وەرگێڕەك نییە تەماشای لای راستی دەکات تەنها ئەوە دەبینێ کە کردوویەتی لەپێش خۆیدا وە تەماشای لای چەپی دەکات ئەوە کردەوەی خۆی دەبینێ وە تەماشای پێش خۆی دەکات تەنها ئاگری دۆزەخ دەبینێ لەپێشی دانراوە وە خۆتان بپارێزن لەئاگری دۆزەخ با بەلەتە خورمایەکیش بێت.

## باب رجل القرآن والماهر بِهِ وتحسين تلاوته

٨٠١.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ ((لَا تَحَاسُدَ إِلَّا فِي اثْنَتَيْنِ رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ الْقُرْآنَ فَهُوَ يَتْلُوهُ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ فَهُوَ يَقُولُ لَوْ أُوتِيتُ مِثْلَ مَا أُوتِيَ هَذَا لَفَعَلْتُ كَمَا يَفْعَلُ وَرَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ مَالًا فَهُوَ يُنْفِقُهُ فِي حَقِّهِ فَيَقُولُ لَوْ أُوتِيتُ مِثْلَ مَا أُوتِيَ عَمِلْتُ فِيهِ مِثْلَ مَا يَعْمَلُ)).

## (بەشی/ ئەوپیاوەی قورئان خوێنە، وە ئەوەی هەوڵ دەدات وە بەدەنگی خۆش قورئان دەرازێنیتەوە)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ)فەرموویەتی: حەسوودی و بەخیلی بەخەڵك بردن درووست نییە، تەنها بەدووکەس نەبێت، بەپیاوێك کەخوای گەورە فێری قورئانی کردبێ وە بەردەوام بەشەوو بەرۆژ خەریکی بێ و دەوری بکاتەوە وە ئەوکەسەش بڵێ خۆزگەم بەوپیاوە ئاوهام بکردبا وەکو ئەو، دووەمیان پیاوێ خوای گەورە ماڵێ پێ ببەخشێ لەرێگای خوا سەرفی بکات ئەویش بڵێ خۆزگە وەکو ئەوپیاوە ماڵ و سامانم هەبوایەو سەرفم بکردبایە بەم دووانە حەسوودی بردن درووستە.

٨٠٢.قالَ صَلَّى اللَّهُ تَعالى عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: ((الْمَاهِرُ بِالْقُرْآنِ مَعَ الْكِرَامِ الْبَرَرَةِ وَزَيِّنُوا الْقُرْآنَ بِأَصْوَاتِكُمْ)).

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەوکەسەی بەلێزانی قورئان دەخوێنێ لەگەڵ فریشتە بەرێزەکانی خوان، وە قورئان برازێننەوە بە دەنگە خۆشەکانتان.

٨٠٣.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ تَعالى عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: ((مَا أَذِنَ اللَّهُ لِشَيْءٍ مَا أَذِنَ لِنَبِيٍّ حَسَنِ الصَّوْتِ بِالْقُرْآنِ يَجْهَرُ بِهِ)).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) گوێی لەپێغەمبەر (ﷺ) بوو دەیفەرموو: خوای گەورە مۆڵەت و ئیزنی هیچ دەنگێکی پێ خۆشتر نییە هێندەی بیستنی دەنگی پێغەمبەرێك کە بەدەنگی خۆش و جوان قورئان بخوێنێ بەئاشکرا.

## باب صوت المؤذن، والله خلقكمْ، وحديث الإسراء

٨٠٤. عَنْ أبي سَعيد الخُدري رَضيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّه قالَ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ: إِنِّي أَرَاكَ تُحِبُّ الْغَنَمَ وَالْبَادِيَةَ فَإِذَا كُنْتَ فِي غَنَمِكَ أَوْ بَادِيَتِكَ فَأَذَّنْتَ بِالصَّلَاةِ فَارْفَعْ صَوْتَكَ بِالنِّدَاءِ فَإِنَّهُ لَا يَسْمَعُ مَدَى صَوْتِ الْمُؤَذِّنِ جِنٌّ وَلَا إِنْسٌ وَلَا شَيْءٌ إِلَّا شَهِدَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: هكَذا سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ).

## (بەشی/ دەنگی بانگدەر، خوا ئێوەی دروووست کردووە، فەرموودەی شەورەوی و بڵندبوونەوە)

ئەبو سەعیدی خودری (رضي الله عنه) وتی بە عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولڕەحمان من تۆ دەبینم حەز لە دەشت و دەرو مەڕومالآت دەکەی، وە ئەگەر لەناو مەڕومالآت بووی کاتی نوێژ هات، بانگی نوێژ بدەو دەنگت بەرز بکەرەوە بەبانگدان، چونکە هەرچی جنۆکەو مرۆڤ و هەرچی فریشتەو هەرشتێکی تر گوێی لێ بێت لەرۆژی قیامەت شایەتیت بۆئەدات.

ئەبو سەعید خودری فەرمووی ئەو فەرموودەیەم ئاوا لەپێغەمبەر بیستووە.

٨٠٥. عَنْ أبي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَال: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ تَعالى عَلَيْهِ وَآلِه وَسَلَّمَ يَقُولُ: ((قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ ذَهَبَ يَخْلُقُ كَخَلْقِي فَلْيَخْلُقُوا ذَرَّةً أَوْ لِيَخْلُقُوا حَبَّةً أَوْ شَعِيرَةً)).

ئەبی هوڕەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ گوێم لە پێغەمبەر بوو (ﷺ) فەرمووی: خوای بالادەست دەفەرمووێ: کێ لەوکەسە ستەمکارترە کەبلێ من شت درووست دەکەم وەکو خوا با گەردێك یان دەنکۆڵەیەك یان دەنکە جۆیەك دروست بکات ئەگەر دەتوانێ.

٨٠٦. عَنْ أَنَسَ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، يَقُولُ: لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ تَعالى عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ مِنْ مَسْجِدِ الْكَعْبَةِ أَنَّهُ جَاءَهُ ثَلَاثَةُ نَفَرٍ قَبْلَ أَنْ يُوحَى إِلَيْهِ وَهُوَ نَائِمٌ فِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ، فَقَالَ أَوَّلُهُمْ: أَيُّهُمْ هُوَ؟ فَقَالَ أَوْسَطُهُمْ: هُوَ خَيْرُهُمْ، فَقَالَ آخِرُهُمْ: خُذُوا خَيْرَهُمْ، فَكَانَتْ تِلْكَ اللَّيْلَةَ فَلَمْ يَرَهُمْ حَتَّى أَتَوْهُ لَيْلَةً أُخْرَى فِيمَا يَرَى قَلْبُهُ وَتَنَامُ عَيْنُهُ وَلَا يَنَامُ قَلْبُهُ، وَكَذَلِكَ الْأَنْبِيَاءُ تَنَامُ أَعْيُنُهُمْ وَلَا تَنَامُ قُلُوبُهُمْ. فَلَمْ يُكَلِّمُوهُ(ﷺ) حَتَّى احْتَمَلُوهُ فَوَضَعُوهُ عِنْدَ بِئْرِ زَمْزَمَ، فَتَوَلَّاهُ مِنْهُمْ جِبْرِيل عَلَيهِ السَّلام.

ثُمَّ شَقَّ جِبْرِيلُ مَا بَيْنَ نَحْرِهِ إِلَى لَبَّتِهِ حَتَّى فَرَغَ مِنْ صَدْرِهِ وَجَوْفِهِ فَغَسَلَهُ مِنْ مَاءِ زَمْزَمَ بِيَدِهِ حَتَّى أَنْقَى جَوْفَهُ، ثُمَّ أُتِيَ بِطَسْتٍ مِنْ ذَهَبٍ فِيهِ تَوْرٌ مِنْ ذَهَبٍ مَحْشُوًّا إِيمَانًا وَحِكْمَةً، فَحَشَا بِهِ صَدْرَهُ وَلَغَادِيدَهُ -يَعْنِي عُرُوقَ حَلْقِهِ- ثُمَّ أَطْبَقَهُ.

ثُمَّ عَرَجَ بِهِ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا، فَضَرَبَ بَابًا مِنْ أَبْوَابِهَا فَنَادَاهُ أَهْلُ السَّمَاءِ: مَنْ هَذَا؟ فَقَالَ: جِبْرِيلُ، قَالُوا: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مَعِيَ مُحَمَّدٌ صَلى اللهُ عَلَيهِ وَآلِهِ وَسَلم، قَالوا: وَقَدْ بُعِثَ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالُوا: فَمَرْحَبًا بِهِ وَأَهْلًا، فَيَسْتَبْشِرُ بِهِ أَهْلُ السَّمَاءِ، لَا يَعْلَمُ أَهْلُ السَّمَاءِ بِمَا يُرِيدُ اللَّهُ بِهِ فِي الْأَرْضِ حَتَّى يُعْلِمَهُمْ.

فَوَجَدَ فِي السَّمَاءِ الدُّنْيَا آدَمَ، فَقَالَ لَهُ جِبْرِيلُ: هَذَا أَبُوكَ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ، وَرَدَّ عَلَيْهِ آدَمُ السَّلَامَ، وَقَالَ: مَرْحَبًا وَأَهْلًا بِابْنِي، نِعْمَ الِابْنُ أَنْتَ.

فَإِذَا هُوَ فِي السَّمَاءِ الدُّنْيَا بِنَهَرَيْنِ يَطَّرِدَانِ، فَقَالَ: مَا هَذَانِ النَّهَرَانِ يَا جِبْرِيلُ؟ قَالَ: هَذَانِ النِّيلُ وَالْفُرَاتُ عُنْصُرُهُمَا.

ثُمَّ مَضَى بِهِ فِي السَّمَاءِ فَإِذَا هُوَ بِنَهَرٍ آخَرَ عَلَيْهِ قَصْرٌ مِنْ لُؤْلُؤٍ وَزَبَرْجَدٍ، فَضَرَبَ يَدَهُ فَإِذَا هُوَ مِسْكٌ أَذْفَرُ، قَالَ: مَا هَذَا يَا جِبْرِيلُ؟ قَالَ: هَذَا الْكَوْثَرُ الَّذِي خَبَأَ لَكَ رَبُّكَ.

ثُمَّ عَرَجَ بِهِ إِلَى السَّمَاءِ الثَّانِيَةِ، فَقَالَتْ الْمَلَائِكَةُ لَهُ مِثْلَ مَا قَالَتْ لَهُ (فِي) الْأُولَى: مَنْ هَذَا؟ قَالَ: جِبْرِيلُ، قَالُوا: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالُوا: وَقَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالُوا: مَرْحَبًا بِهِ وَأَهْلًا.

ثُمَّ عَرَجَ بِهِ إِلَى السَّمَاءِ الثَّالِثَةِ وَقَالُوا لَهُ مِثْلَ مَا قَالَتْ الْأُولَى وَالثَّانِيَةُ، ثُمَّ عَرَجَ بِهِ إِلَى الرَّابِعَةِ فَقَالُوا لَهُ مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ عَرَجَ بِهِ إِلَى السَّمَاءِ الْخَامِسَةِ فَقَالُوا مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ عَرَجَ بِهِ إِلَى السَّمَاءِ السَّادِسَةِ فَقَالُوا لَهُ مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ عَرَجَ بِهِ إِلَى السَّمَاءِ السَّابِعَةِ فَقَالُوا لَهُ مِثْلَ ذَلِكَ.

وَفِي كُلِّ سَمَاءٍ أَنْبِيَاءُ قَدْ سَمَّاهُمْ، فَأَوْعَيْتُ مِنْهُمْ إِدْرِيسَ فِي الثَّانِيَةِ، وَهَارُونَ فِي الرَّابِعَةِ، وَآخَرَ فِي الْخَامِسَةِ لَمْ أَحْفَظْ اسْمَهُ، وَإِبْرَاهِيمَ فِي السَّادِسَةِ وَمُوسَى فِي السَّابِعَةِ بِتَفْضِيلِ كَلَامِ اللَّهِ، فَقَالَ مُوسَى: رَبِّ لَمْ أَظُنَّ أَنْ يُرْفَعَ عَلَيَّ أَحَدٌ. ثُمَّ عَلَا بِهِ فَوْقَ ذَلِكَ مما لَا يَعْلَمُهُ إِلَّا اللَّهُ عزَّ وَجلَّ، حَتَّى جَاءَ سِدْرَةَ الْمُنْتَهَى، وَدَنَا لِلْجَبَّارِ رَبِّ الْعِزَّةِ فَتَدَلَّى حَتَّى كَانَ مِنْهُ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَى، فَأَوْحَى اللَّهُ فِيمَا أَوْحَى إِلَيْهِ خَمْسِينَ صَلَاةً عَلَى أُمَّتِكَ كُلَّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ.

ثُمَّ هَبَطَ حَتَّى بَلَغَ مُوسَى، فَاحْتَبَسَهُ مُوسَى فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، مَاذَا عَهِدَ إِلَيْكَ رَبُّكَ؟ قَالَ: عَهِدَ إِلَيَّ خَمْسِينَ صَلَاةً كُلَّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، قَالَ: إِنَّ أُمَّتَكَ لَا تَسْتَطِيعُ ذَلِكَ فَارْجِعْ فَلْيُخَفِّفْ عَنْكَ رَبُّكَ وَعَنْهُمْ.

فَالْتَفَتَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ إِلَى جِبْرِيلَ كَأَنَّهُ يَسْتَشِيرُهُ فِي ذَلِكَ، فَأَشَارَ إِلَيْهِ جِبْرِيلُ أَنْ نَعَمْ إِنْ شِئْتَ، فَعَلَا بِهِ إِلَى الْجَبَّارِ فَقَالَ وَهُوَ مَكَانَهُ: يَا رَبِّ خَفِّفْ عَنَّا، فَإِنَّ أُمَّتِي لَا تَسْتَطِيعُ هَذَا، فَوَضَعَ عَنْهُ عَشْرَ صَلَوَاتٍ.

ثُمَّ رَجَعَ إِلَى مُوسَى فَاحْتَبَسَهُ، فَلَمْ يَزَلْ يُرَدِّدُهُ مُوسَى إِلَى رَبِّهِ حَتَّى صَارَتْ إِلَى خَمْسِ صَلَوَاتٍ، ثُمَّ احْتَبَسَهُ مُوسَى عِنْدَ الْخَمْسِ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، وَاللَّهِ لَقَدْ رَاوَدْتُ بَنِي إِسْرَائِيلَ قَوْمِي عَلَى أَدْنَى مِنْ هَذَا فَضَعُفُوا فَتَرَكُوهُ فَأُمَّتُكَ أَضْعَفُ أَجْسَادًا وَقُلُوبًا وَأَبْدَانًا وَأَبْصَارًا وَأَسْمَاعًا، فَارْجِعْ فَلْيُخَفِّفْ عَنْكَ رَبُّكَ.

كُلَّ ذَلِكَ يَلْتَفِتُ رَسُول اللهِ (ﷺ) إِلَى جِبْرِيلَ لِيُشِيرَ عَلَيْهِ وَلَا يَكْرَهُ ذَلِكَ جِبْرِيلُ، فَرَفَعَهُ عِنْدَ الْخَامِسَةِ فَقَالَ: يَا رَبِّ إِنَّ أُمَّتِي ضُعَفَاءُ أَجْسَادُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ وَأَسْمَاعُهُمْ وَأَبْصَارُهُمْ وَأَبْدَانُهُمْ، فَخَفِّفْ عَنَّا، فَقَالَ الْجَبَّارُ: يَا مُحَمَّدُ، قَالَ: لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ، قَالَ: إِنَّهُ لَا يُبَدَّلُ الْقَوْلُ لَدَيَّ، كَمَا فَرَضْتُ عَلَيْكَ فِي أُمِّ الْكِتَابِ، وَهِيَ خَمْسٌ عَلَيْكَ.

فَرَجَعَ صَلَى اللهُ تَعالى عَلَيهِ وَآلِهِ وَسلَّم إِلَى مُوسَى، فَقَالَ: كَيْفَ فَعَلْتَ؟ قَالَ: خَفَّفَ عَنَّا، أَعْطَانَا بِكُلِّ حَسَنَةٍ عَشْرَ أَمْثَالِهَا، قَالَ مُوسَى: قَدْ وَاللَّهِ رَاوَدْتُ بَنِي إِسْرَائِيلَ عَلَى أَدْنَى مِنْ ذَلِكَ فَتَرَكُوهُ، ارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ فَلْيُخَفِّفْ عَنْكَ أَيْضًا، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَا مُوسَى قَدْ وَاللَّهِ اسْتَحْيَيْتُ مِنْ رَبِّي مِمَّا اخْتَلَفْتُ إِلَيْهِ، قَالَ: فَاهْبِطْ بِاسْمِ اللَّهِ.

قَالَ: وَاسْتَيْقَظَ وَهُوَ فِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ.

**ئەنەس کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەیفەرموو: ئەوشەوەی کە پێغەمبەری خوا شەوڕەوی بۆکرا لەمزگەوتی کەعبە بوو سێ کەس هاتن بۆلای وەلەفریشتان پێش ئەوەی وەحی بۆ بهێنن کە خەوتبوو لەمزگەوتی ماڵی خوا لەمەککە، یەکەمییان وتی کامە ئەو پیاوەیە؟ دووەمیان وتی ئەوە**

چاکترینیانه وه دوایی یەکەیان وتی چاکەکەیان بگرن وه ئەوشەوه کەس نەیانی دیت هەتا بۆ ئەو شەوی داهاتوو هاتنەوەلای و کە بەدڵ ئەوانی دیت وه بەچاویش خەوتبوو کە دڵی ناخەوێ وه هه روەها پێغەمبەرانیش چاویان دەخەوێ و دڵەکانیان ناخەوێ وه قسەیان لەگەڵ پێغەمبەر نەکردو هەڵیان گرت خستیانەوه نزیك بیری زەمزەم وه جوبرائیل هاتە پێشەوەو لەنێوان گەردەن و سنگی لەت کردو ناوسکی بەئاوی زەمزەم شۆردو تاکو پاکی کردەوەو لەپاشان شتێکیان هێنا وەکو تەشتێك وابوو پڕبوو لەزێری و پڕبوو لەئیمان و بڕوا و دانایی خستیانە ناو سنگی و هەتا ناو دەمارەکانی ڕۆیشتن و دوای سنگیان وەوکوخۆی لێکردەوە وەلەپاشان بەرزیان کردەوە بۆئاسمانی یەکەم و لەدەرگایان داو خەڵکی ئاسمان بانگیان کرد ئەوەکێیە فەرمووی جوبرائیله وه وتیان کێ لەگەڵی دایه وتی لەگەڵم دایه موحەمەد (ﷺ) وتیان ئایا وەحی بۆ هاتووه، یان بەدوایان ناردوه، وتی: بەڵێ، وتیان سڵاوی لێ بێت و بەخێر هاتنی لێ کرا، وه خەڵکی ئەم ئاسمانە کەیف خۆش بوون و مزگێنیان پێدا وه خەڵکی ئاسمان نەیان دەزانی داخوا چی دەوێ لەسەر زەوی هەتا خوا زانیاری پێ دان.

وه لەئاسمانی یەکەم حەزرەتی ئادەمی دیت و جوبرائیل بەپێغەمبەری فەرموو ئەوه باوکته سڵاوی لێ بکە، وه ئادەمیش وەڵامی سڵاوی ئەوی دایەوه وه فەرمووی مەرحەبا بەخێربێی ئەی کوڕی خۆم چاکترین کوڕ تۆی وه لەئاسمانی یەکەم دوو ڕوباری دیت هەڵدەقوڵان، فەرمووی ئەم دوو رووبارانە چین ئەی جوبرائیل ئەویش فەرمووی ئەوه روباری نیل و فوراتە کە سەرچاوەیان یەکە.

لەپاشان هەر لەئاسمان رۆیشتن چاوی بە روبارێکی تر کەوت و کۆشکێکی لەمرواری و زوبەرجەد بوو دەستی لێداو دیتی لەمیسکی ساف درووست کرابوو کە بۆن خۆش بوو، فەرمووی ئەی جوبرائیل ئەم روبارە چییە؟ فەرمووی ئەمە حەوزی کەوسەرە کە خوا بۆتی هەڵگرتووە.

لەپاشان سەرکەوت بۆ ئاسمانی دووەم فریشتەکان وتییان وە ئەوەی وتیان لەئاسمانی یەکەم وایان وتەوەو کە ئەوە کێیە؟ فەرمووی جوبرائیلە، وتیان بەڵێ وتیان بەخێر هاتی، لەپاشان سەرکەوت بۆ ئاسمانی سێیەم و وەکو ئاسمانی یەکەم و دووەم ئاوایان پێ وت لەپاشان سەرکەوت بۆ ئاسمانی چوارەم ئەویشیان بەهەمان شێوە لاپاشان بۆ ئاسمانی پێنجەم و شەشەم و تا سەرکەوت بۆ ئاسمانی حەفتەم بەهەمان شێوە پرسیاریان لێ کردو بەخێر هاتنیان لێ کرد.

وە لەهەر ئاسمانێك پێغەمبەرانی لێبوو کە ناوی هێنان ئەوی کەلە بیرم مابێ ئیدریس لەئاسمانی دووەم وە هارون لەچوارەم وە دواین لەپێنجەم بوو کە ناوی لەبیر نەماوە وە ئیبراهیم لەئاسمانی شەشەم و موسا لەئاسمانی حەفتەم بوو بەوەی کە خوا بەرێزی داناوە لەبەر ئەوەی خۆی گوفتاری لەگەڵ کردووە موسا فەرمووی ئەی پەروەردگارم من گومانم نەبوو کەسێك هەبێ لەمن بەرێزتر بێت، لەپاشان بەرزبۆوە لەسەر هەموو ئەوانەی کە بەس خوا ئاگاداری پێیان هەیە هەتا گەیشتە (سیدرەتولمونتەها) کە دارێکە وە لەخوای پەرەردگار نزیك بۆوە هەتا دووری تیرو کەوانێك یان نزیکتر، ئینجا خوا وەحی بۆ کردو پەنجا نوێژی لەسەر خۆی و ئۆمەتی فەرزکرد لەشەو و رۆژێکدا، ئینجا لەدواییدا پێغەمبەر (ﷺ) هاتەوە لای موساو ئینجا موسا (علیە السلام) راگیری کردو فەرمووی ئەی موحەمەد خوا چی پێ راگەیاندووی؟

فەرمووی خوا پەنجا نوێژی لەسەر خۆم و ئۆمەتم فەرز کرد لەشەوو ڕۆژێکدا، فەرمووی ئۆمەتی تۆ دوایـن ئۆمەتـە و نـاتوانن ئەمـە ڕابگـرن لەسـەر خۆیـان بگەڕێوە لای پەروەردگارت و داوای سوك کردن و کورت کردنـەوەی لـێ بکـە ئینجا پێغەمبەر تەماشای جوبرائیلی کردو وە داوای ڕاوێژی لێ بکـات ئینجا جوبرائیل فەرمووی بەڵێ ئەگەر حەزدەکەی، لەپاشان پێغەمبـەر بـەرز بـۆوە بۆلای پەروەردگاری باڵادەسـت هـەر لەشـوێنی یەکەمیـدابوو فـەرمووی ئـەی پەروەردگارم سوکی بکەرەوە و ئۆمەتی من ناتوانن ئەمە بکەن، ئینجا خوای گەورە بۆی کرد بە دە نوێژ فەرز لەشەوو ڕۆژێکدا وە لەپاشان گەڕایەوە بۆلای موساو وەڕاگیری کرد بەردەوام دووبارەی دەکردەوە لێی داوای دەکرد کەبۆی سووك بکرێت و دەگەڕایەوە لەنێوان موساو پەروەردگاردابوو تاکو بـۆی بـوو بەپێنج نوێژە فەرزەکان ئینجا موسا داوای لـێ کـرد دیـسان بگەڕێتـەوە لای خواو داوای سوککردنی لێ بکات و فەرمووی سوێندم بەخوا من لەمە کەمترم بەسەر نەوەی ئیسرائیلا دانابوو ئینجا خۆیان بێ هێزو وازیان لێ هێنـاوە وە ئۆمەتی تۆش لەهەموو ئۆممەتان بێ هێزترن و بە دەروون و لاشەیان و چاو و گوێیان بگەڕێوە بۆلای پەروەردگارت داوای سووکتری بکە، هەموو ئەم جارانە پێغەمبـەری خـوا تەماشـای جـوبرائیلی دەکـرد وەکـو ڕاوێـژی پێـی بکـا وە جوبرائیلیش هیچ جارێك پێی ناخۆشی دەرنەبڕی ئینجـا لـە سـووککردنی تـا گەیشتە پێنج نوێژە فەرزەکان لەلاشەو دڵ و چاوەکان و گوێیـان داوادەکـەم کە سـوکتری بۆمـان بکـە ئینجـا خـوای کاربـەجێ فـەرمووی ئـەی موحەمـەد فەرمووی لەخزمەتت ڕاوەستاوم ئەی پەروەردگاری من خوا فـەرمووی وتـەی من گۆڕانی بۆنییە هەروەکو فەرزم کردوە لەسەر لەدایکی پەڕاوە کە........ فاتیحەیە کە پێنج نوێـژ لەسـەرت ئینجـا پێغەمبـەر (ﷺ) گەڕایـەوە بـۆلای

موساو فەرمووی چیت کرد پێغەمبەر فەرمووی خوا بۆی سووك کردین پێی بەخشین بەهەر چاکەیەك دەقات پاداشت ئینجا موسا فەرمووی سوێندم بەخوا من لەمە کەمترین داوای سوکترم کرد بۆ نەوەی ئیسرائیل ئینجا بێ فەرمانی خوایان کرد گوێڕایەڵی نەبوون بگەڕێوە بۆلای پەروەردگارت داوای سووك و کورتکردنی لێ بکە، دیسان پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ئەی موسا سوێندم بەخوا شەرم دەکەم لەپەروەردگارم داوای زیاتری لێ بکەم ئینجا جوبرائیل فەرمووی ئەی موحەمەد دابەزە بەناوی خوا دەفەرمووێ کە بەخەبەر هات دیتی خۆی لەناو مزگەوتی حەرام دایە لەکەعبەی پیرۆز.

## باب مطل الغني بالدين
## وتأجيل دفعه وفضل الطاعم الشاكر

٨٠٧. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قال: قالَ النَّبِيُّ (ﷺ) ((مَطْلُ الْغَنِيِّ ظُلْمٌ)).

## (بەشی/ نەدانەوەی قەرز لەلایەن دەوڵەمەند وە ستەم وە فەزڵی نانده‌ری سوپاسگوزار)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: کەسێ قەرزی وەرگرت و ماڵ و سامانی هەبوو کە بیداتەوە بەڵام نەیدایەوە ئەوە گەلێ ستەمکارو ناڕەوایە

٨٠٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ)قال ((الطَّاعِمُ الشَّاكِرُ مِثْلُ الصَّائِمِ الصَّابِرِ)).

ئـەبو هـورەیرە (رضـي الله عنـە) لەپێغەمبـەر (ﷺ) کـە دەفـەرمووێ: نانخۆری سوپاس گوزار یان نان خۆری سوپاس گوزار وەکو نمونـەی کەسـی زۆر بەرۆژووی ئارامگرە.

## باب فيه شِفاءٌ لِلناس والعين حق، ولا عدوى، وفرّ من المجذوم

٨٠٩.عَنْ أَبِي سَعِيد الخُدري رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَال: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ: إِنَّ أَخِي اسْتَطْلَقَ بَطْنُهُ، فَقَالَ عَلَيهِ الصَّلاة وَالسَّلام: ((اسْقِه عَسَلًا))، فَسَقَاهُ، فَقَالَ: إِنِّي سَقَيْتُهُ فَلَمْ يَزِدْهُ إِلَّا اسْتِطْلَاقًا، فَقَالَ: ((صَدَقَ اللَّهُ وَكَذَبَ بَطْنُ أَخِيكَ)).

## (بەشی/ شیفا بەخشە بۆ خەڵکی وە چاوپیسی راستە، تەنینەوە نیە، وە لەکەسی گەرو راکە لێی دوورکەوە)

ئەبی سەعیدی خودری (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پیاوێ هاتەلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتی براکەم سکی دەچێ و ئازاری هەیە ئەویش (ﷺ) فەرمووی: برۆ هەنگوینی بدەرێ ئەویش چوو هەنگوینی پێداو وتی پێمداو هەرئازاری و نەخۆشیەکەی زیاتری کرد، پێغەمبەر فەرمووی خوا راستی فەرمووە: ﴿فِيهِ شِفَآءٌ لِّلنَّاسِ﴾ وە سکی براکەت درۆ دەکات.

٨١٠.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) ، قَالَ: ((الْعَيْنُ حَقٌّ)).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) کەدەفەرمووێ: چاووزار، یان چاوپیسی راستە و بوونی هەیە.

٨١١.عَنْ أبي هُرَيْرَةَ رَضيَ اللهُ تَعالى عَنْهُ، قال: قَالَ رَسُولُ اللّهِ صَلَّى اللّهُ تَعالى عَلَيْهِ وَآلهِ وَسَلَّمَ: ((لَا عَدْوَى وَلَا طِيَرَةَ وَلَا هَامَةَ وَلَا صَفَرَ وَفِرَّ مِنْ الْمَجْذُومِ كَمَا تَفِرُّ مِنْ الْأَسَدِ))

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەری خو (ﷺ) فەرمووی: نە نەخۆشی تەنینەوە هەیە و نە نەقولانە خراپ هەیە و نە پێ رەش و بەدبەختی هەیە و نە (هامە) هەیەو نە پاش خستنی مانگی موحەڕەم هەیە بۆکاتی مانگی صەفەرە نەبەپێچەوانەوە (ئەمە لەزەمانی نەفامی باوی هەبووە) وە لەکەسی تووش بوو بە گوڕوو رابکە و لێی دوور کەوە چۆن لەشێرو دڕندە رادەکەی ئاوا لێی دوور کەرەوە.

٨١٢.عَنْ أبي هُرَيْرَةَ رَضيَ اللهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَآلهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((لَوْ كَانَ عِنْدِي أُحُدٌ لَأَحْبَبْتُ أَنْ لَا يَأْتِيَ ثَلَاثٌ وَعِنْدِي مِنْهُ دِينَارٌ، لَيْسَ شَيْءٌ أَرْصُدُهُ فِي دَيْنٍ عَلَيَّ أَجِدُ مَنْ يَقْبَلُهُ)).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: ئەگەر بەقەد کێوی ئوحود زێڕو سامانم هەبێ پێم خۆشە سێ شەوم بەسەردا تێنەپەڕێ و تا هەمووی ببەخشم، وە خێرو صەدەقەی پێ بکەم مەگەر ئەو دینارەی کە هەڵی گرم بۆ دانەوەی قەرز کە لەسەرمە، بیدەمە خاوەنەکەی.

لایغتب بعضُكمْ بَعضاً والأمر بالعدل، والعَفو عنْ المظلوم

قال اللّهُ تَعَالَى: ﴿وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا ۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ ۚ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ﴾ .

وَقال اللّهُ تَعالَى: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَٱلْإِحْسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَيَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ وَٱلْبَغْىِ ۚ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ .

وَقال اللّهُ تَعالَى: ﴿إِن تُبْدُوا۟ خَيْرًا أَوْ تُخْفُوهُ أَوْ تَعْفُوا۟ عَن سُوٓءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا قَدِيرًا﴾ .

وَقالَ تَعالَى: ﴿وَجَزَٰٓؤُا۟ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا ۖ فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٠﴾ وَلَمَنِ ٱنتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَا عَلَيْهِم مِّن سَبِيلٍ ﴿٤١﴾ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَظْلِمُونَ ٱلنَّاسَ وَيَبْغُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤٢﴾ وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ﴾ .

## (بەشی/ باکەس غەیبەتی کەس نەکات و فەرمانکردن بە دادپەروەری وە لێبوردن و چاوپۆشی لە ستەم لێکراو)

خـوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا ۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ﴾ (سـورة الحجرات).

راڤەکەی: لەپاش ملە باسی یەکتری و ناوی یەکتری بـەخراپ مەبـەن ئایا کەستان خۆشی دیت لەوەی گۆشتی برای خۆی بەمردوویی بخوات دیارە کاری واتـان زۆر پـێ سـەخت و ناخۆشـە دەی کەواتـە لـەخوا بترسـن و پاێزگـارین چونکە خوا گەڕانەوەی خەڵکی وەردەگرێت و میهرەبانە بۆیان.

وه دەفـــەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡبَغۡيِۚ يَعِظُكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ﴾ . (النحل: ٨٩)

واتە: خوا فەرمان دەدات بەدادپەروەری و چاكە كاری و يارمەتی دانـی و بەخشندەيی بەخزمان وە قەدەغە لەگوناهو تاوان و دەست درێژی دەكات (بۆ سەرماڵ و نەفس و ناموسی) وە ئامۆژگاريتان دەكات بۆ ئەوەی يـادەوەری وەربگرن و تێبفكرن و هەرچاكە بكەن.

وه دەفـــەرمووێ: ﴿إِن تُبۡدُواْ خَيۡرًا أَوۡ تُخۡفُوهُ أَوۡ تَعۡفُواْ عَن سُوٓءٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوّٗا قَدِيرًا﴾.

واتە: خێرو چاكە بەئاشكرا بكەن يان بيشارنەوە يان لێبوردەو چاوپۆشی بكەن لەتۆڵە نەكردنەوە خوای گەورە لێبوردەو بەدەستەڵاتە.

وه خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَجَزَٰٓؤُاْ سَيِّئَةٖ سَيِّئَةٞ مِّثۡلُهَاۖ فَمَنۡ عَفَا وَأَصۡلَحَ فَأَجۡرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ۝٤٠ وَلَمَنِ ٱنتَصَرَ بَعۡدَ ظُلۡمِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَا عَلَيۡهِم مِّن سَبِيلٍ ۝٤١ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَظۡلِمُونَ ٱلنَّاسَ وَيَبۡغُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ۝٤٢ وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنۡ عَزۡمِ ٱلۡأُمُورِ﴾.

واتـە: جـا تۆڵـەی هـەرتاوانێك بەئەنـدازەی تاوانەكەيـە بـێ زيـادو كـەم، ئەوكەسەی لێخۆشبوونی هەبێت و چاوپۆشی و چاكسازی بكات ئەوە پاداشتی لەلای خوايە بەڕاستی خوا ستەمكارانی خۆش ناوێ لەراستيدا ئەوەی حـەقی خۆی دەستێنێ دوای ئەوەی كە ستەمی لێكراوە ئەوانە لێپرسراو نابن ئەگەر

لەسنوور لانەدەن، بێگومان تەنها ئەوانە بەرپرس دەبن کەستەم لەخەڵکی دەکەن و دەستدرێژی دەکەن بەناحەق لەزەویدا ئا ئەوانە سزاو ئازاری بەئێشیان بۆهەیە.

لەراستیدا ئەوەی دان بەخۆیدا بگرێت و چاوپۆشی و لێخۆشبوونی هەبێت کە دەتوانێ تۆڵەی خۆی بکاتەوە ئەوە کارێکی بەجێ و چاکی و پەسەند ئەنجام دەدات بەڕاستی ئەوە لەوکارانەیە کەپێویستە بکرێت.

لێرەدا لێبوومەوە لەرافەی (جواهیرو ئەلبوخاری) تەواوبوو

سوپاس بۆخوا لەسەرەتاو کۆتایی

ئەمەی کەدادێت بریتییە لەچەند ئایەت و فەرموودەیەك کە دانەری ئەم پەرتووکە (جواهر البخاری) چەند فەرموودەیەکی لە پەراوەکانی دیکە هێناوە لەگەڵ (جواهر البخاری) یەك ناگرنەوە، وە منیش لەبەر ئەمانەتی وەرگێڕان ئەو فەرمودانەشم هێناون و وەرم گێڕاوەتە سەرزمانی کوردی کە هەندێکیان لەسوونەنەکانی فەرموودە هاتوون و پلەی غریبو حسنی تیایە، لەدەربارەی دوعاو نزاو پاڕانەوە هاتووە، کە ژمارەیان سی و هەشت فەرموودەیە، وە خوا لێمان ببورێت و وەری گرێت. امین

## باب الأدعية المختارة عن رسول الله (ﷺ) والحث على ملازمة الدعاء

قال اللّهُ تَعالَى: ﴿ وَلَا تَتَمَنَّوْا۟ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبُوا۟ ۖ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبْنَ ۚ وَسْـَٔلُوا۟ ٱللَّهَ مِن فَضْلِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴾ .

وَقالَ تَعالَى: ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِىٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ ﴾.

وَقالَ: ﴿ ٱدْعُوا۟ رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴾ .

وَقالَ سبحانَهُ: ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِى عَنِّى فَإِنِّى قَرِيبٌ ۖ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ ﴾ الآية.

وَقالَ تَعالَى: ﴿ أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ ﴾ .

## (بەشی/ ئەوە چەند نزاو پاڕانەوەیەکی هەڵبژێردراوە کە لەپێغەمبەری خوا (ﷺ)وە هاتووەو هان دەدات کە بەردەوامی بکەین ئەم دوعاو نزایانە:

خودا دەفەرمووێ: ﴿ وَلَا تَتَمَنَّوْا۟ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبُوا۟ ۖ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبْنَ ۚ وَسْـَٔلُوا۟ ٱللَّهَ مِن فَضْلِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴾ (لەسوورەتی النساء) ٣١-٣٢.

واتە: ئاواتە خوازی شتێك مەكەن كەخوا بەخشیویەتی بەهەندێكتان و نەیبەخشیوە بەهەندێكتان چونكە خوا دادپەروەرەو یاساكانی لەرووی

زانستیەو حیکمەتەوەیە، کاتێك هەندێك مافی داوە بە پیاوان لەهەندێك رووی تریشەوە مافی داوە بەئافرەتان، پیاوان بەشێکیان هەیە لەوەی کە بەدەستیان هێناوە، هەروەها ئافرەتانیش بەشێکیان هەیە لەوەی کە بەدەستیان هێناوە هەمیشە و بەردەوامیش داوای زیادەبەخشی و بەهرەی خوا بکەن چونکە خوا بەهەموو شتێك زانایە.

وە خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِىٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ ﴾ (البقرة).

وە خوای پەروەردگارتان دەفەرمووێ هاوارو نزای بۆلای من بکەن و وەلامتان دەدەمەوە.

وە دەفەرمووێ: ﴿ ٱدْعُوا۟ رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴾

واتە: بانگ و هاواری پەروەردگارتان بکەن بە مل کەچی و پەنهانی چونکە خوا دوژمنداری و لەسنوور بەزاندنی خۆشی ناوێ.

وە دەفەرمووێ: ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِى عَنِّى فَإِنِّى قَرِيبٌ ۖ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ ﴾ (البقرة).

واتە: خوا دەفەرمووێ ئەگەر بەندەکانم لێم بپاڕێنەوە من لێیانەوە نزیکم و وەلامی داواکاریان دەدەمەوە ئەگەر بانگم بکەن.

وە دەفەرمووێ: ﴿ أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ ﴾.

واتە: خوا ئەوخوایەیە کە وەلامی بۆ بەهانا هاتنی خاوەن پێویستی دەداتەوە بەلاو موسیبەتیان لەسەر لادەبات.

١–عنْ النُعمان بِن بَشير رضي الله عنهُما إن النبي (ﷺ) قالَ: (( الدُّعاء هُوَ العِبادةُ)) رواه أبو داود والترمذي.

نوعمانى كوڕى بەشیر (رضي الله عنهما) لەپێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (دوعا و نزاو پاڕانەوە خواپەرستییە).

٢–عن أنس رضي الله عنه قال: كانَ أكثر دُعاء النَبي (ﷺ): (اللّهُمَّ آتِنا في الدُّنيا حَسَنَةَ وفي الآخرةِ حَسنَةَ وَقِنَا عَذابَ النّار)) مُتَفقُ عليهِ.

ئەنەس (رضي الله عنه) دەفەرمووێ زۆری نزاو پاڕانەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەمەبوو: (ربنا اتنا في الدنيا حسنة وفي الآخرة حسنة وقنا عذاب النار) واتە: خوایە لەدونیادا چاکەمان پێ ببەخشەو وە لەدوارۆژدا چاکە وە لەسزای ئاگر دوورمان بخەرەوە.

٣–عنْ عمرو بن عاص رضي الله عنهُما قال: قال رسول الله (ﷺ): ((اللّهُمَّ مُصَرِّف القلوبِ صَرِّفْ قلوبَنا عَلَى طَاعَتِك)) رواه مسلم.

لە عەمری کوڕی عاص (رضي الله عنهما) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (خوایە ئەی ئەوەی کە دڵان لادەبەیت دڵمان دابدەوە بی خەرە سەر گوێڕایەڵی کردنت).

٤–عن أبي هُريرة رضي الله عنهُ عَنْ النبي صلى الله عليه وآله وسلم قال: ((تَعَوّذوا، بالله مِنْ جهْدِ البَلاء، وَدَرْكِ الشقاء، وَسُوء القضَاءِ، وَشَماتَةَ الأعْداء)) متفق عليه.

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرمووێ: خۆتان پەنا بدەن بەخوا لە توندی بەڵاو موسیبەت و وەلەتوشبوونی نەگبەتی و لەیەخەگرتنی چارەڕەشی و لەچارەنووسی خراپ و لە پێخۆشبوونی دوژمن.

٥-عن علي رضي الله عنه قال: قال لي رسول الله (ﷺ): ((قُلِ اللّهُمَّ اهْدِني وَسَدِّني)) وفي رواية: ((اللّهُمَّ إني أسألُكَ الهدى والسَّدادَ)) رواه مسلم.

**عەلی (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) پێی فـەرمووم: بڵـێ (خوایە هیدایەت و رێنیشاندەرم بە) وە لەریوایەتی تردا هاتووە (خوایە داوای هیدایەت و رێنیشاندەرو رێگای راستەقینەت لێ دەکەم).**

٦-عن عائشة رضي الله تعالى عنها أن رسول الله (ﷺ) كانَ يَقول في دُعائِهِ: ((اللّهُمَّ إنِّي أعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ ما عَمِلْتُ وَمِنْ شَرِّ ما لمْ أعْمَلْ)) رواه مسلم.

**لە عائیشە (رضي الله عنها) کە پێغەمبەر (ﷺ) لەنزاکانی دەیفەرموو: خوایە خۆم پەنا دەگرم بەتۆ لەخراپەی ئەوەی کە کردوومەوە لەشەڕی ئەو خراپەی کە نەمکردووە.**

٧-عنْ زيد بنْ أرقم رضي الله عنه قال: كان رسول الله صلى الله عليهِ وآله وسلم يقول: ((اللّهُمَّ إني أعُوذُ بِك مِنَ العَجْزِ وَالكَسَلِ والبُخْلِ والهَرَم وَعَذابِ القَبْر، اللّهُمَّ آتِ نَفسِي تَقْواهَا وَزَكاها، أنتَ وَلِيُّها وَمَوْلاها، اللّهُمَّ إني أعُوذُ بِكَ مِنْ عِلْمٍ لاَيَنفَعُ وَمِنْ قَلْبٍ لا يَخْشعْ وَمِنْ نَفْسٍ لاَتَشْبَعُ وَمِنْ دَعْوَةٍ لاَ يُسْتَجابُ لَها)) رواه مسلم.

**لەزەیدی کوڕی ئەرقەم (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر ئەم دوعایەی دەکرد: (خوایە پەنادەگرم بەتۆ لەدەستەوسانی و تەوزەڵی و پیری و ئازاری ناوگۆڕ، خوایە تەقوا بەدەروونم ببەخشەو پاکو تەمیز راگرە چونکە تۆ لەهەمووکەس باشتر پاك و خاوێن دەکەیتەوە تۆ خۆت گەورەی و خاوەنی خودی منیت، خوایە پەنا دەگرم بەتۆ لەزانستی بێ کەڵك سوود و لەدڵی بێ ئاگا و لەدەروونی چاوبرسی لە دوعاو نزایێ کە گیرا نەبێ.**

٨-عن عائشة رضي الله عنها أن النبي صلى الله عليه وآله وسلم كان يدعو بِهؤلاء الكلمات: ((اللّهُمَّ إني أعُوذُ بِك منْ فِتْنَةِ القَبْرِ وَعَذابِ النّارِ، وَمِنْ شَرِّ الغِنَى والفَقْرِ)) رواه ابو داود والترمذي.

**عائيشه (رضي الله عنها) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەم شانە دوعای دەکرد و دەپاڕایەوە: (خوایە پەنا دەگرم بەتۆ لەفیتنەی گۆڕو سزای ئاگرو لەشەڕو خراپەی دەوڵەمەندی و هەژاری).**

٩-عن زياد بن علاقة عن عمه قطبة بِن مالِك رضي الله عنه قال: كان النبي صلى الله عليه وآله وسلم يَقول: ((اللّهُمَّ إني أعُوذُ بِكَ منْ مُنْكرات الأخلاقِ والأعمالِ والأهواء)) رواه الترمذي.

**لەزیادی کوڕی عەلاقە لەمامی قوطبە ی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر دەیفەرموو (ﷺ): خوایە پەنا دەگرم بەتۆ لە رەفتاری ناپەسەند وە لەکرداری گەندو لەئارەزوبازی.**

١٠-عن أنسٍ رضي الله عنهُ أن النبي (ﷺ) كان يقول: ((اللّهُمَّ إني أعُوذُ بِكَ مِنْ البَرَصِ والجُنُونِ والْجُذامِ وسَّئ الأسْقامِ)) رواه أبو داود.

**ئەنەس (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) عـادەتی وابـوو ئەم نزایەی دەکرد:**

**خوایە پەنا دەگرم بەتۆ لە بەڵەکی و لەشێتی وە لە گوڕی و وە لەگشت دەردێکی خراپ و پیس.**

١١-عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: كان رسول الله (ﷺ) يقول: اللّهُمَّ إني أعوذُ بِكَ منَ الجُوعِ فإنَهُ بِئْسَ الضَّجيعُ، وأعوذُ بِكَ من الخِيَانةِ فإنَّها بِئْسَت البِطَانةُ))رواه أبو داود.

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنە) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (خوایە پەنات پێ دەگرم لەبرسێتی کە خراپترین. هاو نوێنەو وەلەناپاکی کەخراپترین کاری شاراوەی دەروونە.

١٢-عن عمران بن حصين رضي الله عنه قال: علّم رسول الله (ﷺ) أبي حُصيْناً كلمتَين يَدْعوا بِهُما: ((اللّهُمَّ ألهِمني رُشْدي وَأعِذْني منْ شَرِّ نَفْسي)) رواه الترمذي.

عیمرانی کوڕی حوصەین (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا باوکم کە (حوصەینە) فێری دوو وشەی کرد کە نزاو پاڕانەوەی بێ کات کە ئەویش: (خوایە ژیری و سەلیقەم پێ ببەخشەو دوورم کەرەوە و پەنام بدە لەخراپی نەفس و دەروونم).

١٣-عنْ أبي الفضل العباس بن عبدالمطلب رضي الله عنه قال: قلتُ يا رسول الله علِمني شَيئاً أسأله الله تعالى، قال: ((سَلُوا الله العَافيةَ)) فَمَكَثت أياماً ثُمَ جِئتُ فَقُلتُ: يا رسول الله علمني شيئاً أسألهُ الله تعالى، قالَ لي: ((يا عَبَّاسُ، يا عَمَّ رسول الله صلى الله عليهِ وآله وسلم سَلُوا الله العَافيةَ في الدُّنيا والآخِرةَ)) رواه الترمذي.

لەئەبی الفەضل (عەبباسی کوڕی عەبدولمتەڵیب) (رضي الله عنه) دەفەرمووێ: وتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) شتێکم فێربکە کەپێی لەخوا بپاڕێمەوە ئەویش فەرمووی داوای سەلامەت و دوور لەنەخۆشی لەخوا بکە وە دەفەرمووێ چەندێکی پێ چوو لەپاشان چوومەوە بۆلای و پێم وت ئەی پێغەمبەری خوا شتێکم فێربکە کە پێی لەخوا داوا بکەم ئەویش پێی فەرمووم: ئەی عەبباس ئەی مامی پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوا لەخوا بکە بۆ سەلامەت و لەش ساغی و دوور لەتاوان لەدونیا و لەدوارۆژ.

١٤-عن شهر بن حوشب قال قُلتُ لأم سلمة رضي الله عنها: يا أم المؤمنين ما أكثر دعاء النبي (ﷺ) إذا كان عندكِ؟ قالتْ: كانَ أكثر دعائه صلى الله عليهِ وآله وسلم: ((يا مُقَلِبَ القلوب ثَبِتْ قَلبي عَلى دِينِكَ)) رواه الترمذي.

له شەهری کوڕی حوشب دەفەرمووێ وتم بە ئوم سەلەمە ئەی دایکی ئیمانداران (رضي الله عنها) چ دوعایەك لەهەموویان پێغەمبەر (ﷺ) زیاتر کردوویەتی کە لەلای تۆ بووە، فەرمووی زۆربەی نزاکانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەمە بوو: (یا مُقلبَّ القُلُوبِ ثَبِّتْ قلْبي عَلَى دِينِكَ) واتە: ئەی هەڵسوڕێنەری دڵان، دڵم راگرە لەسەر ئاینی خۆت.

١٥-عن أبي الدرداء رضي الله عنه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وآله وسلم: ((كان مِنْ دُعاءِ داود علَيهِ الصلاة والسلام: اللّهُمَّ إني أسْأَلُكَ حُبّكَ وَحُبَّ مَنْ يُحِبُكَ والعَمَل الذّي يُبَلِغُني حُبّكَ، اللّهُمَّ اجْعَل حُبّكَ أحَبَّ إليَّ مِنْ نَفْسي وأهْلي وَمِنَ المَاءِ البَارِدِ)) رواه الترمذي.

ئەبی دەرداء (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: لەنزاکانی داود پێغەمبەر (عليه السلام) ئەمەبوو (خودایە داوای خۆشەویستی خۆت و خۆشەویستی ئەوکەسانەی کە تۆیان خۆش دەوێ وە بەو کردەوەی کە دەمگەیەنێتە خۆشەویستی خۆت خوایە خۆشەویستی خۆت بکە بە خۆشترین خۆشەویست لە نەفس و ماڵ و منداڵ و وە ئاوی ساردیش.

١٦-عنْ أنس رضي عنهُ قال: قالَ رسول الله (ﷺ): ((ألِظُّوا بِيَا ذا الْجلالِ والإكْرامِ)).

ئەنەس (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: خوو بگرن بەم یادە پیرۆزو هەمیشە بیکەن بە وێردی سەر زمانتان بەکوڵ و بەدڵ

هاوار بکەن بڵێن (یا ذا الجلال والاکرام) واتە: ئەی خودایە خۆت خاوەنی شان و شکۆو قەدرو ڕێزی خوای پیرۆزی نازدار.

١٧–عَنْ أُمامة رضي الله عنه قال: دعا النبي(ﷺ) بدُعاء كَثير لم نَحْفَظ منهُ شيئاً، قُلنا: يا رسول الله، دَعوت بدعاء كثير لمْ نَحْفظ منْهُ شيئاً، فَقالَ: ((ألا أدُلُّكُمْ عَلَى مَا يَجْمَعُ ذلكَ كلُه؟ تقول: ((اللّهُمَّ إني أسْألُكَ منْ خَيْرِ مَا سَألَكَ منْهُ نَبيُّكَ محمدٌ(ﷺ)، وأعُوذُ بِكَ منْ شَرِّ مَا اسْتَعاذَ منْهُ نبيُّكَ محمدٌ صلى الله عليه وآله وسلم، وَأنْتَ المُستَعانُ وعلَيْكَ البَلاغُ وَلاَ حَوْلَ ولاَ قُوَةَ إلاّ بالله)) رواه الترمذي.

له ئەبی ئومامە (رضي الله عنـه) دەفـەرموێ نـزای پێغەمبـەر (ﷺ) زۆر بوون هیچم لەبیر نەمابوو وتمان ئـەی پێغەمبـەری خـوا زۆر نـزاو پاڕانـەوەت کردووە زۆربەمان لەبیرمان نەماوە ئەویش فەرمووی ئایا شتێکتان پێ نیشان بدەم کە هەموو نزاکان کۆدەکاتەوە ئەویش ئەوەیە بڵێ: (اللهم انی اسألك من خـير .... هتـد) واتـە: خوایـە مـن داوات لـێ دەکـەم لەوشـتە چـاکانەی کـە پێغەمبەرەکەت موحەمەد داوای لێ کردوی من خۆم پەنا دەدەم بەتۆ لەوشتە خراپانەی کە پێغەمبەرەکەت موحەمەد (ﷺ) خۆی پێ پەنا داوە لەو وەتۆ یارمەتی دەری و گەیاندن و تەبلیغ کردن لەسەر تۆیە وە هیچ هێزو قوەتێك نیە تەنها بەخوا نەبێت.

١٨–عن إبن مسعود رضي الله عنه قال: كان من دعاء رسول صلى الله عليه وآله وسلم: ((اللّهُمَّ إني أسْألُكَ مُوجِبَاتِ رَحمَتِكَ وَعزَائم مَغْفرَتِكَ، وَالسّلامةَ مِنْ كلّ إثم وَالْغَنيمةَ مِنْ كل برّ وَالفوزَ بالجنَّةَ والنَّجاةَ مِنَ النّارِ)) رواه الحاكم.

له ئەبی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود(رضي الله عنه) دەفەرمووێ لەنزاکانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەمەبوو: خوایە من داوات لێ دەکەم لەوشتانەی دەبنە هۆی

واجیب بوونی ڕەحمەتت و ببێتە هۆی واجب بوونی لێخۆشبوونت و سەلامەت لەهەموو گوناهی وەدەستکەوتی هەموو چاکەیەك و سەرکەوتن بەدەستکەوتنی بەهەشت و ڕزگاربوون لەئاگری دۆزەخ.

١٩-اللّهُمَّ صلِّ عَلَى سَيِّدنا محمدٍ بِقدْرِ مَا في عِلْمِكَ مِنَ العَدَدِ في كلّ لَمْحَة مِنَ الأزَلِ إلى الأبَدِ وَعَلَى آله وَصَحْبِه وَسَلَمْ.

ئەم شێوەی سەڵاوەت دانەش لەسەرزاری پیاوچاکان هاتووە (خوایە بڕێژە سەڵات و سەلام بۆسەر گەورەمان موحەمەد بەئەندازەی ئەو زانیاریەی کەلەژمارە نایەن بەهەموو چاو قوچانێك تاکو ئەو ڕۆژەی هەتا هەتایی و لەسەر ئاڵ و بەیت و ماڵ و خێزانی و هاوەڵانی بێت.

٢٠-وعنْ أبي هريرة أيضاً عنْ النبي صلى الله عليه وآله وسلم قال: ((اللّهُمَّ إني أعُوذُ بِكَ مِنَ الشَّقَاقِ وَالنِّفَاقِ وَسُوء الأخْلاقِ)).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: خوایە خۆم پەنا دەگرم بەتۆ لە دووبەرەکی و ناکۆکی و دووڕوویی و ناپاکی و بەدخوویی و بەدڕەوشتی.

٢١-عن شتير بن شكل عن أبيه رضي الله عنهُ أنَ النبي صلى الله عليه وآله وسلم قال: ((اللّهُمَّ إني أعُوذُ بِك مِنْ شَرِّ سَمْعِي وَمِنْ شرِّ بَصَري ومِنْ شرِّ لِسَاني ومِنَ شرِّ مَنِيَّ)) يعني فَرْجَه.

شەنیری کوڕی شەکل لەباوکی دەگێڕێتەوە (رضي الله عنه) کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: خوایە خۆم پەنا دەگرم بەتۆ لەخراپە و شەڕی گوێم و شەڕی چاوم و شەڕی زمانم و شەڕی دامێنم.

٢٢-عن عمران بن حصين رضي الله عنه أن النبي (ﷺ) قال: ((اللّهُمَّ ألهِمْني رُشْدِي وَأعِذْني مِنْ شَرِّ نَفْسي)).

لەعیمرانی کوڕی حوصەین (رضي الله عنه) کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: خوایە ژیری و سەلیقەییم پێ ببەخشە و پەنام بدە لەخراپەی نەفسی خۆم.

٢٣-عن علي رضي الله عنه أن رسول الله صلى الله عليه وآله وسلم قال: ((اللّهُمَّ إني أعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ سَخْطِكَ، وَأعُوذُ بُمعَافَاتِكَ مِنْ عُقُوبَتِكَ، وَأعُوذُ بِكَ مِنْكَ، لاَ أُحْصي ثَنَاءَ عَلَيْكَ أنْتَ كَمَا أثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ).

عەلی (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: خوایە خۆم پەنا دەدەم بەرازیبوونی تۆ لەتوڕەییت وە خۆم پەنا دەدەم بە عەفوو لێخۆشبوونت لەتۆڵە سەندنەوەت وە خۆم پەنا دەدەم بەتۆ لەتۆ کە ناتوانم سوپاست تەواو بکەم هەر چۆن مەدحی خۆت پێ کردووە.

٢٤-عنْ عبدالله بن عمر عن النبي (ﷺ) قال: (اللهُمَّ إني أعوذ بِكَ منْ زَوالِ نِعْمَتِكَ وتَحَولَ عَافيتِكَ وفَجاءةِ نَقْمَتِكَ وجَميعِ سخطِكَ)

لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: خوایە خۆم پەنا دەگرم بەتۆ لەوەی کە نازو نیعمەتت و پشتم تێ بکەن وە لەوەش کە ئەو ئاسودەییانەی داوتە پێم لێم بسەنیتەوە وە تووشی دەردو مەینەتی ببم، وە پەنا دەگرم بەتۆ لەوەی کە لەپڕو لەناکاو تووشی تۆڵەی سەختی تۆ ببم وە پەنا دەگرم بەتۆ لەهەرچی شتێ دەبێ بەهۆی ناڕەزایی و توڕەیی تۆ.

٢٥-عَنْ أبي هريرةَ (رضي الله عنه) أن رسول الله (ﷺ) قال: (اللّهُمَ أنفَعني بما عَلَمْتَني وعَلِمنِي ما يَنْفَعُني وَزِدني عِلماً، الحمدُ للهِ على كلَّ حالٍ، وأعوذُ باللهِ منْ حَالِ أهْلِ النّار).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: خوایە سودم پێ بگەیەنە بەوەی کە فێرت کردووم وە فێرم بکە بەوەی کە سوودی لێ ببینم و عیلم و زانیاریم زیاد بکە، وە سوپاسی خوا لەسەر هەموو کاتێ و ساتێکدا وە خۆم پەنا داوە بەتۆ لەماڵ و باری سەختەتی خەڵکی ئاگر.

٢٦-عنْ أبي مالك (رضي الله عنه) أنّ رسول الله (ﷺ) قال: (اللهّمَ إغفر لي وأرْحَمْني وأهْدني وَعافِني وأرزقني).

لەئەبی مالیك (رضي الله عنه) کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: خوایە لەتاوانم خۆش بە وە رەحمم پێ بکە و هیدایەتم بدەو وە ساغی و سەلامەتیم بکە و رزق و رۆزیم بدە.

٢٧-عنْ أبي هريرة (رضي الله عنه)أن النبي صلى الله عليه وآله وسلم قال: ( اللّهُمّ أغْفر لِي ذِنبي وَوَسِعْ ليّ في داري وَبارِكْ لِي في رزقي).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرمووێ: خوایە لەتاوانم خۆش بەو ماڵ و خانووم فراوان بکەو پیت و بەرەکەت بخەرە رزق و رۆزیم.

٢٨-عن علي بن أبي طالب (رضي الله عنه) أن النبي صلى الله عليه وآله وسلم قال: (اللّهُمَ أكْفِني بحَلالكَ عَنْ حَرامِكَ، وأغْنِني بِفَضلِكَ عَمّنْ سِواكَ).

له عەلی کوڕی ئەبو طالیب (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: خودایە بەحەلاڵی خۆت بێ نیازم بکە لە حەرامی خۆت وە هەروەها لەسایەی خۆشتەوە داماوی دەستی کەسی ترم نەکەی.

٢٩-عن عبدالله بن مسعود (رضي الله عنه) قال، قال النبي صلى الله عليه وآله وسلم: (اللّهُمَ إني أسألَكَ الهّدى، والتُّقّى، والعَفاف والغِنى).

لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعود (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: خوایە داوات لێ دەکەم بە هیدایەت و ڕێ نیشاندەری و داوێن پاکی و خواترسی و دەوڵەمەندی.

٣٠-عَنْ عمر (رضي الله عنه) أن النبي (ﷺ) قال: (اللّهُمَ زِدْنا ولاتَنْقُصنَا، وأكرِمنَا ولاَ تهِنّا، وَأعطِنا ولاَ تَحْرمْنا، وآثِرنا ولا تُؤثِر عليْنا، وأرَضِنا وأرْض عَنّا).

لە عومەر (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: خوایە پیت و بەرەکەتت زیاد بکەی لەسەرمانا و کەمی نەکەی، ڕێزمان لێ بگری و سوکایەتیمان پێ نەکەی و پێمان ببەخشی و لێمان نەگریتەوە و وە لێمان ڕازیبەو لێمان زویرمەبە.

٣١-عَنْ أبي هريرة رض الله عنه قال: قال رسول الله (صلى الله عليه وعلى آلهِ وسلم: (اللّهُمَ إنَكَ سألتنا من أنفسِنا مَا لاَ نملكهُ إلاّ بِكَ، اللهُمَ فأعطِنا منْها ما يرُضيكَ عَنا).

اللّهُم أقْسِم لَنا منْ خَشْيَتِكَ ما تُحولُ بهِ بَيْنَنا وبَيْنَكَ وَبيْنَ مَعاصيَك، وَمِن طاعَتِكَ ما تُبلّغنا بِهِ جَنتَكَ، وَمنْ اليَقِين ما تُهَونُ بِهِ علينا مَصَائِبَ الدُّنيا).

وَمَتّعْنا بأسْماعِنا وأبْصارِنا، وَقوّنا ما أحْيَيتَنا، وأجْعَله الوّارِث مِنا وأجعل ثأرنا على مَنْ ظَلَمَنا وأنصُرنا على مِنْ عَادَنا، ولأتجعل مُصيبتَنا في دِينِنا، ولاَ تجْعَل الدُّنيا أكْبَر هَمِنا ولاَ مبلَغَ عِلْمِنا، وَلاتُسَلِطْ علينا بِذنوبِنا مَنْ لاَيَخافُكَ وَلاَيَرحَمنا).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: خوایە داوات لێ کردووین لە نەفسی خۆمانا کە خاوەنی نین تەنها تۆ نەبی خوایە ئەوەمان پێ ببەخشە کە ببێتە هۆی ڕازی تەواو بوونی تۆ لەئێمە،

خوایە ئەوەندەمان بەش بۆدابنێ لەترس و سامی خۆت کە دوورمان بخاتەوە لەبێ گوێی و نافەرمانی تۆ لەطاعەت و فەرمانبەری خۆشت ئەوەندەمان بەش پێ بدە کە پێی بگەینە بەهەشتی تۆ، لە یەقین و دڵنیایی و متمانەیش ئەوەندەمان بەش پێ بدە کە گوێ بەوەی و جۆرتم و قۆرتی جیهان نەدەین، گوێمان و چاومان و هێزمان هەتا سەر پێ رەوا ببینەوە لەپاش مردنیشمان بیانکە بەمایەی سودو قازانج بۆمان هەرکەس زۆر ستەم و ناهەقیمان لێ دەکا تۆڵەی ئێمەی لێ بستێنەوە هەرکەسێ دوژمنایەتیمان تێ دەبەستێ سەرمان بخە بەسەریدا ئایین و دینمان گرفتاری وەی و موسیبەت مەکە، دنیا مەکە بە هۆمێدی هەرە گەورەمان و بە ئەوپەڕی ئاواتمان! ئەوکەسانەشمان بەسەردا زاڵ مەکە کە بەزەییان نایەتەوە پێماندا.

٣٢-عنْ ابي هريرة (رضي الله عنهُ) أن النبي عليه الصلاة والسلام قال: اللهُمَ أصْلِحْ ليَ ديني الذي هُوَ عِصْمَةَ أمري وأصْلِحْ ليَ دُنياي التي فيها مَعاشِي وأصلِح لي آخِرتي التي فيها مَعادي، واجْعَل زِيادةَ ليَ في كلّ خَيرٍ، واجْعَل المَوتَ رَاحَةَ لي مِن كل شَرّ).

لە ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) کە پێغەمبەر (رضي الله عنه) فەرموویەتی: خوایە دینەکەم مایەی خۆشی و باشی هەموو کارو بارێکمە رێك و پێکی بکە بۆم، دنیاکەم کە تێیدا دەژیم و گوزەرانی تیا دەکەم سازی بکە بۆم دوارۆژم کە تێدا زیندوو دەبمەوە باشی بکە بۆم خودایە ئەم ژیانەی ئەم جیهانەم بۆبکە بەهۆی هەموو زیادە خێرێ، مردنیشم بۆبکە بەمایەی سەرفرازی حەسانەوە لەدەستی هەموو شەڕێ.

٣٣-عن عائِشة (رضي الله عنها) أن النبي (ﷺ) قال: (اللّهُمَ اغفِر لي وارحَمني وألْحَقني بالرَّفيق الأعلى).

لەعائیشە (رضي الله عنها) کە پێغەمبەر (رضي الله عنها) فەرموویەتی: خوایەگیان لێم خۆشبەو رەحمم پێ بکەو بەم گەیەنە بەهاوەڵی بەرزەکانەوە (الرفیق الاعلی).

٣٤-عن بريدة (رضي الله عنه) أن النبي (ﷺ) قال: (اللّهُمَّ اجعَلْني شَكُوراً واجْعَلني صَبوراً وأجعلني في عيني صغيراً وفي أعيُنِ الناس كَبيراً).

لە بەریدە (رضي الله عنه) دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (رضي الله عنها) فەرموویەتی: خوایە وام لێبکە کە سوپاس گوزاریم و سەبرو ئارامم زۆر بێ و وە وام لێ بکە لەپێش چاوی خۆم خۆمم بە بچووك بێتە پێش چاوان و لەپێش چاوی خەڵکانیش بەگەورە دیاریکەوم.

٣٥-عن أبي بريدة (رضي الله عنه) أن رسول الله (صلى الله عليه وآله وسلم قال: (اللّهُمّ إني أسألُكَ بأنَكَ الله لا إله إلا أنتَ الأحَدُ الصَمَد الذي لم يَلِد ولمْ يولَد ولَمْ يَكنْ لَهُ كُفواً أحد).

لە ئەبی بورەیدە (رضي الله عنه) کە پێغەمبەر (ص) فەرموویەتی: خوایە داوات لێ دەکەم بەوە کەتۆ خوداو پەروەرگاری و هیچ پەرستراوێ نییە تۆ نەبی و تاکی و بێ نیازی و نە منالْت هەیە و وەنە لەکەس بووی وە کەسیش هاوشان و ئاوکوفی تۆ نییە.

٣٦-عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن النبي عليه الصلاة والسلام قال: (اللّهُمَّ إني أسْألُكَ المُعَافَاةَ في الدُّنيَا والآخرة).

ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) لەپێغەمبەر (رضي الله عنها) دەگێڕێتەوەو کە فەرموویەتی خوایە داوای لەش ساغی و بێ وەیت لێ دەکەم لەدونیاو دوارۆژ.

٣٧-عن عائشة (رضي الله عنها) أن النبي عليه الصلاة والسلام قال: (اللّهُمّ إنَكَ عَفُوٌ كَرِيمٌ تُحِبُ الْعَفوَ فاْعْفُ عنّي).

عائيشه (رضي الله عنه) دەفەرمووێ پێغەمبەر (رضي الله عنها) فەرمووی: خوایە دڵنیام کەتۆ هەم تاوان بەخش و هەم خەڵات بەخشی تۆ بەخشەری و بەخشندەی تۆ بەخشین و لێبوردنت پێ خۆشە سادەی بەمیهرەبانی خۆت بم بەخشە.

٣٨-وعنها أن النبي صلى الله عليه وآله وسلم قال: (اللّهُمّ عَافِني في جَسَدي وعافِيني في بَصَري، واجْعَلهُ الوارِثَ منّي، لا إله إلا الله الحليمُ الكريمُ، سُبحان الله رب العَرْشِ العَظيم، والحمدُ للهِ ربّ العالَمين).

لە عائیشە خان (رضي الله عنها) کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: خوایە ساغی و سەلامەتی بخەرە لاشەم و چاوم بیانکە بەمایەی قازانج و سوود بۆمن، هیچ پەرستراوێ نییە جگە لەتۆ نەبێ و کەخوای بەنەرم و سەخی و وە پاك و بێ گەردی بۆتۆ پەروەردگاری عەرشی گەورە وە سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانیان.

وقد آن أثني عنان القلم، واستغفر الله مما زلت به قلمي، والحمد لله أولاً وآخراً، وصلى الله على سيدنا محمد النبي الأُمي وعلى آله وصحْبِهِ وسلمْ

(تم بحمد الله تعالى)